# چەند مەلۆیەک لە خەرمانی تەمەنم

## ( بیرەوەرییەکانم )

بەشی یەکەم : ١٩٦١ - ١٩٩١

عەلی باپیر

٢٠١٥ ز ١٤٣٦ک

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : چەند مەلۆیەك لە خەرمانی تەمەنم / بیرەوەرییەکانم.

نـووســەر : عەلـی باپـیـر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدین محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٦ ك– ٢٠١٤ز.

تــیـراژ : ٢٠٠٠ دانە.

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٢)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە**

# پێشـکـەش بێ

بە هەموو ئەوانەی کە ئەم بیـرەوەرییانەم بە وردیی دەخوێنـنـەوەو بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان لێیـان بەهرەمەنـد دەبـن‌و، دەبنــە مایـەی زیاتـر تێگەیشــتن‌و چاکتـر پێگەیشتنیان.

# سوپاس و پێزانین

لە ناخی دڵمەوە سوپاس‌و پێزانین ئاڕاستەی هەر کام لە بەڕێزان:

١ـ کاك سۆران عومەر .

٢ـ کاك هەرێم هادی .

٣ـ کاك حەیدەر موزەففەر .

دەکەم، کە هەڵسان بە تایپکردن‌و هەڵەگیریی ئەو سەرگوزشتەو بیرەوەرییانەم، خوا بەچاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

هەروەها سوپاس‌و دەستخۆشیی‌و پێزانین ئاراستەی ستافی بەڕێزی گۆڤاری (لڤین) دەکەم، کە بڵاوکردنەوەی ئەو یادداشتانەیان بە پەنجاو پێنج (٥٥) ئاڵقە لە گۆڤارەکەیاندا، پاشان لە دووتوێی کتێبێکدا، بە ئەستۆوەگرت، خوا پاداشتیان بداتەوە.

# دوو ڕوونكـردنەوەی پێویسـت لەبارەی بیـرەوەرییـەكا نمـەوە

١ـ زۆرم هەوڵ داوە كە سەرگوزشتەی ژیانم‌و بیرەوەرییەكانم، وەك خۆیان‌و بێ كـەم و زیـاد بگێڕمەوە "ئەوەی كە پێم وابووە سوودو پەندێكی تێدایە" هەر بۆیەش زۆرجار ڕەخنەم لـە هەندێك قسەو هەڵوێستی ئەوسای خۆم گرتوە، كە ئێستا كـە پـێم هەڵـەن، بـەلاَم مێـژوو ناگۆڕرێ و پێویستە ڕووداو و هەڵوێستەكان بێ دەسـتكاریی تۆمـار بكـرێن‌و وەك خۆیـان بگێڕرێنەوە، بەچاك‌و خراپ‌و شیرین‌و تاڵەوە.

هەربۆیەش هەر كەسێك شتێكی لەبارەی خۆی یان نیزیكانیەوە لەم بیرەوەرییانە كەوتـە بەرچاو، كە بەدڵی نەبوو، "هەرچەندە زۆر خۆیشم لەوبارەوە پاراسـتوە" بـا لـێم زویـرو دڵگران نەبێ‌و، دڵنیـابێ كە جگـە لـە تۆمـاركردنی ئەمینداراانـەی سەرگوزشـتەی ژیـانم‌و بیرەوەرییەكانم "ئەوەی كە پـێم وایـە مایـەی ســـوودو پەنـدە" هـیچ مەبەسـتێكی دیكـەم نەبووە.

٢ـ بێگومان تەمەنێكی سی (٣٠) سـاڵەی لـە ١٩٦١ ز تـاكو ١٩٩١ز، پـڕ هـەورازو نشـێوو كەندو لەندو ڕووداو و پێشهاتی بابایەكی وەك بەندە، هەرگیز ناتوانرێ باسی وردو درشتی بكرێ، هەربۆیەش داوای لێبوردن لە نیزیكان‌و دڵسۆزانێك دەكەم كە یان لـەبیرم نـەبووە، یان بەپێویست‌و پەسندم نەزانیوە، هەندێك بەسەرهات‌و بیرەوەریی نێوان ئەوان‌و بەندە لەم سەر گوزشتەی ژیانمدا باس بكەم.

هەر لێرەشەوە سوپاس‌و پێزانینی خـۆم بـۆ سـەرجەم ئـەو بـەڕێزو دڵسـۆزانە دووپـات دەكەمەوە، بەهەرشـێوەیەك لـە شـێوەكان، لـە هـەورازو نشـــێوەكانی ژیـانم دا هاوكـارو دەستبارگرم بوون، خوای میهرەبـان‌و بەخشـندە بەباشـترین شـێوە پاداشـتیان بداتـەوەو، بێگومان لەوبارەوە خۆم بە قەرزدارو منەتباریان دەزانم.

# پـێشـەکی

الحمد لله رب العالـمين، والصلاة والسلام والبـركات علـى رسـول الله محمـد الـمبعـوث رحمـة للعالـمين وآلـه أجـمعين، من الصحب والأزواج والقرابـة، والتابعين لـهم بإحسان الـى يوم الديـن.

هەرچـەندە عـادەت وایـە ئەوانـەی سەرگوزشـتەی ژیـانی خۆیانیـان نووسـیوەتەوەو بیرەوەرییەکانی گەشتی تەمەنی خۆیانیان تۆمارکردوون، بەزۆریی لەدوا دوای تەمەنو قۆناغی کۆتـایی ژیانیانـدا ئـەوکارەیان کـردوە، یـان بـەلانی کەمـەوە پـاش ئـەوەی کۆتاییـان بـەو کاروچالاکیـیو پرۆژانە هێناوە، کەکردوویانن بە ئامانجی ژیانیان، بەڵام من بەرواڵەت پـێش ئەو قۆناغە دەستم بەو کارەکرد، هەرچەندە بـەس خـوای پـەنهانزان (عـالم الغيـب) کۆتـایی تەمەنی ئینسان دەزانێ، ئەویش بە دوو پاڵنــەر:

یەکەم: داواکارییو داکـۆکیکردنی چـەند برایـەکی دڵســۆزو نیزیـك، کـە ئـەوە کـارێکی پێویستەو بۆ خەڵكو خوێنـەران جێی سوودو بەهرەیە.

دووەم: دیارە هەمیشە مردنو بەجێهێشتنی ئەم ژیانە کاتییە، شتێکی چاوەڕوانکراوەو، بەهـەر دەقەو چرکەیەکی ژیانو تەمەنمان، هەنگاوێکی دیکـە لـەو سـەرەنجامە مسـۆگەرە نیـزیکتر دەبینەوە، ئاشکراشە گـەلێك کـەس فریـای تۆمـارکردنو نووسـینەوەی بیرەوەرییـەکانیان نەکەوتوونو، لەگەڵ خۆیاندا بردوویانن بۆ گۆڕو جیهانی بەرزەخو پاشان قیامەت!.

شایانی باسیشە کە وێـڕای سـەرقاڵیو پرئیشـییو کـەم دەرفـەتییم، ئـەوەی وادەکـات بم پەرژێتە سەر یادداشتکردنی بیرەوەرییەکانم، ئەوەیە کـە بـرای بـەرێزو دڵسـۆزم کـاك سـۆران عومەر لە شـێوەی نیمچـە چاوپێکەوتنێکــدا، هەڵدەســتێ بـە تۆمـارکردنی سەرگوزشـتەی ژیانمو، پاشان خۆی لەکاسێتەوە تایپی دەکاتو دووبارە بـۆم دەنێرێتـەوەو پێیـدا دەچـمەوە،

بگره جاری واهەیە دوو جار یان زیاتریش پێیدا دەچمەوەو، سووکە دەستکارییەکی دەکەم، بەوجۆرە من کاتی زۆرم بۆ دەگەڕێتەوە[١].

بۆیەش ئەوەم خستەڕوو، تاکو هەم شێوەی گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ژیانمو تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانم دیاربێ، هەم وەك وەفایەکیش بۆ ئەرکو ماندووبوونی کاك سۆرانو، هەم بۆ ئەوەش وانەزانرێ کە وەك عادەتی زۆربەی ئەوانەی بیرەوەرییەکانی خۆیانیان یادداشتکردوون، منیش لەکاتی بێ ئیشییو دەست بەتاڵیی (فراغ)دا بەوکارە هەڵدەستم !

شایانی باسیشە کە بە مەبەستی زۆر درێژنەبوونەوەی سەرگوزشتەی ژیانمو، زۆر قەبەنەبوونی قەبارەی بیرەوەرییەکانم، خۆم لە باسکردنی زۆر شت پاراستوە، کە پێموابووە حیکمەتو سوودێکی خوێنەرانی بەڕێزی تێدانیە، هەڵبەتە جاری واش هەیە لەکاتی گێڕانەوەکەمدا شتێکی گرنگم لەیاد نیەو، لەکاتی چاوپێداخشاندنەوەدا دەینووسم، یان ئەوکاتەش هەر نایەتەوە یادمو، ئەگەر تەمەن بە بەرییەوەما، لە چاپەکانی داهاتوودا تۆماری دەکەم.

---

١) زۆربەی ئەم بەشی یەکەمی بیرەوەرییەکانم بەوجۆرە ئامادەکران، بەڵام دوایی کاك سۆران لەبەر کاری پەرلەمان بۆی نەکراو، هەرخۆم ڕاستەوخۆ نووووسیمنو ئامادەم کردن.

# نـاو و ڕەچـەڵەکم

ناوم (عەلی)یە باب‌و دایکم ناویان لێناوم (عەلی)و منداڵی دووەمی خێزانەکـەمم، لـەپێش مندا برایەکم لەدایکبووە ناوی لێنراوە (وەتمان)، یان (عوسمان) کە دیـارە بـابم بـەناوی بـابی خۆی کردۆتەوە، دوای من سێ خوشکم لەدایکبوون (عائیشە)، وە(خەدیجە)، وە (مەریەم)، دوای ئەوان (عەبدولواحید)ی وە (موحەممەد) کە بەگچکەیی وەفاتیکردوە، ئنجا (عومەر) کـە دیارە (عومەر)یش وەفاتی کردووەو پاشان باسی کات‌و شوێنی‌و کوژرانی دەکەین، خـوا لێـی خۆشبـێ، ئنجا (ئەبوبەکر)و (ئیبراهیم)، وە خوشکێکی گچـکەشمان بـەناوی (فاتمـە) هـەر بەمنداڵی وەفاتیکردوە، پاشان (قەدەم خێر)، ئەوە بووین بەحەوت براو پێنج خوشك، بـەلاّم لەیەك کاتدا هەموویان پێکەوە نەبوون.

بابم (باپیر) هـەزار ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ کـە ئەمسـاڵ، (٢٦ـ٥ـ٢٠١٢) وەفـاتیکردو لەدایکبووی ساڵی: ١٩٢٧ز بوو، لەگۆڕستانی (چـاکی بەسـتەهیزە) نیزیـك ڕانیـە، بـەخاك سپێررا، کوڕی وەتمان، کوڕی ماماغا، کوڕی وەتمـان، کـوڕی وەتمـان (دووبـارە) ﴿واتـە: وەتمان بەناوی بابی خۆی کراوەتەوە، کە بـابی بەگـەنجیی مـردووەو نـاوی وەتمـان بـووە﴾ ئـەو (وەتمان)ەی یەکەم کوڕی ئەحمەد ئاغا (ئەحمد ئاغای بێشیر) بووە، دیارە عەشیرەتی میراودەلـی نۆ بەرە بابن، یەکێکیان بەرەبابی ئەحمەد ئاغایە، ئەو بەرە بابە بەناو ئەو ئەحمەد ئاغایەوە کراوە، ئنجا (ئەحمەد ئاغا)ش کوڕی (حەمـەد ئاغـای گـەورە)ی میراودەلییـە، هـەر نـۆ بەرەبـابەکە هـەموویان دەچـنەوە سـەر (حەمـەد ئاغـا)، ئـەویش کـوڕی خـان بـوداغ‌و ئـەویش کـوڕی (میراودەل)ە، کەواتە: زنجیرەی ڕەچەڵەك (نَسَـب)ی مـن لـەلای بابـمەوە ئاوایـە: عـەلی، باپـیر، وەتـمان، ماماغا، وەتـمان، وەتـمان، ئەحمەد، حەمـەداغا، خان بوداغ، میراودەل، ئەوە ڕەگ‌و ڕیشەی لایەنی بابم، لەسەری لای بابییەوە.

ئنجا دایکی بابم ناوی (مێر) بووەو ئەویش کچی خاڵ برایم بووە، کە بە (وەستا خاڵە ناسراون)و هۆزێکن خەریکی ئاسنگەریی بوون لە ناوچەی قەڵادزێ.

دایکم کە لە دایکبووی ساڵی: ١٩٤٠ز بووە و لە ﴿١٧\١٨-٢-٢٠٠١ز دا﴾ لە گوندی ئەحمەداوا کۆچی دوایی کردو لە گۆرستانی (خورماڵ) بەخاك سپێررا، تەرەفی بابی گۆرانە، ناوی (ڕەسووڵ گۆران) بووە، ناوی سیبانی دایکم: (مێر ڕەسوول برایم) بووە (ڕەسوول گۆران) مەشهوور بووە، من هێشتا بۆم ساغ نەبووەتەوە ئایا خەڵکی ئەم گۆرانەتیی لای ئێرە (هەولێر) بووە، یانی ناوچەی گۆرانەتیی؟ یان هۆزێك هەیە لە پشدەر بەناوی گۆران؟ خەڵکێك هەیە بەناوی گۆران، ئایا لە شوێنێکی دیکەوە هاتوون، یان ناویان گۆران بووە، نازانم چۆن بووە[1]؟

تەرەفی دایکی دایکم لە هۆزی (مەنگوڕ)ە واتە: نەنکم (دایکی دایکم) لە هۆزی مەنگوڕە، وە دایکم تەنیا برایەك بە ناوی (ابراهیم)و خوشکێك بە ناوی (خەج)ی بوون.

ماڵی ئێمە کە بابم و دایکم هەزار ڕەحمەتیان لێبێ، بوونە هاوسەری یەکدی، ئەو کاتە ماڵی بابم لەگوندی (دۆڵە دزێ) بووە، وە دایکم لەگوندی (ئالاوێ) بووە، (ئالاوە)و (کەستانە)و (دۆڵەدزێ) سێ دێن لەچۆمی (ئالاوێدا)دا، کە لە خوار (هەڵشۆ)و (دارەشمانە)وەیە، ماوەیەك لەوێبوون، نازانم ساڵێك یان دوو ساڵ، لەوێ باب و باپیرم زەوی و موڵکیان هەبووە، بەڵام بابم تاقانەی بابی بووە، واتە: (وەتمان) تەنیا (باپیر)ی بووە، بابم دوو مامی هەبوون، (ئەحمەد ئاغا)و (مەحموود ئاغا).

---

١) پاشان لە رۆژی: (٢٠١٤/١٢/١٤)ز (حەسەنی ئەحمەداغای کەستانێ) کە دایکی وی (پوورەخەج)م خوشکی گەورەی دایکمەو ئێستاش لە ژیاندایە، پێی گوتم: لە ساڵی (٢٠٠٤)دا کە لە (زاخۆ) دەگەڕامەوە لە ڕێگا لە چێشتخانەیەك لامداو، کە باسم کرد: منیش دایکم گۆرانەو کچی (ڕەسوول گۆرانی کوڕی برایم گۆرانی کوڕی عەولا گۆران)ەو (ڕەسووڵ و عەولا)ش هەردووکیان کوڕانی (برایم گۆرانی کوڕی عەولا گۆران) بوون، یەکسەر خەڵککە گوتیان: کەواتە: خزمین، چونکە ڕیش سپییانمان دەڵێن: کاتی خۆی: (برایم گۆران) لێمان زویر بووەو چۆتە پشدەرو هەرچەندە خزمان دووجاریش بەدوای داچوون بیهێننەوە، بەڵام لەگەڵیان نەهاتۆتەوە!.

واتە: (ئەحمەد)و (مەحموود)و (وەتمان) هەرسێکیان برابوونو کوڕی (ماماغا) بوون، جێی سەرنج ئەوەیە کە (وەتمان) تەنیا بابمی لەپاش بەجێماوە، واتە: (باپیر)، وە (محمود) تەنیا پوور (پەری)ی لەپاش بەجێماوەو (ئەحمەد)یش تەنیا پوورە (بەسێ)ی لەپاش بەجێماوە، پوور (پەری)و پوورە (بەسێ)م ئێستا لەژیاندا ماون[1]، ئەو سێ ئامۆزایە لەو سێ برایە بوونو، تەنیا ئەو دوو کچەو ئەو کوڕەیانبووون.

---

١) پاشان پوور (پەریی)یم لە ١٤/١/٢٠١٣زدا لە شاری ڕانیە کۆچی دوایی کرد.

# هۆی کۆچکردنی بابم لە پشدەرەوە بەرەو سەنگەسەرو پاشان بیتوێن و ڕانیە

بابم کە تاقانەی بابی بووە، پاش وەفاتی بابی لەدایکبووە، چونکە (وەتمان ئاغا) زۆر بەگەنجیی وەفاتیکردوە، وەك بیستوومە مامەکانی و خزمەکانی دەستیان بەسەر موڵك و ماڵەکەیدا گرتوە، وادیارە کاتی خۆی لەنێو هۆزی میراودەلیی خۆیشیاندا، ئەوانەیان کە دەسەلاّتیان بووە، ستەمیان کردووە لەوانەی کە دەسەلاّتیان نەبووە، بۆیە بابم تووڕەو نیگەران بووە لە خزمەکانی و سەرەنجام هاتووەتە خوار، واتە لە پشدەرەوە هاتوە بەرەو سەنگەسەرو بەستەستێن، بەلاّم جاریٰ بەردەربەند نەبووە، جا مەشهووره دەڵێن: ئەگەر کەسێك لە کەسێك تووڕە بووایە لەپشدەر، دەیانگوت: دەبڕۆ بریا هێندە دەرۆیشتی بەردەربەند دەبووی، واتە: (دەچوویە خوار دەربەند) کە مەبەستیان دەربەندی ڕانیە بووە، دیارە بۆ ئەوکاتە شوێنێکی دووربووە، بەلاّم بابم جاریٰ بەردەربەند نەبووەو هەر لە پشت دەربەندەوە بووە، ئیدی ماڵی بابم لە دێیەك نیشتەجێبووە، بەناوی (کەنجارە) ئەو دێیە ئێستاش ماوە، دوایی دێیەکە کەوتووەتە ژێر دەریاچەی دووکان، لەویٰ بەس خەریکی کشتوکاڵ و توتنەوانی بووە، بۆ ماوەی چەند ساڵێك، من لەویٰ لەدایکبووم، جارێکیان لە دایکمم پرسی بەرەحمەت بیٰ، من چ ساڵێك لەدایکبووم؟ تۆ لەبابم چاکترت لەبیرە، گوتی: ڕۆڵە تۆ لە هاوینی (١٩٦١)دا لەدایکبووی.

❁ ئەوەی من لەژیانی ئەو گوندە (کەنجاریٰ) وەبیرم دیٰ: خەڵك لە قەراغ دیٰ ڕادەوەستان، من گچکە بووم لەبیرمە دەیانگوت: ئەها! ئەوە مارە، لەنێو بەحردا کاتێك کە مارەکان سەریان دەردەهێنا، هەروەها ئەوەی کە لەویٰ بەبیرم دیٰ، دار هەنجیری لێبوون، وەتمانی برام بەرەحمەت بیٰ، دیارە بە نەباڵغیی و بەگچکەیی مردووە، وا پێدەچیٰ نزیکەی شەش ساڵان بووبیٰ، بەلاّم زۆر وریاو ئازابوو، بەبیرم دیٰ دەچووە سەر درەختی هەنجیر،

دەیگوت: عەلی! تۆ وەرە من لەسەرێ بۆت فڕێ دەدەمە خوارێو تۆش کۆیان بکەوە، ئنجا بە منداڵەکانی دەگوت: هەرکەسێك یەك هەنجیری دەست بداتێ چیو چی لێدەکەم، زۆر ئازاو جەربەزە بوو، من دوو سێ ساڵ لەو گچکە تربووم، لە خوارێ بووم، هەنجیرەکانی بۆ بەردەدامەوەو کۆم دەکردنەوە، تا دوایی دەهاتە خوارێ.

❁ یەکێکی دیکە لەبیرەوەرییەکانی ئەوکاتە کە لەبیرمە ئەوەیە کە وەتمانی برامو دوو سێیەکی دیکە لەگەڵ سێ چوار کەسی دیکە شەڕە بەردیان بوو، منیش گچکە بووم، گوتی: تۆ وەرە لەپشتمەوە بووەستە، با بەردت پێ نەکەون، شەڕە بەرد بوو، لەبەرچاومە باش، ئەو بیرەوەرییەم هەرگیز لەبیر ناچێ، بەردێك هاویشترا بەنێوچاوانم کەوت، کە ئێستاش شوێنی ماوە، شوێنەکەی شکاو نێوان هەردوو برۆیەکانم خوێنی زۆری لێهات، منیش دەستمکرد بەگریان، وەتمانی برام کە خوێنی پێوە بینیم، زۆر تووڕەبوو، ئەو کوڕەی دیکەش ڕایکرد، بابیشم کە زانی ئەوە، بەدوای ئەو کوڕەدا ڕایکرد، بەهەرحاڵ ئەو سەرشکانەم لەو قۆناغەدا بەسەر هاتوە.

❁ بیرەوەرییەکی دیکەی خۆشم لەو قۆناغەی تەمەنمدا لەبیرە، ئەوکاتە خەڵك هەژارو نەداربوو، بابم جووتێك جزمەی کڕیبوون بۆ وەتمانی برام، زستان بوو منیش جزمەم نەبوون، منداڵ زۆریان هەر پێخاوس بوون، جا کاتێك وەتمان دادەنیشت، منیش دەمگوت ئەوجار من لەپێیان دەکەم، ئەو دادەنیشتو منیش لەپێم دەکردنو ڕادەوەستام بەپێوە! خەڵك هەژارو نەداربوو، ژیانو گوزەرانیان، ژیانێکی کولەمەرگیی بوو.

❁ ئەوەشم لەبەرچاوەو لەیادە کە ئێمە خەریکی نیوەکاریی بووین وەك پێشتر باسمکرد، بابو باپیرانمان مەللاك بوون، بەڵام بابم کە لەخزمەکانی تووڕە بووەو هاتووەتە خوارێ بەژیانی نیوەکارییەوە خەریکبووە، ئنجا دوو کەسی خاوەن موڵك هەبوون لە (کەنجارە) ناویان (قادری کوێخا حەسەن)یو (قادری کوێخا حەمەد) هەردووکیان بەڕەحمەتی خوا چوون، خوا لێیان خۆشبێ کوڕو کچیان ماون، بابم لەگەڵ خەڵکێکی دیکە لەلای (کوێخا قادری کوێخا حەسەن) بوو، تووتنو زەراعەتیان دەکرد بەنیوەیی، نیوەی بۆ ئەوانو نیوەی بۆ ئەو خەڵکە، دیارە ئەوە زوڵمو ستەمێکی گەورەیە، کابرا ڕەنجی ئەو

سێچوار مانگە بێنیۆ كوێخا لەگەڵی بەشبكات، بۆخۆشی لاقی لەسەر لاقی داناوە، بەشەرتێك پێشم شك نایەت خاوەن موڵك بەهیچ شتێك تێدا بووبێ، تەنیا زەوییەكە هی ئەو بوو، ئنجا ئایا ئەو زەوییەش چۆن بووەتە هی ئەو؟ بەهەرحاڵ پێموانییە هیچ كەس بەزێڕو زیو كڕیبێتی، یان تاپۆ بووبێ، بەلاّم وەزع ئاوابوو، ئەو كاتە ئەوانەی كە ئاغابوونو خاوەن موڵك بوون، لەهەموو شوێنەكان بەهەمان شێوە خەڵك بەنیوە كاریی ئیشیان بۆ دەكردن، ئەوەی كە خاتری نیوەكارەكانی بگرتایە بە سێیەك، واتە دوو بەشی دەدایە ئەوانو بەشێكی بۆخۆی[1].

---

١) بەلاّم خوا فەرموویەتی: ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ...﴿٢٩﴾﴾ البقرة، واتە: وەئەوەی كە لە زەویدایە بۆ هەمووتانی دروستكردوە، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾﴾ الرحمن، واتە: خوا زەمینی بۆ مرۆڤەكان "هەموویان بێ جیاوازیی" داناوە.

# چەند بیرەوەرییەکی
# پۆلی یەکەمی سەرەتایی ساڵی (١٩٦٧)

❋ ئەوکاتەی پۆلی یەکی سەرەتایی بووم، ڕۆژێك مامۆستا ناوی مانگەکانی لەسەرجەم قوتابییەکان پرسی، هیچیان نەیانزانی تەنیا من زانیم و ناوی هەموو مانگەکانم بۆ گوت، مامۆستا پێشتر فێری کردبووین، ئەوکاتە کوڕو کچ تێکەڵاوبووین، مامۆستا ئافەرینی بۆ کردم و گوتی: ڕاستە، نزیکەی (٢٤) قوتابی دەبووین، هەڵسا هەموو قوتابییەکانی فەلاقەکرد، یەکی چوار داری لەبەری پێی دان، ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە زۆرم پێسەیربوو، پۆلی یەکی سەرەتایی و زستانیش بوو!! منیش دوو زللەی لێدام و سوربوومەوە، گوتم: مامۆستا! بۆ لێتدام خۆ من زانیم؟ گوتی: بۆچی لەچاو هەموویان تۆ زانیت، ئەگەر تۆش نەتزانییایە ئەوانەش فەلاقەیان نەدەخوارد؟! پێم سەیر بوو، من بەهەستی منداڵی خۆم پێم زوڵم بوو!

❋ هەر لەبیرەوەرییەکانی ئەو ساڵەم، ساڵی (١٩٦٧) ئەوەیە کە مامۆستایەك ڕۆژێك نامیلکەیەکی هێناو لەبەرانبەریدا یەکی (١٠) فلسیان لێوەرگرتین، نامیلکەکە بەناوی (شێری ساختە) بوو ساڵی (١٩٦٧) بوو، ئەوکاتە شەڕی جەلالیی و مەلایی گەرمبوو، جارێك لێیان پرسیم: لەکەیەوە دەستت بەخوێندنەوە کردوە؟ گوتم: لەیەکی سەرەتاییەوە، گوتیان چۆن؟ گوتم: بڕواتان بێ لەیەکی سەرەتاییەوە ئەو نامیلکەیان کە داینێ، دەستم بەموتاڵا کردوەو ئێستاش هێندێکیم لەبیرماوە، سەرەتاکەی ئاوابوو:

## شێری ساختە

منالینە وەرن راکەن — ئەم دیمەنە تەماشاکەن
گوێدرێژێکی ڕق هەڵساوە — لەتاو ئازار ورووژاوە

ئنجا بەسەرهاتەکەش ئاوابوو: گوێدرێژێك لە دێیەکدا زۆر زوڵمی لێدەکەن، منداڵە وردکە بەردی تێدەگرن، سواری دەبن، داری تێوە دەژەنن و نارەحەتی دەکەن، کە دیارە ئەو بەسەرهاتە دروستکراوە، گوێدرێژەکە زۆر ڕقی لەخەڵکی دێیەکەو منداڵەکانی هەڵدەستێ و لەبەرخۆیەوە بڕیار دەدات کە ڕۆژێك بیانترسێنێ، ئیدی دەچێت بۆ دارستانێك، سەیردەکات لەوێ شێرێك تۆپیوەو کەوڵەکەی دادەڕنێ و بە بەرخۆیدا دەکات، دەڵێ با بچمەوە بۆ ئەو دێیەی کە چەند جارە من ئەزیەت دەدەن، ئەو منداڵە وردکانە تۆزێك بترسێنم، دەچێ بۆ دێیەکەو کەوڵە شێرەکەشی لەبەرکردوە، ئنجا کە بەکۆڵانەکاندا دەڕوات، خەڵکەکە هەموویان دەچنە ژوورەوەو لە پەنجەرەوە سەیردەکەن، بەینێك دێ و دەچێ و منداڵەکان هەموویان خۆ دەشارنەوەو دەڵێن: شێر هات، دوایی دەڵێ: ئنجا مادام هەر تۆقاندوومن، بۆ تۆزێك بەسەریاندا نە نەڕێنم و هەر یەکجاریی زراویان بەرم! کە دەستپێدەکات، دیارە نەڕەی وی زەڕەیە، خەڵکەکە دەڵێن: ئای خۆ ئەوە زەڕەی کەرێییە! ئیدی منداڵ و خەڵك لێی دادەوروکێن و دەڵێن ئەوە کەرە، دەست دەکەن بە لێدانی و کەوڵەکەی لێدادەڕنن و دەبێتەوە بەکەرە تێهەڵدراوەکەی جاران، جا ئەوە من پێموایە تەعلیقێك بوو دەدرا لەوەی کە کەسانێك هەبوون خۆیان کردوە بە شێر، بەڵام لەڕاستیدا شێر نین و سەرەنجام ئاوایان لێدێ، ئەو چیرۆکە تەعلیقێکی سیاسی بوو، بەڵام ئێمە گچکە بووین و وامانەدەزانی کە ئەو بەسەرهاتە ڕاستییە و نەماندەزانی کە ئەوە مەغزایەکی سیاسی لەپشتەوەیە، ئەوە یەکێکە لەبیرەوەرییەکانی ژیانم لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی.

❀ بیرەوەرییەکی دیکەم لەو قۆناغەدا لەبیرە: نەنکم (دایکی دایکم) کە (بەسەخرە)یان پێدەگوت، هەزار ڕەحمەتی لێبێت کە لەڕانیە وەفاتی کرد لەساڵی (١٩٨٢)دا، ئافرەتێکی زۆر بۆ خوا سوڵحاوو خواپەرستبوو، ئەو نەنکەم زۆری خۆشدەویستم زۆر نازی دەدامێ و لەخۆی نزیکدەکردمەوە، لەبیرمە گوڵەبەڕۆژەی دەبرژاندو دەیگوت: ڕۆڵە بچۆ لەسەنگەسەر بیانفرۆشە، گچکەبووم لە پۆلی یەکی سەرەتایی، ڕەنگە لەپێش سەرەتاییش

ئەوەم کردبێ، لەیادمە ئیستیکانی[١] بەعانەیەکم دەدا، عانەیەك پێنج فلس بوو، جارێك گوڵەبەڕۆژەی بۆ برژاندبووم، جوان لەتەشتێکدا هەڵمگرتبوون، کە چوومە (سەنگەسەر) بۆ فرۆشتنیان، ڕەتەڵێکم بردو تەشتە گوڵەبەڕۆژەکەم لێڕژا، ئیدی دەستمکرد بەگریان‌و دوایی کابرایەك هات‌و گوتی: کوڕەچکۆڵ مەگری، بەخوا تازە بەکەڵکی کۆکردنەوەش نایەت، ئنجا پرسی: ئەوە تۆ خەڵکی کوێی؟ گوتم: خەڵکی بەستەستێنم، گوتی هەستە بچۆوە، گوتم: هی نەنکمەو نەنکم بۆی برژاندووم‌و پێیداوم تا بیفرۆشم، کابرا گوتی: بچۆوە "ان شاءَ الله" تووڕە نابێ، بڵێ بەدەستی خۆم نەبووە، بەهەرحاڵ ئەگەر یادەوەریی خۆم هەڵکۆڵم بیرەوەریی دیکەم دێنەوە بیر، بەڵام ئەوەی کە شایانی باس بێ، هەر ئەوشتانە بوون.

١) ئیستیکان: پیاڵەی چایی پێخواردنەوە.

# ماڵ گواستنەوەمان لە بەستەستێنەوە بۆ گوندی (گردی تلێ)

دەوامی قوتابخانە تەواوبوو، ماڵمان لە بەستەستێنەوە گوازرایەوە بۆ گوندی (گردی تلێ) کە لەنێوان هەردووك ناحیەی: (سەروچاوە)و (چوارقوڕنە) دایە، ئەو کاتەش بابم دیسانەوە بەمەبەستی کەسابەتو زەراعەتو فەلاحەت لەگەڵ دوو سێ کەسی خەڵکی دێیەکە چوون بۆ ئەوێو لەوێ دامەزرا، ئەو ساڵە کە دەبوو من لەدووی سەرەتاییبم، پێموایە ئەو کاتە (سەروچاوە) مەکتەبی لێنەبووە، یان نازانم چۆن من لە قوتابخانەی سەرەتایی چوارقوڕنە وەرگیرام! ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێ کەماڵی پوورم لە چوارقوڕنەبووە، واتە ماڵی خوشکی دایکم کە مێردەکەی ناوی (ئەحمەد وەتمان برایم ئاغا) بوو، (ئەحمەد ئاغای کەستانێ)یان پێدەگوت "بەرەحمەت بێ"، ئەویش لەحەفتاکاندا کۆچی دواییکرد، (پوورە خەج)م کە ئێستاش ماوەو خوشکی گەورەی دایکمە، دەیگوت "دایکی تۆم بەگچکەیی بەخێوکردوە، دیارە ئەوان گچکەبوون کە دایكو بابیان مردوون، ئیدی من لە چوارقوڕنە لە ماڵی پوورم دەمخوێند، لەدووی سەرەتایی بووم، لەیادمە زۆر لە مامۆستاکانمان ئافرەتبوونو زۆر خۆشیان دەویستمو دیارییان دەدامێ، چونکە زیرەك بووم ئەو ساڵەش یەکەم بووم، بەڵام هەموو جارێك مامۆستاکان دەیانگوت: ڕۆڵە! بەبابت بڵێ: وەرەقەی نەقڵت بۆ بکات لە قوتابخانەی سەرەتایی سەنگەسەرەوە بۆ قوتابخانەی سەرەتایی چوارقوڕنە، ئەگەرنا ئەمساڵت دەفەوتێ، منیش دەچوومەوە پێمدەگوت، بابیشم دەیگوت: ڕۆڵە مەجالم نیە لەبەر کاروکەسابەت، ئیدی ئەو ساڵەم فەوتا، هەرچەندە یەکەمیش بووم، کەچی بۆم حساب نەکرا! لەبەر وەرەقەی نەقڵ، ئەو ساڵە جارجارە هاموشۆم دەکردو بەپێ لە چوارقوڕنەوە دەچوومەوە بۆ ماڵی خۆمان لەگوندی (گردی تلێ)، تەنانەت جارێك شەوم بەسەردا هات، ڕێگەکەم نیو سەعات دەبوو بەپێ، جۆگەیەکی گەورەم لەڕێ بوو جۆگای (کاکی زێوە)یان

پێـدەگوت، ئێسـتا نـازانم نـاوی چییـە؟ ئـەو جۆگایـە لـە سـەرچاوەی سەروچـاوەوە هەڵبەسترابوو، ئەو ناوچەیەیان پێئـاودێر دەکـرد، لەبیرمـە هـاوینی ئـەو کاتـە کـە ماڵمـان لـە گوندی (گردی تلـێ) بوو، قەلو مریشکمان هـەبوون، دایکـم دەیگـوت: ڕۆڵـە بچـۆ ئـەو مریشك‌و قەلانە بلەوەڕێـنە، ئەوێش ماری زۆری لێبوون، جاری وا هەبوو جوجکە مریشك‌و قەلی گچکە ماری گەورە پڕی دەدانێ‌و دەیخواردن، ئنجا دایکـم دەهـات‌و دەمگـوت: دایـە! ئەوە مارێك جوجکە مریشکەکە، یان جوجـکە قەلەکـەی خـوارد، ئـەویش دەیگـوت: دەی قەیناکـا ڕۆڵە، مادام بۆ خۆت سەلامەت بووی، بەو جۆرە سـاڵێك لـەوێ ماینـەوە، دواتـر ئەوەبوو جارێکی دی ماڵمان گواسترایەوە بۆ ڕانیە، دیارە ئـەوەی کـە باسـم کـرد، لـە سـاڵی (١٩٦٨)دا بوو، کاتێك لە چوارقوڕنە لە دووی سەرەتایی بووم، لەوێ ئەو ساڵەم ڕۆیشـت‌و ساڵی (١٩٦٩) دووبارە لە دووی سەرەتایی دانرامەوە، لە قوتابخانەی سەرەتایی ڕانیـە.

## ماڵ گـوازرانەوەمـان بۆ ڕانیــە

ئنجا هاتینە رانیەو لەویش ماڵی بابم هەر بەکەسابەت و کشتوکاڵی تەماتەو بامیەو باینجانو تووتنەوە خەریکبوون، بەپلەی سەرەکیش تووتن دەکرا، بەو جۆرە هەرساڵەی لە شوێنێك ژیانمان دەگوزەراند، ساڵێك لە ناوچەیەك کە پێیدەگوترێ: (چاکی بەستەهیزە)، ساڵێك لەدەشتی لای گوندی (بۆسکێن) ساڵێك لە (پیاوکوژراوان)، ساڵێك لە (گولەك)، ساڵێك چووینەوە (کەنجارە) لەبەرئەوەی ئێمە زەوی خۆمانمان نەبوو، بابم هەر ساڵە لەشوێنێك و بەسێ یەك و بەنیوەیی کەسابەتی دەکرد، دایکیشم هاوکاریی دەکرد، دیارە من و براو خوشکەکانیشم وردەوردە کە پێراگەیشتین، هاوکارییمان دەکردن، من لە ساڵی (١٩٦٩) لە قوتابخانەی سەرەتایی ڕانیە لە پۆلی دوو دامەزرامەوەو، پۆلەکانی (دوو، سێ، چوار، پێنج)م لەوێ تەواوکرد، بەڵام لە شەشی سەرەتایی نەقڵکرام بۆ قوتابخانەی ئاکۆی سەرەتاییو، پۆلی شەشم لەوێ تەواوکرد.

# باسی خوێندنی سەرەتایی

لێرەدا با تۆزێ باسی ژیانی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی خۆم بکەم: وەك گوتم: من لە قۆناغی سەرەتاییدا هەموو ساڵەکان یەکەم دەبووم، تەنیا ساڵێکیان نەبێ ئەویش وابزانم لە پۆلی سێ، یان لە دوو بووم، یەکێکی دیکەیان کردە یەکەم کە پێموایە کوڕی حاکم بوو، منیان کردە دووەم، بەڵام مامۆستایەکان زۆر خۆشیان دەویستم‌و قوتابییەکانیش بەهەمان شێوە، لەبیرمە زۆر لەباب‌و دایکی قوتابییەکان دەیانگوت: دەبێ ببیتە رەفیق لەگەڵ کوڕەکانی ئێمەو دەرسیان پێبڵێیەوە، هەندێك قوتابی هەبوون تەمبەڵبوون، ئنجا یان من دەچوومە ماڵیان، یان ئەوان دەهاتن، بۆ ئەوەی دەرسیان پێبڵێم، ئەوەی شایانی باس بێ، لە قۆناغی سەرەتاییدا وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، مامۆستایەکان شێوازی زۆر زبریان لەگەڵ قوتابیدا بەکاردەهێنا، بەڵام ئێستا پێموایە بەولادا شکاوەتەوە! ئێستا مامۆستا لێی قەدەغەیە هیچ جۆرە زبرییەك بەکاربهێنێ‌و قوتابی زۆرجار ئیهانەی مامۆستا دەکەن! هەڵبەتە دەگونجێ نەمامۆستا زۆر زبرو توندوتیژبێ لەگەڵ قوتابیدا، نەقوتابیش بێشەرم‌و بێحورمەت‌و بێرێزبێ لە بەرانبەر مامۆستاداو زوڵمی لێبکات، واتە هاوسەنگیی هەبێ، لە یادمە مامۆستایەکان زۆر توندبوون، شووڵەداریان دەهێناو بەقوتابییەکانیان دەگوت: دارمان بۆ بهێنن بۆ لێدانی قوتابی، ئنجا دەبووایە دەستبگریتەوە، جاری واهەبوو ئەگەر قوتابییەك شتێکی وایکردبایە، کە مامۆستا پێیوابێ سەرپێچییەکی زۆر گەورەی کردوە، فەلاقەشیان دەکردو لەبەری پێیاندەدا، ئیدی دەبوو بەزیقەزیق لەو ژوورەدا، من لەخوا بەزیادبێ پێم شکنایەت یەك زللەشم خواردبێ، جگە لەوەی پۆلی یەکی سەرەتایی، ئەگەرنا دەرسەکانم لەبەردەکردو زیرەك بووم‌و سەرپێچییم نەدەکردو، کەیفم بە موشاغەبەو نارێکیی نەدەهات، هەندێك قوتابی هەبوون چەتوون‌و بزۆزبوون، بەڵام من کەیفم بەو شتانە نەدەهات‌و لەگەڵ مامۆستاکاندا بەحورمەت بووم‌و رێزم لێدەگرتن‌و ئەوانیش خۆشیان دەویستم، بەڵام ئەوەی قەت لەبیرم ناچێ، جارێك کۆمەڵێك قوتابی دەرسیان لەبەر نەکردبوو، مامۆستاکەمان ناوی مامۆستا (عبدالله) بوو زۆر بێرەحمبوو، هات هەموو قوتابییەکانی لەسەر یەك کەڵەکە کردو خستنییە سەریەك، ئنجا لەو

کاتەدا یەکێکیان سەری بەر پەنجەرەکە کەوت‌و سەری شکاو خوێنی لـێ‌هات، مامۆستاش زۆر شڵەژاو رەنگی سپی بوو و گوتی: دەنگێ مەکـەن!!

❀ یەکێکی دیکـە لەبیرەوەرییـەکانم، ئەوەیـە کـە لـەپۆلی دوو بـووم، رۆژێـك مامۆسـتایەك هاتەژوورو قسەیەکی لەگەڵ مامۆستاکەماندا کرد کـە دەرسـی پێـدەگوتین، گـوتی عـەلی باپیر! گوتم: بەڵێ، گوتی لەگەڵ مامۆستادا برۆ، منیش گوتم: بۆ کوێ؟ گـوتی: بـرۆ، نەمزانی بۆ چییە؟ گوتم: بەڵێ باش، ئیدی بەرێوە ئەو مامۆستایە پێیگوتم: دەتبەم بۆ پۆلی شەش، ناوی مانگەکان نازانن، ناوی ئەو مانگانەت لێدەپرسم‌و بیانڵێ، ئەگەر دەیانزانی، گوتم: بەڵێ دەیانزانم، ئیدی چووینە ژوورەوەو گوتی: ئادەی ناوی مانگەکان بڵێ، دیارە منیش ناوی مانگەکانم لەبەربوو هەموویانم گوت، مامۆستا گوتی: چـەپڵەیەکی بـەقوەتی بۆ لێدەن، چەپڵەیەکیان لێدا، ئنجا گوتی: بە نینۆکیش چەپڵەیەك بۆ خۆتان لێدەن!

❀ مامۆستایەکی دیکەمان هەبوو ناوی (مامۆستا حەمیدی حاجی کاکەی قەسسـاب) بـوو، بابی لە رانیە قەسساب بوو، بەڵام لەبنەرەتدا خەڵکی کۆیەبوون، ئێستاش مامۆستا حەمید ماوەو کـورێکی بـەناوی (عبـدالکریم) لـەپێش راپـەرین بەدەسـتی رژێـم گـیراو کـوژراو بەرەحمەتی خوا چوو، کە هـەر ئـەو تاقـە کورەشـی هـەبوو، جـا مامۆسـتا حەمیـد لـەنێو مامۆستاکانماندا دیاربوو، پیـاوێکی نوێژکـەرو مسـوڵمان بـوو، هەڵبەتـە نـازانم ئەوانـەی دیکەش رەنگە نوێژکـەر بـووبن، بـەڵام ئـەو مامۆسـتایە دەرسـی دیـنی پێـدەگوتین‌و زۆر لەگەڵمان بەرەحمبوو، لەسەر خۆبوو، ئامۆژگاریی دەکردین، من کاتی خۆی زۆر سوودی رووحییم لەو مامۆستایە وەرگرت، بەنیسبەت نوێژو تاعەتـەوە، ئـەوەی مـن بێتـەوە یـادم لەپۆلی چواری سەرەتاییەوە، بـەپێی وێنەیـەك کـە رەفیقـێکم (سـەلام کـەمال خورشـیدە فەندیی) بە ئیمەیڵ بۆی ناردووم، نوێژم کردوە، ئنجا ئـەو رەفیقـەم گـوتی: فـلان کـەس کاتی خۆی لەو پۆلەی ئێمەدا مامۆستا حەمید حاجی کاکە، نوێژی پێکردین‌و تـۆی کـردە ئیمامان لە پۆلی چواری سەرەتایی، ئیدی من لەو کاتەوە دەستم بەنوێژو تاعـەت کـردوە، بێ ئەوەی باب‌و دایکم پێمبڵێن، هەڵبەتە زۆر پێیان خۆشبوو، بەڵام لـەیادم نیـە راسـتەخۆ پێیانگوتبم نوێژ بکەم.

❁ بیرەوەرییەکی دیکەی ئەوکاتەم ئەوەیە کە ئەو کاتە یاری کەلایانێ (هەڵماتێن) هەبوو، لە پۆلی چواری سەرەتایی کە گچکەبووم کەلایانێم دەکرد لەسەر پارە، ڕۆژێك چوومەوە ماڵێ، گوتم: دایە! بڕیارم داوە لەمەودوا کەلایانێ لەسەر پارە ناکەم حەڕامە، ئنجا دایکم "بەرەحمەت بێ"، دوای ئەوە هەموو جارێك کە ئامۆژگاریی برایەکانم دەکرد عەبدولواحیدو عومەرو ئەبوبەکرو ئیبراهیم، پێمدەگوتن: فلاّن کارە مەکەن! دەیگوت ڕۆڵە گیان! لێیان گەڕێ، دەمگوت: بۆچی دایە؟ دەیگوت: تۆ کاتێك لە سەرەتایی بووی، بۆ خۆت گوتت: من بڕیارمداوە نوێژ دەکەمو کەلایانێ لەسەر پارە ناکەم!

❁ لەیادمە نوێژم دەکردو ئەهلی کشتوکاڵو کەسابەتیش بووین، هەموو جارێك ئەگەر کەسابەتو زەرعاتەکەمان لەنیزیك شار بووایە، دەچووم بۆ مزگەوتی گەورە، بابم دەیگوت: ڕۆڵە چۆن وا دەبێ کەس واناکات؟ دەمگوت: بابە! نوێژەکەم بەجەماعەت دەکەم، وە لەیادمە کە نوێژم دەکردو سەجدەم دەبرد (تات)ێکمان هەبوو لەماڵێ "کە لەهەندێك شوێن (بەردە نوێژی) پێدەڵێن" ئنجا کە زۆر لەسەجدەدا دەمامەوە دایكو بابم پێیاندەگوتم: ڕۆڵە! بۆچی ئەوەندە سەر لە عەرز دەنێی؟ دەمگوت: ئەدی ئەوە نیە مەلا دەڵێ: دەبێ سێ جاران بڵێی (سبحان ربي الأعلى وبحمده)؟! هەڵبەتە بەزۆریی خەڵکەکە نوێژی هاکەزاییان دەکرد، بەبیرم دێ ئەوکاتە هەرچی وەرمگرتبایەو بیانگوتایە: ئەوە ئاوایەو دەبێ وابێ، یەکسەر جێبەجێمدەکرد.

### ئەزموونی تەماتە فرۆشتن:

❁ هاوینان لەگەڵ بابم کشتوکاڵو فەلاحەتو کرێکاریم دەکرد، لە هیچ ئیشێك دوانەدەکەوتم، ئنجا لەگەڵ تووتن دا ئێمە تەماتەشمان ڕەنیو دەهێنا، جاروبار بابم دەیگوت: ڕۆڵە ! ئەو تەماتەیە بەرە بیفرۆشە، کە ئەوەش ئەزموونێکی تازەبوو لە ژیانمدا، تەماتەی بۆ دەکردمە نێو دوو سەبەتەوە، گوێدرێژێکمان هەبوو کەرێکی ڕەشبوو، لێی باردەکردنو دەیگوت: وەرە بۆ خۆشت لەنێو بارە تەماتەکە سواربە، ئنجا بچۆ بیفرۆشە، دەچووم لە زێی دەربەند دەپەڕیمەوە بەقەیاغ، یان جاری وا هەبوو ئەگەر کاروانێك هەبووایە، گوێدرێژەکەم بەتەنیا فێرنەبوو بەئاودا بپەڕێتەوە، دەبوو لەگەڵ گوێدرێژو

ولآغی دیکەدا بڕوات، ئیدی لە گوندەکانی، بەری مەرگە: (سەرسیان)و (بەردەکۆز)و (مەمەندئاوا)و (دێڵێژە)و (قەرەتەپە) دەچووم تەماتەکەم بەگەنم، یان بەجۆدەدا، ئەگەر بەجۆ بووایە یەكو دوو، کیلۆیەك تەماتە بەدوو کیلۆ جۆ، ئەگەر بەگەنم بووایە، سەربەسەر بوو.

❁ یەکەم جار کە بارە تەماتەم برد، پۆلی چواری سەرەتایی بووم ساڵی (١٩٧١)، چووینە گوندی (بەردەکۆز) لەناوچەی (بەری مەرگە)، کە چووینە گوندەکە ئەحمەدی کوڕی خاڵیشم لەگەڵدابوو (ئەحمەد ئیبراهیم ڕەسووڵ)، لەخۆوە چووینە ماڵێك، ژنەکە گوتی: ڕۆڵە! ئنجا دەبێ بانگ بکەنو هاوار بکەن، منیش گوتم: ئەحمەد! تۆ لەمن گەورەتری تۆ بانگ بکە، گوتی من شەرمێ دەکەم، تۆ بانگ بکە، منیش گوتم: ئاخر نازانم بڵێم چی؟ ئافرەتەکە گوتی: بڵێ هۆ وەرنە تەماتان، هۆ وەرنە تەماتان، پاشان گوتی: بچۆ سەر ئەو بانیژەیەی کە بانیژەیەکی[1] نزمبوو، منیش سێ جار لەسەریەك گوتم: هۆ وەرنە تەماتان، ژنەکە گوتی: ئەیەڕۆ وانابێ نا، دەڵێی هەڵشۆیی، گوتم: ئەدی چۆن؟ گوتی: زۆر بەخێرایی وا دەڵێی، دەبێ بڵێی هۆ وەرنە تەماتان، ئاوا بەشێنەیی، پێم وایە دوو سێ جاران لەگەڵ ئەو کوڕە خاڵەمدا چووم، ئنجا دوایی بەتەنیا دەچووم ئەو تەماتەو بامییەو باینجانەم دەفرۆشتن‌و بەگەنم‌و جۆم دەدان‌و دەهاتمەوە، دیارە لەڕووی ماددییەوە فەقیربووین، بۆیە بابم دەیگوت: ڕۆڵە! من بۆمناکرێ تۆ بچۆ، منیش گچکە بووم، زۆر جار ئەوشتانە کە بۆ منداڵەکانی خۆم باس دەکەم، پێیان سەیرە زێیەکی گەورە لێیپەڕییەوەو بچی بۆ دێیەکی نەدیو و نەناسیاو، لەوێ تەماتەی لێبفرۆشی‌و بگەڕێیەوە!! هەڵبەتە خەڵکەکە بارەکەیان بۆ لێدەنام، دەنا بۆخۆم توانای ئەوەم نەبوو، بۆیان قایمدەکردمەوەو بڕۆ، بۆ خۆشم لەنێو بارەکەدا سواردەبووم، ئنجا دایکم هەموو جارێك بەرچنە[2] یەك تەماتەو بامێ‌و باینجانی بۆ دەپێچامەوەو دەیگوت: ڕۆڵە! ئەمە بدە بەماڵە خانە خوێیەکەت، بۆ ئەوەی خزمەتت بکەن، کەچی جاری وا هەبوو چایەکیشیان نەدەدامێ،

١) بانیژە بریتیە لە سەربانی خانوویەکی نزم‌و بچووك.

٢) بەرچنە، سەوەیەکی بچووکە.

هەرچەندە بەرچنەکەشم دەدانێ، بەڵام کاتی ڕۆیشتن ژنەکە دەیگوت: ڕاوەستە با چـایەك لێبنێین! دیارە خەڵکەکەش فەقیربوون، لەوانەیە چاو شەکر نەبووبێ، ئنجـا کـە دەهاتمـەوە دایکم دەیگوت: ڕۆڵە چات خواردووەتەوە؟! دەمگوت: دایە ئافرەتەکە فریـا نەکـەوت، گوتی: با چا لێبنێین، منیش بارەکەم بـۆ لێنرابـوو ڕانەوەسـتام! ئـەویش یـەك دوو قسـەی بەژنەکە دەگوت و دەیگوت: دیارە ماڵێکی ڕەزیل بوون، چۆن چایەکیان نەداوە بەتۆ؟!

## بیـرەوەرییەکی هەرگـیز لەیـاد نەچوو: گەڕانەوە لە کەناری مەرگ :

❁ بیرەوەرییەك کە هەرگیز لەیادم ناچێ، ئەوەیە ڕۆژێك هاتم دوای ئەوەی کە بارە تەماتەکەم فرۆشت و بارە گەنمەکەم هێنا، هاتم بۆ دەم زێ، قەیاغ ئیشی نەدەکرد، هیچ کاروانێکیشی لـێ نەبوو، کەرەکەشم کە کەرێکی ڕەش بوو، عادەتی وابوو فێری پەڕینەوەی ئاو نەبوو، بابم هەموو جارێك پێی دەگوتم: ڕۆڵە! کەرە ڕەش فێری ئاو نیـەو نازانـێ بـەنێو ئاوێـدا بڕوات، ئەگەر لەگەڵ کاروان نەبێ، نەچی بەتەنێ تێی بکەی! منـیش ئـەو ڕۆژە بـەینێکی ڕاوەستام، کەس نەبوو، ئنجا دوایی گوتم: خۆ هەموو جارێك بێرەدا هاتووم بوارێك بوو شارەزای بووم، دیارە ئەگەر بەپێیان بام، ئاوەکە هـەتا ملـم دەهـات، بـەڵام مـن بۆخـۆم سواری گوێدرێژەکە بووم، لەسەر بار، لەنێو فـەردە گەنمەکانـدا، کاتێـك کـە ڕۆیشـتین و تەماشامکرد "ئینسان ئەگەر تەماشای پێش خۆی بکات لە ڕووبـاردا سـەری دەسـووڕێ" هەستمکرد سەرم دەسووڕێ و کەرەکەش فێری ئـاو نـەبوو، تەماشـام کـرد بـەرەو خـوار دەچین، لەجیاتی ئەوەی بەرەو ئەوبەر بچین، ئیدی وردە وردە ڕۆیشـتین، هـەتا گەیشـتمە ئەو شوێنەی کە ئەوپەڕی سنووری بوارەکە بـوو، لـەخوارەوەش گێـژێك هـەبوو، بـەڵام خواو ڕاستان لەوبەرییەوە سێ چوار ترێ فرۆشی جاف، کە دوایی لـێم پرسـین، گوتیـان خەڵکی (خوڕخوڕە)و (یاخیان)ین[1]، لەوبەرییەوە بانگیانکرد، گوتیان: کـوڕە ڕاوەسـتە ڕاوەستە! ماڕاوەرە! ماڕاوەرە! واتە: بێرەدا وەرە! گوتم: چییە؟ گوتیان: تۆ بەرەو خـوار دەچی، منیش گوتم: ئاخر کەرەکەم بۆ ناسووڕێتەوە، گوتیان: ڕاوەستە، یەکیان هـات و

١) (خوڕخوڕەو (یاخیان) دوو گوندی ناوچەی جافایەتی نیزیك (بەری مەرگە)ن.

گوتی: کوڕە تۆ زۆر ڕۆیشتووی! هەتا لەبیرمە کـابرا شەڕواڵەکەشـی دانـاو بەپەلـە هـات گوتی: ڕێشمەکەم بۆ هەڵدە، چونکە من ناوێرم بێمە پێشیٖ‌و ئاو دەمبا، منیش ڕێشـمەکەم بۆ هەڵدا، بەڵام جاری یەکەم بـۆی نەگیرایـەوە، جـاری دووەم بـۆم هەڵدایـەوە، گرتـیٖ‌و ڕایکێشاو گوتی: یەك هەنگاوی دیکـە ڕۆیشـتبای حسـابت دەڕۆیشـت، جـا دوایـی کـە هاتمەوەو بۆ دایك‌و بابم گێڕایەوە، زۆر دڵ تەنگبوون‌و گوتیان: هـەر خـوا تـۆی دایـەوە، بابم گوتی: ڕۆڵە! ئەدی نەمگوت کەرەکە فێری ئاو نیـە؟ گوتم: ئاخر کەسی لـیٖ نـەبوو منیش دەبوو هەر ڕاوەسـتابام لەویٖ، گوتی: نا، جاری دیکە ئەگەر زۆریـش ڕاوەسـتی، شتی وانەکەیٖ‌و هەر بە قەیاغـیٖ[1] بپـەڕەوە.

❁ هەر لەو بارەوە، لەبارەی تەماتە فرۆشتنەوە، بیرەوەرییەکی دیکەم هەیە: وڵاخ کـە مێشـی دێتـیٖ زۆر نارەحەت دەبیٖ، جارێکیان کەرەکەم مێشی هاتیٖ، هەرئەوەندەم زانی خۆی لـە عەرزێداو کەوت بۆئەوەی خۆی بخورێنیٖ، بارەکەشی کە بەسەرەوە بـوو، ئاڵقـا، منـیش منداڵێکی گچکەی کەم تاقەت بووم[2]، ئیدی هەرچەندم کـرد بـۆم هەڵنەسـتایەوە، بۆیـە بەدیاریەوە دەستمکرد بەگریان، هاوین بوو زۆر گەرمابوو، وەك ئێسـتاش نـەبوو سـەیارە هەبیٖ، ڕۆژی چەند سەیارەیەك بەو جادەیەدا هاتباو نەهاتبا، هەر بە پێیانیش ڕۆیشـتن کـەم بوو، لەوانەیە نیو سەعات زیاتر من بەدیار ئەو کەرەوە دانیشتبم، زۆر نارەحەت بووم لـەو بەر سوورەتاوە، ئێسـتاش "سـبحان الله" شـوێنەکە دەزانم کوێیـە، درۆزنـاوێکی لێیـە لـەنێوان (قوڕەگـۆ)و (دەربەنـد)، لـەویٖ بـوو، بـەبینێك بـەدیار کەرەکـەوە دانیشـتم، هەرئەوەندەم زانی کابرایەکی عەسکەر پەیدا بوو، پیاوێکی سوورو سپی، گـوتی: کـوڕە چکۆڵ ئەوە بارەکەت لـیٖ‌کەوتوە؟ گوتم: بەڵیٖ، گـوتی: ڕاوەسـتە! ئێسـتا بـۆت چـاك دەکەم، گوتی: من بارلێنان باش نازانم، پێم بڵیٖ چـۆن بارەکـە قـایم بکەمـەوە؟ گـوتم: باشە، کەرەکەی بۆم هەڵساندەوەو دوایی بارەکەی کردەوە، ئنجـا گـوتی: مـن یـەکیٖ لـە گونییە گەنمەکان هەڵدەدەمە سەر پشتیٖ‌و تۆ بۆم بگرە، هەتا ئەوەی دیکـەش دێـنم، ئیـدی

١) قەیاغ: پردێکی گەڕۆکەو بەسیمێکی قایم لەوبـەر ئەوبـەری ڕووبـار دەبەسـترێتەوەو، سـەییارەو وڵاغ‌و بـاری قورسی پیٖ دەپەڕێنرێتەوە.

٢) ئەو کاتە پۆلی چوار یان پێنجەمی سەرەتایی بووم.

بەهەر حالّ منیش تۆزێك بۆم گرت‌و هاوكارییم كرد، بەلاّم ئەوە نەبوو بتوانم بار لێ بنێم، دوایی گوتم: ئەدی جەنابت بۆ كوێ دەچی؟ گوتی: دەچمە ئەو شاخە، پیاوێكی زۆر باش دیاربوو، جا دوایی دایكم دەیگوت: ڕۆڵە! بە خوا ئەوە خدری زیندە بووە، هەرچەندە من بڕوام بە خدری زیندە نیە، بەلاّم سەیر نیە جندێكی مسوڵمان بووبێ، یان فریشتەیەك بووبێ، بەهەرحالّ، دوایی كە ئاوڕم دایەوە، لەبەرچاوم دیار نەما، ڕەنگە سەربازێكیش بووبێ، چووبێتەوە چیا بۆ ڕەبایە، گرنگ ئەوەیە ئەو كابرایە لەفریام هات، هەركەسێك بووبێ خوا پاداشتی بداتەوە.

❁ بیرەوەرییەكی دیكەشم ئەوەیە كە لەبیرمە چاوم دەئێشا، ئەوكاتە چاو ئێشە زۆر بوو، شەوێ دەبوو تووتنمان ڕنیبایە، جا من لەبەرئەوەی كە چاوم دەئێشا، كە چاوم بە تیشكی (لۆكس) دەكەوت، زۆر نارەحەت دەبووم، ئیدی شەوێ لەبەر لۆكس تووتنمان پێوە دەكرد تا درەنگی شەوێ، پاشان دەبوو تووتنمان لێ كردبایەوە، بۆ ئەوەی بۆ بەیانی بە سووژن‌و داویەوە بكەین، ئیدی بۆ تووتن بە سوژنەوە كردن‌و ڕنین، دەبوو لە تاریكێ بم، ئنجا بەیانی زوو تاریك‌و ڕوونی بەیانی دەبوو هەڵسم بارە تەماتەیان بۆ ساز دەكردم‌و دەڕۆیشتم، جارێكیان لەنێوبارەكەدا خەوتبووم، دایكیشم ئافرەتێكی زۆر بەڕەحم بوو "هەزار ڕەحمەتی لێ بێ" سۆزو ڕەحمێكی تایبەتی هەبوو، دەیگوت: ڕۆڵە! هەموو جارێك تا تۆ دێیەوە، هەر تەماشای ڕێگا دەكەم بزانم كەی دەگەڕێیەوەو دەردەكەوی، ئنجا وەختێك گوێدرێژ دەردەكەوێ بە بارەوەو منیش دیارنیم، چونكە لەنێو بارەكەدا خەوتووم، دایكم گوتبووی: باپیر! ئەوە عەلییشمان ڕۆیشت! ئەوە كەرە ڕەش هاتەوەو بارێكی پێوەیەو عەلی بەسەرییەوە دیارنیە، وەختێك بەرەو پیرەوە هاتن، بە دەنگە دەنگی ئەوان خەبەرم بوویەوەو هەڵسام‌و گوتیان: ئەوە ماوی؟ گوتم: بەڵێ، زۆر خەوم هات‌و خەوم لێكەوتبوو!

## بێستانەوانیی‌و كاڵەك فرۆشتن:

❁ هەروەها هەر لەو قۆناغەی تەمەنمدا ساڵێكیش بوومە بێستانەوان، ماڵی خاڵم (خاڵ برایم) كە ئەوكاتە هەر لە (بەستەستێن) بوون، بێستانی كاڵەكیان كردبوو، لە بانووێكی خوار

جادەی سەنگەسەر قەلادزەو ئاقار پردی سەر ڕووباری بەستەستێن، ئەوکاتە پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم، تەنیا کارم ئەوەبوو چاودێریی بێستان بکەمو نەهێڵم وڵاخی بێنە نێوو زەڕی بکەن، یان خەڵکی ڕێبوارو نەناسیاو کاڵەکەکان بڕنیو بەبێ پارەوکڕین بیانبات.

هەندێك ڕۆژانیش بارەکاڵەکێکیان بۆ لەکەرێك دەنامو دەمبردە هەندێك گوندو لادێی نیزیكو بەگەنمو جۆ دەمفرۆشتو ئێوارە بەبارە دەغڵەوە دەگەڕامەوە.

❀ جارێکیان لەگوندی (بارەپانە) پیاوێك هەندێك گەنمی هێناو، خستیە تای تەرازوویەکەوەو، تا تەراوزووەکەی دیکەشی پڕ کرد لەکاڵەك، بەلام بەجۆرێك تەرازووەکەی گرتبوو کە تاتەرازووی کاڵەکەکان لەسەریو هی گەنمەکە هەر لەخواری بوو! منیش سەرەتا سەرم سوڕما، بەلام کەسەرنجی دەستیمدا، فێڵەکەیم زانیو پێمگوت: ئەگەر تەرازووەکەم پێ نەدەی کاڵەکت پێنافرۆشم! ئەویش گوتی: ئاخر تۆ ناتوانی تەرازووەکە بەرز بکەیەوە، گوتم: با دەتوانم، ئیدی سەرەنجام سێ چوار کاڵەکم لە تەرازووەکە فڕێدان، کە بە حسابی وی هەندێکی دیکەش مابوون!

ئنجا وەك گوتم: هەموو ئەو کارو کەسابەتانەی کە بابم دەیکردن "هەزار ڕەحمەتی لێ بێ" لەگەڵ دایکمو بابم هەر پێکەوە بوونو منیش کەسابەتم لەگەڵدا دەکردن، جا بەزۆریی دروێنەو کێشەو گێرە هاوینان هەبوو، دوایی کشتوکاڵی دی، وەك گوڵەبەڕۆژەو تووتنو تەماتەو بامیو باینجانو... هتد، لە هیچ ئیشێکیش دوانەدەکەوتم: ئەوکاتە جاری وا هەبوو بابم "هەزار ڕەحمەتی لێ بێ" کە ئەرکە گەورەکە لەسەرشانی ئەو بوو، ڕەمەزان دەهات بەڕۆژوو نەدەبوو، من هەر بەڕۆژوو دەبووم، دەیگوت: ئاخر ڕۆڵە ڕۆژووت بۆ ناگیرێ، یان ئیشەکەت بۆ ناکرێ، دەمگوت بابە! وردە وردە بۆم دەکرێ، با ڕۆژووەکە نەفەوتێنم، زۆریش ماندوو دەبووم، لەبیرمە بەڕۆژوو دەبوومو دروێنەی برنج (مەرەزە)م دەکرد، لەگەڵ بابم دەچوومە کرێکارییو بناغەی عەموودم هەڵدەکەند، لە قەراغ جادەی ڕانیە ـ دەربەند بەڕۆژووش دەبووم، جا ئێستا زۆر جار کە کرێکاران دەبینم، دەڵێم: براینە! برای خۆشتان وەختی خۆی کرێکاریی کردوە تا ئێواریو بەڕۆژووش بووە، بەهاوینو لە ڕەمەزاندا ئیش بکەیو بەڕۆژوو بی، بەڕاستیی زۆر قورسە، بەلام خوای

بەبەزەیی تەوفیقت دەدات، ئینسان ئەگەر هیممەتی کردو عەزمی لەسەر ئیشێك جەزم بوو، خوای میهرەبان بۆی ئاساندەكات.

❁ بیرەوەرییەکی دیکەی ئەم قۆناغەی تەمەنم لەگەڵ دایکم (بەرەحمەت بێت)، ئەوەیە ڕۆژێکیان دایکم نەخۆش بوو، گوتی: ڕۆڵەگیان! بچۆ لەسەنگەسەر کیلۆیەك هەناری ترشم بۆ بێنە، لەگەڵ (عەبدوڵلا)ی خاڵۆزات پێکەوە بچن.

ئەوکاتە هاوین بوو لە ڕانیەوە چووبووینەوە بۆ گوندی (کەنجارە) بۆ کشتوکاڵ، پۆلی سێی سەرەتایی بووم، پێکەوە چووین بۆ سەنگەسەرو پرسیارمان کرد دووکانێکمان دۆزیەوە هەناری هەبوو، دووکاندارەکە پرسی ڕۆڵەگیان! هەناری ترشتان دەوێ یان هی شیرین؟ ئێمەش تەماشای یەکدیمان کردو گوتمان: وەڵلا هەناری شیرین خۆشترە، هی شیرینمان دەوێ! وەك بڵێی هەنارەکان بۆخۆمان بکڕین نەك بۆ دایکم! دیارە کیلۆ هەنارەکەمان برد، چونکە تامەزرۆی هەنار خواردنیش بووین، کیلۆ هەنارەکەمان بە نیوەیی کرد هەتا گەیشتینەوەو، کە گەیشتینەوەش وەك دیارییەکی گەورەمان هێنابێتەوە، گوتم: دایە! هەناری شیرینمان بۆ هێناوی! دایکیشم پێکەنیو گوتی ڕۆڵە! ئەدی نەمگوت هەناری ترش؟ منیش گوتم: ئاخر هی شیرین خۆشترە.

❁ بیرەوەرییەکی دیکەشم لەگەڵ بابمدا (هەزار ڕەحمەتی لێ بێ) ئەوەیە کە بابم هەتا بڵێی بۆ هەموو جۆرە کارو کاسبییەك ئازاو دەستگەرم بوو: دروێنە، پاچکاریی، زەوی کێڵان، بلۆك بڕین، تووتنەوانیی، کرێکاریی ... هتد، دیارە منیش کەمو زۆر هەر لە خزمەتیدا بووم ... ئنجا ڕۆژێکیان لە بناری چیای کێوەڕەش پێکەوە دروێنە (درەو)ی گەنممان دەکردو یەکجار گەرماش بوو، منیش کە بابم ئاوا بە ئازاو دەستگەرم بینی، حەماسەتم جووڵاو باش خۆمم ماندووکرد، کە بە حیساب وەك بابم پەرێزم دیاربێو هەموو لەشم لە ئارەقدا شەلاڵ بوو بوو، ئنجا لەکاتی پشوودانا کە بەرەو لای کەپرەکەمان دەچووینەوە، تەماشایەکی پەرێزی خۆمم کردو گوتم: بابە! منیش پەرێزم دیارە؟ ئەویش گوتی: پیاو خشپە خشپێکی لە تەنیشت هەبێ هەر باشە!

# چەند بیرەوەرییەکی نێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٧٣)

ئنجا با هەندێکی دیکەش لە بیرەوەرییەکانی ئەو قۆناغەی تەمەنم لە (١٩٦١) تاکو (١٩٧٣)، بخەمەڕوو:

❁ دیارە من زۆر دڵخۆش دەبووم کە هەموو ساڵێك لەخوێندن یەکەم دەبووم، مامۆستایەکان دیارییان دەدایێ، جارێك مامۆستایەك پاندانێکی جوانی پێ بوو، دەرسی مێژووی پێ دەگوتین، ناوی مامۆستا (حەمەد ئەمین) بوو گوتی: ئەمجارە (٩٠) پلە بێنە، ئەو پاندانەت دەدەمێ، هەموو جارێك (٩٠)م دەهێنا، سەری مانگ گوتی: (٨٩)ت هێناوە، هەر بۆ ئەوەی پاندانەکەم نەداتێ، (٨٩)ی بۆ دانابووم، منیش بۆخۆم دەمزانی پاندانەکەم بۆخۆم ڕەواکردوە، گوتم: مامۆستا! باشم وەڵام داوەتەوە، بەڵام دیارە مامۆستا پاندانەکەی خۆش ویستوە، یان زانیویەتی ئەگەر بیشیداباما یە ئیستیفادەم لێ نەدەکرد، ئەو پاندانە بۆ مامۆستا باش بوو، بەڵام چونکە گفتی پێدابووم، وامدەزانی ستەمی لێکردووم!

❁ لەیادمە دوای ئەوەی کە گوازراینەوە بۆ قوتابخانەی ئاکۆ، هەموو قوتابییەکانیان کۆدەکردەوەو سروودیان پێدەگوتن، بەزۆریی منیان دەردەهێناو دەیانگوت: وەرە شیعرمان بۆ بڵێ، منیش ئەو شیعرەی بێکەسم دەگوت کە سەرەتایەکەی ئاوایە:

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختی بەندیی و ئەسارەت، پێ بە تەوق و کۆتەوە

تا کۆتاییەکەی، کە دەڵێ:

شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خوا دەستم بدا
دوژمنت پەتکەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە

هەموو جارێك دەیانگوت: ئەو شیعرەمان بۆ بڵێ، منیش بـۆم دەگـوتن و چـەپڵەیەکی توندیان بۆ لێدەدام، ئیدی بەو شێوەیە قۆناغی سەرەتاییم گوزەراند.

❁ حاڵەتی فیکرییم: عەقیدەو ئیمان و تێگەیشتنم لەئیسلام، هەر حاڵەتێکی فیطـریی هـەبوو، هاموشۆی مزگـەوتم دەکـرد، وردە وردە رەفاقـەتی فـەقێ و مامۆسـتایانی و حوجرەکـانم دەکـرد، بـەهۆی هاتووچـۆی مزگەوتـەوە هێـدی هێـدی هەنـدێ ئـەدەبی ئیسـلامەتیی و کۆمەڵایەتیی و شتی دیکە فێربووم لە مامۆستایان، زۆر گوێم بۆ مامۆستایان دەگرت، ئـەو کاتەش حاڵەتەکەم وابوو هەر شـتێکم وەرگرتبایـە، یەکسـەر لـە مێشـکمدا تۆمـاردەبوو، ئەوەشم لەبیرنەچێ من عاشقی کتێب بووم هەر لەقۆناغی یەکی سەرەتاییەوە، هەمیشە کـە بابم دەچوو بۆ بازاڕ، دەمگوت: بابـە! فـلآن کتێـبم بـۆ بکـڕە، ئـەو کتێبانـەی ئـەوکاتی باوبوون (حەیدەرنامە، میعراج نامە، مەولوود نامە، مەنیجەو بیـژەن، ئـەمیر ئەرسـەلان، ڕۆسـتەم و زۆراب)، جـا دایکـم دەیگـوت: ڕۆڵـە! وەرە بۆمـان بخوێنـەوە، منـیش بـۆم دەخوێندنەوە، جاری واهەبوو کە کتێبەکە نوسخەی کەم بووایە، دەمنووسییەوەو کتێبەکەم نەقڵدەکرد، لەبەرئەوەی ئەوکاتە کتێب زۆرکەم بوو، حاڵـەتی ڕۆشـنبیریی و کلتـووریی و خوێندنەوە بێهێزبوو.

## هەڵسوکەوتـی کۆمەڵایەتییـم:

✪ بـە سروشـت ئینسـانێکی کۆمەڵایـەتیی و تێکـەڵبووم، لەگـەڵ قوتابیـانی قوتابخانـەو هاوپۆلەکانم، لەگەڵ منـداڵانی گـەڕەك، ئێسـتاش هاموشـۆم لەگـەڵ هەندێکیانـدا هـەر بەردەوامە، ئەوکاتە ماڵمان لە گەڕەکی (قولە) بوو لەڕانیـە، مـن تـا دەربـەدەر بـووم هـەر لەماڵی بابم بووم لە گەڕەکی قولە، هەتا تووشی ئاوارەیی و دەربەدەریی بووم، هـەر لـەوێ بووم، جا زۆربەی ڕەفیقەکانی سەردەمی منداڵیم خەڵکی ڕانیەن، هەندێکیان ئیسلامیین و هەندێکیان هەڵگری فیکرەی دیکەن، بەلآم ئێستاش خۆشەویستیی زەمانی منداڵیی، یاخود ڕەفاقەت و وەفام لەگەڵ پاراستوون، لە هەر شـوێنێك بـن ئێسـتاش هاموشـۆیان دەکـەم و کتێبیان بۆ دەنێرم، پەیوەندیی تەلەفۆنیی لە نێوانـماندا هەیە.

✪ بە منداڵیی هەڵسوکەوتم سەلامەت بوو، شەڕەنگێز نەبووم، بەڵام زوڵمم قبووڵ نەدەکرد، لەبیرمە دوو سێ جار تووشی شەڕبووم، جارێك دووبرا بوون ویستیان لێمبدەن، منیش بۆکس خەنجەرێکم پێبوو، ئەو کاتە گچکە بووم، سەری یەکێکیانم شکاند، ئنجا ئەوکاتە ﴿یەکێتی لاوان﴾ هەبوو سەر بە پارتی بوو، پێموایە ساڵی (١٩٧١)، یان (١٩٧٢) بوو هاتن، منیش بۆکس خەنجەرەکەمدا بەکورە خاڵەکەم (عبداللە) کە ئێستاش لە ژیاندا ماوە، گوتم: ها هەڵیگرە، دوایی هاتن گوتیان: کوا چیت لە بۆکس خەنجەرەکە کرد؟ گوتم: لەلام نیە، هەندێك لەمنداڵەکان گوتیان: بەو کوڕەیدا، پێیان گوت: کوا؟ گوتی: ئەوەتا، گوتم: ئەوە بۆچی پێتدان؟ ئیدی بۆی نەشاردرایەوە، دوایی گوتیان: بابە منداڵن و دوایی ئاشتدەبنەوە، گوتم: ئاخر ئەویش گازی لێگرتووم، منیش بۆکسێکم لێداوەو لەتاو دەستی خۆم لێمداوە، بەکورتیی: شەڕم نەدەکردو شەڕەنگێز نەبووم، بەڵام زوڵمیشم قبووڵنەدەکرد.

✪ جارێکی دیکەش بەهەمان شێوە شتێکی وا بوو، ئەویش یەکێ بوو لە منداڵەکانی گەڕەك دوو برا عەزیەتیان دام، منیش دوایی بە تەنیا تۆڵەی خۆم لە یەکیان کردەوەو لێمدا، دوایش کە پاڕایەوە، گوتم: باشە، بەڵام جارێکی دیکە هەڵەی وا دووبارە نەکەیەوە.

## یاریی و گەمەو عادەتی منداڵانە:

یاریی تۆپ تۆپێنیشم دەکردو یاریچییەکی تیمەکەی خۆمان بووم، لەگەڕەکەکەی خۆماندا یاریمان دەکردو، جار جارەش لەگەڵ گەڕەکەکانی دیکەدا یاریمان دەکرد، هەروەها دەچووین بۆ شاخی کێوەڕەش (دۆڕیێو ڕێواس و چەقالە بادەم)مان دەهێنا لەگەڵ ڕەفیقەکانم، جاری واش هەبوو، هەندێك لەهاوەڵەکانم هەندێك شتی سەیرۆکەیان دەکرد، بۆ نموونە: بەدوای سەگە خوێڕی دەکەوتن، بەڵام من عادەتی خراپم نەبوون، سوپاس بۆ خوا، خوا پاك ڕایگرتبووم، ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە زۆر سوپاسی خوا دەکەم، بەبیرم دێ منداڵ دەچوون شتی خەڵکیان دەدزی، منیش دەمگوت: ئەوە مەکەن حەرامە، هەرگیز نەدەچووم کاڵەك و شووتی لە بێستانی خەڵك و، میوە لەباخی خەڵك بێنم، بەسروشت کەیفم بەو شتانە نەدەهات، جنێودان و گەمەو یاریکردن بەخەڵك، ئەو عادەتە منداڵانەی کە دەکرێن، مەگەر

چۆن ئەگەرنا نایەتەوە یادم ئەو رەفتارانەم کردبن و، رەفیقەکانی گەڕەك و شارو قوتابخانەشم شایەدن، بەلاّم هەڵبەتە لە ڕوانگەیەکی دینییەوە نا، چونکە ئەو کاتە منداڵبووم و شارەزاییەکی ئەوتۆم لە ئیسلام نەبوو، بەس هەر وەك حاڵەتێکی سروشتیی و فیطریی، کەیفم بەوجۆرە رەفتارانە نەدەهات، رەفیقەکانیشم بەزۆریی ئینسانی رەوشت جوان و پاك بوون، ئەوانەی کە شەڕەنگێزو خراپەکاربوون، کەیفم بە چارەیان نەدەهات و تێکەڵییانم نەدەکرد.

## هەڵسوکەوتی نێو خێزان :

❁ لەنێو ماڵی خۆماندا، چونکە من کوڕی گەورەی ماڵێ بووم، بۆ هەموو شوێنێك لەدوای بابمەوە بووم، بۆ هەموو کارو کەسابەتێك، لەبەرئەوە دوای بابم بەسەرپەرشتیاری خێزان تەماشادەکرام، لەگەڵ دایکم بەرەحمەت بێ و لەگەڵ خوشکەکانم و برایەکانیشم، منافیسم نەبوون، تاکو لێیان بدەم، بەڵکو ڕەحم پێدا دەهاتن، شتم بۆ دەکڕین، ئێستاش وێنەی ئەوکاتەم ماوە کە ئەبوبەکرو ئیبراهیمی برام هەردووکیان دەیانگوت: رۆژی جەژن بووە یەکی دەسکە نێرگزێکیان پێیە هەردووکیانم لەباوەش گرتوون، منیش گچکە بووم لە یەکی نێوەندیی بووم، سەرو دەسکە نێرگزم بۆ کڕیون و هەردووکیانم لەباوەش گرتوون، لەگەڵ دایکیشم "بەرەحمەت بێ" زۆر هاوکاربووم، دایکم کە دەچوو بۆ سەردانی خزمان، منداڵەکانم بۆ هەڵدەگرتن و لەباوەشم دەگرتن، دەیگوت: ئاخر ڕۆڵە ناتوانی! دەمگوت: نا، قەیناکات هەڵم دەگرتن و لەباوەشم دەکردن، چونکە لە هەموویان گەورەتر بووم، مەگەر یەکێکیان سەرپێچییەکی کردبایە، یان لە قسەی بابم و دایکم دەرچووبانایە، ئەگەرنا باشترین پەیوەندییم لەگەڵیان هەبوو، ئێستاش هەروایین.

❁ پێم شك نایە بابم و دایکم لێیان دابم، بەلاّم یەك جار بابم لێم تووڕە بوو ڕامکردو نەیتوانی بمگرێ، ئەویش خەتای خۆم نەبوو، بابیشم نەیزانی کەوایە، گوتی: وەرە ڕۆڵە ئەو پارچە تووتنە ئاوبدە، گوتم: بەڵێ بابە، لاّم و جیمم نەبوو لەگەڵ بابم و قەت (نا)م نەبوو، بەهەرحاڵ تووتنم ئاو دەدا، نیوەڕۆیان خەڵك کە تووتن و تەماتەو زەرعاتەکەیان ئاودەدا، ئیسراحەتیان دەکرد، ئاوەکان پێکەوە بەشاجۆگەدا بەردەدرێنەوە، جووتیارەکان هەرکامیان ئاوەکەی خۆی دەگرێتەوەو دێتەوە نێو جۆگەی سەرەکیی و ئاو زۆر دەبێ، هەر ئەوەندەم

زانی ئاوێكی زۆرم بەسەر گەڕا، قرچەی نیوەڕۆ بوو، ئەوكاتە پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم هاوینی ساڵی ١٩٧٢ز بوو، لە نیزیك بۆسكێن تووتنمان كردبوو، ماڵی مامۆستا حەسەن بابەكریش هەر لەو دەوروبەرەبوون، ئیدی هەر ئەوەندەمزانی ئاوێكی زۆرم بەسەر گەڕا، بۆم چار نەدەكرا، ئاو كە زۆربوو بەسەر دێراوەكان دەگەڕێ، ئنجا كە ئاو بەسەر دێراوەكان دەگەڕێ، دوایی بژار پەیدا دەكات، بابیشم گوتی: ئەوە بۆچی ئاوا؟ منیش ئەوە بێلْ هەڵدەسووڕێنم ئاوم بۆ چار ناكرێ، شوێن نیە ئاوەكەی پێدا بەربدەمەوە، گوتم: بابە! بەدەست خۆم نیە، گوتی: ئەو هەموو ئاوەت بۆچی بەرداوەتەوە؟ گوتم: بابە! من بەرمنەداوەتەوە، ئیدی بابم تووڕە بوو، بەكەستەكە گڵان كەوتە سەرمو دوو كەستەكی پێداداەو ڕامكرد، بەڵام پێمنەكەوتن، دوایی كە زانی خەتای من نەبوو، پەشێمان بووەوەو گوتی: ڕاست دەكەی، ئیدی دوایی ئاشتبووینەوە، ئەگەرنا پێم شك نایە بابم لێی دابم، بابم لەگەڵ منداڵان زۆر خووی نەدەدانێ، عادەتی وابوو، دایكم "بەرەحمەت بێ" بە موبالەغەو گلەییەوە پێی دەگوت: باپیر! تا ئێستا ئەو منداڵانەت ماچ نەكردوون! بەڵام بابم لەگەڵ من زۆر پەیوەندییەكی تایبەتیی هەبوو، بەگچكەیی هەر پێی دەگوتم: مامە سوورەی بابی خۆی، زۆر لوتفی لەگەڵم هەبوو، ئەوەشم لەبیرنەچێ باسیبكەم: دایكم "بەرەحمەت بێ" دەیگێڕایەوەو دەیگوت: ڕۆڵە! بەخێوكردنت زۆر سەهل بوو، بە چیلكەیەكەوە خۆت دەخافڵاند تا ئێوارێو ئەركت نەبوو.

❁ لە دوای خۆم خوشكە ئایشێم بوو، ئەو كاتە من هەر لە پەیمانگای ئیسلامیی بووم لە شاری سلێمانی دەمخوێند، كە خوشكە ئایشێم شوویكرد بە كاك ئەحمەدی زاوامان، كە ئێستا لە ژیانداو كۆمەڵێك خوارزامان هەن، دوای ئەو خوشكە مریەمم، دوایی كاك عەبدولواحید، ئنجا عومەری برام بەرەحمەت بێت، ئنجا ئەبوبەكر ئنجا ئیبراهیم، پاشان قەدەم خێری خوشكم، كە سوپاس بۆ خوا لەگەڵ هەموویاندا باشترین پەیوەندییمان هەبووەو هەیە، بایی ئەوەندەی كە لێم زانیبێ وەك خوشكو برا ڕێزم دەگرتنو بەزەییم پێدادەهاتنەوە، ئەوانیش ڕێزی منیان دەگرتو منیان زۆر خۆشدەویست، ئەگەر دیار نەبوومایە، زۆر نارەحەت دەبوونو دەیانگوت: دەبێ كاكمان لەكوێ بێ؟ ئێستاش سوپاس بۆ خوا هەربەردەوامین لەسەر ڕێزو خۆشەویستییمان.

## خاڵ حوسـەینی حیکـایەتخوان :

بەپێویستی دەزانم بەرلەوەی قۆناغی تەمەنی منداڵییم بەجێبهێڵم، ئاماژە بەوە بکەم کە لەڕووی فراوانبوونی ئاسۆی بیرو زەینمەوە، لەساڵانی سەرەتای تەمەنمدا، بەتایبەت پێنج ساڵان تاکو دوازدە ساڵان (٥ ـ ١٢) سوودی زۆرم لە خاڵێکی دایکم بینی، کە ناوی (حسین) بوو بە حوسەینی ئەحمەدە قیت ناسرابوو، ئێمە هەر پێمان دەگوت (خاڵ حوسەین).

خاڵ حوسەین حیکایەت خوانێکی ناودارو زەبردەستبوو، کە بەشێك لەحیکایەتەکانی بەشیعرو بەشێکیشی بەپەخشان دەگێڕایەوەو کۆڕو مەجلیسی وا گەرمدەکرد، کە هیچ کەس نەك هەر قسەی نەدەکرد، بگرە کۆکەو پژمینیشی نەدەکرد، مەگەر بە دەنگی کپو نزم.

شایانی باسیشە حیکایەتەکانی خاڵ حوسەین هەیانبوو بەشەوێك تەواو نەدەبوو، ئەوەی دەمایەوە بۆ شەوی دووەمو سێیەم هەڵدەگیرا.

دیارە منیش زۆرباش گوێم دەگرتو حیکایەتەکانیشم لەبەردەکردو، ئێستاش هەندێکیانم هەر لەبیرە، مەگەر چۆن دەنا باسی دێوودرنجیان هەر تێدابوو، بەتایبەت (دێوی ڕەش)، هەروەها (دلۆپیا)ی بەحریی، کە بێگومان ئەوکاتە هەموو حیکایەتەکانم بەشتی ڕاستو واقیعیی دەزانین، نەك خەیاڵو ئەفسانە.

هەزار ڕەحمەت لە خاڵ حوسێن بێو خوا لێی خۆش بێو، هەتا بڵێی پیاوێکی قسەخۆشو ڕوو خۆشبوو، دەتوانم بڵێم: بۆ ئەو ڕۆژگارە کەلێنی رادیۆو تەلەفزیۆنی ئەم ڕۆژگارەی بە باشی پڕکردبووەوەو، منیش لەڕووی فراوانبوونی زەینو بیرو خەیاڵەوە، سوودی زۆرم لێبینیو ئەویش لەگەڵ منو کوڕە خاڵو کوڕە پوورەکانیشمدا یەکجار ڕووخۆشو بە لوتف بوو.

## بەهرەمەندبووم لە ڕووی چاوکرانەوەو کاروکەسابەتو پشت بخۆبەستنەوە :

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم، کە لەم قۆناغەی تەمەنمدا قۆناغی سەرەتایی، هەورەها لە قۆناغەکانی دیکەی تەمەنیشمدا، سوودێکی زۆرم لەوە وەرگرتوە کە بابم "هەزار ڕەحمەتی لێبێ"، بۆ هەموو ئیشوکارێکی لە خزمەت خۆیدا دەیبردم، چ فەلاحەتیی بووایە، وەك: دروێنەو کێشەوگێرەو کاکێشان، چ کشتوکاڵ بووایە، بە هەموو جۆرەکانییەوە: کردنی

تووتن، تەماتەو بامییەو باینجان، گوڵەبەڕۆژە، کونجی، کاڵەك‌و شووتی، هاروێ‌و ترۆزیی، گەنمەشامیی... هتد، چ دارهێنان بووایە لە چیا، چ گەڵاهێنان بووایە، چ کرێکاریی بووایە بە هەموو جۆرەکانییەوە، پاش هەراشبوونم، پێش باڵغبوون‌و دوای باڵغبوون.

کە دەتوانم بڵێم، ئەو بەهرەمەندبوونەم لە ئیشکردن لە خزمەت بابمدا، لە چەند ڕوویێکەوە بوو:

١- فێری کاروکاسبیی بوون‌و پشت بەخۆبەستنم و لەسەرپێی خۆم وەستانم، لەقۆناغەکانی داهاتووی تەمەنمداو بەچۆکدا نەهاتن لە بەرانبەر نەداریی‌و بێپارەییدا، وەك دوایی باسی دەکەم، خوا پشتیوان بێ.

٢- چاوکرانەوەم لە ڕووی چۆنییەتی ژیان‌و گوزەرانی چین‌و توێژە ماندوو مجرۆو گرفتارەکانی کۆمەڵگەوە، وەك جوتیارو کرێکارو کاسبکارە جۆراوجۆرەکان.

٣- نەبوونی بۆشایی (فراغ)و دەستبەتاڵیی، کە بێگومان بۆشایی‌و بێ ئیشیی لە هەموو قۆناغەکانی تەمەندا، زیانی زۆری هەیە، وەك یەکێك لە خواناسان گوتوویەتی: (النفس إن لم تشغلها بالحق شغلتك بالباطل) واتە: نەفس ئەگەر بە هەقەوە سەرقاڵت نەکرد، بەناهەقەوە سەرگەرمت دەکات.

٤- فێربوونی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لەبەرانبەر ماڵ‌و خێزانداو بەخێوکردن‌و بژیو بۆ پەیداکردنیان‌و مشوورلێخواردنیان.

٥- دڵخۆشبوون بەوەی کە ڕەنجێك دەکێشریێ‌و هەوڵێك دەدریێ‌و بەرهەمێك وەدەستدێ، هەڵبەتە ڕەنگە هەر ئەوەش وایلێکردبم، کە لە ژیانمدا زۆر بە بێکاریی‌و تەنبەڵیی‌و سستیی قەڵسم‌و، زۆریشم کەیف بە گورج‌و گۆڵیی‌و چالاکیی‌و دەستگەرمیی دێ.

شایانی باسیشە کە بابم جاروبار بۆ هاندانم لەسەر ئیشوکار پێیدەگوتم: ئەگەر فلاَن ئیشە بکەی، ئەوەندە پارەت بە دیاریی دەدەمێ، ئنجا کە دیارییەکەم وەردەگرت، یەك دنیا پێی دڵخۆش دەبووم.

هەزاران ڕەحمەت لە باب‌و دایکی دڵسۆزو هەمیشە ماندووم‌و، خوای میهرەبان بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو، ماندوێتی‌و گرفتارییەکانی ژیانی دنیایان لەبیرباتەوە.

# قۆنـاغـی نـاوەنديـیو ئامادەيـی

ساڵی (١٩٧٣) کە پۆلی شەشی سەرەتاییم تەواوکرد، تەمەنم (١٢) ساڵبوو، ساڵێکیشـم فەوتا، واتە ساڵی (١٩٦٨) بەهۆی ئەوەوە کە وەرەقەی نەقڵم بۆ نەکرا، خوێندنم فەوتا.

لە ساڵی (١٩٧٤) تەمەنم بوو بە (١٣) ساڵ و، لە (١/ ٧/ ١٩٧٤) پێمنایـە تەمـەنی (١٤) ساڵان، پێشتر باسمکرد کە هەر لەقۆناغی سەرەتاییەوە دەستمکردبوو بەنوێژو تێکەڵیی لەگـەڵ خەڵکی مزگەوتو سەردانی حوجرەکانم دەکردو مامۆسـتایانو فـەقێکانم دەبـینی، لەڕانیـەو دەرەوەی شاری ڕانییەش، بەڵام تا ئەوکاتە هەر دینداریەکی سادەی فیکریم هـەبوو، ئاوێتـە نەبوو لەگەڵ شارەزایی لە قورئانو سوننەت، بەڵام بە حوکمی تێکەڵییم لەگـەڵ مامۆسـتایانو قوتابخانە شەرعییەکاندا، وردە وردە شارەزاییم پەیـدادەکرد، لەگـەڵ نوێـژو ڕۆژوو تاعـەتو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی و ئەدەبو ڕەوشت، هەر لە سەرەتاشـەوە خـوای پـەروەردگاریش فیترەتێکی واپێدابووم، مەگەر چۆن دەنا مەیلی خراپـەو گونـاهم نـەبوو، ئـەوەش فـەزڵێکی خوایەو لەبەر شارەزاییم نەبوو.

## چۆنییـەتی چوونـم بۆ پەیمانگـەی ئیسـلامیی لە ڕانیـە :

پاش ئەوەی لە شەشی سەرەتایی وەك هەموو ساڵێك یەکەم بووم، یەکێك لـە مامۆسـتاکان کە هاتووچۆی مزگەوتەکەیم دەکرد، ﴿مزگەوتی (سەید قادر) لە ڕانیە﴾ ناوی مامۆستا (مەلا عەبدولقادری هەڵۆنەیی)یە[1]، گوتی: فلان کەس دەتـەوێ بچـیتە کـوێ؟ گـوتم: دەمـەوێ بچمە نێوەندی! گوتی: ئەدی بۆ ناچیتـە پەیمانگای ئیسـلامیی؟ شـتێکی زۆر باشـەو لەگـەڵ ڕەغبەتی تۆش دەگونجێ! گوتم: جا ئەوە چۆنەو چی دەخوێنن؟ گوتی: تەفسـیری قورئـانو فەرموودەی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" دەخوێنن، زانستی شەریعەتو زمانی عـەرەبی دەخوێنن، ئیدی مامۆستا (عەبدولقادری هەڵۆنەیی) هانیدامو لەلای شیرینکردم، خۆشـم لـە

---

١) ئێستا ماڵیان لـە ڕانیـەیەو هاموشۆمان بەردەوامە.

ناخەوە تینوێتی ئەوەم هەبوو کـە شـارەزا بـبم لـە شـەریعەتو سـەرەنجام چـوومە پـەیمانگای ئیسلامیی لە ڕانیە.

(مامۆستا مەلا ئەحمەدی سکتانیی)ش هەبوو، کە (مەلا ئەحمەدی قاضـی)یـان پێـدەگوت، قاضی شۆڕشبوو "هەزار رەحمەتی لێبـێ"، ئەو بەرپرسی پەیمانگای ئیسلامیی بوو لـە ڕانیـە، کە تازە لە ڕانیە دامەزرابوو، کە تەنیا پۆلی یەكو دووی هەبوو، هەرچەندە لەبیرم نەماوە چـۆن چووم، بەڵام لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێکانی سەرەتاییم چووینە پەیمانگای ئیسلامیی لەڕانیـە، لەوانە مامۆستا حەسەن بابەکر لە پۆلی دوو بوو، منیش چـوومە پـۆلی یـەك، مامۆسـتا مـەلا ئەحمەدی قاضی "خـوا لێـی خۆشبـێ" یەکـەم مامۆسـتام بـووە کـە دەرسـی شـەرعییم لـەلا خوێندوە، دیارە هەر کام لە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای خـەیاڵو مامۆسـتا مـەلا عەبـدولقادری هەڵۆنەییش بەهەمان شێوە دەرسـیان پێـدەگوتین، لەگـەڵ چـەند مامۆسـتایەکی دیکـە کـە لـە نێوەندیی و ئامادەییەکانەوە دەهاتنو دەرسەکانی دیکەیان پێدەگوتین، ئنجا کـە مامۆسـتا مـەلا ئەحمەدی قاضی منی دەبینی، لەنێو قوتابییەکاندا نوێژو تاعەتەکانم دەکردو ڕێزی مامۆسـتاکانم دەگرت، زۆر خۆشی دەویستمو زۆرجار هانیدەدام.

۞ ئنجا کە دەستمان بە خوێندن کرد لە پەیمانگای ئیسلامیی، دەرسەکانی (فقه و نحوو صرف منطـق و بلاغـة) شتێکی نامۆ بوون بۆم، چونکە پێشینەم نـەبوو، لەبەرئـەوەی سـەرەتاییم تەواوکردبوو و لەفەقێیەتیی و حوجرەوە نەچووبووم، لەو زانستانەدا پێشینەم نـەبوو، بـەڵام لەبەر ئەوەی تامەزرۆییەکی دەروونییم هەبوو، دەرسەکانم باش دەخوێندنو، کەم هـەبوو لە سەد کەمتر بێنم، مامۆستا مـەلا ئەحـمەد کـە ئەوکاتـە قاضـی شـۆڕش بـوو، حەقبێـژو بوێربوو، گۆچانێکی پێبوو، وە جاروباریش کڵاشینکۆفەکەی دەهێنا دایدەنا، دەیانگوت: مەلا مستەفا ئەو مەلایانەی خۆشدەویستو دەیکردنە قاضی کە حەق بێژبوونایە، مامۆسـتا مەلا ئەحمەدیش مەشهووربوو کـە قاضـی مـەلا مسـتەفایە لـە بتـوێنو پشـدەر، هەرکـەس کێشەیەکی هەبووایە دەیانهێنایە لای ئەو، هەر مەلایەکیش سەردانی بکردایـە، دەیهێنـا بـۆ پۆلەکەمانو منی پێشاندەداو دەیگوت: ئەو عەلی باپیرە دەبینن؟! ئەوە زیرێکەو لەو گۆڕەی

کەتییە! ئەوە زۆر زیرەکەو دەرسەکانی باش ئامادەدەکاتو ڕێز لەمامۆستایەکانی دەگـرێ، چونکە هەندێك لە قوتابییەکان زۆر چەتوونییان دەکرد، هەراو دەنگە دەنگیان دەکرد.

❁ یەکێك لەبیرەوەرییە خۆشەکانی ئەو ساڵە (١٩٧٤ز) کە لەبیرمە، ئەوەیەکە مامۆستا مـەلا ئەحمەد پرسیاری لە قوتابییەك کرد، کە ئێستا لـەژیان دایـە، بـەڵام ناوینـاهێنم، مامۆستا پێیگوت: هەستە دەرسەکەم بۆ بڵێ! ئەویش گوتی: مامۆستا! عەلی باپیر باشی لەبـەرە بـا ئەو بیڵێ! مامۆستاش گوتی: جوولەکەی خەیبـەرێ! ئەدی تۆ چی لێرە دانیشتووی؟

مامۆستا مەلا ئەحمەد زۆر توندبوو لەسەر قوتابییەکان، ئەگـەر واش نەبووایـە قوتابییـەکان زیاتر ئەزیەتیـان دەدا، لەبیرمە لە عیلمی (صرف)دا، کە مامۆسـتا دەیگوت: (ضَرَبَ، ضَـرَبَا، ضَـرَبُوْا، ضَـرَبْتَ، ضَـرَبْتُمَا، ضَـرَبْتُمْ، ضَـرَبْتِ، ضَـرَبْتُمَا، ضَـرَبْتُنَّ، ضَـرَبْتُ، ضَـرَبْنَا) پاشـان دەیگوت: بیلێن، قوتابییـەکان دەسـتیان پێـدەکرد! مامۆسـتا دەیگـوت: بەسـە! هـەر پێیـدا دەهاتنەوەو نەیاندەبڕیەوە بۆ ئیزعاجکردنی مامۆستا، وەك کۆڕسێکی سروود بە دەنگـی بـەرز دەیانگوتەوە!

## جـەڕەس لێـدانی ناوەخـت:

مامۆستا لە وانەوتنەوەدا پابەندنەبوو بە کاتەوە، جاری وابوو لەکاتی دیاریکراو تێدەپەڕی، قوتابییەکان بێزاردەبوون، ئنجا هەڵسابوون تەگبیرێکیان کردبوو، مـام حەسـەنێکمان هـەبوو کارگوزاربوو، دەبوو مامۆستا بیگوتایە: حەسەن جەرەس لێبدە! جەرەسەکەش ئاسنێك بـوو هەڵواسرابوو ئاسنەکەی لە دیـواری رادەکێشـا، یـان بـە ئاسـنێکی دیکـە زرینگـە زریـنگ لـە ئاسنەکەی دەدا، ئێمەش هـەردوو پۆلەکـە دەهاتینـە دەر، قوتابییـەکان هەنـدێکی چـەتوونیان تێدابوون، گوتبوویـان: تـەگبیرێك لـەخۆمان نەکـەین مامۆسـتا دەمانفـەوتینێ! هەسـتابوون دەزووە غەرغەرەیەکی سپی، یان رەشـبوو لـە ئاسـنەکەیان خسـتبوو، بـە بـن کورسـییەکاندا هێنابوویان بـۆ لای خۆیـان، زۆرکـات لـە نیـوەی دەرسـدابوو جـەرەس لێـدەرا! مامۆسـتا دەیگوت: حەسەن؟ کەنگێ ئێستا کـاتی جەرەسـە؟ مـام حەسـەن دەیگـوت: مـن جەرەسـم لێنـەداوە! مامۆستا دەیگوت: حەسەن بۆ درۆ دەکەی، ئەدی کێ ئەو جەرەسەی لێدا؟ تـاکو

دواتر ئاشکرابوو کە ئەوە دەزووە غەرغەرەیەو فرێیان دابوو، کەس نەیزانی سەرەکەی لەلای کێ بووە!

### لێپرسینەوەی دەرس :

مامۆستا کە ئەمڕۆ دەرسی پێدەگوتین، بۆ بەیانی، یان دوو بەیانی دەیگوت : لەبەری بکەنو لێی دەپرسینەوە! قوتابییەکان بۆ ئەو ڕۆژەی دەیانزانی لێپرسینەوە هەیە، جلی ئەستووریان لەبەردەکرد! چونکە مامۆستا گۆچانی پێبوو، بەگۆچانەکەی لێی دەدان، ئەوانیش بۆ ئەوەی ئازاریان پێنەگات، ئەو جلە ئەستوورانەیان لەبەردەکرد، بەلاّم من بەڕاستی زۆر سوودم لە مامۆستا وەرگرت، ئەوانەی بیانویستایە بەڕاستی بخوێنن، سوودی زۆریان دەبینی، چونکە مامۆستا مەلا ئەحمەد لەگەڵ دەرسەکەدا پەروەردەشی دەکردین، پاشان مامۆستا عەبدوڵلاّی خەیاڵو، مامۆستا عەبدولقادری هەڵۆنەیی و، یەك دوو مامۆستای دیکەش زۆر سوودیان پێگەیاندین، خوا پاداشتیان بداتەوە.

ساڵی (١٩٧٤) لە یەکی نێوەندیی پەیمانگای ئیسلامیی بووم، وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە ژیانی مندا، ئەویش ئاشنابوونم بوو بەزانستە شەرعییەکان، قورئانو فەرموودەیان پێ لەبەردەکردین، من لەوێوە دەستم بەلەبەرکردنی چەند سوورەتێکی قورئان کرد، کتێبی (المصحف المفسر) واتە قورئانی تەفسیرکراو، تەفسیرێکی کورتی (محمد فريد وَجْدي) بوو، ئەوە مەنهەجمان بوو، لەگەڵ کتێبی (رياض الصالحين)دا کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەرن "صلى الله عليه وسلم"، فیقهمان هەبوو، مەنتیقمان دەخوێند، دەرسەکانی مێژوو جوگرافیاو ئینگلیزیشمان هەبوون، بۆ من ئەوە سەرەتای دەستپێکردنو شارەزابوونم بوو بە زانستە شەرعییەکان، دەربارەی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" و یاساکانی شەریعەتو ئەدەبو ڕەوشتی ئیسلامیی، وەك ئەوەی لە قورئانو سوننەتدا هاتوە، بۆ من ئەوە سەرەتایەك بوو، بۆیە وەك لە هەندێك کتێبیشمدا باسم کردووە[1]، مامۆستا مەلا ئەحمەدی قاضی، یەکەم مامۆستای من بوو کە زانستی شەرعیی لەسەر دەستی فێربم.

---

١) زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن؟! چاپی سێیەم: ٢٠١٢ز.

## هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول‌و فەوتانی ساڵێکی خوێندنم :

ساڵی (١٩٧٥ز) شۆڕشی ئەیلوول هەرەسی بەسەرداهات، ساڵی یەکەمی پەیمانگامان تەواوکرد، بۆ ساڵی دووەمی پەیمانگاش ئیمکانییەتی ماددیمان وانەبوو، باب‌و دایکم نەخوێندەواربوون، سەرپەرشتیارێکی وامنەبوو، ئەگەر نا پێموایە دەگونجا ئەو ساڵەم نەفەوتێ‌و دووی نێوەندی پەیمانگا لە سلێمانی تەواوبکەم، بەلاّم ئەو ساڵەم فەوتا، لەو ساڵەشەوە دەستمکرد بە کرێکاریی لەگەڵ بابم، لە یادمە سێ مانگ لەسەر یەك لە دۆڵی شاوری کارم دەکرد، لە دروستکردنی پردی (سوورەبنێ)دا، لەوێ رژێم تۆپبارانی پێشمەرگەری دەکرد، ئێمەش لە دروستکردنی ئەو پردەدا کرێکارییمان دەکرد، هەر ئەو ساڵە ماوەی مانگێکیش کارم لەگەڵ ئەوانە دەکرد کە پێیان دەگوتن: (دەرمانرشێن) دەرمانیان دەرشاند بۆ ماڵەکان دژی مێشوولەو مێش‌و مەگەزو مار، بە کەرە رەش[1] ماوەی مانگێك دەرمانم بۆ دەگواستنەوە، لە دۆڵی شاوری لە گوندەکانی: (بەردانگەو گولاّن‌و سپیاوی‌و بێردبی‌و مێدیری‌و دۆڵە رەقە).

## شەرم کردن‌و تێرنەخواردن‌و پەندوەرگرتن :

ئەوکاتە خەڵك نەداربوو، ژیانێکی کولەمەرگییان هەبوو، یەکێك کە میوانی دەهات، تەنگانەی دەهاتێ، لەیادمە نیوەڕۆیەك لە ماڵێك میوان بووین، منیش یەکەمجارم بوو بچمە مالاّن، زۆر برسی بووین، ماڵەکە ناوساجییان هەبوو، یەکی ناو ساجییەکیان بۆ داناین، من هی خۆم خواردو گوتم: (الحمد لله!)و کشامەوە، هەرچەندە نیوەتێریش نەبووبووم! بەلاّم ئەوانی دیکە بەتەمەنتربوون، نەکشانەوە! یەکی دوو ناوساجی دییان بۆ هێنان! دواتر گوتیان: فلاّن کەس وەرە! با شتێکت فێربکەین: ئەگەر لە مالاّن دانیشتی‌و تێرت نەخوارد، مەکشێوەو مەڵێ: (الحمد لله) گوتم: ئەدی بڵێم چی؟ گوتیان: بمێنەوەو سەیری سفرەکە بکە، نانی دیکەت بۆ دێنن!

---

١) هەر ئەو (کەر)ە کە کاتی خۆی تەماتەم لەسەر پشتی دەفرۆشتن.

ئێوارەیەكی دیكە لە ماڵێك میوان بووم، دیارە من دەرمانم بۆ دەرمان ڕشێنەكان دەبرد، بۆیە ئەوكاتە تاككەوتبووم‌و هەر خۆم بووم، ماڵەكە گوتیان: وەرە بـۆ لای ئێمـە بـرنج بەشـیرمان لێناوە، بەڵام نابێ شـەرم بكەی! منیش زۆرم برسی بوو و تەمبێ بووبووم شـەرمێ بكـــەم، ئیدی ئەو شەوە برنج بە شیرێكی باشم بە دوو نانـــەوە خواردو فەرامۆشییم بۆ هات!

## تێكەڵـیی لەگـەڵ مەلاو فەقـێ‌و موتالای كتێبـی ئـاییـنـیدا :

لەگەڵ مامۆستایانی مزگەوت‌و فەقێ‌و حوجرەكاندا هاموشۆیەكی باشم بۆ دروستبووبوو، وردە وردە كتێبی ئیسلامییم دەخوێندنـەوە، بـەڵام ئـەمجارە بـە مەبەسـتی شـارەزایی زیـاتر لـە ئیسـلام كتێبـــم دەكڕی‌و دەمخوێنـــدەوە، نەك وەك خولییـــایەك كە پێشـــتر هەمبوو.

ئەوكاتە كتێبی كوردی ئیســـلامیی، یان نەبوو، یـان زۆر كـەمبوو، ئـەو چـوار بەرگـەی مامۆستا عەبدولكەریـمی مودەڕریس بەناوی (شەریعەتی ئیســلام) كتێبەكە لە فیقهـــی ئیمـام شـــافیعیی دایە، بەڵام ئەو ناوی (شەریعەتی ئیسلامیی) لێنابوو! ئەگەر نا دەبـوو ئیعتیمـــادم لەسەر ئەوەبـێ كتێبـی عەرەبـــی بكڕم‌و لە مامۆستایان بپرسم: ئەو وشەیە مانـــای چییـــە؟

## چوونــم بۆ پەیمانگـای ئیسـلامیی لە سـلێمانی :

بۆ ساڵی (١٩٧٦) كەوتومـە تەمەنی (١٥) ساڵیی‌و، چوومە سلێمانی بۆ خوێنـدن لەگـەڵ چەند هاوڕێیەكم، لەوانە مامۆستا حەسەن بابەكرو كاك خالید وەلی‌و كاك پشتیوان محەمـــەدو كاك محەمـەد عەبدولڕەحمان حەمە شەریف، ئەوانە لە پـۆلی ســێ بـوون، مـن لـە پـۆلی دوو بووم‌و هەركام لە كاك بایەزیـدو كـاك ئەحـمەد مـەولود هـاوپۆلم بـوون، ئەوكاتـە پـەیمانگای ئیســـلامیی لـە مزگـەوتی گـەورەدا بـوو، مامۆسـتای خـەتیب (مامۆسـتا مـەلا محەمـــەدی قەرەداغیی) "بەڕەحمەت بێ" بەڕێوەبەری پەیمانگاكە بوو، كە لە هەمانكاتدا خـەتیبیش بـوو، بەشی نێوخۆییەكەشی بەدەم مزگەوتەكەوە بوو، من یـەك سـاڵ لـەو بەشـە ناوخۆییـە بـووم، ئاشنایەتییم لەگەڵ خەڵكێكی باش پەیداكرد، مامۆستایەكانیشمان: مامۆستا مەلا عەبـدوڵڵای خەیاڵ، مامۆستا عەبدوڵڵای خاڵ كـە خـەڵكی هەڵەبجـەبوو، مامۆسـتا غـەفوور مەجیـد كـە

دەرسی مەنتیقی پێدەگوتین، مامۆستا مەلا خالید كە لەجێی مامۆستا خەتیبیش بوو بە بەڕێوەبەری پەیمانگا، مامۆستا مەلا جەلالی مەلا عارفی پێنجوێنی كە ئەدەبی عەرەبی پێدەگوتین، مامۆستا عەبدولڕەحمان كە خەڵكی قەرەداغ بوو، ئەوانە ئەو مامۆستایانە بوون كە دەرسیان پێدەگوتین، خوا لە مردووەكان خۆش بێ و زیندووەكانیش هەر سەربەرزو سەلامەت بن.

دیارە لەو ماوەیەدا كە لە سلێمانی بووم، بیرەوەریی زۆرم هەن، بەڵام ئەوانەی كە بەلای خۆمەوە گرنگ بن، هەندێكیان لێ باس دەكەم:

# كەوتنە نێو گەردەلوولی فیكریی و رووحیی لە سلێمانی

ئەوكاتە پەیمانگای ئیسلامیی دەبووایە كادری ئیسلامیی و مسوڵمان دەربچووێنێ، بەڵام تێبینیمان دەكرد كەسانێكی زۆری هەڵگری فیكری ماركسیێتی لەو پەیمانگایەدا هەبوون، كە موناقەشەی بوونی خواو راستێتی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" یان دەكرد!! كە ئەوە زۆر جێی سەرنج بوو و وەك بڵێی بەدەست نێردرابوون، هەندێك لەوانە ئێستاش ماون و خەڵكی دیارن، بەڵام پێمخۆش نیە ناویان بهێنم، من هەر لەسەرەتاوە بەجیددیی مەسەلەی عیبادەت و تاعەتی شەخسییم گرتبوو، موتابەعەی فیكرییشم هەبوو، بەزۆریی وتوێژو موناقەشەم لەگەڵ ئەوانەشدا دەبوو كە لەخۆم بەپشتەوە بوون و لە پۆلی پێنج و شەشی ئامادەیی بوون، ئنجا هەندێك لەوانەی خەڵكی ناوچەی خۆمان بوون، دەیانگوت: موناقەشە لەگەڵ ئەوانەدا مەكە، هەڵتدەگێڕنەوەو كافرت دەكەن! منیش دەمگوت: بەتەمام ئەوان بەرەو ئیسلام بهێنم! دەیانگوت: ئەوانە زۆر زیرەكن و زۆر موتاڵەعە دەكەن! منیش دەمگوت: ئەدی ئێمە بۆ نابێ موتاڵەعە بكەین؟ بۆ نابێ مسوڵمان لەوان زیرەكتر بێ؟ دەمگوت: مەگەر هەر ئیسلام راست نیە؟ ئەدی كەسێك كە هەڵگری ئیسلام بێ، نابێ لەوان بەهێزترو زیرەكتر بێ؟

ئەو جەوە فیكریی و پرِكێشەیەی ئەویَ لەلایەكەوەو، لەلایەكی دیكەشەوە: شۆڕش رووخابوو، وە (یەكێتی نیشتمانیی) تازە دامەزرابوو، بیری كوردایەتیی و بەرگریی لە نیشتیمان گەرمەی بوو، لەوكاتەدا زۆر هاندەر بۆ من پەیدا بوون، بۆ لێكۆڵینەوەو خوێندنەوەو خۆ بەهێزكردنی زیاتر، تاكو بتوانم لەرووی فیكرییەوە بەرگریی لە ئایین و عەقیدەكەم و لەخۆم بكەم، پاشان لەرووی رووحییشەوە هاندەری گەورەم بۆ پەیدا بوو، تاكو خۆم بەهێزتر بكەم، كە بریتیی بوو لە تینوێتی رووحیی، لەرووی كۆمەڵایەتییشەوە پەیوەندیی زیاترم پەیداكرد، پێشتر لە رانیە بووم، دیارە رانیە لەچاو سلێمانی جیاوازیی زۆری هەبوو، لەرووی هۆشیاری فیكریی و سیاسیی خەڵك و گەلێك بواری دیكەوە، بۆیە زۆر بەخەستی

دەستمکرد بە خوێندنەوە، یەکەمجار کتێبی (گەشتەکەم لەگومانەوە بۆ باوەڕ)م خوێندەوە کە مامۆستا مەلا محەمەدی شارەزووریی "هەزار رەحمەتی لێبێ" وەریگێڕابوو، کتێبێکی (د.مصطفی محمود)ی میسریی بوو، بەناوی (رحلتي من الشك الى الإيمان)، زۆر شتێکی خۆش بوو، وادەزانم یەکەم بەرهەمی کوردی بووە خوێندوومەتەوە لەرووی فیکرییەوە، پاشان کتێبەکانی: (رێکەوت لەتەرازووی ژیرییدا)و (سروشت لەتەرازووی ژیرییدا)و (داروین لەتەرازووی ژیرییدا)و (فرۆید لەتەرازووی ژیرییدا)م خوێندنەوە، پاشان ئەو کتێبەی مامۆستا عەبدولعەزیز پارەزانیی: (ژیانی پێغەمبەری مەزن)، هەروەها چەند کتێبێکی دیکەی وەك (لە سەرەڕێی کاروانی باوەڕدا)و (بەرەو ڕێبازی ئیسلام)و چەند کتێبێکی دیکەی کوردی پەیدابوونو زۆر سوودمان لێ بینین، بەڵام من ئیعتیمادی سەرەکییم لەسەر کتێبی عەرەبی بوو، وردە وردەش کە لەپەیمانگای ئیسلامیی زمانی عەرەبیم باشبوو، دەستمکرد بە موتاڵای تەفسیرەکان، کتێبێك کە بە پێویستی دەزانم ئاماژە پێ بدەم، چونکە زۆر کاریگەریی لەسەرم هەبوو لەرووی فیکریی و سلووکیی و ڕۆحییەوە، کتێبەکەی ئیمام (محمد الغزالي): (إِحياء علوم الدين) بوو، ئەوکاتە دوو جار هەر پێنج بەرگەکەیم خوێندۆتەوە، ڕاستە لەهەمووی تێنەگەشتووم، بەڵام زۆر کاریگەریی لەسەرم هەبوو، لە کتێبەکانی (تفسیر)یش: تەفسیری (الكبیر) کە پێی دەوترێ: (مفاتیح الغیب) هی ئیمام فەخرەددینی ڕازییە، وە تەفسیری (روح المعاني) کە هی (الالوسي)یەو تەفسیری (ابن کثیر)و هەندێك تەفسیری دیکەش، کە بەهۆیانەوە شارەزاییم لە قورئان ڕۆژ بەڕۆژ قووڵتر دەبوو، لەیادمە ئەوکاتە لە دووی نێوەندی بووم، کتێبی (المنجد)م کڕی بەدینارێك و حەوسەدو پەنجا فلس، کە وشەی عەرەبیم لێ عاصێ دەبوون، دەگەڕامەوە بۆ (المنجد)، چونکە ئەو فەرهەنگە کوردیی و عەرەبییانەی ئێستا هەن، نەبوون، لەیادمە ئەوکاتە حیزبی شیوعیی ڕۆژنامەیەکی هەبوو بەهەردووك زمانی کوردیی و عەرەبی، بەناوی (بیری نوێ- الفكر الجديد) من هەردووکیم دەکڕی، کوردییەکەم بەراورد دەکرد بە عەرەبییەکە، بۆ ئەوەی مانای وشەکان فێربم.

لـە ڕووی ڕووحییـەوە بەشـداریيم دەكـرد لەهەنـدێك كـۆڕو مەجلیسـی سـۆفییەكانی تەریقـەتی نەقشبەندیی، دەچووم بەشداریی زیكرەكانیانم دەكرد، هەندێك زیكرو قورئانیان دەخوێند، لەڕووی ڕووحییەوە سوودم لێدەبینین، هەرچەندە ئینتیمام نەبوو بۆ تەریقەتەكە.

ئنجا عادەتم وابوو ئەوەی كە دەمزانـیو دەمخوێنـد، كـارم پێـدەكرد، خـوای پـەروەردگار بەوجۆرە فیترەتەوە خوڵقاندبوومی، كە هەمیشە حاڵی بوونەكەمم دەكرد بەحاڵ، بـۆ نموونـە: كە دەمخوێندەوە: شەو نوێژ وایەو خێری وایە، زیكرەكانی بەیانیانو ئێواران، بەرۆژووبوون، نوێـژی چێشـتەنگاو و ویـترو، خۆپاراسـتن لەنـەزەرو خۆپاراسـتن لەغەیبـەت، خێـرو چاكە... هتد، هەوڵمدەدا موو بەموو جێبەجێیان بكەم.

## یەكـەمین ناسـینمان لەگـەڵ مامۆسـتا مەلا موحەممەدی شارەزووریی دا :

لەپۆلی دوو بووم یان لە پۆلی سێ بووم، ڕۆژێك چووم كتێبێك بكـڕم لـەخوار مزگـەوتی خانەقا لە سلێمانی، كتێبخانەیەكی لێبوو هی مامۆستا مەلا سـەعیدی زمنـاكۆ بـوو، وابـزانم تەفسیری (روح المعاني) یان (روح البیان) بوو، چونكە دواتـر هـەردووكیانم كـڕی، گـوتم: مامۆستا! كتێبـی تەفسیری (روح المعاني)ت هەیە؟ مامۆستا مەلا سەعید، یان گوتی: هەمـە، یان گوتی: بۆم دێ، لەوەدا بـووین، لەوكاتـەدا مەلایـەكی تـەڕپووش بەسـەری لـێ بـوو، تەماشای كتێبخانەكەی دەكرد، گوتی: مامۆستا هیچ كتێبـی عەسرییت بۆ نەهاتوون؟ دوایـی كە زانی من لەو تەفسیرە دەگەڕێم گوتی: كاكـە! كتێبـی عەسـریی بخوێنـەوە! تەماشـایكردم تەمەنم كەمەو لەو تەفسیرە دەگەڕێم، فەقێش نیمو سەرم ڕووت بوو، گوتی: من ئارەزووم لە ئیسـلامی عەسـرییە، منیش گوتم: مامۆستا! ئینسان پێویستە پێشێ لە ئیسلامی ئەسڵیی حاڵی بێ، ئەوكاتە ئیسـلامی عەسریی! بەسەرسووڕمانەوە تەماشای كردم! وەك بڵێی قسەكەی پـێ گەورەتر بوو لە خۆم! گوتی: تۆ نـاوت چییەو لـە كـوێی؟ گـوتم: نـاوم فـلان كەسـەو لـە پـەیمانگای ئیسـلامییم، گـوتم: ئـەدی تـۆ كێـی؟ گـوتی: مـن موحەممـەدی مـەلا سـاڵحی شارەزوورییم، گوتم: تۆی فلان كتێبـت دانـاوە؟ گـوتی: بـەڵێ! گـوتم: مـن زۆر دەمێكـە عەوداڵی بینینـی تۆم، ئیـدی بەگـەرمی تەوقـەم لەگـەڵ كـردو لـەوێ لەگـەڵ مامۆسـتا مـەلا موحەممەدی شارەزووریی تەعـاروفمان كرد "هـەزار ڕەحمـەتی لێبـێ"، دواتـر دەیگێڕایـەوە

دەیگوت: پێشان کە گوتت: پێویستە ئینسان لە ئیسلامیی ئەسڵیی حاڵی ببێ، پاشان لە ئیسلامیی عەسریی! گوتم: دەبێ ئەو گەنجە کێ بێ؟ قسەکە لەو گەورەترە!

## گواستنەوەم بۆ حوجرەی مزگەوتەکان:

من تەنیا ئەو ساڵە لە بەشی نێوخۆیی بووم، چونکە زۆر جار قوتابییەکان هەر خەریکی گەمەو یاریی بوون، شەڕە بالیفیان دەکرد، جاری وا بوو بالیفەکە لێکهەڵدەوەشا دەبوو بەتۆزو خۆڵ، چاو چاوی نەدەبینی، گەنجو قوتابی بوونو لە غەریبییدا بوون، شەوی وابوو هەر نەدەخەوتن، جاروبار دەبوو بەشەڕو دەمەقاڵێیان، بەیانیان خوا لە خێری دەرنەکات هەڵمدەستاندن بۆ نوێژی بەیانی، لە دەرگا دەرگام دەدا، دوایی من لەوێ ڕۆیشتمو هەر ساڵێك لەوێ مامەوە، چونکە کاتم زۆر بەفیڕۆ دەچوو، منیش عادەتم وابوو کاتی خۆم بەفیڕۆ نەدەدا، موتاڵەعەم زۆر دەکرد، لەززەتی فیکریی و ڕووحییشم زۆر لێدەبینی، ئیدی من ئەو چوار ساڵەی دی کە لە سلێمانی مامەوە، هەر لە حوجرەدا دەمامەوە، ساڵێك لەحوجرەکەی مزگەوتی مەلا عەلی خانەقا بووم، لام وابێ مامۆستایەکەی ناوی مەلا حەمەدەمین بوو، دوو ساڵ لەمزگەوتی هەلاجەکان بووم، مامۆستا مەلا ئەحمەدی جاف لەوێ بوو کە بەئەسڵ خورخوڕەییە، یادی بەخێر، دوو ساڵ لە مزگەوتی مەولەویی بووم، کە مامۆستا مەلا حوسێنی دەشتێویی "هەزار ڕەحمەتی لێ بێ" و خوا پلەکانی بەرز بکات، کە زانایەکی دەرەجە یەك بوو لە سلێمانی، لەوێ بوو.

## کرێکارییکردن لە سلێمانی:

لە پۆلەکانی: دووو چوارو پێنجی پەیمانگا مەعفوو بووم، کۆتایی ساڵ تاقیکردنەوەم نەدەکرد، بەڵام لەبەر هاوەڵە قوتابییەکانم کە خەڵکی ڕانیە بوون، نەدەگەڕامەوە، حەزیان دەکرد پێکەوە بگەڕێینەوە، دەچووم کرێکارییم دەکرد، ماوەی (١٥ـ ٢٠) ڕۆژ، تاکو ئەوان لە تاقیکردنەوەکان تەواو دەبوون، پاشان پێکەوە دەگەڕاینەوە بۆ ڕانیە.

هەروەها لە رۆژانی دیکەی دەوامی خوێندنمدا رۆژانی پێنج شەممان‌و جومعـان، دەچـوومە کرێکاریی، رۆژی بە دوو دینار بە سێ دینار، دواتر کرێکاری رۆژی بوو بەچوار دینار، ئیدی ئەو پێنج شەممەو جومعەیەی کرێکارییم دەکرد، پێنج شەش دیناریکم دەهاتە دەسـت، کتێـبم پێ دەکڕین‌و پێداویستیی خۆم پێ دابین دەکردن، هەندێك جار یارمەتی خەڵکیشـم دەدا، زۆر بەتەنگ خواردنیشەوە نەبووم، ئەوکاتەی لە بەشـی نـاوخۆیی بـووم هاورێکـانم دەیـانگوت: دەچین خواردن دەخۆین، چێشتخانەی عەلیـە سوور هەبوو، برنج‌و فاسۆلیا دوو سـێ پشـکە گۆشتی تێدا بوو، بە سێ پەنجایی بوو، دوایی بوو بە ڕوبعێك، دەیانگوت: نایەی بچـین نـان بخۆین؟ منیش زۆرجار پارەم پێ نەدەبوو، بەڵام بەسەر خۆمم نەدەهێناو دەمگوت: ئێوە بچـن من دواتر نان دەخۆم، هەندێك جار دە سەموونم دەکـڕی، هـەیوانی بەشـی ناوخۆییەکـەمان کووپە شکاوێکی لـێ بوو، سەموونەکانم لەوێ دەهاویشـتن، ژەمـی سـەموونێکم دەخـوارد بەدەم خوێندنەوەوە، ئەوان کە دەهاتنـەوە دەیـانگوت: نانـت خـواردوە؟ دەمگـوت: بـەڵێ! دەیانگوت: لە کوێ؟ دەمگوت: نانم خـواردوە، ئەوکاتـە سـەموونێك بـەپێنج فلـس بـوو، بەپەنجاییـەك دە سـەموونم دەکـڕی، دوو سـێ ڕۆژم پـێ بـەڕێ دەکـردن، هەنـدێك جـار مامۆستایانیش دەعوەتیان دەکردین، حاجی مامۆستا عبدالرحمن نەورەسی یەکێکە لـە هـاوڕێ خۆشەویستەکانی ئەوکاتەم، زۆری خۆش دەویسـتم، ئـەو لـەمن گـەورەتر بـوو، زۆرکـات مامۆستایانی دەعوەت دەکردن، بەتایبەت مامۆستا مەلا عوسمان‌و مامۆستا مەلا عەلی هەڵەبجە "هەزار ڕەحمەتیان لێبـێ" منیشی دەعوەت دەکرد، دەنا ئەگەر هەر خـۆم بوومایـە، بەشـتێکی سادە بەڕێم دەکرد، زۆر عەوداڵی خواردن نەبووم.

## لەگەڵ خۆدا خەریك بوون لە بواری تەزکیـەدا:

ئەوکاتە کتێبی (إحياء علوم الدين) زۆر کارتێکردنی لەسەرم هەبوو، هەرچەندە زێدەڕۆیی زۆری تێدا بوو لەبواری دونیا بەکەمگرتندا، جاری وابوو لەسەر خۆم عەهدم دەکرد کە چوار مانگ لەسەر یەك شیرینی نەخۆم، کە زۆرم حەز لەشیرینی بوو، یان چا نەخۆمەوە، دیارە پـێ بە پێش کە ئاستی فیکرییم بەهێزتر دەبوو، بازنەی چالاکی فیکریی‌و بانگەوازو قسەکردنم بـۆ

خەڵك و تێكەڵییم لەگەڵ خەڵكدا فراوانتر دەبوو، چ لە پەیمانگای ئیسلامیی دا، چ كاتێـك كـە دەگەڕامەوە بۆ ڕانیـە، یـان كـە دەچـووم بـۆ دەورووبـەری ڕانیـە، هەنـدێك لـە هاوڕێكـانی ئێستاشم، هی ئەوكاتەن، هەندێكیان ئەهلی شەڕاب و قومار بـوون و كـارتێكردنم لەسـەریان هەبوو، ئەوانەی لە پەیمانگای ئیسلامیی بوون، بەزۆریی ئەهلی نوێژو تاعـەت بـوون، بـەڵام هەوڵم دەدا زیاتر پابەند بین بەنوێژو تاعـەت و ڕەوشـتی ئیسـلامییەوە، لەیادمـە لـە پـەیمانگای ئیسلامیی زۆركات هاوڕێكانم دەیانگوت: با بچـین بـۆ نـاو بـازاڕی سـلێمانی، بـۆ پیاسـەو تەماشاكردنی ئافرەتی جوان و شتی جوان! تۆ بۆ نایەی؟ هەندێكیان تەمەنیان لەمن زیاتر بـوو، دەیانگوت: ئەوە جاریێ نازانیێ ژیان چییە! دەمگوت: بۆچی نازانم ژیان چییە؟ دەیـانگوت: ئەدی ئەگەر دوو پیاسە نەكەی لەو بازاڕانەی سلێمانی و سەیری دوو كچـی جـوان نەكـەی و، دوو شتی خۆش نەخۆی، ئەدی ژیان یانی چی؟ منیش دەمگوت: مـن وادەزانم ئێـوە لـەژیان تێنەیگەشتوون، دەیانگوت: چۆن؟ دەمگوت: باشە ئێمە نەهاتووین لێرە بخووێنین؟ باشە ئەوە تەماشای ئافرەتانتانكرد! مانای وایە گوناهێكتان كردو دەبیێ خەفەتیشی لـیێ بخۆن، پاشان ئایـا پێتاناخۆشە خەڵك بە حەڕامیی سەیری خوشكی ئێـوە بكـات؟ دیـارە خـەڵكیش پێـی ناخۆشـە سەیری خوشكی بكەی، وەك پێشتر گوتم: من لەو سەرەتایەوە كتێبی (إِحیاء علـوم الـدین)م دەخوێندەوە كە هەڵبەتە زێدەڕۆیی تێدایە لەرووی دنیا بەكەمزانییەوەو لەكتێبـی (ڕێگای سـاڵح بوون و بەرەوخواچوون)دا بەتێروتەسەلیی باسی ئەو مەسەلەیەم كردوە.

## پێنج ساڵەكانی خوێندنم لە سلێمانی:

وەك پێشتر باسمكرد لە ساڵی (١٩٧٦) لە پۆلی دووی نێوەندی پەیمانگای ئیسلامیی بـووم لە سلێمانی، ساڵی (١٩٧٧) كە تەمەنم بوو بە (١٦) ساڵێ، لە سـێی نێوەنـدی بـووم، سـاڵی (١٩٧٨) تەمەنم بوو بە (١٧) ساڵێ و لە چواری ئامادەیی بووم، ساڵی (١٩٧٩) كە تەمەنم بوو بە (١٨) ساڵێ، لە پێنجی ئامادەیی بووم، لە ساڵی (١٩٨٠)دا كە تەمەنم بوو بـە (١٩) سـاڵێ، شەشی ئامادەیی پەیمانگای ئیسلامییم تەواوكرد.

وەك پێشتریش ئاماژەیەكم پێدا، ئەوكاتە لە سلێمانی لەدوای رووخانی شۆڕشی ئەیلوول، فیكری ماركسی لینینیی و ماویی، زۆر تاوی سەندو دەركەوت، ئنجا وەك چۆن ئێستا عەلمانییەت و دیموكراسی پێكەوە ئاوێتەكراونو، دەڵێن: ئەگەر دەتەوێ دیموكراسی بی، دەبێ عەلمانیی بی، كە ئەمەش درۆیەكی گەورەیە: هیتلەر عەلمانیی بوو، دیكتاتۆرێكی گەورەش بوو، ستالین عەلمانیی بوو، دیكتاتۆرێكی گەورەش بوو، مۆسۆلینی عەلمانیی بوو دیكتارتۆریش بوو، ئەو رژێمانەی دەورووبەرمان شای ئێرانو سەددامو ئەتاتوركو حافز ئەسەدو كوڕەكەی عەلمانی بوون، هەمووشیان دیكتاتۆرو خۆسەپێنبوون.

عەلمانییەت یانی: دابڕینی دین لەژینو ڕێگانەدان بەتەدەخولی خوا "سبحانه وتعالى" لەژیانی خەڵكدا، لەرێگەی دینو وەحییەوە، مانای باوو نێوەرۆكی عەلمانییەت (سیكۆلاریزم) ئەوەیە، واتە: ئینسان بەدوور لەتەدەخولی خواو دین، ژیانی خۆی رێكبخات.

ئەوكاتەش كوردایەتی لەگەڵ ماركسیزمدا بووبوون بەدوو رووی سكەیەك، دەتەوێ كوردایەتی بكەی؟ حەتمەن دەبێ چەپگەرا بی! كە لەڕاستیدا ئەوەش وانەبوو، بەلاَم لەوكاتەدا بەوجۆرە ماركسیزم رەواجی پێدەدرا، ئنجا ئەوكاتە وەك بلێی خوای میهرەبان هیدایەتێكی تایبەتی دابووم، دەمگوت: مادام ئیسلام دینێكی تەواوە، مادام خوای زاناو دانا دەفەرموێ: ﴿...ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ... ③﴾ المائدة، واتە: ئەمڕۆ بەرنامەو ئایینەكەتانم بۆ تەواوكردن.

دینی تەواو، دەبێ هەموو پێداویستییەكانی ژیانی ئینسانی تێدابن، جا بەرگریی لە نیشتمانە، بەرەوپێشبردنی خەڵكە، چەسپاندنی دادگەرییە، چەسپاندنی ئازادییە، دابینكردنی مافەكانی ئافرەتە، كرێكارە...هتد، ئەوكاتە دەمگوت ئەم دینە تەواوە، پێویستی بە پینەو پەرۆی رێچكان نیە، ئەو دینە لەنێوخۆیدا دینێكی تەواوە و ناچارمان ناكات بچینە بەردەرگای میرە رۆژهەلاَتیو رۆژئاواییەكانو، سوالۆ سەدەقەی رێچكەو بیردۆزەكانیان لێبكەین!

زۆركات ئەو پرسیارەم لێكراوە: ئایا كێ زۆر كاریگەریی لەسەرت هەبووە؟! وەلاَمەكەشی ئەوەیە من خوای پەروەردگارو بە بەزەیی هیدایەتی داومو لە زیندووان كەسێكی

دیاریکراوم پێشك نایەت، بەلاَم لە مردووان زۆر سوودم بینیـوە لـە زانایـان، ئـەبو حامیـدی غەززالیی، ئیمام فەخرەددینی رازیی، ئیبنو تەیـمییە، ئیبنو قـەیم لجـەوزیی، سـەید قوتـب، حەسـەن بـەننا، مـەودوودیی، دیـارە لەکتێبـەکانیان، هەڵبەتـە وەك زانسـتی شـەرعیی ئـەو مامۆسـتایانەی دەرسـیان پێگوتـووم، زۆر سـوودم لێبینیـون، بـەلاَم لـە رووی فیکرییـەوە، کەسێکی دیاریکراو نەبووە، جگە لە هەندێك کتێبو بەرهـەمی کـوردیی، کـە بـۆ هەنـدێك بوارو بابەتی تایبەت لێیان بەهرەمەندبووم.

شایانی باسیشە کە موتالاَی کتێبەکانم دەکـرد، بـێ قەیدوشـەرت تەسـلیمی قسـەی هـیچ کەس نەدەبوومو، هەرشتێك لە فلتەری عەقڵم دەرنەچووایە، رەفزم دەکـرد، بۆیـە کتێبـەکان پەراوێزم لەسەر دەنووسین، کە رەنگە زۆریش لێیان تێنەگەشـتبم، بەلاَم بە موتڵەقی تەسلیمی نووسینی کەس نەدەبووم، کتێبەکانی ئەبو حامیدی غەززالیـیو ئیبنو تەیـمییەو ئـیبن قەیـم دەخوێنـدنەوە، بەلاَم هەرگیز نەمگوتوە تابیعی هیچیانم، سوودم لەکتێبـەکانی سـەید قوتـب بینیوە، بەلاَم نەمگوتوە: قوتبییم، سوودم لـە کتێبـەکانی نۆرسـیی دەبـینی، بـەلاَم نۆرسـییی نەبووم!

ئیمام مالیك "رەحمەتی خوای لێبـێ" قسەیەکی جوانـی هەیـە دەڵـێ: "کـلٌ یُؤخـذ منـه ویُرد علیـه الا صاحب هذا القبـر".

هەموو کەس قسەی لێوەردەگیرێ، (ئەگەر راست بێ)، بەسەریشیدا دەدرێتەوە، (ئەگـەر هەڵە بێ)، جگە لە خاوەنی ئـەم قـەبرە، کـە مەبەسـتی پێغەمبـەری خوایـە "صـلى الله علیـه وسلم"، دیارە ئەوکاتە لەلای گۆڕی پێغەمبـەر "صلى الله علیه وسلم" وەستاوە.

# سەرەتای بیرکردنەوە لە چارەسەرێکی ئیسلامییانە

ئەوکاتە جەوی سیاسی سلێمانی بەجۆرێکبوو کە خەڵکی بەدوای بەدیلێکدا دەگەڕا، لەوکاتەدا یەکێتی و پارتی و شیوعی و لایەنی دیکەش هەبوون، بەڵام ئەوکاتە زاراوەی ئیسلامیی لەکوردستاندا دانەهاتبوو، برایانی مسوڵمان (الإِخوان المسلمون) کاری ڕەسمییان نەبوو، تا ئەوکاتە من هیچ کەسم نەبینیوە باسی کاری ئیسلامیی بکات، کەسیش بەمنی نەگوتوە: کە من ئیخوانولموسلمینم، یان فلان جەماعەتم، لە پۆلی پێنج و شەشی پەیمانگای ئیسلامییدا، لەگەڵ مامۆستا (عبدالرحمن) نەوڕەسیی و هەندێك لەمامۆستایانی دیکە، قسەمان لەوبارەوە دەکرد، کە پێویستە ئەو خەڵکە مسوڵمانە سێبەرو چەترێکی هەبێت، ئەوکاتە مامۆستا نەوڕەسیی و کاك حەسەنی حەمە خالیدو کاك کەمال دۆڵپەمۆیی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای هەنجیرەکە، یادی هەموویان بەخێر، ئێستاش هەموویان لەژیاندان، جار جار دادەنیشتین کە شتێك بکەین، ئەوە بوو کە دواتر (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) دروستبوو، لەو سەرەتایانەدا لە بازنەیەکی داخراوی بچووکدا، ئەو قسەو باسانە دەکران لە شاری سلێمانی، من لەو سەرەتایەدا هەبووم و قەناعەتم وابوو کە پێویستە ئێمەش شتێکمان هەبێت لەو شۆڕش و خەباتەدا، وەك خەڵکی دیندارو ئەهلی تاعەت، کە بەڕەوامان نەدەزانی شوێن کەسانێکی بەلای کەمەوە نوێژنەکەرو ڕۆژوو نەگربکەوین!

لەو مامۆستایانەی کە لەوکاتەدا بینیومن، تەنیا مامۆستا مەلا عوسمان و مامۆستا مەلا عەلی و مامۆستا مەلا عومەر، "خوا لێیان خۆش بێ"، بوون، کە دەهاتنە مزگەوتی هەلاجەکان، لەو تەمەنەدا ئەو مامۆستایانەی دیکەم نەدیوە، لە ساڵی (١٩٨٣)دا مامۆستا شێخ محەممەدی بەرزنجیم ناسی و، هەر ساڵی (١٩٨٣)ش لە هەولێر مامۆستا (شێخ عەبدوللەتیفی واژەیی)م بینی، هەروەها لە ساڵی (١٩٨٣)دا سەفەرێکی لای سیروان و هەڵەبجەم کردو

مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموودم ناسی، "خوا لە هەموویان خۆشبێ‌و" پلەو پایەیان بەرزبکاتەوە.

لە ساڵی (١٩٨٢)دا بۆ یەکەمجار مامۆستا (سەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین)م لەتاران بینی، بەڵام تا ئەو تەمەنەی لەسلێمانی بووم، هیچ کەسم بەناوی کاری ئیسلامییەوە نەدیوەو نەناسیوە.

## لەبەرکردنی قورئانی بەپێز :

ساڵی (١٩٨٠) پۆلی شەشی پەیمانگای ئیسلامیم لە سلێمانی تەواوکردو سەری ساڵ چل (٤٠) رۆژ ئیزن درایەوە بۆ کۆششکردن‌و خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ، سی (٣٠) رۆژیم تەرخانکرد بۆ لەبەرکردنی قورئان، واتە لەو سی (٣٠) رۆژەدا هەموو قورئانم لەبەرکرد، سوپاس‌و ستایش بۆ خوا، هەر رۆژە جوزئێکم لەبەردەکرد، دیارە پێشتریش چەند جوزئو سوورەتێکم لەبەربوون.

## نەنووسینی پەخشان‌و لەکیسچوونی سی (٣٠) نمرە :

لە کاتی تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ لە شەشی ئامادەیی پەیمانگای ئیسلامییدا، لە تاقیکردنەوەی زمانی عەرەبیدا دوو تەعبیریان بۆ هێنابووینەوە، تاکو یەکیان هەڵبژێرین‌و پەخشانی لەسەر بنووسین، سی (٣٠) نمرەی لەسەر بوو، دیارە منیش عەرەبییەکەم باشبوو، بەڵام تەعبیرەکان، یەکێکیان وەسفی سەددام بوو، یەکێکی دیکەیان زەمی خومەینی بوو، بەڵام من پەخشانەکەم نەنووسی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوام بە هیچ کام لە وەسفی سەددام‌و زەمی خومەینی نەبوو، دیارە قوتابییەکان زۆریان پێسەیر بوو، دەیانگوت: چۆن سی (٣٠) نمرەت لەکیس خۆتداوە؟ گوتم: شتێك قەناعەتم پێی نەبێ ناتوانم بینووسم، بۆیە ئێستاش ئەگەر تەماشای نمرەکانم بکەن، لە عەرەبی (٧٠) لە سەدم هێناوە، ئەگەر تەعبیرەکەم وەڵامبدابایەتەوە، بەلای کەمەوە نەوەد لە سەد (٩٠٪)م دەهێنا، زۆر جار گوتوومە: شتێك قەناعەتم پێی نەبێ نە بۆم دەگوترێ، نە بۆم دەنووسرێ! شتێکیش قەناعەتم

پێی هەبێ، دەتوانم بیڵێم‌و بینووسم‌و بەپێی بۆلوان بیشیکەم، کە ئەوەش زۆر جار باجی پێداوم، چونکە هەندێك جار قەناعەتێك هەیەو لەوانەیە تەرەفی بەرانبەر پێناخۆش بێ‌و لەسەر دڵی قورس بێ، تۆش پێچەوانەی قەناعەتی دڵی خۆت بڵێی بۆ رازیکردن ئەو، ئەوە بۆ موجامەلەو دڵ رازیکردنە، بەڵام من باجدانەکەم پێرەواترە، ئینسانیش دەگونجێ ئەگەر لێزانین‌و حیکمەتی خۆی بەکاربهێنێ، دەتوانێ هاوسەنگییەك رابگرێ لەنێوان ئەوەدا کە قەناعەتەکانی خۆی بڵێ‌و، خەڵکیش زۆر نارەحەت نەکات، هەرچەندە ناشگونجێ تۆ هەر خەڵك رازیی بکەی، سەرەنجام تۆ یان دەبێ مەبدەئیی بێ، یان مەسڵەحیی، یان دەبێ پارێزگاریی لە مەبدەئەکانت بکەی، یان بەرژەوەندیی چۆن بوو وا بکەی، بێگومان مەبدەئییبوون، هەمیشە باجی خۆی هەیە، بەڵام سەرەنجامی دنیاو دوارۆژی خێرەو، هەلپەرستییش ئەگەرچی هەندێك وردە دەستکەوتی بچووکی دەبن، بەڵام باجەکەی زۆر گەورەیە لە دنیاو دوارۆژدا.

## چەند بیرەوەرییەکی کرێکاریی کردن:

❁ یەکێك لە بیرەوەرییەکانی ئەوکاتەم: لە پێنجی ئامادەیی بووم، وەك پێشتر باسمکرد، چونکە لە تاقیکردنەوەی سەری ساڵ مەعفوو دەبووم‌و چاوەڕێی هاوەڵەکانم دەکرد، دەچووم لەنێو شار، یان دەورووبەری شار کرێکاریم دەکرد، وە لەکرێکارییدا بێقسووربووم‌و تەنەخییم تێدانەدەکرد، لەیادمە هەندێك لەهاورێکانم کە کرێکارییان دەکرد، خۆیان دەخافڵاند، یان چیمەنتۆ کە ئێواران دەمایەوە، لەبن لمەکەیان دەکرد، بۆ بەیانی دەبوو بە شاخ! ئەوانیش نەدەهاتنەوە بۆ ئیش کردن لەو شوێنە، پێم دەگوتن: ئەوە گوناهە، کابرا زیانی لێدەکەوێ، با پێی بڵێین، دەیانگوت: نابێ پێی بڵێین، چونکە ئەگەر پێی بڵێین دەبێ ماوەیەکی دیکەش کار بکەین، واتە زیاد لەکاتی دیاریکراو "کە دیارە ئەوەش ستەمێك بوو لە کرێکارەکان دەکرا"، بەڵام من زۆر بەبێ فێڵیی ئیشم دەکرد، بۆ ئەوەی پارەکەم حەڵاڵ بێ، رۆژێك کارم دەکرد چیمەنتۆم بۆ دوو وەستا دەبرد، کە خۆی دەبێ چیمەنتۆ بۆ یەك وەستا ببەی، من بۆ هەردووکیانم دەبردو بە تین‌و

تاقەتیشبووم، دەشـمگوت: با پارەکەم حەڵاڵ بێ، یەکێك لە وەستاکان گوتی: خێراکـە ڕۆڵە، منیش هەر خەریکبووم و لە ئارەقدا ڕەش بووبـووم، زۆر مانـدووبووم، ئیشـی دوو کرێکارم دەکرد، چووم تاسە چـیمەنتۆیەکەم پێبـوو، گـوتم: وەسـتا! یـەکجاری دیکـە بڵێی: ڕۆڵە، ئەم تاسە چیمەنتۆیەت بە تەپڵی سەردا دەدەم! گوتی: بۆچی کاکە؟ گـوتم: لەبەرئەوەی من ئیشی دوو کارێکارتان بۆ دەکەم، کەچی تۆش وادەڵێی! من ڕۆڵەی کەس نیم، ڕۆڵەی بابی خۆمم، گوتی: کاکە ئـەوە لـەڕووی خۆشـەویسـتییەوەیە، ئنجا کـە چیمەنتۆی لێـدەبڕا، دەیگوت: ئاخر چۆن دەبێ نەوێـری بڵێـی کاکـە وەرە! وەسـتایەکی قسـە خۆشیش بوو، خەڵکی سـلێمانی بوو، دوایی گوتی: تۆ خـەڵکی کـوێی؟ گـوتم: خەڵکی ڕانیـەم، گوتی: کرێکاری وەك تۆم نەدیوە، لێرە بـە ئیعتیـادیی دەڵـێین: ڕۆڵـە، گوتم: من قبووڵم نیـەو بۆ خۆشت دەزانی من ئیشـی دوو کرێکارتان بۆ دەکـەم، گوتی: ڕاستە زۆر ئیشـکەرو ئـازای، بەڵام من بە مانـاوە وامنـەگوتوە.

❁ لەیادمە لە شوێنێکی دیکە کارێکارییم دەکرد، دەبوو بەردی نەقارِم چـاك و چەکوشـکاریی بکردایە، ئەوجار بۆ وەستایەکەم هەڵبـدایە، بەردێکم چاك دەکرد وەستایەکە گـوتی: لـەو بـەردە گـەڕێ بۆت هەڵنـادرێ، منیش لـەخۆم ڕادەبینـی کـە بـۆی بەرزبکـەمەوە، کـە تەواوم کرد، گوتم: وەستا خۆت بگرە، لەڕقی ئەوەی کـە گوتبـووی بـۆت هـەڵنادرێ، هێندە زۆر بەرز بۆم هەڵدا، بەسەر سەریدا ڕۆیشـت! گـوتی: خـەریکبوو بشـمکوژیت! گوتم: ئاخر تۆ دەتگوت: بۆت هەڵنـادرێ!

## ئەو جـۆرە کرێکـارییـانەی کردوومـن:

❁ زۆربەی هەرە زۆری جۆرەکانی ئەو ئیش و کارانەی ئەوکاتە بـاوبوون کـردوومن، وەك: جەبلـەگرتنەوە، بلۆك بڕین، بنـاغەلێدان، گەچکاریی، دارو تەختـە، بـەردی نەقـار، بەرد شکاند، ئیشی کاشـیی، لەبلغکاریی، ئیشـی خەبـاتە، دیوار دانان.

❁ جارێکیان لە سلێمانی وابزانم یەکەمجاربوو بچم بۆ کرێکاریی، دیارە پێشتر لەگەڵ بابم لە ناوچەی خۆمان کرێکاریی و فەلاحەتم زۆر کردبوو، بـەڵام لـە سـلێمانی کـە چـووم بـۆ

مەیـدانی كرێكـاران، هەركـەس دەهـات، فـوت‌و كەمچـەیەك بەلاقەدییـەوە بووایـە، دەیانگوت: ئەوە وەستایە، چاوەڕێمان دەكرد لەگـەڵ خـۆی بـمانبات بـۆ كرێكـاریی، دیاربوو چەند كەسێكمان كەس نەی بردین بۆ ئیش، یەكێك لە كرێكارەكان پێـی گـوتم: تۆ جلەكانت پاكە، بڕۆ تۆزێ خۆت بە خۆڵ بكە تاكو كە بزانن ئیشت كـردوە، لـەولاوە وەستایەك هات گوتی: كاكە ئیش دەكەی؟ گوتم: بەڵێ بۆ ئیش ڕاوەستاوم، گـوتی: چ ئیشێك دەزانی؟ گوتم: هەموو ئیشێك دەزانم، ئنجا لەگەڵ هەركەسیش ئیشـم بكردایـە، دەیانگوت: لەگەڵمان نابی بەكرێكاریی دایـمیی؟ دەمگـوت: نـا، تـەنیا پێـنج شـەممان‌و جومعان كرێكاریی دەكەم، لەبەرئەوەی قوتابییم، ئنجا كە كرێكارییم دەكـردو پارەكـەیم دەستدەكەوت، دەگەڕام كام كتێبەم پێویستبووایە دەمكڕیی‌و دەگەڕامەوە، وە لە ماڵـەوەش یارمەتی براو خوشكەكانیشم دەدا، بابیشم هەر بە كولەمەرگیی‌و كرێكاریی‌و جوتیـاریی‌و نیوەكاریی ژیانی دەگوزەرا، بۆیە گلەییم لێنـەدەكرد.

❁ بیرەوەرییەكی خۆش‌و ناخۆش: لەو ماوەیەدا كە لە سلێمانی بووم، پێنج ساڵ بوو، بـابم "بەڕەحمەت بێ" یەكجار هات بۆلام، ئەویش ئەوجارە عائیشـەی خوشـكمیان داوا كـرد بوو ، هاتبوو بزانێت من ڕام چییـە؟ منیش گوتم: مادام ئێـوە پێتـان چـاكە، منـیش پـێم باشە، قوتابییەكانی دیكە بابیـان دەهات بۆلایان‌و پارەیان بۆ دەهێنان، منیش تۆزێـك دڵـم لە خۆم دادەما، دەمگوت: كـەس نایـەت بـۆلام، بـەڵام چـونكە هـەموو سـاڵ یەكـەم دەبووم، زۆر گوێم پێنـەدەدا، دوایی دەچوومەوە دەمگوت: بابە! فلانكـەس بـابی هـات پارەی بۆ هێنـا، كەچـی بەقـەراریش دەرچـوو! دەیگـوت: قـەیناكا ڕۆڵـە ئێمـەش لێـرە مەشغوولێن.

## پەككەوتن لەسـەر كرێـی سـەییـارە:

جارێكیان چوومەوە بـۆ مـاڵ‌و لەوسـەرەوە كرێـی سـەیارەم پێنـەبوو پـێ بێمـەوە! كرێـی سەیارەش لە ڕانییـەوە بۆ سلێمانی دینـارێك بوو، بە كەمییش دەچوومەوە، لەبەر كەم پارەیی‌و سەرقاڵیی خوێندن‌و خوێندنەوە، هاوڕێـكانم هـەیانبوو هـەموو مانگێـك دەهاتـەوە، دایكـم

"بەڕەحمەت بێ" گوتی: باپیر! عەلی دەچێتەوەو پارەشی پێنیە، بابیشم یان پارەی پێنەبوو، یان پێی بوو، بەلاّم بۆ مالّ پێویستی پێبوو، بەهەرحالّ گوتی: پێم نیە، شتی زەروورتر هەیە، دایكیشم گوتی: ئاخر هەموو سالّێك یەكەمەو با بچێتەوە، ئەویش گوتی: ئاخر ئیمكانیەتمان نیەو لەگەلّ من كرێكاریی بكات باشترە! دایكم "بەڕەحمەت بێ" گوتی: رۆلّە خۆت نیگەران مەكە، ئەنگوستیلەیەكی زێڕی هەبوو، چوو بۆی فرۆشتم بە چوار دینار، دوو دیناری دا بە منو گوتی: ها رۆلّە! دینارێكی بدە بەكرێی سەیارەو، ئەوی دیكەشی بۆخۆت خەرج بكە.

## داڕێژرانی هێلّە گشتییەكانی فیكرو تێگەیشتنم لەبارەی ئیسلامەوە:

ئەو پێنج سالّەی سلێمانی تارادەیەكی زۆر كەسایەتی منیان لەڕووی فیكریی و رۆحییەوە دارشت، دیارە سوودیشم بینیوە لە مامۆستایەكانم، بەلاّم زیاتر ئەوەی كە سوودم لێبینیوە، هەولّی خۆم بووە، وە سوودم لە نووسینی زانایان و پێشەوایانی رابردوو، یان هاوچەرخ كە بەخزمەتیان نەگەشتووم، بینیوە، بۆ نموونە: (محمد سعید رمضان البوطي) كتێبەكەی "فقه السيرة" مەنهەجمان بوو، هەروەها كتێبەكانی (شیخ محمد الغزالي)و كتیبەكانی (سید قطب) و (محمد قطب) و(أبو الأعلی المودودي) و (أبو الحسن الندوي)و كتێبەكانی (وحیدالدین خان) "الإسلام یتحدی"، وە كتێبەكەی (عفیف عبدالفتاح طبارة) "روح الدين الإسلامي" وەك گوتم: كەسێكی وانەبوو لەوكاتەدا من بانگ بكات بۆ رێكخراوو بەرنامەیەك، كە ئەمەش بە فەزلّێكی خوای بەخشەر دەزانم، كە هەر لە سەرەتاوە تێگەیشتنم بۆ ئیسلامو شێوەی پابەندییم بە ئیسلامەوە، مۆركی هیچ قوتابخانەیەكی فیكریی دیاریكراوی وەك: سەلەفیی، سۆفیی، ئیخوانیی،... هتدی پێوە نەبێو ئیعتیمادم لەسەر قورئانو سوننەت بوو، دەمارگیرییشم بۆ كەس نەبوو، بەگشتی سوودم لە كتێبی زانایان دەبینیو، تەسلیمی موتلّەقی هیچ كەسیش نەدەبووم، ئەوە نەبوو هەركەس هەرچی گوت، تەسلیمی بم.

# هەندێك بیرەوەریی ئەو ماوەیە كە لە دووی نێوەندیی پەیمانگای ئیسلامیی بووم، تاكو شەشی ئامادەیی، لە (١٩٧٦) تاكو (١٩٨٠)

## ئیشوكارم لە كاتی پشووی هاویناندا :

پێشتریش گوتم: هاوینان دەگەڕامەوە ماڵی بابم، هەركارێك هەبووایە تووتنەوانیی، گوڵەبەڕۆژەوانی، بامیەو تەماتەكردن، كونجی و نۆكو نیسك ڕنین، دروێنەی گەنمو جۆ... هەرچی هەبووایە دەمكرد، وە لەو ماوەیەدا كە دەچوومەوە بۆ ڕانیە، زیاتر لە مزگەوتی گەورەی ڕانیە دەبوومو، خەریكی كتێب خوێندنەوەو قورئان خوێندن دەبووم، ئەوكاتەی مامۆستا مەلا شێخ كەمال برای مامۆستا بەهائەددین نووریی لەوێ بوو، خەتیبی مزگەوتی گەورەی ڕانیە بوو، هەروەها مامۆستا مەلا ئەحمەدی سكتانیی، مامۆستا مەلا سەید كاكەو، مەلا سەید سولەیمانو، مامۆستایانێكی دیكەی ناوچەكە دەهاتن، منیش بەحوكمی خوێندنی پەیمانگای ئیسلامیی و ئەو شارەزاییەی كە هەمبوو، لەگەڵ مامۆستایان تێكەڵ دەبوومو سوودم لێدەبینین.

## دامەو نۆ ڕیزكینەكردنی مامۆستایانو بیانوویەكی بێجێ :

من ڕەمەزانان خۆم تەرخاندەكرد بۆ تاعەتو قورئان خوێندنو ڕۆژووگرتن، مامۆستایانێك كە لەوێ بوون لە مزگەوتی گەورەی ڕانیە، خەریكی (دامە)و (نۆڕیزكێنە) دەبوون، كە دوو جۆرە یاریی فیكریین، وەك شەترەنج، منیش دەمگوت: مامۆستایان بۆچی خۆتان بەووە خەریك دەكەن؟ دەیانگوت: فلان كەس! ئەوە باشترە لەوەی غەیبەت بكەین، منیش ڕۆژێك گوتم: مامۆستایان! ئێوە هەموو جارێك عوزر بەوە دێننەوە، ئنجا

خۆ فەرز نیـە، یان (نۆرپزکێنـە) و (دامە) بکـەن، یان غەیبەت بکــەن؟ قورئـان بخوێننـەوە، موتالاّ بکەن! ئەوانیش سەیری یەکدییان کردو گوتیان: وەڵلاّهی قسەکەت ڕاستە.

## خـەڵك شـارەزاكردن‌و فێـركـردن:

هـەر لـە سـەرەتاوە هانـدەرێکم هـەبوو ئـەو زانیارییانـەی وەرمـدەگرتن، بـە خەڵکیـم دەگەیاندن، ئێستاش زۆرکەس دەبینم هەیە لەنێو حیزبەکانی دیکەیە، هەیە ئیسلامییـە، هەیە ئەهلی کەسابەتە، دەڵـێن: فلاّن کەس دەبینم هەیە لەنێو حیزبەکانی دیکەیە، هەیە ئیسـلامییە، هەیە ئەهلی کەسـابەتە، دەڵێن: فـلاّن کـەس! ئەوکاتـەی تـۆ لـە مزگـەوتی گـەورەی رانیـە دەرست پێدەگوتین، ئەوکاتـە سـوودمان لــێ بینیــوی‌و ئـەو ڕچـەیەی لەوکاتـەوە لەسـەری بووین، هەر بەردەوامین‌و کاریگەریی لەسەرمان بووە.

## فتـوایەكـی سـەیـر:

ڕۆژێك کابرایەك هات بۆلام گوتی: فـلاّن کـەس! کێشــەیەك لێـی ڕوویداوم، دەمــەوێ بۆتـی باس بکەم، گوتم: فەرموو، گوتی: دوێنـێ لەبیرم چووە نییـەتی ڕۆژوو بهێنم، چووم بۆلای مامۆستا فلاّن کـەس "نـاوی مامۆسـتایەکی هێنـا کـە ئێسـتا بەرەحمـەتی خـوا چـووەو پێمخۆش نیــە ناوی بهێنم" پێمگوت بەڕۆژووم، بەلاّم لەبیرم چووە نییــەت بهێنم، ئەویش پێیگوتم: نابێ ڕۆژووەکەت بشـکێنی‌و بۆشـت حیسـاب نیـەو وەك بـەرازی دەمبەسـتراوی، چونکە نییەتت نەهێنـاوە! گوتی: ئنجا ئێستا بەلامەوە گرنگ نیـە ڕۆژووەکـەم حیسـاب نیـە، دەیگرمەوە! بەلاّم بۆچی بووم بـە بـەرازی دەمبەسـتراو؟ منـیش پێکـەنیم‌و گـوتم: بەراسـتی مامۆسـتا فتوایـەکی سـەیری داوە! لەوکاتـەدا (منهـاج)ی (ئیمـام نـەوەویی)یم لـەلابوو، مەنهەجیشـمان بوو لە پەیمانگا، لە باسی نییـەتی نوێژو ڕۆژوودا دەڵێ: (ویندب التلفظ بها ومحلها القلب) واتە: سوننەتە نییـەتەکە ببێـژرێ‌و شوێنی نییەتیش دڵە، ﴿دیـارە کـە دەڵـێ: سوننەتە نییــەتەکە گۆ (تلفـظ) بکەی‌و ببێـژی، هیچ بەڵگەیەکی نەهێناوەتەوە﴾، گوتم: ئایـا لەوکاتەوە بەربانگت کرد، هەتا نوێژی بەیانی، بەدڵتـدا نەهات بەیانی بەڕۆژوو بی؟ گـوتی:

پارشێویشم كردوە، تەنیا لەبیرم چووە بڵێم، نییەتـمە بـەیانی بـەڕۆژوو دەبم، گـوتم: بـەس نییەتی ئەم ڕۆژووەت بەشـێوەیەكی ڕێك و شـەرعیی هێنـاوە، هـەر بـەدڵ نییـەتت هێنـاوە، چونكە شوێنی نییەت دڵەو گوتنـی نییەتەكـە نەك فەرز نیە، هەر سوننەتیش نیە، بەڵام ناشڵێم هەر كەس گوتی: نییەتـمە وا دەكـەم، نییەتەكـەی دانامـەزرێ، بـەڵام زانایـان گوتوویانـە: پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" لێی نەبیستراوە بـۆ هـیچ عیبـادەتێك فـەرموویێتی: نییـەتم هەیـە وا دەكەم، جگە لە حەج و عـومرە كـە نییەتەكەیـان بـە دەنـگ دەردەبـڕرێ، لەكـاتی بەسـتنی ئیحرامدا، گوتم: ڕۆژووەكەت زۆر ڕێكـەو إن شـاء الله تاعەتەكـەشـت قبوولـەو خەمـت نەبێ.

### گڵـی دوور دەرمـانە :

ئەوكاتە زۆر هاوڕێم هەبوون كە لەمن بەتەمـەنتربوون، هەنـدێك ئامۆژگـارییم دەكـردن، لەوبارەوە كە لایـەنی نەتەوایـەتیی و كوردایـەتییان وەك فیكـرەو مەبـدەئێك تەبـەنیی كردبـوو، دەمگوت: ئینسان ئەگەر مسوڵمانی باش بێ، كوردی باشیشـە، پێویست ناكات بڵێین دەبـێ بە فلان حیزب، هەستم دەكرد كارتێكراوبوون بە یەكیەتیی و پارتی و هەنـدێك لـەو حیزبانـە، دەیـانگوت: ئـاخر وانـەبێ كوردایەتیـی نـاكرێ! منـیش ئەوكاتـە لـە كوردسـتاندا زاراوەی ئیسـلامیی دانەهاتبوو، بەڵام دەمگوت: دەكرێ هـەر پابەنـدبین بـە شـەریعەتەوەو دیفـاع لـە میللەتی خۆشمان بكەین، چـونكە ئیسـلام وادەڵـێ، بـەڵام ئـەوان بـە عەقڵیانـدا نەدەچـوو، دەیانگوت: ناگونجـێ كوردایـەتیی بكـەی و یەكێتـی، یـان پـارتی، یـان شـیوعیی نـەبی، هەندێـك لەوانە چـەند ساڵێك لەپێش منەوەبوون، پاشان چـوونە زانكـۆ لـە بەغـداد، دیـارە دكتۆر موحسین عەبدولحـەمید دەرسی پێگوتبوون، یەكێكیان نامەیەكی بۆ نووسیبووم: فـلان كەس ئەوەی تۆ پێتدەگوتین، لێـرە تێیگەیشـتین ڕاسـتە، ئینسـان ئەگـەر ڕێبـازی ئیسـلامیی گرت، بۆ بەرگریی لە میللەت و نیشتمانی، پێویست ناكات بـبێ بە شـتێكی دیكـەو ئیسـلام هـەموو شتێكی تێدایە، منیش لە وەڵامیدا بۆم نووسیبوو: گڵی دوور دەرمانـە! كـە پەنـدێكی پێشـینانە، ئەوەی من لێرە پێمدەگوتن، دیارە لە بەغـداد لێی حاڵی بوون كە ڕاسـتە، ئـەوەی

من لەبەرئەوەی خۆکردیی و خۆماڵیی بوو، زۆر متمانەتان پێنەبوو، بەهەرحاڵ لە بەغداديش تێیگەشتبن هەر باشە! کە ئەوە زۆرجار وایە، من شت بە کوردیی دەنووسم، هی واهەیە هەمانشت ئەگەر لە کتێبێکدا بە عەرەبی بیخوێنێتەوە، دەڵێ: دیارە ئەو شتە وایە، مەلای گەورەی کۆیە، دەڵێ: کوردییەو خۆکردییە، لەبەرئەوەی بە کوردیی نووسراوەو خۆکردییە، لەلایەن کەمبایەخە، ئەگەر بە زمانێکی دی بنووسرێ، شتێکی دیکەیە، ئەوەش هۆکارەکەی هەستکردن بەکەمیی، یان متمانە بەخۆنەبوون و شتی خۆ پێکەمبوونە، من کتێبێکم هەیە بەناوی (رێگای ساڵح بوون و بەرەو خوا چوون) کە هەتا ئێستا پێنج جار چاپ کراوەتەوەو تەرجەمەی عەرەبیش کراوەو چاپ و بڵاویشکراوەتەوە، هەندێك لە خوێنەران لەبارەیەوە پێیانگوتووم: فلان کەس! کتێبی دیکەمان لەوبارەوە لەبارەی تەزکییەی نەفسەوە زۆر خوێندوونەوە، بەڵام هەندێك مەسەلە لەوەی کە تۆ لەو کتێبەتدا باستکردوون، لەو کتێبانەدا دەستمان نەکەوتوون، مرۆڤ پێویستە ڕواڵەتبین نەبێ، وەك گوتراوە: (أنظر إلى ما قيل ولا تنظر إلى من قال) تەماشا بکە چی گوتراوە، نەك کێ گوتویەتی! زۆرجار ئەو پەندە کوردییە تەواوە " گڵی دوور دەرمانە! " .

## بەهێزکردنی لایەنی ڕووحیی بۆ پارێزران لە خلیسکان و لادان :

ئەوکاتە لە سلێمانی مشتومڕو ململانێیەکی فیکریی بەهێز هەبوو، چ لە ڕووی نەتەوایەتییەوە لەنێوان پارتی و یەکێتیدا، وە چ لە ڕووی هێڵی فیکری مارکسیی و هێڵی فیکری دیکەدا، بۆ وێنە: لەنێوان مامۆستا مەسعوود موحەممەد کوڕی مەلای گەورەی کۆیەو هەندێك لە چەپگەراییەکاندا، مەسعوود موحەممەد ئەوکاتە کتێبەکانی: (مرۆڤ و دەورووبەر) و (حاجی قادری کۆیی) نووسی، نەیارەکانیشی بە نووسینی کتێب و وتاری گۆڤارو ڕۆژنامەکان، وەڵامیان دەدایەوە، منیش کەم و زۆر کارتێکراودەبووم بەو ململانێ فیکرییانە، خۆیشم توانای ئەوەم نەبوو دەستبگەیەنمە سەرچاوەکان، ئیدی ئەو حاڵەتە زۆر جار پاڵی پێوەدەنام کە قەرەبووی ئەوە بکەمەوە، بەزۆر لە خوا پاڕانەوەو عیبادەتکردن، چونکە زۆربەی مرۆڤەکان بەقۆناغی گوماندا بەرەو یەقیندا دەڕۆن، بەڵام من هیچ کاتێك

نەگەیشتوومە ئەو قۆناغەی گومانم لە بوونی خوای بەدیهێنەرو رۆژی دوایی هەبێ، ئەوانەی كە گفتوگۆم لەگەڵ دەكردن، زۆر مەسەلەیان باس دەكردن، كە بۆ من دەبوون بە هاندەرو پاڵنەر تاكو زیاتر هەوڵ بدەم، ئنجا هەندێك جار لەڕووی فیكرییەوە ئیشكالەكەم بۆ حەلنەدەكراو، دەستم نەدەگەیشتە ئەو سەرچاوەو كتێبانەی كە وەڵامی ئەو پرسیارانەیان تێدایە، بۆیە هەوڵم دەدا بە بەهێزكردنی لایەنی ئیمانیی و مەعنەویی قەرەبووی ئەوە بكەمەوە، كە مەگەر چۆن ئەگەر نا شەو نوێژم نەدەچوو، هەروەها بەیادی خواكردنو نوێژی بە كۆمەڵو رۆژووی دوو شەممەو پێنج شەممە، خۆم لە ڕووی غەریزەی جینسییەوە دەپاراست، دەتوانم بڵێم ئەو پێنج ساڵەی لە سلێمانی بووم، جارێك بە مەبەستو بە حەرام تەماشای ئافرەتم نەكردوە، كە لە تۆغیانو تافی لاوێتیدا بووم، چونكە وەك پێشتر گوتم: لە تەمەنی چواردە پازدە ساڵییەوە تاكو هەژدەو نۆزدە، لە سلێمانی بووم، ئەوەش فەزڵی خوای بەخشندەبوو، وە ئەو تاقیكردنەوەیەی بۆ یوسف "علیه السلام" هاتۆتە پێشو خوا بە پاكیی دەریچواندوە، نەك جارێك، چەند جار ئەوەم بۆ هاتۆتە پێش و خوای بە بەزەیی یارمەتی داوم كە باش خۆم كۆنترۆڵ بكەم، وە ئەوكاتە وەك پێشتریش گوتم: زۆر سوودم لە كتێبەكانی ئەبوحامیدی غەززالیی، وەردەگرت، بەتایبەت كتێبی (إِحياءُ علوم الدين) وە لەكتێبی (مدارج السالكين)ی (ابن القيم) و (عطاء الله السَّكندري) بەناوی (إيقاظ الهمم في شرح الحِكَم) زۆر بەهرەمەندبووم، كە مەتنەكەی (الحكم العطائية)یەو شەرحێكی لەسەر كراوە، لەلایەن (ابن عجيبة)وە بەناوی (إيقاظ الهِمَم) كە ئەو كتێبەم لە مامۆستا مەلا حوسێنی دەشتێویی وەرگرت "هەزار ڕەحمەتی لێبێ" وە لە كتێبی (الرسالة) ی (قُشَيري)و كتێبی (عوارف المعارف)ی (سُهروردي)یش بەهرەمەندبووم.

بەڵێ سوودی زۆرم لەو كتێبە ڕووحییانە دەبینی، هەرچەندە داهێنان (إبتداع)و كەمو زیادیشیان تێدایە، وەك لە كتێبی (ڕێگای ساڵحبوونو بەرەوخواچوون)دا باسمكردوەو ئەزموونی بواری تەزكییەو بەرەوخوا چوونی خۆم تێدا تۆماركردوە، وە ئەو لایەنە رووحییە زۆر هاوكارو پارێزەرم بوو، بۆ تووش نەبوون بەهەڵەو كەموكوڕیی، هەر لە گچكەیی تا گەورەیی، ئەوەش بەخششێكی خوای بەخشەرە لەسەرمو بە ئازایەتی خۆمی

نازانم، وەك خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴿٥٣﴾﴾ النحل، واتە: (هەر چاکەیەکتان هەبێ هەر لە خواوەیەو هەرکات نارەحەتییەکیشتان تووشبوو، تەنیا پەنا بەو دەبەن).

لێرەوەش ئامۆژگاریم بۆ گەنجەکانمان بە هەردوو ڕەگەزەکەوە، ئەوەیە کە ئەوەی بیەوێ پارێزراوبێ لە بەرانبەر ئارەزووان (شهوات)و گومانان (شبهات)دا، دەبێ خەم لە لایەنی ڕووحیی خۆی بخوات، کە مەبەستم زۆرشتە، بەڵام بەر لە هەموو شتێك پێنج نوێژە فەرزەکان، کە سوونەتەکانیان لەگەڵدا بکرێن، شەو نوێژ بەتایبەت زۆر کاریگەریی هەیە، لە قووڵکردنەوەی ئیماندا، لە قووڵکردنەوەی ئیخلاسدا، کاتێك کە خەڵك خەوتوە، خۆت لەگەڵ خوادا ڕازو نیازو گفتوگۆ دەکەی، ئەو ئایەتانەی کە لە شەونوێژدا دەیخوێندرێن تاموچێژێکی دیکەیان هەیە، بەتایبەت ئەگەر ئینسان قورئانی لەبەربێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾﴾ المزمل.

واتە: بێگومان ئەو نوێژەی لە شەوگاردا دەکرێ، کاریگەریی بەهێزترە (لەسەر خاوەنەکەی) باشترو ڕاستریش قورئانی تێدا دەخوێندرێ.

بەڵێ ئەو نوێژەی بە شەو دەکرێ، زۆر کاریگەریی زیاترە لەوەی بە ڕۆژ دەکرێ، هەروەها لەبارەی ڕۆژوو گرتنەوە، حەدیسەکەی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" کە دەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ﴾ رواه البخاري ومسلم.

واتە ئەی کۆمەڵی گەنجو لاوان! هەرکەس لەئێوە توانی با هاوسەرگیریی بکات، چونکە ئەوە بۆ گرتنەوەی چاو لە نەزەری حەرامو پاراستنی داوێن باشترە، وە هەرکەس نەیتوانی با بەڕۆژوو بێ، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئارەزووی، واتە بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە ئینسان دەتوانێ زیاتر کۆنترۆڵی ئارەزووی خۆیبکات.

بەڵێ ئەو فەرموودەیە بەڵگەیەکی پتەوە بۆ ئیسپاتی ئەوەی گوتمان.

شـاعیـرێك دەڵــێ:

إن الشــباب والفـراغ والجـدة مفســدة للمــرءِ أي مفســدة

واته سێ شت ئینسان زۆر بـەرەو فەسـادو خراپـە هـان دەدەن "گـەنجێتی و دەستبەتاڵیــی و هـەبوون " .

ئنجا وەك دەرس و عیبرەت بۆ گەنجەکانمان، دووپاتی دەکەمـەوەو دەڵـێم: ئینسـان ئەگـەر بیەوێ بەرانبـەر رەشـەبای ئارەزووەکـان (شـهوات) خۆڕاگربـێ، بەهـەموو جۆرەکانیانـەوە بەتایبەت ئارەزووی جینسیی، هەروەها بەسەر گومانـان (شـبهات)دا زاڵ و سـەرکەوتووبێ، دەبێ دڵنیابێ کە بەهۆی تاعـەت و عیبادەتـەوە، ئیمـانی دامـەزراوتر دەبـێ و رەوشـتی قـایمترو مەحکەمتر دەبێ و بەسەر ئارەوزوویدا زاڵتـر دەبێ، لە شوێنی خراپ بەدووردەبێ.

۞ ئەوکاتە جاری وابوو کە ئیشکالێکی فیکـرییم بـۆ دروسـت دەبـوو، لەگـەڵ شـیوعیی و مارکسـییەکاندا، دواتر هەڵدەستام پەنام دەبردە بەر خواو شـەونوێژم دەکـرد، شـەوی وا هەبووە، تا بەیـانی نەخەوتووم، جاری وا هەبووە بۆ ڕاهێنـانی نەفسـم لەسـەر تاعـەت، "ئەوکاتە لە حوجرەی مزگەوت بووم" کاتێك جێورەکە دەخەوت، من تا بـەیانی لەبـەر باران شەونوێژم دەکرد، دیارە ئێسـتا خۆم بەهەڵە دەزانم کە وامکـردوە ـ واتە: کـە لەبـەر بارانی زستان تا بەیانی وەستاوم ـ، هەرچەندە بۆیە وامدەکرد کە خوا بەزەیی زیـاتری پێدا بێم، وە جاری وابوو لە خەودا بەلُگەیان فێردەکردم، هەستم دەکرد دوو فریشـتە لـەنێوان خۆیاندا وتووێژیان دەکردو دەیانگوت: ئەگەر ئەو پرسیارە کرا، ئەوە وەلاّمەکەیەتی.

۞ لە سۆنگەی ئەوەوە ـ وەك پێشتریش باسمکرد ـ کە لەرووی ماددییەوە حاڵم باش نەبوو، جاری واهەبوو بۆ بـەربانگ هـیچ نـەدەبوو بیخـۆم، رۆژێکیـان زۆر برسـی بـووم و بـۆ بەربانگ لە حوجرەکەدا هیچ نەبوو بیخۆم، عیززەتی نەفسیشم زۆر بوو، لە برسا مردبـام داوای هیچم لە کەس نەدەکرد، لەبیرمە ئەو رۆژە بەخەمـەوە، هەرچـەندە هـەرگیز دوای عەسران نەدەخەوتم: ، بەلاّم لەکاتی خوێندنەوەدا بەخەمەوە خەوم لێکەوت، لە خەومـدا خواردنێکیان دامێ، بۆ بەربانگ ئەوە هیچ کە هەسـتم بـە تێریـی و تێراویـی دەکـرد، بـۆ

سبەینێش هەستم بـەتێرو تەسـەلیی دەکـرد، ئـەو حاڵەتـە ڕووحییانـەش لـە دوو ڕووەوە سوودیان پێــدەگەیاندم:

١) کە لە هەڵەو کەموکوڕیی بـمپارێزن.

٢) لە ڕووە فیکرییەکەوە بەهێزتـربم.

دیارە پرسیاری فیکریی بە موتاڵەعەو تەحقیقاتی فیکریی وەڵامدەدرایـەوە، بـەڵام مـن دەستم بە کتێـبەکان ڕاندەگەشتو پەنام بۆ ئەو لایەنە ڕووحییـە دەبـرد.

۞ بەبیرم دێ لەسەر خۆم دەکرد بەعەهد کە نابێ نەزەر بکەم، غەیبـەت بکـەم، دڵـی هـیچ کەس عاجز بکەم، نابێ هیچ قسـەیەك بکەم خەڵك دڵی نارەحەت بێ، کە شەو دەچوومە سەرجێگا، بەبیری خۆم دەهێنایـەوە بـزانم چـیمکردوە، ئەگـەر هەڵـەو کەموکوڕییـەکم هەبووایە سزای خۆم دەدا، بەو جۆرە ئیشم لەسـەر خـۆم دەکـرد، ئەوکاتـەش لەکتێبـدا دەمخوێندەوە کە دەبێ هەموو کەس شـێخێکی هـەبێ، هەنـدێك لـە شـێخو خەلیفـەکانی ڕێبازەکانی قـادریی و نەقشـــبەندییم دەبیـنین، بـەڵام نەدەکەوتنـە بـەر دڵـم، کـە بتـوانم سـوودێکیان لێببـینم، کە ڕەنگە ئەوکاتە من ئاستەکەم وانەبووبێ، لەبەر ئەوە زیـاتر داوام لە خوا دەکردو دەگەڕامەوە بۆ قورئانو سوننەتو ئەو کتێبـانەم دەخوێندەوەو، بە کردەوە ئیشم لەسەر خۆم دەکرد.

۞ ساڵی (١٩٧٩ـ ١٩٨٠) لەمزگەوتی (مەولەویی) بووم لە خزمەت مامۆستا مەلا حوسێنی دەشتێوێ لە حوجرەکەیدا بووم، کە ئەوکاتە مامۆسـتا مـەلا ئەبوبـەکری سـددیقییش لـە دێیەك بوو لە بەرانبەر پیرەمەگروون بە ناوی (سابووراوا) مەلا بوو، ئـەویش دەهـات بـۆ لای مامۆستا مەلا حوسێن دەرسی دەخوێند، دیـارە مـن بـەرەسمیی لای مامۆسـتا مـەلا حوسـێن دەرسـم نەدەخوێنـدو تـەنیا لەحوجرەکەیـدا بـووم، بـەڵام سـوودم لێـدەبینی، ڕۆژێکیان گوتم: مامۆستا! دەبێ دەرسی (نحو)و (صرف)م پێ بڵێی، دوو سێ جار لـێم دووبارە کردەوە، دیاربوو مامۆستا زۆر سـەرقاڵبوو، زیادە لوتفیشی دەدا بە من، ئەوکاتە خەریکی خوێندنەوە بووم گوتی: چی دەخوێنیتەوە؟ گوتم: تەفسیری (روح الـمعــاني)

دەخوێنمەوە، گوتی: ئەو عیبـــارەتەم بـۆ بخوێنـەوە، لاپەڕەیـەك بـوو، کـە خوێندمـەوە تەماشـــایەکی کــردمو گــوتی: ئەوەشـــم بــۆ بخوێنـــەوە، پــاش خوێندنــەوەی ئــەوێش تەماشایەکی دیکەی کردمو گوتی: بڕۆ پێویسـتیت بـە(نحو)و (صـرف) خوێنـدنی دیکـە نیە، گوتم: بۆچی؟ گوتی: (نحو)و (صرف) بۆ ئەوەیـە کە عیبـارەتی پێ بخوێنیتەوەو تۆ پێویسـتیت پێی نیــە.

مامۆستا مەلا حوسێن ئیجازەدراو (مُجاز)ی مەلا موحەممەدی گەلاڵیی بـوو، ئەوکاتـە لـە سەردەمی خۆیدا مامۆستایەکان دەهاتن فتوایان لەو وەردەگرت، مامۆستایەکی زۆر مەشهوور بوو، خەڵکی گوندی (دەشـتێوی) لای قەڵادزێ بوو، ڕۆژێك گوتی: فلانکەس ئێسـتا مـن دەبینی جارجـار لەسەر پشت ڕادەکشێمو قورئان دەخوێنم؟ گـوتم: بەڵـێ، گـوتی: ئێسـتا دەمەوێ هەندێك قورئان لەبەر بکەم، پێموایە عومرمـان بەزایـــە چـوو کـە هـەر خەریکـــی (نحو)و (صرف)و هەندێك تەحقیقـــاتی زمانەوانیی بووین، کـە دەبووایـە خـەریکی قورئـان بین، هەر ئەو ســـاڵەش مامۆسـتا وەفاتی کرد، پاش وەفاتیشی دوو جار خـەونم پێـوە بـینی، پێــی دەگوتم: ڕۆڵە وەك پێمگوتی: (هەر لەگـــەڵ قورئانێ خەریك بـە، ئـەو عـومرە بەزایـە ناچـێ کە لەگەڵ قورئاندا سەرف دەکرێ) هەڵبەتە ئەوە زۆر کاری تێکردمو ڕەنگە یەکێك لـە هانـدەرەکان کـە وایلێکـردم هـەموو قورئـان لەبـەر بکـــەم، ئـەو قسـەیەی مامۆسـتا مـەلا (حوسێن)ی دەشـــتێویی بووبێ.

# قۆنـاغی چوونـە زانكۆ لە سـالّی ١٩٨٠ -١٩٨١ دا

## دەرهێنـانی ڕەگەزنـامەو دیـدار لەگـەڵ (شـێخ ناظم العاصـي)دا :

دوای ئەوەی كە پۆلی شەشی ئامادەیی پەیـمانگای ئیسلامییم تەواوكردو ئـەو سـاڵە یەكـەم بووم، وەك لەیادم بێ تێكڕای نـمرەكانم نەوەد (٩٠) بوو، هاوینەكەی هاتـمەوە بۆ ماڵی باوم لە ڕانیە، وەك عادەتی ساڵانم، ملم لەبەر كەسابەتو فەلاحەت نا لەخزمەت باوـمدا.

وە لەو ساڵەدا پێویستیم بە ڕەگەزنامە (جنسیة) هەبوو، تا ئەوكاتە ڕەگەزنامـەم نـەبوو، لـە پشدەرەوە مامەڵەم كردو لەوێشەوە بۆ سلێمانی، لە سلێمانیش ڕەوانەی بەغدادیان كردم، ئنجا لە ڕێگای چوونم بۆ بەغداد، بۆ یەكەمین جارو دواهەمین جار، كەسـایەتییەكی گـرنگم بـینی كە پێشـتر ناوبـانگیم بیسـتبوو، لـە مامۆسـتا حەسـەنی چەمچەماڵیـی (مامۆسـتا حەسـەنی كـوردیی) ئـەویش (شـیخ ناظـم العاصـي) بـوو كـە لـە گونـدی (السَّـبعة)ی سـەر بـە دووزخورماتوو دادەنیشت، وەك پێشتریش بـاسمكرد مـن جۆرێـك لـە عـەودالّیی و تینـوێتیی رووحییم هەبوو، بەدوای كەسانێكدا دەگەڕام ئەگـەر بیسـتبام لایـەنی ڕووحیـی و تەزكییـەی نەفس و تەقوایان بەرزە، تاكو سوودێكیان لێببینم، كە بیسـتم ئەو (شیخ ناظـم)ە پیاوێكی زۆر بوێرو حەقبێـژەو قسە بە ڕژێم دەڵێ و زۆر دینـدارە، چووم بۆ گوندی (السـبعة) كە گەیشـتمە ئەوێ كاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، كاتی نانخواردن بوو، (شێخ ناظم) بەپێچەوانەی هـەموو ئـەو شێخانەی دیكە كە تائێستا بینیومن، بۆ خۆی نانی بۆ میوان دادەنا، ئەو ژەمە هەر مـن میـوانی بووم، گوتی: دانیشـە ئێستا نانت بۆ دێنم، گوتم: ڕەنگە ئێسـتا كەسێك نان بێنـێ، ئەوكاتـە تەمەنی شێخ ناظم بە مەزەندەی خۆم دەوری حەفتـا (٧٠) ساڵ دەبـوو، منـیش تەمـەنم (١٩-٢٠) ساڵ بوو، هاتەوەو ماستو گۆشـتی هێنا، هێندێك وشەی كـوردی دەزانـی، گـوتی: " كُـل گۆشت! " (گۆشت بخـۆ) منیش ئەوكاتە زۆر كارتێكراو بووم بە قسەكانی ئەبوحامیدی غەززالیـی، بۆ دنیا بەكەمگرتن و ئیكتیفاكردن بەیـەك جـۆر خـواردن، جێبەجێشـم دەكـرد،

گوتم: تەنیا یەك جۆر پێخۆر دەخۆم، گوتی: (الأكراد يحبون ماست)، كورد حەزیان لە ماستە، وشەی ماستی بەكوردی گوت، گوتم: هەر ماستەكە دەخۆم، گوتی: بۆچی؟ گوتم: وام پێخۆشە، گوتی: (أنت قريب مِنّا) واتە تۆش نیزیكی لە ئێمە، كە مەبەستی پێبواری تەزكییەو عیرفان بوو.

هەڵبەتە لەوانەی بینیومن لە ژیانی خۆمدا، هی وەك ئەوم نەبینیوەتەوە، هەم زۆر بە تەقوام دەبینیی و لەڕووی ڕووحییەوە زۆر كاریگەرم دەبینی، هەم زۆر بوێربوو، هەم موتابەعەی عیلمیشی هەبوو، بەڵام هەر ئەو ساڵە ژارخوارد كرا "رەحمەتی خوای لێبێ" جا من كە چووم گوتم: هەر هاتووم پێت ئاشنابم و گوتوویانە: جەنابت ئەهلی تەریقەتی و شێخی، گوتم: پێمخۆشە بزانم چ تەریقەتێكی؟ ئەویش گوتی: من كاتی خۆی لەسەر دەستی شێخ تەقییەددینی نەبهانیی تەمەسسوكم كردوە، بەڵام ئێستا ئێمە لەسەر ڕێبازی موحەممەدیین "نحن الآن على الطريقة المحمدية" گوتم: من هەر ئەمشەو لێرە دەبم و بەیانی دەگەڕێمەوە، ئەگەر چەند ئامۆژگارییەكم بكەی، گوتی: تۆ تا سێ ڕۆژی دیكە لێرەی، گوتم: ئاخر موعامەلاتی جینسییەم هەیەو لە زانكۆ دەخوێنم، دەبێ بچم بۆ بەغداد، گوتی تا سێ ڕۆژی دیكە تۆ لێرەی، وامدەزانی وەك تەكلیف دەڵێت لێرەبە، گوتم: ئاخر بۆم ناگونجێت، گوتی: نا سەفەرت بۆ ناكرێ! "سبحان الله" تا سێ ڕۆژ من سەفەرم بۆ نەكراو سەیارە نەهات بۆ ئەوێ، من سێ شەممە چووم بۆ ئەوێ، ڕۆژی جومعە توانیم بگەڕێمەوە، ئەو سێ ڕۆژەی لەوێ بووم هەردووكمان بەڕۆژوبووین، عادەتی وابوو، دەیگوت: دەبێت شەوو ڕۆژی خەتمێكی قورئان بكەم، بەزۆریی خۆی دەیخوێند، من و یەك دوویەكی دی لێبووین گوتی: ئێوەش دەبێ هاوكاریم بكەن، ئەگەر كەسیشی لێنەبووایە دەیگوت: هەر خۆم خەتمەكە دەكەم، دیارە زۆر ئەهلی شەونوێژ بوو، هەروەها ڕۆژووی سوننەت، پاشان ئەوەی بۆخۆی بە سوننەتی دەزانی، دەیكرد، بۆ وێنە: لەكاتی نانخواردندا دەیگوت: (إبدء بالملح واختم به) واتە: بە خوێ دەستپێبكەو بە خوێ كۆتایی پێ بهێنە! چونكە سوننەتە، لەبیرمە ڕۆژێك دەستم بۆ خواردنەكە درێژكرد، گوتی: ئەو سوننەتەمان لەبیرچوو، دەبووایە بە خوێ دەستمان پێبكردایە، پەنجەیەكمان لە خوێ بهاویشتایەو

بمانخواردایە، لەکۆتاییشدا دیسان دەبوو پەنجەمان لە خوێدابایەو بمانخواردایە، دیارە مـن هیچـم لەسەر نەدیوە کە سوننەت بێ، بەڵام ئەو بە سوننەتی دەزانـی، یـان دەیگـوت: کـە دەسـتمان شۆرد دەبێ دەست نەسڕیینەوە، ڕۆژێك دەستم شۆردو سڕیم، گوتی: نابێ! دەبـێ دەسـتت تەڕبێ کە دەست دەکەی بە خواردن، دووبارە دەستم شۆردەوە، زۆر وردبوو لەو شتانەدا کـە بۆخۆی بە سوننەتی دەزانین، مەرجیش نەبوو سوننەت بن، بەڵام ئەوکاتـە منـیش شـارەزاییم هێندە نەبوو و موناقەشەم لەگەڵ نەدەکرد.

ڕۆژی جومعە میوانی زۆری هاتن، کۆمەڵێك ئەفسەری پلەدار هاتن بۆ لای میوان بوون، دیـارە بـەرپرس بـوون، خـۆی وتـاری نـەدەدا، شـێخ (رامـي) وتاریـدا، کـە دواتـر ڕژێـم لەسێدارەیدا، پاش وتارەکە زیکریان کرد، تەسبیحێکی درێژ بوو وابزانم هەزار دەنك دەبوو، بەدەست هەموومانەوە دەهات، هەر بەپێوە زیکرەکە کـرا، هـەزار جـار (لاالـه الا الله) کـرا، حاڵەتێکی جـەزبی ڕووحیـیم هەسـتپێکرد لـەو زیکـرەدا، کـە هـەر بـەپێوەبوو، بـەڵام بـەبێ هەڵپەڕینو داپەڕین، کە بۆ یەکەمجارم بوو هەست بەحاڵەتی ڕووحیی وا بکەم.

دوای زیکرەکـە چـووینەوە مـاڵ گـوتی: دانیشـن، وەك عـادەتی خـۆی چـوو قابلەمـەی چێشتەکەی هێناو بۆخۆی یەك بەیەك نانی بۆ دانایـن، ئنجا کـە نـان خـورا، وتارێکیـدا، زۆر هێرشی کردە سەر ڕژێمو حیزبی بەعسو میشـیل عەفلەق، گـوتم: ئـەوە چـۆن وادەکـات؟ ئەدی ئەگەر ئەوانە جاسووسێکیان تێدا بێ! گوتیان: ئەوە هەر عادەتی وایە، من زۆر سـوودم لێبینـیو لەکتێبـی (ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چـوون)و لـە کتێبـی (زانایـانی ئیسـلام کـێنو چـۆنن؟)دا، وەك وەفایـەك ئامـاژەم پێـداوە، دوای ئـەوە زۆری پێنەچـوو گوتیـان: خادیمێکی هەبووە لە ڕێگای ئەو خادیمەوە ژەهرخوارد کراوەو بەڕەحمەتی خوا چوو، "خوا لێی خۆشبێ"، من سێ ڕۆژ لەوێبووم، کە وەك خۆی گوتی، سـێ ڕۆژەکـە مامـەوەو ئـەوەم بـە کەرامەتێکی زانی، دوای جومعە گوتی: شـێخ (رامی)! فلاّن کەس لەگەڵ خۆت بەرەوە بـۆ دووزخورماتوو، لەوێشەوە چوومە کەرکووكو لەوێشـــەوە بۆ بەغداد.

## سەرەتای چوونم بۆ زانكۆو چەند بیرەوەرییەكی ساڵی یەكەمم :

سەرەتای ساڵی (١٩٨٠ ـ ١٩٨١) چوومە زانكۆ، بۆم هەبوو لە كۆلێژی (آداب)و لە كۆلێژی (شريعة)ش وەربگیرێم، بەڵام من چووم بۆ (كلية الفقه)ی نەجەف، كە پێیان دەگوت: كولێژی شەریعەتو زانیارییە ئیسلامییەكان (كلية الشريعة والعلوم الإِسلامية)و (كلية الفقه) كۆلێژی فیقهیشیان پێدەگوت، ئەوانەی كە دەهاتن بۆ ئەویٚ بەناچاریی بوو، چونكە ئەو كۆلێژە كەمترین نمرەی وەردەگرت، ئەوانەی كە كۆلێژەكانی ئاداب و شەریعەت وەرینەدەگرتن دەهاتنە ئەویٚ، هەرچەندە من نمرەشم بەرزبوو، بەڵام چوومە ئەویٚ، لەیادم نییە بۆچی چووم بۆ ئەویٚ، ئەوەنەبیٚ كە ویستم لەفیكرو مەزهەبی شیعە شارەزابم، دیارە ئەو ساڵە زۆر بەناڕەحەت گوزەرا، چونكە گەرمەی شەڕی ئێران عێراق بوو، ڕژێم زۆر فشاری دەكرد لەقوتابییەكانو دەیگوت: دەبیٚ مەشقی سوپای گەلیی (الجيش الشعبي) بكەنو لەیەكێتی قوتابییان (إِتحاد الطلبة)دا بن، ئینتیماتان بۆ حیزبی بەعس هەبیٚ، منیش هەموو ئەوانەم ڕەفز دەكردنو هەر ڕەفزیشم كردن، ئەو ساڵە تەنیا لەپۆلەكەی ئێمە (٤ـ٥) قوتابییان گرتو هەندێكیان لەسێدارە دران، یەكێكیان بەنوێژی نیوەڕۆ هاتن بیگرن لەكۆلیژ، رایكرد بۆ نێو قەبرستانەكە (قەبرستانی ئیمام عەلی پێدەڵێن) بەردەمانچەیان داو بەبرینداریی گرتیان، وەزعێكی زۆر قورس بوو، من هەر خوا پاراستمی، دەرسێكمان هەبوو بەناوی (الثقافة القومية) كە هەمووی باسی نەتەوەپەرستیی و حیزبی بەعس بوو، موناقەشەم لەگەڵ مامۆستا دەكردو وەڵامم دەدایەوە، زۆركات نەدەچوومە ژوورەوە، پاشان لەویٚ قسەی خێرم دەكرد، سیٚ چوار جار هاوڕێكانم ئاگاداریان دەكردم كە ڕاپۆرتم لەسەر دەچیٚ لەبەرانبەر ئەوەدا كە ئامۆژگاریی قوتابییەكان دەكەمو بانگەواز دەكەم، پێیان وایە ئینتیمام هەبیٚ بۆ لایەنێكی سیاسی، بۆیە پێیان دەگوتم: چاویان لەسەرتە.

ئەوكاتە برادەرێكم سەرۆكی (إِتحاد الطّلبة) بوو بەناوی (صبيح إِلياس) كە ئێستا كونییەكەی (أبو جهاد)ە، پیاوێكی مولتەزیم بوو ریشی بە نەوعێك هێشتبووەوە، سمێڵی وەك بەعسییەكان بوو، لە ساڵی (٢٠١١) كە لە بەغداد بینیم، ئەویش بەهۆی هاوسەرەییەوە ناسیمەوە (ندی

السُّوداني)کە پێکەوەبووین لە ئەنجوومەنی نوێنەران (مجلس النـواب) ، ئەوکاتە لێم حاڵی بـوو کە لەبنەوە سـەربە حیزبی (الدعـوة) بووە، دوایی لێم پرسی: گـوتی: مـن تـوانیم تـا سـاڵی چوارەم بەردەوام بم‌و لە ساڵی چوارەمدا گرتــمیان، چـەند سـاڵێك زینـدانیی بـووم‌و دواتـر هەڵاتم بۆ ئێـران.

ئەو برادەرە زۆر ئاگاداری دەکردمـەوە دەیگـوت: فلانکـەس! ئەوانـە چـاویان لەسـەرتەو راپۆرتت لەسەر دەدەن، هەرچی راپۆرت لەسەرت هاتۆتە لای من دراندوومە، بەڵام وریابەو چاویان لەسەرتە، دیارە کۆمـەڵێك بـرادەری سـلێمانیو رانیـەو هەڵەبجـەو بادینانمـان لەگـەڵ بوون، بەهۆی خوێندنەوەو سەرقاڵبوون بەدەرسەکانەوە هەموویانم لەیاد نین کێ بوون، بەڵام کە ئێستا دەیانبینمەوە دەمناسنەوەو دەڵێن فلان کەس! لەوێ پێکەوە بووین.

۞ بیرەوەرییەك کە بەپێویستی بزانم باسی بکەم ئەوەیە کە لەوکاتەدا لەنەجـەف جوولانـەوەی زانسـتی زۆر بەهێزبوو، لەگەڵ ئەو هـەموو فشــارەش، چەند کتێبـێکم لـەوێ کـڕین، وەك (دائرة الـمعارف)ی فەرید وەجدییو (الـمحلّـى)ی (إبن حزم)، زۆر کتێب دەهاتنو بەنرخێکی هەرزان دەفرۆشران، کاتی خۆم بەفیڕۆ نـەدەداو بەجیـددیی دەمخوێنـد، خـۆم لەقسەی لابەلا دەپاراست، هەرچەندە شیعەکان جاروبـار قسـەیان بەئەبوبـەکرو عومـەر دەگـوت، "رەزاو رەحمـەتی خوایـان لێبـێ"، بـەڵام دوایـی داوای لێبوردنیـان دەکـردو دەیانگوت: هەر زمانمان وا ڕاهاتوە!

## کتێبەکەی خومەینیی لە کتێبخانەی کۆلیـژدا:

لە کتێبخانەی کۆلیژ کتێبم زۆر وەردەگرتن، رۆژێك چـووم تەماشـای لیسـتی کتێبـەکانم کرد، کتێبێکم بینی بە ناوونیشانی: (الحکومـة الإِسـلامية أو ولايـة الفقيـــه)ی خومـەینی، گوتم: ئەو کتێبەم وێدە، کە ناوەکەی بـینی، کـابرا چـاوی چـووە پشـتی سـەریو تـۆقی، گوتی: بێـدەنگ بـە هـەردووکمان لەسـێدارە دەدەن، چـۆن ئـەو کتێبـە لێرەیـە؟دەبێ ئێسـتا لایبەرین، گوتم: ئەوەتا لەنێو لیستی کتێبەکانتاندا هەیە، کە بینی زۆر ترسا، گوتی: بۆچیتە؟

گوتم: دەمەوێ بزانم چی تێدایەو چی گوتوە؟ گوتی: هەر بزانن شتی وا هەیە، لەسێدارەمان دەدەن، گوتم: دەباشە کتێبێکی دیکەم وێدە.

## دەرسی (أصول الفقه) و دەمارگیریی یەکی ناماقووڵ:

بیرەوەرییەکی دیکە کە بەپێویستی دەزانم باسی بکەم، ڕۆژێك دەرسی (أصول الفقه)مان هەبوو کە کتێبەکە هی (محمد رضا مظفر) بوو بەناوی (معارج الوصول الی علم الأصول) مامۆستا سەرچاوەکانی یاسادانان (مصادر التشریع)ی پێدەگوتین "الأدلة الشرعية" کە دیارە لەلای ئێمە بریتین لەم چوارە: (قورئانو سوننەتو ئیجماعو قیاس)، ئەمانە زانایان لەسەریان یەکدەنگن، بەڵام هەرکام لە (المصالح المرسلة والعُرف والإستصحاب والإستحسان، مذهب الصحابي، شرع من قبلنا) زانایان ڕای جیایان لەبارەیانەوە هەیە، بەڵام شیعە دەڵێن قورئانو سوننەتو عەقڵ، یەکێکی دیکە لەسەرچاوەکانی تەشریعیان بریتییە لە (مخالفة العامة)، منیش هەڵسام ڕەخنەم گرت، گوتم: مامۆستا ئەوە یانی چی؟ بۆچی موخالەفەی ئەهلی سوننەت بەڵگەی شەرعییە؟ لەکتێبەکەدا دەڵێ: مەسەلەیەك کە دێتە پێش، بزانە لەقورئاندا چی دەڵێ؟ ئەگەر لە قورئاندا نەبوو سەیری سوننەت بکە، ئەگەر نەبوو، بزانە عەقڵ چی دەڵێ؟ ئەگەر نا بزانە ئەهلی سوننەت چیکردوە، تۆ موخالەفەی ئەهلی سوننەت بکە، ئەوە هەقت پێکاوە! گوتم: ئاخر بۆچی موخالەفەی ئەهلی سوننەت بکەن، خوا لێتان ڕازیدەبێ؟ گوتی: نا، مەبەستی ئەوە نیە! گوتم: ئەدی مەبەستی پێی چییە؟ گوتی: (مخالفة العامة)، واتە: موخالەفەی خەڵکی عەوام، گوتم: نا، بەڵکو ئێوە ئێمە بەگشتییو ڕەشۆکیی دەزانن‌و خۆتان بەشتێکی تایبەت (خاص)، گوتی: نا وانیە، بەهەرحاڵ مشتومڕێکمان بوو، ئەو ساڵەم هەرچۆنێك بێ تەواوکرد، لەکۆتایی ساڵدا، (صبیح إلیاس) یادی بەخێرو خواپاداشتی بداتەوە، گوتی: ئەمساڵ (١٥ـ٢٠) ڕاپۆرتم کە لەسەر تۆ نووسرابوون دڕاندوون، ئنجا لە تاقیکردنەوەی سەری ساڵ لە دەرسی (الثقافة القومية)دا هەرچی لە دڵمدا پەنگی خواردبووەوە، وەك ڕەخنە لە حیزبی بەعس، هەموویم هەڵڕشتە سەر کاغەز، ئێستا بۆخۆم بیردەکەمەوە زۆرم پێسەیرە! ئەوەم پێسەیر نیە کە هەرچی لەدڵمدا بوو هەڵمڕشت‌و

نووسیم لەسەر حیزبی بەعس، لەڕووی فیكریی و عەقیدەیی و لەڕووی زوڵمـی نەتەوەییـەوە، بەڵكو ئەوەی پێمسەیرە، ئەوەیە كە دوایی چوومەوە بۆ كۆلیژ، وەك ئەوەی هیچـم نـەكردبێ! هاوینەكەی كە تەواوبووین چوومەوە بۆ رانیەو وەك ساڵان خەریكی كەسابەتبووم.

## ساڵی دووەمی كۆلێـژ: ١٩٨١ – ١٩٨٢ و ئاگاداركرانەوەم لەلایەن برادەرێكمەوە كـە بڕیاری گرتنـم لەلایەن ڕژێمـەوە دراوە:

بۆ ساڵی ئاینده، لەیادمە بەجلی كوردییـەوەو جەمەدانەیەكم لەسەر سەرم دانابوو، پێموایە ئەوە یەكەمجاربوو جەمەدانـە لەسەر بنێم، كاك سـەبیح ئیلیاس لەبەردەرگای كۆلێژ مـنی بـینی گوتی: ها فلاّنكەس ئەوە چییە؟ چۆنە هاتوویـەوە؟ گوتم: هاتوومەوە بخـوێنم، گـوتی: تـۆ دەزانی چیت كردوە؟ بڕیار دەركـراوە بتگـرن، هـەر مەچـۆ ژوورەوە، گـوتم: دەزانم چـیم كردوە، جامی غەزەبی خۆم بەسەر حیزبی بەعسدا ڕشتوە، گوتی: من ئاگادارم، هەر بتبیـنن دەتگرن، تا زووە خۆت دەربازبكـە، ئیـدی گەڕامـەوە بەغـدادو، ئـەو شـەوە لـەوێ بـوومو بەیـانییەكەی گەڕامەوە ڕانیـە، هەر كە گەڕامـەوە ڕانیـە دوو ڕۆژ، یـان سـێ ڕۆژی پێچـوو، موختاری رانیە (مام صالح) "هەزار رەحمـەتی لێبـێ" كـە خـەزووری كـاك تـەهای حـاجی زاهیر، بابی عائیشە خانی هاوسەری بوو، دەیناسیمو دۆستایەتییم لەگـەڵی هـەبوو، گـوتی: فلاّنكەس! دائیرەی ئەمن ئاگادارییان كردووم كە ماڵی ئێوەیـان پێشـانبدەم، پێموایـە بەتـەمان بتگرن، منیش هەروا خافلاّندوومن تاكو خۆت دەرباز بكەی، منیش بە باب‌و دایكمم گوت: "هەزار رەحمەتییـان لێبـێ" وەزعەكەم وایـەو دەبێ بڕۆم! ئیدی ئەوەبوو كە خۆم دەربـازكردو وەك لە حیكایەتـاندا دەڵێ "پشتم لە ئاوەدانیی كردو ڕووم لە چۆڵەوانیـی كرد".

# قاچاغبوونم و واز لە خوێنـدنی زانكـۆ هێنـانم و ڕۆشـتنم بەرەو كوردسـتانی ئێـران

سەرەتای ساڵی خوێندن لە مانگی (٩ـ ١٠)ی ساڵی (١٩٨١)دا بڕیارمدا بڕۆم و كوردستان بەجێبهێڵم، لە زێی دەربەند پەڕیمەوە بۆ بەری مەرگە، چـووم بـەرەو دێهـاتی بـەری مەرگـە: قەرەتەپەو مەمەنداواو دێلێژە، دیارە بەپێیان و بەنەشارەزایی ملی ڕێـم گـرت، بـەڵام بـەردەوام پرسیارم دەكرد ئەو ڕێیـە بۆ كوێ دەچێ؟ پارەیەكی كەمیشم پێبـوو، مـاڵی بـابم نـەداربوون، تەنیا قورئانێكی موفرەداتم پێبوو لەگەڵ ئەو جلانەی لەبەرمدابوون، بـۆ شـەوەكەی گەیشـتمە (هەڵەدن) لە چوونمدا نیوەڕۆكەی لەلای لەشـكری ئیسـلامیی بـووم، بنكەیـەكیان لەگونـدی (دۆڵەبی) لە دۆڵـی جافـەتی بـەری مەرگـە هـەبوو، تۆزێـك قسـەمان كـرد، بەرپرسـەكەیان كابرایەكی بادینی بوو دینداربوو، گوتی: ئەوانەی لەگەڵمن دەڵێن: ئەو ناوی ئیسلامییە بۆمان بووە بە بەڵا، خەڵك هاوكاریمان ناكەن! منـیش بـۆم دەركـەوت كـە جەماعـەتێكی بـۆش و بێنێوەرۆكن، ئەو كابرایەیان دینداربوو خۆشمویست، تـەنیا ئـەو قورئانـە موفرەداتـەم پێبـوو زنجیرداربوو، بە زنجیر دادەخرا، ئەوكاتە شتێكی نایـاب بـوو، دیـاربوو تـەماعی تێكردبـوو، وێمدا، گوتم: بۆ تۆ.

## شـەومانەوەم لـە (هەڵـەدن) و (وڵاغلـوو) و مشـتومڕم لەگـەڵ بەرپرسـێكی یەكیـەتی:

شەو لە هەڵەدن بووم، لەیادم نییە چوومە چ ماڵێك، بۆ بەیانی گوتیـان: ئەوانـە دەچـن بـۆ گوندی (وڵاغلوو) لەگەڵ كاروانچییاندا ڕۆیشتم، كە گەیشتمە وڵاغلـوو، بـەرپرس تیپێكـی یەكێتی كە ئێسـتاش ماوە، بەڵام ناوی ناهێنم، ئەوكاتـە بەرپرسـی تیپـەكانی یـەكێتی خـاوەن دەسەڵات و نفـووزبوون، هەواڵیان دا بۆیـە كـە گـەنجێك هـاتوە غەریبـەو نایناسـین، دەڵـێ دەمەوێ بچم بۆ ئێـران، هـەر لـەخۆوە منیـان بـانگ كـرد، ئـەو بـرادەرە گـوتی: ڕەنگـە تـۆ

جاسووس بی! منیش گوتم: نـەخێر مـن سـیخورِ نـیمو لـەئێوەش خـۆم بـەكوردتر دەزانم، گوتیان: چۆن خۆت لە ئێمە بـەكورد تـر دەزانیـت؟ گـوتم: لەبـەر ئـەوەی لـە زانكـۆ بـووم برادەرانی ئێوە هەبوون، زۆر لافـی كوردایەتییان لێدەدا، بەڵام بەرگی مەشقی سوپای گـەلیی (جیش الشـعبـي)یان پۆشیو لە (إتحـاد الطلبـــة) بوون، بەڵام مـن هیچـكام لەوانـەم نـەكرد، بۆیە نەمتوانی بخوێنمو ئێستا فەرمانی گرتنم هەیە لەلایەن رژێمی بەعسـەوە، موختـاری رانیـە ئاگاداری كردووم كە دائیرەی (أمن) دەیانەوێ بتگرن (من نەمزانیبوو كە ئەو فەرمانی گرتنە لە (منظومة الشـمال)و ئەمنی سلێمانییەوە هاتبوو، وەك دواتر باسی دەكـەم) دیـاربوو قسـەكانی منیان پێ قورسبوو، گوتی: ئەوە ئەگەر فلاّن كەس بووایە ـ ناوی بەرپرسێكی خۆیانی هێنا ـ، بێقەیدو شەرت دەیكوشتی! بەڵام من ناتكوژم، منیش گوتم: هەر لە خـۆرِا؟ یـانی هەرچـی ئێوە نەتانناسی جاسووسە؟ گوتی: ئاخر قسـەت رِەقە دەڵێی: من لە ئێوە كـوردترم، گـوتم: من ئێستا وازم لە خوێندن هێنـاوەو فەرمانی گرتنم هەیە لەلای رژێمی بـەعس، خـۆم دەربـاز كردوە، كوردایەتیی من بۆچی لەهی ئێوە كەمترە؟ (لـە خـوا بـەزیاد بێـت هـەر لـە سـەرەتای تەمەنمەوە بە عیززەتی نەفسەوە هێناومە، خـۆم لـە خـەڵكی پێزیـاتر نـەبووەو خۆشـم پێكـەمتر نەبووە) ئیدی هەرِەشەی كردو گـوتی: بیگـرن تـا دوایـی تـەحقیقی زیـاتر دەكـەین، مـەلای مزگەوتەكەش گوتی: با لەلای من بێ، لەوكاتەدا (مەلا شێخ جەلالی گاپیڵـۆن) خوا پاداشتی بداتەوە، كە لەوێ خەریكی سوڵحێك بوو، گوتی: برادەرینە مـن دەیناسـم! نـازانم مـنی لـە كوێ دیبوو، گوتی: زەمانەتی دەكەم، مامۆستای دێیەكە ئەگەر مابێ خوا پاداشـتی بداتـەوە، ئەگەر نەشمابێ خوا لێی خـۆش بـێ، شـەوێ كـە چـوومەوە ماڵیـان، گـوتی: كاكـە گیـان لەسەرەخۆبەو قسەت رِەق نەبێ لەگەڵیان، چونكە تۆزێك موناقەشەی ئیسلامو ماركسـییەتمان كرد، لێم بەرِقدا چووبوون، واپێدەچێ ئەگەر مەلا شێخ جەلال نەبووایە تووشـی ئەزییـەتو دەردەسەرییان بكردمایە، ئنجا لە هەمووی سـەیرتر ئەوەیـە كـە مـاڵی مامۆسـتاكە پەنجـەرەیان لەسەر كۆڵان بوو، گوتم: مامۆستا! با من تۆزێك باسی ماركسـییەتت بـۆ بكـەم، مامۆسـتا گوتی: كاكە بێدەنگ بە، لەسەر خۆ قسە بكە، بەخوا گوێیان لێیـێ منـیش بـەتۆوە دەگـرن، دیاربوو مامۆستا زۆر حەزەری دەكرد، ئیدی بۆ بەیانی دوو كەس دەیانویست لە ولاّغلـووەوە

بەپێیان بچن بۆ کوردستانی ئێران، واتە: لە ولاَغلووەوە بۆ (گەلاَلە)ی شینکایەتی، بە (سەفرە)و (زەروون)داو بە چۆمی هەرزنێدا بپەڕنەوە بۆ بەری (ئەشکان) بۆ ناوچەی (ئالانەتیی).

## پەڕینەوەم لە چۆمی هەرزنێو چوونم بۆ گوندی ئەشکان:

مامۆستا تەکلیفی لە دوو کەسەکە کرد لەگەڵیان بچم، یەکێکیان ناوی حەمەڕەشید بوو کەسێکی باشم دەهاتە بەرچاو، ئەویدیکەیان کەسێکی چەتوونو ناجۆربوو، ناوەکەیم لەیاد نەماوە، ئینسان ئەگەر مەحەببەتی لەگەڵ کەسێك نەبێ، ناوەکەشی لە زیهنیدا نامێنێت، ئنجا کاتێك گەیشتینە سەر چۆمی هەرزنێ، نێوانی شێوانو خەوتنان بوو، کە گەیشتینە ئەوێ، دەبوو بە بوارێدا بپەڕینەوە، ئەو کەسەی کە چەتوون بوو، گوتی: ئنجا تۆ چۆن دەتوانی لەو ئاوە بپەڕییەوە؟ گوتم: (ان شـاء الله) دەتوانم، مەلەش دەزانم، گوتی: ها، جا بەو شەوە مەلە دەکرێ؟ گوتم: منیش وەك ئێوە، گوتی: جا تۆ وەك ئێمەت بۆ دەکرێ؟ ئەوی دیکە گوتی: بۆچی بۆی ناکرێ؟ تۆ بۆچی کوڕەکە دەتۆقێنی؟ بەهەرحاڵ ئاوی چۆمەکە تاکو پشتێنێ دەهات، ئیدی تێمانکرد بۆ ئەوبەری، کاك حەمەڕەشید لە پێشەوە ڕۆیشت، من لەدوای ئەو، بەلاَم کابرای چەتوون عاسێبوو نەهات، گوتی: ناوێرم، منیش تۆزێك پێمخۆشبوو، چونکە قسەی ڕەقی لەگەڵ کردبووم، تۆزێکیشم پێناخۆشبوو گوتم: ئەویشمان لێبەجێبمێنێ باریکە، کاك حەمەڕەشید بەدوایدا چۆوەو بەهەرشێوەیەك بوو هێنای تا پەڕاندیەوە، کە پەڕینەوە گوتیان: ئنجا تۆ دەچیتە کوێ، خانەخوێت هەیە؟ ئەوکاتە کەسم لە زیهندا نەبوو، گوتم: نا، بەلاَم ماڵێك هەر دەبێت، ئەو کابرا چەتوونە گوتی: ئێمە خانەخوێمان هەیە، ئیدی (سبحان الله) لەوکاتەدا شتێکم بەبیر هاتەوە، کاتێك لەبەری مەرگەوە بەرەو (هەڵەدن)و (سەرگەڵوو) دەهاتم، لە نیزیك گوندی (شارستێن) کابرایەکی ئەسپسوارم گەیشتێ، ئەو بە سواری دەڕۆیشتو منیش بەپیادە، گوتی: کاکە بەخێربێ، گوتم: سەلامەت بی، گوتی: جەنابت کێیو بۆ کوێ دەڕۆی؟ منیش بەسەرهاتی خۆمم بە ڕوونی پێگوت، کە من فلاَن کەسمو خەڵکی پشدەرینو لە زانکۆ دەمخوێندو لەلایەن ڕژێمەوە

فەرمانی گرتنم بۆ دەرچووە و موختاری ڕانیە ئاگاداریكردووم‌و منیش هەڵاتووم‌و كوڕی فلاّن كەسم‌و لە عەشیرەتی میراودەلییم، گوتی: كەواتە: ئێمە خزمین، چونكە منیش میراودەلییم، ئەدی ئێستا بۆ كوێ دەچی؟ گوتم: جارێ نازانم، بەڵام دەچم بۆ ئێران، گوتی: با شتێكت پێبڵێم: تۆ ڕێگاكەت ڕەنگە بچێتە (گەلاڵە)و (سەفرە)و (زەروون)، لەوێ لە چۆمی هەرزنێ دەپەڕیەوە، ئنجا با من خانەخوێیەكت پێبڵێم لە گوندی (ئەشكان)، چونكە خانەخوێت نەبێت، نابێ، گوتی: لەوێ بچۆ ماڵی بابەكر ئاغاو بڵێ من فلاّن كەس ڕێنمایی كردووم‌و كوڕی فلاّن كەسم، ئنجا چونكە بە خێرایی‌و ڕێڕەویی یەكدیمان بینی، ئێستا ناوی ئەو كەسەم باش لەیاد نەماوە، بەڵام پێم وایە (موحەممەد) بوو، ئیدی من لەڕێگادا ئەوەم لەبیر نەمابوو، بەڵام كاتێك كە خەوتنانێكی درەنگ گەیشتینە لای گوندی ئەشكان‌و گوتیان: تۆ دەچیە كوێ؟ خانەخوێت كێیە؟ گوتم: ئێرە كوێیە؟ گوتیان: گوندی ئەشكانە، لەوكاتەدا بەبیرم هاتەوە كە كابرای ئەسپسوار باسی گوندی ئەشكانی بۆ كردووم، گوتم: من دەچمە ماڵی بابەكر ئاغا، گوتیان: كاكە مادام وایە خانەخوێی زۆر چاكت هەیەو حیسابت زۆر چاكە، گوتم: هەر خزمیشین، گوتیان چۆن؟ گوتم: من هۆزی میراودەلییم‌و ئەوانیش میراودەلیین، پاش نوێژی خەوتنان بوو، بەڵام جارێ خەڵك نەخەوتبوون، چوومە ماڵەكەو سەلامم كرد، وەك عادەتی كوردەواریی گوتم: میوانان ڕادەگرن؟ گوتیان بەڵێ بەڵێ فەرموو، گوتیان: جەنابت؟ گوتم: با دابنیشم بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوەو لە خزمانی خۆتانم، منیش میراودەلییم‌و فلاّن كەس ڕێنمایی كردووم بۆ ئێرە، دوایی ڕەچەڵەك‌و شەجەرەی خۆمتان بۆ دەخوێنمەوە، نوێژی شێوان‌و خەوتنانم نەكردبوو، گوتم: پێشان نوێژەكانم دەكەم، گوتیان: ئنجا هەر نوێژێك نیە؟ گوتم: نا، نوێژی شێوان‌و خەوتنانیشم نەكردوە، گوتیان: ئنجا ئەوە دەگونجێ؟ گوتم: بەڵێ چونكە ڕێبوارم، گوێم لێبوو گوتیان: لە عێراقییان ئەوە یەك كەس، پێش نانخواردن بڵێ نوێژدەكەم! منیش بۆخۆم پێم سەیربوو، گوتم: دیارە لە عێراقییان ڕێیان لە نوێژكەران كەمكەوتوە، ئیدی دەستنوێژم گرت‌و نوێژەكانم كردو دانیشتم، برسی‌و ماندوو هیلاك، ئەوانیش هەر بەو دەمودەستە مریشكێكیان هێنا نازانم سووریان كردبووەوە، یان برژاندبوویان، گوتم: بۆچی ئەركتان كێشاوە؟ گوتیان: میوان عەزیزی خوایەو تۆش خزمی

خۆمانی، شەویٚ خەوتین، قسەو باسمان زۆر نەکرد، چونکە زۆر ماندووبووم، بەڵام دوو کوڕیان پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات بوون، بۆ بەیانی پێمگوتن: من لەترسی حیزبی بەعس هەڵاتوومو یەکێتیش لە (وڵاغلوو) گرتوومیان نەیانناسیومو لێمکەوتوونە گومان، تاکو مامۆستایەكو شێخێك بوونەتە کەفیلمو ئێستاش دەمەوێ بچم بۆ ئێران بخوێنم، گوتیان: ئنجا ئەوە واناکرێ، چونکە حیزبی دیموکرات هەر کەس نەیناسن دەیگرن، تۆش لەودیوی هاتووی، گوتیان: تۆ لەگەڵ ئێمەدا وەرە، بە چیای (سەری زەرتك)دا کە ناوچەی ئاڵانەتیی پێدەڵێن، ئاودیوو دەبین، یەکەمین دێ چایخانەیەکی لێیە (دەرماناوێ) دەچینە ئەوێ، لەوێڕاش سواری ماشێن دەبین بۆ سەردەشت، ئەوکاتە ئەو ناوچە بەدەست حیزبی دیموکراتەوە بوو.

ئیدی بە چیای سەری زەرتکدا سەرکەوتینو چووینە گوندی (دەرماناوێ) نیوەڕۆ لەوێ نانمان خواردو پارە عێراقییەکەم گۆڕییەوە بە تمەن، کە یەکەمجارم بوو تمەن ببینم، پارەکەم هەڵگرتو ئەو برادەرەی لەگەڵم هاتبوو شۆفێرێکی بانگ کردو، گوتی: کاکە ئەمە میوانی ئێمەیە دەیبەی بۆ سەردەشت، بەڵام لەڕێ بازگەی حیزبی لێیە، پێش ئەوەی بگەیە بازگەکە دایدەبەزێنی، ئنجا ئەو برادەرە پێیگوتم: کە دابەزاندی بەدەستی ڕاستدا بڕۆ ومەچۆ بازگەکە، دەتگرن، چونکە ناتناسن، لەوێ کە دابەزی دەچیە گوندی (کانیە ڕەش) لەوێوە بەپێ بڕۆ بۆ سەردەشتو وەزعی خۆتیان لێ حاڵی بکە، کە ڕاتکردوە لەدەست ڕژێمی بەعسو بۆ خوێندن چووی.

ئیدی سواری سەیارەکە بوومو ڕۆیشتین، پێش ئەوەی بگەینە بازگەکە، شوفێرەکە سەیارەکەی ڕاگرت، گوتیان: ئەوە چییە؟ گوتی: کارێکم هەیە، کاکە دابەزە، دابەزیمو گوتی: لێرەوە بڕۆ ئەوە کانیە ڕەشە، ئیدی لە پەلەپەلی ڕۆیشتنم لەبیرم چوو پارەکەی بدەمێ، کابرا گوتی: ئاغا! پووڵەکەی نادەی؟ گوتم: با، ئیدی پارەکەم بۆ دەرهێناو لەسەر دەستم دامنا، حەقی خۆی لێ هەڵگرت، خوات لەگەڵ، خوات لەگەڵ، منیش ڕۆیشتم جۆمەڵێك بوو، بە جۆمەڵەکەدا ڕۆیشتم، ئافرەتێکم بینی منداڵێکی پێبوو، گوتم: خوشکێ! کامە گوندی کانیە ڕەشە؟ گوتی: خێرە، ئەوەتا ئەو دێیەیە، دەڵێی عێراقی؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: چ ئیشت لەکانییە ڕەش هەیە؟ گوتم: ئیشم لەوێ نیە بۆ سەردەشتێ دەچم، گوتی: کەوابێ

مەچۆ نێودێ، هەر لێرەوە برۆ دەچێتە سەردەشت، ئیدی هەر لەو ڕێیەوە ڕۆیشتم، كابرایەك جووتی دەكرد، سەلامو خوا بەقەوەتییەكم لێكرد، گوتم: كاكە ئەو ڕێیە دەچێتە كوێ؟ گوتی: دەچێتە سەردەشت، جوتیارەكە پێیگوتم: تۆ عێراقیو یەكەمجارتە بێیە ئێران، دەبێ بچیە (پاسگاه) واتە: پۆلیس و حاڵی خۆتیان بۆ باس بكەو بڵێ: هاتووم بخوێنمو ببمە پەنابەر (پناهندە)، ئەگەر نا بتگرن گومانی خراپت لێدەكەنو تووشی زیندان دەبی.

# چوونم بۆ سەردەشتو بوونم بە پەنابەر

کە چوومە (پاسگاه)یەکە دیاربوو (٨ـ ٩) کوردی خەڵکی سلێمانیو هەولێری لێبوون، جا نازانم دەستبەسەربوون، زیندانیی بوون! سەلامم کردو ئەوانیش دایانە پرمەی پێکەنین، منیش پێم سەیربوو! گوتم: ئەوە چیە؟ گوتیان: تۆشیان گرت؟ گوتم: نەخێر من بۆخۆم هاتوومو قاچاغبووم لە ڕژێمی بەعسو دەمەوێ بخوێنم، گوتیان: دەی بەخێر بێی، دیاربوو چاویان لەوەبوو فیشقیاتو پێکەنین بکەن، گوتم: گوێبگرن! با ئامۆژگارییەکتان بکەم، ئێوە، یان گیراون، یان پەناهێندەن، ئنجا ئایا هیچ ئیش نەماوە بیکەن پێکەنینو گاڵتەو گەپ نەبێ؟ گوتیان: دیارە جەنابت مامۆستای؟ گوتم: مامۆستاش نەبم من ئەوە یەکەمجارە بێم، پێکەنینو گاڵتەو گەپی چیتانە، گوتیان: ڕاستدەکەی داوای لێبوردن دەکەین، بەلاّم ئینسان لێرە بێتاقەت دەبێ، دەوری (١٠ـ ١٥) ڕۆژ لەوێ مامەوە، فێری نوێژمکردنو سوودێکم پێگەیاندن، من لەگەڵ بەرپرسی پاسگاکە قسەم کرد، گوتم: من لەودیووەوە (لە دیوی عێراقەوە) هاتووم بخوێنم، گوتی: هاتووی لەنێو حکوومەتی خومەینیدا بخوێنی؟ گوتم: بەڵێ هاتووم بخوێنم، دیاربوو کابرا هەر لە بەرپرسەکانی سەردەمی شا بوو، لێی حاڵی دەبووم بە نیوە کوردیو فارسی، بزنێك لەوێ بەسترابۆوە، دەیگوت: ڕقم لەو بزنەشە! چونکە ڕیشی هەیە! مەبەستی لە خومەینی بوو، گوتم: توخوا وەرە، من هاتووم لێرە بخوێنمو بحەسێمەوە، کەچی یەکەم بەرپرسی ئێرە ڕقی لە هەرچی ڕیشدارە! زۆرم پێ سەیربوو، موناقەشەم لەگەڵ نەکرد، ئەوکاتە نێوانی سەردەشتو سەقز بەدەست حیزبی دیموکراتو کۆمەڵەو موجاهیدینی خەڵقەوە بوو، دەبوو بەکۆپتەر هاتووچۆ بکەن، ئەوانەی لەوێ بوون چاوەڕێی فڕۆکەبوون بیانگوازنەوە.

## ئاغـا میـوان بە !

ئەو ماوەیەی لەویٰ بووم شتێكی خۆشم بەبیردێتەوە: ئێوارەیەك كاتی دەمەو نوێژی شـێوان بوو، گوتم: دەچمە بازاڕ لفكەیەك دەكڕم، ئیزنیان دەدایـن بچـینە بـازاڕ، چـوومە بـازاڕ لـە دووكانێك گوتم: كاكە ئەو لفكە بەچەندە؟ ئەوان بە لفكە دەڵێن: لیف، گـوتی: ئـەو لیفـە؟ بەوەندەیە، ئاغا میوان بە، ﴿ئەوان بۆ ئەوەی بڵێن: پارەكەی مەدە، دەڵێن: میوان بـە، یەكـەم جارم بوو ئەوە ببیستم، ئەوەشیان بە جیددیی نیـەو موجامەلەیـەكی ناڕاسـتە، چـونكە ئەگـەر بڵێی: باشەو بڕۆی، دەڵیٰ: ئاغا ئەدی پووڵەكە نادەی؟ ئەوە برایەكی خۆمان شـتێكی گرانـی گڕیبوو، دووكاندارەكە گوتبووی: ئاغا میوان بە، گوتبووی: باشـە! زۆر چـاكە سوپاسـت دەكەم، تۆزێك دوركەوتبۆوە گوتبووی: ئاغا... ئاغا... بگەڕێوە بەخوا بەڕاستم نیە هـەر زمانمان وا ڕاهاتوە، زمانم بەبڕینچیٰ!﴾ كە كابرای دوكانداریش پێی گوتم: ئاغا میـوان بـە، وامزانی دەڵیٰ بۆ ئێوارە میوان بە، گوتم: سوپاس لەو پاسگایەم، گوتی: مەبەستم ئەوە نیـە، دەڵێم: پووڵەكەی مەدە! بەهەرحاڵ لفكـەم كـڕیو چـوومەوە، دوایـی لـەنێو ئـەو كەسـانەی پاسگاكەدا هاوڕێیەكم بۆ دروستبوو، ناوی رزگاربوو خەڵكی هەولێر بوو، ئەو هـۆگری مـن بوو، ئنجا بۆیدەگێڕامەوە كە پێشتر ئەهلی گوناهبووە، بـەڵام دەیگـوت: لەسـەر دەسـتی تـۆ تۆبەم كردوەو هەستم دەكرد ڕاست دەكات.

## دەرچوون لە پاسـگا بەرەو گوندی بریســویٰ :

دوایی بیرم كردەوە گوتم: كاكە ئێمە ئەگەر هەر چاوەڕێی كۆبتـەر بكـەین، خـوا دەزانـیٰ كەی دیٰ؟ مادام لێرەش وەرمانناگرن وەك پەنابەر، با بۆخۆمان بڕۆین بۆ نێو هێزی پێشـمەرگە بۆ ئەو دێیانەی كوردستان، ئنجا ڕاوێژمان كرد بچینە كویٰ، نەچینە كویٰ؟ سەرەنجام چووینە نزیكترین دیٰ كـە گونـدی (بریسـویٰ)یە، لـەخوار چـۆمەكەوەیە[1]، لـەخوار شارۆچـكەی (ڕەبەت) لەوبەری (سەردەشت).

---

١) واتە: زێی گچكە كە دێتـەوە دەربەندی ڕانیە.

ڕێیـان دەدایـن بچـینە دەرەوەی پاسـگاکە، کـە ڕۆیشـتین و چـووینە خـوار، گەیشـتینە مەفرەزەیەکی حیزبی دیموکرات خەریك بوو تەقەشمان لێبکەن، واپاندەزانی پاسـدارین، یـان ئارتەشین دێینە خوار، گوتمان: کاکە خۆمانین، گوتیـان: چـاك نـەبوو تەقـەمان لێنـەکردن، واماندەزانی پاسدارن، ئێوە خەڵکی کوێن؟ گوتمان: خـەڵکی عێـراقین‌و گیرابـووین لـەوێ‌و پەناهێندەین، گوتمان: بابچینە بەشی کوردستان، ئەدی ئێوە؟ گوتیان: ئێمـەش پێشـمەرگەی حیزبی دیموکراتین‌و دەچـین بـۆ چـالاکییەك، لـەوان ڕەتبـووین‌و ڕۆیشـتین چـووینە گونـدی (بریسوێ)، شەو لەماڵی مامۆستایەکە میوان بووین، پێم وایە ناوی مامۆسـتا مـەلا موحەممـەد بوو، یەکسەر خەڵکی دێیکە هەواڵیاندابوو بەحیزبی دیموکرات کە مامۆستا دوو میوانی عێراقی هاتوون، زۆرم بەلاوە سەیر بوو، ئەو کاتە دیمـوکرات‌و کۆمەڵـەو یـەکێتی، کـە هەرسـێکیان گرتوومیان، لەهەموو کەس بەگومان بوون!

### گیـرانمان لەلایەن حیـزبـی دیموکـڕاتەوە:

بەیانی برادەرانی حیزبی دیموکرات هاتن گوتیان: مامۆستا! دەبـێ میوانـەکانت لەگـەڵمان بێن دەیانبەین بۆ بارەگای حیزب، مامۆستا گوتی: کاکە بۆکوێیان دەبـەن! ئەوانـە مامۆسـتاو فەقێن؟ گوتیان: نابێ، دەبێ لەگەڵمان بێن! سەرەنجام بردیانین بۆ گونـدی (بناویلـە) لـەولای ڕەبەت، بەپێ ڕۆیشتین‌و باش لەدیامە نیوەڕۆ پەتاتەیان هەبوو، نانمان خـوارد، ئەوکاتـە ژیـان زۆر بەزەحمەت بوو، نانیش بەزەحمەت دەستدەکەوت، ئێمەش لەمێژبوو برسی بووین، ئیـدی لەوێ تێرمان خوارد.

نیوەڕۆ لەوێ بووین هەندێك موناقەشەیان لەگـەڵ کـردم، گوتیـان: ئێـوە کـێن؟ چـین؟ گوتم: ئێمە ئاوارین‌و ئەوە حاڵ‌و حسابمانە، گوتیان: باشە جارێکی دیکـە لێـرە نەتانبینینـەوە، گوتم: کاکە ئێمە هـاتووین لـەم بەشـەی کوردسـتان بحەوێینـەوە، مانـای چـی نامانبیننـەوە! گوتیان: ئاخر کێ دەڵێ ئێوە جاسووس نین، گوتم: کێ دەڵێ؟ من دەڵێم! چونکە ئەسڵ ئەوە نیە خەڵك تاوانبارێ‌و بێتاوانیی خۆی بسـەلمێنێ، ئینسـان بێتاوانە، تاکو بەڵگە دەبێ خەتاباری دەکـات، ئێـوە بەڵگـەتان چـییە کـە ئێمـە جاسووسـین؟ گوتیـان: باشـە بـەیانی دەتانبەینـە

شارۆچكەی (ڕەبەت) ئەگەر لەوێ كەسێك هەبوو كەفالەتتان بكات، ئەوە باشـە، ئەگـەر نـا ئێمە ناهێڵین لێرەبن.

## چوونمان بۆ شـارۆچكەی ڕەبـەت :

بەیانی لەگەڵ خۆیان بردیانینە شارۆچكەی ڕەبەت، لـەوێ ئێمـە چـووینە مزگـەوت نوێـژ بكەین، ئەوانیشمان لەگەڵ هاتن، یەك دوو قسەم لەگەڵ مامۆستایەكەدا كـرد، گـوتی: ئـەوە چییە لەگەڵ ئەوانەن؟ گوتم: مامۆستا! گرتوویانین‌و دەڵێن: ئێوە جاسووسن، گوتی: چۆن؟ ئێوە چین؟ گوتم: من خەڵكی عێراقم‌و دانیشجۆم، (واتە: قوتابی زانكـۆم) لەدەسـت ڕژێـم هەڵاتووم‌و هاتووم لێرە بخوێنم، گوتی: من پێیان دەڵێم، گوتی: كاكە ئەوانـە میـوانی مـنن، مـن دەیانناسـم‌و كەفالـەتیان دەكـەم، گوتیـان: زۆر سـوپاس مامۆسـتا، ئەگـەر ئەزیـەتی میوانەكانیشمان دابێ، داوای لێبوردن دەكەین.

## سـەردانمان بۆ حوجـرەی فەقـێیان لە شـارۆچكەی (ڕەبـەت) :

ئێوارە چووینە ئوتێل (میوانخانە)، لەگەڵ كاك رزگار بیرمان دەكردەوە چ كاسبییەك بكەین؟ بیرمان كردەوە بۆ خۆژیاندن‌و حەوانەوە گوێدرێژ بكڕین‌و دار بهێنین بیفرۆشین، مـن هێنـدەم پارە پێنەبوو، ئەویش هەروابوو، بەڵام وەك گوتراوە: (ئەوەی لەلای بەندە خەیاڵە لەلای خـوا بەتاڵە) یان (بەندە تەگبیر دەكات‌و خوا تەقدیر دەكات) بۆ هەمان ئێوارە بوو، یـان بـۆ سـبەینێ بوو لەیادم نیە، بەڵام بۆ نوێژ چووینە مزگەوت، دوای نوێژ مامۆستا مەلا سـەید موحەممـەدی ڕەبەت راوەستا، پێم وایە ئێستاش ماوە، ئەگەر مردووشە "خوا لێی خـۆش بـێ"، مامۆسـتا گوتی: دەڵێی ئێوە خەڵكی ئێرە نین؟ منیش گوتم: بەڵێ مامۆستا ئێمە عێراقیین، گوتی: ئەدی كوا، خانەخوێتان لە كوێیە؟ گوتم: مامۆستا لە میوانخانەین، گوتی: چۆن دەبـێ لەگـەڵ مـن وەرن، بچنـە حوجرەی فەقێیـان، منـیش پێمخۆشـبوو، گـوتم: زۆرباشـــە، لەگـەڵ كـاك رزگار چووین، مەجلیسی فەقێیـان زۆر خۆشە، جمەی دەهات، كابرایەك لەوێ بوو بەتەمەن تربوو لەوان، دیاربوو توركی دەزانی، پێیان دەگوت: ئـەرێ دوو پـارووان بـە تـوركی بخـۆ!

لێیان دەپرسی: بە توركی بەوە دەڵێن چی؟ بەوە دەڵێن چی؟ ئێمەش لەلای خوارەوە لە شوێنی نیزیك پێڵاوەكان دانیشتین، فەقێیەكان زۆر گوێیان پێنەداین، من (١٥) ڕۆژ دەبوو لە سەفەر بووم، هەر ئەو دەستە جلەم پێبوو كە لەبەرم بوون، ڕەنگو ڕوومان دژوێن بوو، گوێم لێڕاگرتن، وەختێك هاتنە سەر باسی میری سۆران (میر موحەممەد)و مەلای خەتێ، یەكێكیان گوتی: لەگەڵ دوو سێیەكی حیزبو یەك دوویەكی كۆمۆنیست، (واتە: كۆمەڵە) موناقەشەم بوو، گوتیان: كاتی خۆی مەلای خەتێ فتوای داوەو میرنشینی سۆران ڕووخاوە، فەقێیەكانی دیكە گوتیان: ئەدی تۆ چیت گوت؟ گوتی: وەڵڵا من هیچم لێنەزانی، لەبەینی خۆیاندا لێیان بوو بە باس، دەیانگوت: چۆن جوابی ئەوە بدەینەوە؟ فەقێیەكی دیكەیان گوتی: یەكێك لەوێ بوو لەولائیكانە گوتی: جا كێ دەڵێ خوا هەیە؟ ﴿عەجایب ئەوەبوو ئەو كوردە سیكۆلاریستە داماوانەی خۆمان لەگەڵ زمانیان دەپڕژا بە ماركسییەت، دەهاتنە سەر كوفرو بێدینیی، وەك بڵێی گەلی كورد پەكی هەر لەسەر كوفرو بێدینیی كەوتوە!﴾ منیش گوێم هەڵخستبوو، بزانم دەگەنە كوێ، دوایی تەماشام كرد، شارەزاییەكی وایان نەبوو، ئەو شتانەش كە ئەوان باسیان لێوە دەكرد، شارەزاییەكی باشم هەبوو لێیانو كتێبم لەسەر خوێندبوونەوە، كتێبی (كوردو كوردستان)ی ئەمین زەكی بەگم خوێندبۆوە لەسەر مەسەلەی چۆنییەتی ڕووخانی (میرنشینی سۆران) كە مەسەلەی فەتوای مەلای خەتێ لەو بارەوە هەرباس ناكاتو، بە شێوەیەكی دیكە باسی ئەو ڕووداوە دەكات، منیش لە دەرفەتێكدا گوتم: ئەگەر ئیجازە بدەن من لەو بارەوە شتێك باس دەكەم، هەموو گوێقولاغ بوون، بەتایبەت كە زانییان لەهجەكەشم وەك هی ئەوان نیە، گوتیان: فەرموو، دەڵێی ئەو برادەرە خەڵكی ئێرە نیە؟ گوتم: نا، من عێڕاقییم، گوتیان: فەرموو فەرموو قسە بكە! منیش دەستم پێكردو باسی مەسەلەی نەتەوایەتییم كرد، وەك خوای پەروەردگار لە قورئاندا لە سورەتی (الحجرات) ئایەتی ژمارە (١٣)دا باسی دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوەمان لەنێرو مێیەك درووستكردوە، پاشان گێڕاومانن

بە چەند گەڵو تیرەیەك تاكو پێك ئاشنابن، بێگومان ڕێزدارترتان لەلای خوا پارێزكارترتانـە، بێگومان خوا زانای شارەزایە، ئنجا گوتم: ئەو مەسەلەیەی مەلای خەتێ كـە بـاس دەكـرێ، ئەسڵ و ئەساسی نیە، چونكە ئەمین زەكی بەگ لە كتێبـی (كوردو كوردستان)دا باس دەكاتو دەڵێ: میری سۆران (میر موحەممەد) تەماشایكردوە، وێڕای توركیا لـە بەغـدادو مسوڵیشـەوە سوپای لەدژ هاتوەو زانیویەتی شەڕێكی بێئەنجامەو وڵاتەكەی كاول دەبێ و خەڵكەكەش لەبەین دەچێ، بۆیە سەرەنجام وازی لـە بیرۆكـەی جـەنگكردن لـە دژی دەوڵـەتی عوسمـانی دێنـێ و كێشەكە بەئاشتییانە كۆتایی دێ، میر موحەممەدیش دەچێتە ئەستەمبوڵ بۆلای سوڵتان، بەڵام لە گەڕانەوەیدا لە ساڵی (١٢٥٣)ی كۆچـییدا لـە شـاری (تـەڕابزوون) لـە توركیـا دەكـوژرێ، بەهۆی نووسینو دەم لێكوتانی (عەلی ڕەزا) والی بەغـداوە[١].

ئنجا دیاربوو كە هەندێك ئایەتو فەرموودەم بۆ خوێندنەوە، گوتیان: مامۆستا تۆ كێـی؟ نابێ لەوێ دابنیشی، وەرە سەرێ، جێیان بۆ چۆڵكردمو كاك رزگاریشیان بانگ كردە سەرێ، گوتیان: مامۆستا تۆ كێی؟ گوتم: من خەڵكی عێـراقمو لـە ڕژێـم قاچاغبوومو لـە قۆنـاغی دووی زانكۆ بووم، گوتیان: دانیشجۆشی؟ گوتم: بەڵێ، سوپاس بۆخوا هەموو قورئانیشـم لەبەرە، گوتیان: چۆن؟ هەموو قورئانت لەبەرە؟ شتی وا دەگمەن بوو، زۆریان پێ سەیربوو، كە قسەشم دەكردو ئایەتو فەرموودەم دەهێنانەوە، لەلای ئـەوان شـتی وا نـەبوو، گوتیـان: ئەدی ئێستا چۆنە هاتووی؟ گوتم: هاتووم لێرە بحەوێمەوە، گوتیـان: ئـەدی بـۆ شـتێكی دی نەكەین؟ گوتم: چی؟ گوتیان: عیلمەكان هیچی ماوە نەیخوێنی؟ وایاندەزانی هەرچیی عیلمە خوێندوومە، گوتم: بەڵێ عیلم زۆر ماون بیـانخوێنم، گوتیـان: ئامـادەی بخـوێنی؟ گـوتم: بـەڵێ، لـەدڵی خۆمـدا گـوتم: ئـەوە زۆر باشـە، هـەم دەخـوێنمو هـەم دەحەوێمـەوەو لـەو قاچاغییەش نـەجاتم دەبـێ، نـاكرێ هـەرجارە حیزبێـك تێـت هەڵپێچـێ، دیـاربوو كەوتنـە مشتومڕی نێوان خۆیانو گوتیان: باشە كێ هەیە لەلای بخوێنی؟ یەكێ گوتی: فلان مامۆستا، یەكێكی دیكە گوتی: فلان مامۆستا، موستەعیدێكی دیكە گوتی: فلان مامۆستـا، كـە ئێسـتا

---

١) بڕوانە: (خلاصـەیەكی تاریـخی كوردو كوردستان لە زۆر قەدیـمەوە تا دەوری ئیمـڕۆ) محمـد أمین زكی بگ، لاپەڕە: (٢٨١-٢٨٢). بنكەی ژین: ٢٠٠٦، سلێمانیی.

دووان له‌وانه‌ مامۆستان‌و برادەرمن: كاك مەلا مستەفای (زمزیران)، كاك مەلا ئەحمەدی (قەلەڕەشێ)، دوایی گوتیان: مەگەر مامۆستا مەلا موحەممەدی (بەردەڕەشیی) بتوانێ دەرسی ئەوە بداتەوە، ئەگەر نا ئەوانی دیكە ناتوانن، ئیدی گوتم: زۆرم پێچاكە، بەڵام گوتیان: لەلای مامۆستا مەلا موحەممەدی بەردەڕەشیی جێ نابێ، مەلا ئەحمەدی قەلەڕەشێ‌و مەلا سەید مستەفای زمزیران، كە ئێستا مامۆستای موعتەبەرن‌و پەیوەندییم لەگەڵیاندا هەر هەیە، گوتیان: ئێمە تەكلیف لەمامۆستا مەلا موحەممەدی بەردەڕەشیی دەكەین جێگات بكاتەوە، كاك رزگاریش گوتی: فلان كەس! جا ئەوە تۆ دەخوێنی، بەڵام من هیچم نەخوێندوەو لێی نازانم، منیش دێم دەبم بە مجێور، یان دەبمە بانگبێژ!

گوتم: باشە، بەڵام دواتر كاك ڕزگار نەهات‌و ئێستاشی لەگەڵبێ نەمزانی چی لێهاتوەو نەمدیتەوە!

# دامەزرانـم لە حوجـرەی مامۆســتا

# مەلا موحەممـەدی بەردەڕەشـییدا بۆ خوێنــدن

چووم بۆ گونـدی (بەردەڕەش) تاکو لەوێ دەست بەخوێندن بکەم‌و، لـەو چـوونەمدا لـە شارۆچکەی (ڕەبـــەت)ەوە، دوو ئامانجم هەبوون:

١- شوێنێکم دەستبکەوێ بۆ حەوانەوە.

٢- درێژە بەخوێندنی زانستە شەرعییەکان‌و خوێندنی دیکەش بـدەم، ئنجـا کـە چـووین بـۆ بەردەڕەش، مامۆستا مەلا موحەممەدی بەردەڕەشیی (کە سـێ ساڵ زیاتر لەمەوپێش وەفـاتی کرد لە (١٦/ ١/ ٢٠١١) زایینی، بەرانبەر (٢٦/ ٩/ ١٣٨٩)هـەتاویی، خـوا پلـەو پایـەی بەرز بکات) لەوێبوو، یەکێك لە مەلا هەرە باشەکانی کوردستانی ئەودیو بوو، کە چـووین بۆ خزمەتی مامۆستا، خۆم‌و هەرکام لە کاك مەلا سـەید موسـتەفای زمزیـران‌و کـاك مـەلا ئەحمەد قەلەڕەشێ، دوای بەخێرهێنان، لەوانی پرسـی: ئـەوە کێیـە؟ گوتیـان: ئـەوە فـلان کەسەو لەکوردستانی عێراقەوە هاتووەو حاڵ‌و حیسـابێکی ئـاوای هەیـە، بۆیـان باسـکرد، ئەوکاتە نازناوی (مەلا عەلی عێراقیی)یان بۆ دانام، مامۆستای بەردەڕەش "هەزار ڕەحمەتی لێبـێ"، لەسەرەتاوە گوتی: یاخوا بەخێر بێـی، بـەڵام حوجرەکـەمان قەرەباڵغـەو ڕەنگـە جێتان سەغڵەت بێ‌و جێتان باش نەبێ، منیش ئەو دەرسانەی کـە دەیانڵێمـەوە زۆرن، وەك بڵێی ئەگەرێکی تێخست، بەڵام ئەوانەی لەگەڵمبوون، کاك مەلا سەید مستەفای زمزیران‌و کاك مەلا ئەحمەدی قەلەڕەشێ، ﴿(زمزیران‌و قەلەڕەشـێ) نـاوی دوو گونـدی ڕۆژهـەڵاتی کوردستانن﴾ ئەو دووانەم باش لەیادن، ئەوان زیاتر داکۆکییان کردو گوتیان: جێی خۆمان دەکەینەوە، ئیدی هەرچۆن بێ مامۆستا قەناعەتی کرد کە من لەوێ بمێنمەوە، ئنجا گـوتی: چی دەخوێنی؟ گوتم: باسی میرات‌و نیکاح‌و تەڵاق، هەرچـەندە خوێنـدووشمن، بـەڵام ئەگەر پێیاندا بچمەوە لەلای تۆ پێم باشە.

یەکێك لە برا فەقێکانیش گوتی: پێمخۆشە کتێبی (قصة الإيمان بين العلم و االفلسفة و القرآن)ی (شيخ نديم الجسر)م پێ بڵێی، کتێبێکی فەلسەفیی و فیکریی وشکە، ئیدی هەم دەرسم لەلای مامۆستا دەخوێندو هەم وردە وردە ئەو دەرسەشم بەو برا فەقێیە دەگوت، بەلاّم دیارە کتێبەکەمان تەواونەکرد، ئنجا لە دڵی خۆمدا گوتم: بۆچی فێری فارسی نەبم؟ لەیادمە ئەو کاتە فەرهەنگی (عميد) هەبوو لەزمانی فارسیدا، لەماوەی (٢٠) رۆژ، مانگێکدا، دەتوانم بڵێم زۆربەی ئەو قاموسەم لەبەرکرد، فەقێکان زۆریان پێسەیربوو دەیانگوت: فلاّنکەس فەرهەنگی عەمید لەبەر دەکات! هەڵبەتە لەوماوەیەدا کە لەوێبووم، بیرەوەریم زۆر زۆرن، هەرچەندە تەنیا شەش مانگ مامەوە لەبەردەرەش، کە ئەمانە هەندێکیانن:

### پەیوەندیی و نێوان خۆشییم لەگەڵ مامۆستادا:

لە خزمەت مامۆستا مەلا موحەممەددا رەفاقەتمان زۆر خۆشبوو، مامۆستا خۆشی دەویستم کە تەماشای کرد زۆر بەجیددیی دەخوێنم و، جگە لەخوێندن هیچ کارو سەرگەرمییەکی دیکەم نیە، چونکە ئەوکاتە حوجرەی فەقێیان (قوتابخانەی شەرعیی) هەندێك عادەتی سەیریان هەبوو، بۆ وێنە: یاریو سوعبەتیان زۆر دەکرد، چەندان یارییان دەکردو، جەوێکی میزاحو قسەی خۆشو نوکتە بەسەر حوجرەدا زاڵدەبوو، هەندێك جۆرە یارییان دەکرد، وەك کەڵەمستێنەو گوریس پچڕکێنەو کلاّو کلاّوێنەو... هتد، کە شەرت نیە هەموویانم بەوردیی لەیادمابێ، دیارە من بەشداریی یارییەکانم نەدەکرد، بەلاّم دادەنیشتم بۆ گوێگرتن لەقسەی خۆشو پێکەنین، ئەگەرنا زیاتر خەریکی موتاڵەعەو خوێندن بووم، وە ئەوەندەی خوا بۆی ئاسان دەکردم سەرگەرمی تاعەتو عیبادەت دەبووم، بۆ وێنە: دووشەممەو پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبووم، هەروەها جاری وابوو رۆژ نا رۆژێکیش بەڕۆژوو دەبووم، وە لەگەڵ قورئاندا زۆر خەریکدەبووم، چ وەك قورئان خوێندنو تێفکرینی، چ لەگەڵ تەفسیرەکاندا ئەوەی دەستم کەوتبایە، جگە لە دەرسی لای مامۆستا، هەروەها وشەو موفرەداتی فارسییم لەبەر دەکرد، رێزمانی فارسییم دەخوێندەوەو کتێبی فارسی، ئەوەی کە دەکەوتە بەردەستم هی کۆن، یان هاوچەرخ، دەمخوێندنەوەو کاتم بەفیڕۆ نەدەدا.

## نەخـەوتن لە ژووری حوجـرەدا :

یەکێك لە بیرەوەرییەکان کە شایستەیە بیگێڕمەوە، ئەوە بوو کـە مـن لـە ژووری حـوجرەدا نەدەخەوتم، چونکە حوجرەکە زۆر گەرم بـوو، جێگـاش تـۆزێ سـەغڵەت بـوو، بۆیـە بـە فەقێکانم گوت: ئەگەر ئیجازەم بدەن دەچم لـە مزگـەوت دەخـەوم، گوتیـان: لـە مزگـەوت سەرمات دەبێ، لەنێو کەشی پایزدا بووین و بـەرەو زسـتانیش دەچـووین، گـوتم: قـەیناکا، چونکە لێرە بەخەبەرنایەم، من عادەتم وابوو شەونوێژم دەکرد، بەهەرحاڵ سـەرەنجام شـوێنی خەوتنم بردە مزگەوت، هەرچەندە شەوی وا هەبوو زۆر سەرمابوو، ئـەو سـاڵەش "سـبحان الله" کە کۆتایی سـاڵی (١٩٨١) بـووو دەچـووینە نێـو سـاڵی (١٩٨٢)ەوەوە، سـاڵێکی زۆر ساردبوو، بەفرێکی زۆر باری.

## نوێـن و پێخـەفی خەوتـن و سـووتانی لێفـەکـەم :

بۆ مەسەلەی نوێن و پێخەفیش یەکێك لە خەڵکی ئاواییەکـە کـە نـاوی (وەسـتا قـادر) بـوو لێفەیەکی دامێ لەگەڵ سـەرینێك، ئیدی ئەو لێفـەو سەرینەی ئەو ماڵی ئاوا بێ ئەو زسـتانەم پێبـەڕێکرد، شەوێك زۆر سـەرمام بوو، جـا ئـەوان بەسـۆبە دەڵـێن (کـوورە)، مجێورەکـە گـوتی: مامۆسـتا! گـوتم: بـەڵێ، گـوتی: ئەمشـەو زۆر سـاردە، دەقەسـری، (واتـە: ڕەقدەبییـەوە لەسەرمان) گوتم: چی بکەم؟ گوتی: وەرە کوورەکەت بۆ دادەخـەم، هەنـدێك کۆلکەدارو دارقەلاشکەری مەحکەمی دەخەمـەنێو، بۆئـەوەی ئاگرەکـە وا زوو نەکوژێتـەوە، ئنجـا وەرە نزیکـی کوورەکـە بخـەوە، گـوتم: باشـە، دیـاربوو شـەوەکە زۆر سـاردبووو مزگەوتەکەش گەورە بوو، دووقاتێـك بوو، ئنجا باقـڵ[1] شەو سەرمام بووبوو، شەو هـەر بەلای سۆبەکەوە چووبووم، ئیدی شەو بە بۆنکرووزو دووکەڵ بەخەبەر هاتم، تەماشام کرد، خوایە ئەوە چییە! مزگەوتەکە پڕ بووە لە دووکەڵ، کە تەماشام کرد زانیم ئـەوە لێفەکـەی منـە سووتاوە، بەقەدەر نانێکی فڕنی لـێ سووتابوو، لێفەکەش لۆکە بوو، ئنجا هەر زوو پەرداخە

---

١- باقڵ: توومەز.

ئاویکم لەویٚ دانابوو بۆ پارشێو، پەرداخە ئاوەکەم بە لێفەکەدا کـردو کوژاندمـەوەو، تۆزێـك دەستو پەلیشم سووتان، ئنجا بیرم کردەوە ئایا ئەو دووکەڵە چی لێبکەم؟ گوتم: ئێستا ئـەو خەڵکە بۆ نوێژی بەیانی بیٚ، زۆر ناخۆشە، تەماشـام کـرد شـەو دوو سـیٚ سـەعاتی مـابوو، چووم پەنجەرەکانم کردەوە بۆ ئەوەی دووکەڵەکە بچێتـە دەریٚ، زۆریش سـەرما بـوو، ئیـدی بەهـەرحالٚ پەنجـەرەکانم کـردەوەو، لێفەکـەم ئـەوەی کـە لێـی سـووتابوو، خۆڵـەمێش و سووتاوییەکەیم فڕێدایە دەریٚو، شوێنەواری سووتانەکەم لە مزگەوتەکـەدا نەهێشـت، بـەلاٚم ئەو شەوە خەوم لێنەکەوتەوە، ئنجا بۆ بەیانی ئەوەی دەهات دەیگوت: ئەوە چـییە بـۆنکرووز دیٚ، دەبیٚ شتێك سووتابیٚ؟ مجێورەکە گوتی: ڕەنگە شتێکیان لە کوورەکە هاویشتبـیٚ، منیش پێم عەیب بوو بڵێم لێفەکـەی منە سووتاوەو دەنگم نەکرد، بەلاٚم دوایی بـە خـاوەنی لێفەکـەم گوت: کاك وەستا قادر! لێفەکەی کە وێتـداوم سووتاوە، گوتی: ئنجا لێفــە بـەقوربانی تـۆ بیٚ، قەیناکا لێفەی دیکەت بۆ دەهێنم، گوتم: نەوەڵلاٚ بۆم مەهێنـە، هەر ئەو لێفەیـەم بەسـە، بەلاٚم پەڵەیەکی تێبووە، گوتی: قەیناکا، دیارە لێفەو سەرینەکەم هەر لە مزگەوت بوونو، وام قەد دەکردن سووتاوییەکەی دەرنەکەویٚ!

## نـانو هێلکـەی پارشـێوان:

شایانی گوتنە ئەو ڕۆژانەی کە بەڕۆژوو دەبووم، پێنج شـەممەو دووشـەممە، یـەك هێلکـەو یەك نانم بەردەکەوت، چونکە نانو پێخۆر کەمبوو، هێلکەکەیشم لەسـەر پشـکۆی سـۆبەکە دادەنا، جاری وابوو هێلکەکە دەتەقیو تەنیا کەمێکی لێدەمایـەوە، بـەلاٚم بەهـەرحالٚ مـەداری خۆم بەوەندە سازدەکرد.

## لە مزگەوتـدا خەوتـنیش، باجـی خۆی هەیـە:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە دروست نیە بە لـەش پیسـیی (جنــابة) لـە مزگەوتــدا بــمێنیەوە، شەوی وا هەبوو لەنیوەی شەودا ئیحتیلامم دەبوو، ئیـدی دەبـوو یەکسـەر بچـم لـە حـەوزی مزگەوتدا کە شوێنی مردوو شۆرینیش بوو، خۆم بشۆم، دیارە مزگـەوتو ڕێـی مزگـەوتو

حەوزەکەو حەوزەکەش، هەموویان تاریك بوونو، جاری وا هەبوو لە شەوانی ساردی پایزو زستاندا، کە خۆم دەخستە نێو حەوزەکەوە، دەمگوت رەنگە هەناسەم نەیەتەوەبەر، جاری واهەبوو کە دەهاتمە دەرو هەوای ساردم بەردەکەوت، مووی سەرورپیش‌و برۆو برژانگم دەبوونە شیخە سۆڵ‌و دەیبەستن!

## بۆ یەکەمجارو دوامین جار ڕاتبەکردن‌و نان چنینەوەی فەقێیایەتی :

لەو بیرەوەرییانەی کە هەرگیز لەبیرم ناچن: رۆژێك سوختەکان لەویێ نەبوون، (سوختە فەقێی بچووکەو موستەعید ئەوەیە ئامادەبووە بۆ مەلایەتیی) گوتیان: ئەمڕۆ سوختەکانمان لێرە نین، یەك سوختەی لێبوو، ڕوویانتێکردم‌و گوتیان: فلاَن کەس! تۆ تا ئێستا نەچووی بۆ ڕاتبێ؟ (ڕاتبێ، ئەوەیە کە فەقێ دەچێ نان‌و خواردن لە مالاَن دێنن) گوتیان: بۆچی ئەمڕۆ تۆ ناچی؟ هەر بشزانە ڕاتبێ چۆنە؟ گوتم: تا ئێستا ئەوکارەم نەکردوە، گوتیان: دەی هەر بچۆ، تەجرەبەیەکەو ئەو با ئەو فەقێیەشت لەگەڵ بێ، گوتم: ئاخر من نازانم چی بڵێم؟ گوتیان: با سوختەکە داوا بکات، تۆ هیچ مەڵێ، گوتم: باشە، ئیدی چووینە ماڵێك، کە یەکەم ماڵ بوو، فەقێیەکە گوتی: ڕاتبێ ڕەحمەتتان لێبێ، نانی فەقێیان، ئافرەتێك هاتە دەرێ، ئافرەتێکی دەم هەراش بوو، گوتی: ئەوە چی بوو فەقێینە، ڕاتبێی فەقێیان هەر نەبڕایەوە؟ تۆزێك پرتەو بۆڵەی کرد، منیش گوتم: کاکە ئەوە چییە؟ گوتی: ئەوە هیچ نیە ئەو ئافرەتە هەروایە، تووڕەیە، گوتم: هەر ئاوا نان پەیدا دەکەن؟ گوتی: نەخێر هەموو ماڵەکان هەروانین، بەس هەندێك هەروا چاو چنۆکن، گوتم: باشە! ڕاتبەکەمان کرد، نازانم چیدیمان پەیداکرد، بەهەرحاڵ چووینەوە، گوتم: برایانی فەقێ، گوتیان: بەڵێ، گوتم: کاکە من لەمەودوا هەرگیز ناچمەوە بۆ ڕاتبێ، گوتیان: بۆچی؟ گوتم: حاڵ‌و حیسابێکی وابووە، گوتم: لەمەودوا من بەڕاستی بەس بە ئەندازەی ئەوەی کە پێبژیم بەڕەوای دەزانم لە نانی ئێرە بخۆم، (سَـدُّ الرَّمَـق) یانی ئەوەندەی کە پێی بژیم، گوتیان: بۆچی؟ گوتم: نانێك ئێوە ئاوا پەیدایبکەن، ئەو خەڵکە لە شەرمی خۆی نانتان دەداتێ، ئەوە دەبێتە غەسبولحەیا، (غَصْبُ الحيـاء) بۆیە بە شەرعیی نازانم لەوە زیاتر بخۆم، لەمەودوا بەس دوو ژەم دەخۆم،

جگە لەو ڕۆژانەی كە بەڕۆژوو دەبم، گوتیان: نابێ وابكەی، گوتم: خۆتان ماندوو مەكەن، ئیدی لەوە بەدوا، هەر ئاوام دەكرد.

هەڵبەتە ئەوكاتە قەناعەتم وابوو، بەڵام ئێستا پێموایە ژیاندنی مامۆستاو قوتابییانی زانستی شەرعیی، لەسەر خەڵك‌و كۆمەڵگا فەرزە، وەك لە كتێبی (زانایانی ئیسلام كێن‌و چۆنن؟)دا باسم كردوە، بڕوانە چاپی سێیەم.

## خولە بەردەڕەشیی‌و فێربوونی ژمارە:

لەو بیرەوەرییانەی ئەوێم: ڕۆژێك كابرایەك هات بۆلام، گوتی: مامۆستا! بێزەحمەت دەمەوێ فێری ژماردنم بكەی، دووكاندار بوو، دەیویست فێری حیساب‌و ژماردن ببێ، (لە كتێبی ﴿ئیسلام‌و ڕێچكان﴾دا ئەو بیرەوەرییەی خۆمم گێڕاوەتەوە) كابرا ناوی مەحموود بوو، ئەوان پێیان دەگوت: (خولە)، ئیدی كاكە خولە هات فێری حیساب‌و فێری ژماردنی بكەم، گوتم: باشە، منیش فێرم كرد، فێری كۆكردنەوە (زائد)م كرد، دوایی فێری لێكدان (ضرب)م كرد، ئێستا (چەندان)ی پێدەڵێن، ئنجا فێری دابەشكردن (التقسیم)م كرد، دوایی كە فێری لێدەركردن (ناقص)م كرد، گوتی: ئەوە بۆچییە؟ گوتم: ئەوە بۆ ئەوەیە تۆ دووكانداریكی، ئەگەر زەرەرت كرد، بلێین ئەوەندە تەمەنت زەرەركرد، لێی دەردەكەی، واتە: ئەوەندەت زەرەركردوە، گوتی: مامۆستا! نامەوێ ئەوە فێرببم، گوتم: بۆچی؟ گوتی: ئاخر نامەوێ زەرەر بكەم، گوتم: ئاخر جاری وا دەبێ زەرەردەكەی، گوتی: بە خوا نامەوێ ئەوە فێربم، سەرەنجام نەیخوێندو گوتی: ئەوەیان ناخوێنم، جا ئەوەم لە كتێبی ﴿دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچكان﴾دا باس كردوە، گوتوومە: ماركسییەكان دەگەڕێن ئەو بیردۆزە زانستییانەی كە لەگەڵ ماركسیزمدا دەگونجێن دەیانهێنن، بەڵام هەر بیردۆزێكی زانستی لەگەڵ ماركسیزمدا نەگونجێ، باسی ناكەن، وەك خولە بەردەڕەشیی.

## بەستنی زاری گورگ :

تەماشای عەقیدەو فیكرو تێڕوانینی خەڵك، بكەن! خەڵكی گوندەكە زۆر متمانەیان پێم بوو، چونكە هەمیشە لە مزگەوت بووم‌و كارم بەسەر كەسەوە نەبوو، رۆژێك كابرایەك هات، گوتی: مامۆستا هاتووم زاری گورگم بۆ ببەستی! گوتم: بۆچی؟ گوتی: مانگایەكمان نەهاتۆتەوە، منیش گوتم: ئنجا زاری گورگ چۆن دەبەستریٚ؟ هەر بەڕاستی نەمدەزانی، بیستبووم، بەس نەمدەزانی، گوتی: ئەوە نیە سوورەتێك هەیە دەڵێ: ها ها...، گوتم: ئێ؟ گوتی: دەبێ ئەو سوورەتەی لەسەر بخوێنی، گوتی: خۆ تۆ دەزانی، چۆن نازانی؟، منیش گوتم: سوورەتی ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ۝١ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ۝٢﴾ اَلشَّمْسِ؟ گوتی: بەڵێ، منیش گوتم: باشە بۆت لێدەخوێنم، دیارە بۆ خۆشم لە مەسەلەكەدا دڵنیاییم نەبوو لەوبارەوە، ئەوساكە شارەزاییم نەبوو، گوتم: بەلاّم با ئامۆژگارییەكت بكەم، گوتی: بەڵێ، گوتم: كاكە بەتەمای زاری گورگی بەستن لە مانگایەكەت مەگەڕێ، بەدوایدا بچن، گوتی: ئاخر زۆر گەڕاوین، گوتم: كاكە تۆ بەقسەی من بكە، دوو سێ نەفەر با بچن، دەنا ئەمشەو بمێنێتەوە گورگ دەیخوات، زاری گورگی نابەستریٚ، زاری گورگێك دەبەستی، زاری دووان دەبەستی!! گوتم: بەپێی زانیاری من شتی وا لە شەرعدا نیە، گوتی: بەلاّم مامۆستایان وا دەكەن، منیش گوتم: بەپێی شارەزایی من شتی وانیە، چونكە خوا گورگی خوڵقاندوە، خۆ دەبێ شتێك بخوات، مانگای تۆ نەبێ‌و بزنی ئەوی دیكە نەبێ، ئەدی چی بخوات؟ گوتم: بەلاّم من سوورەتەكەت بۆ دەخوێنم، بەس تۆ بەتەمای ئەوە لێمەگەڕێ‌و بچۆ خەم بخۆ، بۆ بەیانی "الحمد لله" دیاربوو مانگاكە بە ساغیی دۆزرابۆوە، دیارە ڕەنگە ئەو قەناعەتی هەر وابووبێ، كە من زاری گورگم بۆ بەستوە!

## خواپەرستیی لە حوجرەدا :

ئەوکاتە پێمخۆشبوو ئەوەندەی بۆم بگونجێ خواپەرستیی بکەم، هەڵبەتە برا فەقێکان زۆریان پێ عەجایەب بوو، کە من دوو شەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبووم، شەونوێژم هەبوو، سوننەتی نوێژە فەرزەکان (رواتب)و نوێژی چێشتەنگاو نوێژی دەستنوێژو سوننەتی وەترو قورئان خوێندنو زیکری بەردەوامم هەبوو، زۆریان پێ سەیربوو! ئنجا مامۆستای مەرحووم، مامۆستا مەلا موحەممەد بۆ پێش نوێژیی نوێژی خەوتنان، بەتایبەتی کە زستانیش بوو، سەرماو قوڕو چڵپاو بوو، کەمتر دەهاتە مزگەوتو وەك بێتەوە یادم بەس جار جار دەهات، بۆ نوێژی بەیانیانیش هەر نەدەهات، بۆیە گوندەکە جەماعەتی نوێژی خەوتنانو بەیانیانیان نەبوو، ئنجا من هەتا لەوێ بووم، بۆ نوێژی خەوتنانو بەیانیانیش پێش نوێژییم بۆ دەکردن، کاتێك لەگەڵ فەقێکاندا باسی نوێژی بەکۆمەڵم دەکردو هانم دەدان دەیانگوت : کاکە فەقێو نوێژی بەیانیان نەگوتوە! کاتێك باسی ڕۆژووی سوننەتم بۆ دەکردن، دەیانگوت : فەقێو ڕۆژووی سوننەتیان نەگوتوە! ڕۆژێك ئاوا لەگەڵیان دانیشتبووم، گوتم : برایان وەرن هەندێك قسەم هەیە، گوتم : باشە ئێوە دەرسی عەقیدەو فیقهو زانیارییە شەرعییەکانی دیکە بۆچی دەخوێنن؟ گوتیان : بۆ ئەوەی فێرببین، گوتم : ئاخر بۆچی فێردەبن؟ بۆ ئەوە نیە کاری پێبکەن؟ گوتیان : با؟ گوتم : ئێستا ئێوە دەڵێن : فەقێو جەماعەتی بەیانیان نەگوتوە، فەقێو ڕۆژووی سوننەتیان نەگوتوە؟! ئەدی کێ بیکات؟ ئیدی زۆر ئامۆژگارییم کردنو هەیانبوو سوودی لێبینی.

## ژیانو گوزەرانی سەختو بێ جلو بەرگییو دژوێنیی :

ئەو پێنج شەش مانگەم زۆر بەسەختییو نارەحەتیی لێگوزەرا، ژیانو گوزەرانێکی سەختبوو، پاكو خاوێنیمان بەزەحمەت بۆدەکرا، پارەو کەلو پەلم پێنەبوو، جلەکانیشم هەر ئەو دەستە جلەبوو کە پێمبوو، هەرکات چڵکن دەبوون، دەمشۆردنو شتێکم لەکەسێکی دی وەردەگرت تاکو جلەکانم وشك دەبوونەوە، بۆیە کێچو ئەسپێمان زۆربوونو بەڕاستی ئەو

پێنج شەش مانگە بەکولە مەرگیی ژیام، بەڵام لێرەدا وەك وەفادارییەك بەرانبەر بەخەڵکی دێی بەردەڕەش، بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەشتێك بکەم:

هەندێك جار ئەو ماڵانەی هەبوو و دەستڕۆیشتووبوون، وەك سەرجەم فەقێکان دەعوەتیان دەکردین، ئەو دەعوەتانەش کە بەزۆریی گۆشتیشیان تێدابوو، ئاهێکی باشی دەهێنایەوە بەرمانو هێزو پێزێکی پێدەداینەوە، بەتایبەت ماڵی (حاجی مەحموود) ناوێك و ماڵی بابی فەقێیەك کە ناوی (عبدالکریم) بوو، خوا پاداشتی هەرە بەرزی خەڵکی خێرخوازی ئەو دێیە ئیسلام دۆستە بداتەوە.

### بەجێهێنانی وەسیەتێکی دایکم:

شتێك کە بەگرنگی دەزانم لێرەدا باسی بکەم، ئەوەیە کە پێش بەرێکەوتنم لە رانیەوە، دایکم "بەڕەحمەت بێ" پێی گوتم: رۆڵە! کە چووی بۆ کوردستانی ئەودیو، وەسییەتێکت بۆ دەکەم لەوێ دوو پوورم هەن، واتە خوشکی دایکی، پوور (حەلیم)و پوور (خەیاڵ)وە کچە پوورێکم هەیە، (رابیعـة)، پوور حەلیم لە گوندی (شیوەمێری)و پوور خەیاڵ لە گوندی (بێ لۆکێ)و رابیعەی کچە پووریشم (کچی پوور خەیاڵ) لە گوندی (سەپێکان)ە، پێمخۆشە ئەو خزمانەم بەسەربکەیەوە، گوتم: بەسەرچاو دایە، رۆژێك هاتەوە یادم، گوتم: دایکم شتێکی وایگوت، بۆچی نەچم؟ دیارە ئەوکاتە لە دایکمم پرسی گوتم: ئەو گوندانە لەکوێن؟ گوتی: لە نزیك گوندی (میراوێ)ن، ئەوە بوو لەبەردەڕەشەوە چووم بۆ (ڕەبەت) "ڕەبەت ناحیەیە"، لەوێوە بەرەو میراوێ چووم، چونکە (شیوەمێر) لەلای (میراوێ)یە، (سەپێکان)و (بێلۆکێ)ش هەر لەو دەوروبەرەن، لە دێیەك کە (بناویلە)ی پێدەڵێن گەیشتمە سەیارەیەك هی پێڕی کۆمەڵە بوو، گوتیان: کاکە دەچییە کوێ؟ گوتم: دەچم بەرەو لای میراوێ، گوتیان: هەتا لای گوندی (کاژێ) لەگەڵ ئێمە وەرە، گوتم: باشە، لەگەڵیان سواربووم، بەڵام لە ڕێگا سەیارەکە لە قوڕێدا چەقی، گوتیان کاکە پاڵ دەنێین، پاڵمان دەدا لە پاڵدانێدا جامی پشتەوەی سەیارەکە شکا، کە من لە پشتەوەڕا پاڵم دەدا، مەچەکی دەستی ڕاستم برینداربوو، ئێستاش شوێنی برینەکەی دیارە، بەهەرحاڵ سەیارەکەمان دەرهێنایەوەو

سواربووم تا گەیشتینە سەر ڕووبارەكە، ئەو ڕووبارەی كە دێتەوە دەربەند، (واتە: زێی گچكە كە لە هەر شوێنە ناوی ئەوێی لێهەڵدەدەن، لەلای (نەڵاس) چۆمی نەڵاس و، لەلای گوندی (هەرزنێ) چۆمی هەرزنێی پێدەڵێن) كە گەیشتینە سەر ڕووبارەكە، تەماشام كرد لەوێ كەڵەكی لێبوو، خەڵك بەكەڵەك دەپەڕییەوە، منیش دەستم گرتبوو خوێنی پێدا دەهات، كابرای كەڵەكەوان[1] گوتی: كاكە مەلا ئەوە چییە؟ گوتم: دەستم بریندار بووە، گوتی: بەچی؟ گوتم: حاڵ و حسابێكی وابووە، پلاستەرێكی پێبوو، پلاستەرەكەی لێبەست و گوتی: با خوێنەكەی وشكبێ و خوێنی لێنەیەت، ئیدی بەكەڵەكێ پەڕیمەوە، كەڵەكەوانەكە گوتی: دەچییە كوێ؟ گوتم: بەرەو لای میراوێ دەچم، گوتی: دەی تازە ئەوە درەنگە، (كات دەمەو شێوان بوو، شەوی هەینیش بوو) گوتی: ئەمشەو درەنگە، گوتم: تازە ئەمشەو لێرە دەبم، لەلای فەقێیان دەبم، ئیدی لە گوندی (كاژێ) شەوێ چوومە لای فەقێكان، نانمان خواردو دوایی دڵم زۆر توندبوو، لەبەر چەند هۆیەك، خۆمم پێ غەریب بوو، دەستیشم بریندار بوو ئازاری هەبوو، وە دەمگوت: نازانم ئێستا دایك و بابم و ئەوان چییان لێهاتوە؟ پاشان ئایندەی خۆمم لەلا ڕۆشن نەبوو، پارەیەكی وام پێنەبوو، لە ماڵی خۆم دوور بووم!

## لە خوا پاڕانەوەی گەرم و بە كوڵ و مووژدەدەر (مبشِّرة)یەكی زۆر خۆش:

ئەوەبوو چوومە مزگەوت، نوێژی خەوتنانم بە جەماعەت كرد، دوایی نوێژی وەترم كردو زۆر پاڕامەوەو دوعای بەكوڵم كرد، نازانم بۆچی هەر وا بەدڵمدا هات، گوتم: خوایە! ئەمشەو بە خزمەت پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" بگەم، خوایە دڵم خۆش بكە! دوای دوعایەكان چوومەوە حوجرەو خەوتم، شەو ئەم خەونەم بینی:

﴿لە خەونمدا گوتیان: ئەوە گۆڕی پێغەمبەرە "صلى الله عليه وسلم" پێویستە هەڵیكەنییەوەو، جەنازەی موبارەكی دەربێنییەوەو بیگوازیەوە بۆ ئەو گۆڕە

١) كەڵەكەوان: كەسێكە سەرپەرشتیی (كەڵەك) دەكات و خەڵك دەپەڕێنێتەوە، وە (كەڵەك) لە چەند كوندەو مەشكە یان چەند چوویێك دروست دەكرێ.

تازەیە، "گۆڕێكی تازەم بۆ هەڵكەندبوو" ، لەو گۆڕە تازەیەدا بینێژی، (واتە: گۆڕەكەی كۆن بووە دەبێ جەنازەكەی دەربێنییەوەو بیخەیە ئەو گۆڕە تازەیەوە) یەك كەسی دیكەم لەگەڵدا بوو، نەمزانی كێ بوو؟ منیش گڵەكەم هەڵدایەوە لامبرد. . . لامبرد. . . لامبرد، ئەگەر كەستەكە گڵێك كەوتبایە سەر كفنەكەی بە پەلەو زۆر بە پەرۆشەوە لامدەبرد، دوایی گەیشتمە جەنازەكەی، وەك بڵێی پێغەمبەر "صلى الله و عليه و سلم" بە زیندوویی بێ، كفنەكەی سپیو جوان، خۆیشی هەر وەكو بڵێی زیندووبێ لەنێو كفنەكەیدا، ئیدی ئاوا لە مشتومڕی ئەوەدابووین كە تەرمەكەی دەربێنمەوەو بیخەمە گۆڕە تازەكەیەوە، خەبەرم بۆوە! ❁ كە خەبەرم بۆوە سەراسیمە بوومو سەرم سوڕما! گوتم: خوایە! من بەتەمابووم بە خزمەت پێغەمبەر "عليه الصلاة والسلام" بگەم، ئایا حیكمەتی چییە ئەوەم بینی؟ قەبری پێغەمبەر هەڵكەنیو تەرمەكەی دەربێنیو بتەوێ بیخەیە قەبرێكی دیكەوە، ئەوە دەبێ چی بێ؟ لەدڵی خۆمدا گوتم: ڕەنگە خوا پێیناخۆش بووبێ، كە من ئەو دوعایەم كردوە، زۆر دڵم نارەحەت بوو، بەس تۆزێكیش ئیحتیمالم دادەنا دەمگوت: ڕەنگە خەونەكەم تەعبیرەكەی باش بێ، بەڵام زیاتر دڵم بەلای نارەحەتییدابوو، دەمگوت: ڕەنگە خوا داوایەكەمی پێناخۆش بووبێ، بۆیە ئەوەی پێشانی منداوە، بەهەرحاڵ وەك مەراقێك، هەر لە دڵمدابوو.

## سەردانكردنی پوورەكانی دایكم:

دوایی چوومە (شێوەمێرێ) كە پوور حەلیم یەكێ لەپوورەكانی دایكم لەوێ بوو، شەوێ لەوێ بووم، دوایی چوومە (سەپێكان)، كە كچە پوورێكی دایكم (ڕابیعە) لەوێ بوو، شەوێكی دیكەش چوومە (بێلۆكێ) كە پوور خەیاڵی لێبوو، یەكی شەوێك یا دوو شەو لایان دەبووم، زۆریان پێخۆشبوو كە دەچووم، دەیانگوت: كێی؟ فلان كەسی؟ كە خۆم پێدەناساندن، شاگەشكە دەبوون، دەیانگوت: چۆن ئێرەت دۆزیوەتەوە؟ ئێستا لە كوێی؟ دیارە بۆم باسكردن كە كێمو چۆن هاتوومو لەكوێ دەخوێنم؟!.

## گەڕانـەوەم بۆ بەردەڕەش و زانیـنی تەعبیـری خەونەكـەم :

دوای ئەوەی چەند شەوێك لەلایان مامەوە گەڕامەوە، كە گەڕامەوە یەكەم ئیشم ئـەوە بـوو چوومە خزمەت مامۆستا مەلا موحەممەد، "بەرەحمەت بێ" گوتم: مامۆستا! لەم سـەفەرەمدا خەونێكم بینیوە، دوای ئەوەی كە زۆر دڵتەنگ بووم و شەوی جومعە بوو، زۆر زۆریش دوعام كرد، خەونێكی ئاوام بینـی، زۆریش دڵم پێی نارەحەتــە، مامۆستا "هەزار ڕەحمەتی لێبــێ" پێكەنی و گوتی: ئەو خەونەت بینیــوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: خەونەكەت زۆر چاكەو هـیچ خەمت نەبێ، گوتم: مامۆسـتا چۆن؟ گوتی: تەعبیرم هەیـە بۆت دێـنم، بـەلاّم ئێســـتا لـە یادمە تەعبیرەكـەی چـاكە، دوایـی كتێبەكـەی هێنـا گـوتی: هـا بۆخـۆت تەماشــــای بكـە! ﴿تەعبیری (إبن سیرین) دەڵێ: (هەركەسێ ببینێ گۆڕی پێغەمبــەر "علیه الصلاة والسـلام" هەڵدەداتەوە، بەمەرجێك نەگاتـە ئێسـك و پرووسـك، (واتـە: هەسـت بكـات جەنازەكـەی نەگۆڕاوە، كـە دیـارە خەونەكـەی مـن وابـوو) ئـەوە ڕێ و شـوێنی پێغەمبـەر "علیـه الصـلاة والسـلام" زیندوودەكاتـەوەو بـەرێی پێغەمبــــەردا دەڕوات و ڕێ و شـوێنەكەی، ئـەوەی كـە لەئارادا نەماوەو لەبیرخەڵك چـۆتەوە، دەیبووژێنێتــــەوە، بڕوانـە: (تعطیــر الأنـام في تعبیــر الـمنام، لابن سیرین) ج٢، ص١٣٩، لفظ: قبـر﴾ ئەوە بۆ تۆ شتێكی زۆر گەورەیـە، هەڵبەتـە لــەو كاتــەوەش مامۆســتای بەردەڕەشــیی "هــەزار ڕەحمــەتی لێبــێ"، هەسـتم دەكـرد خۆشەویستیی و ڕێزو مشوور خواردنی بۆم زیـادبووە، منیش زۆر دڵم خۆش بـوو، گـوتم: مامۆستا! زۆر دڵم لەو خەونەم دەترسا، گوتی: نا ئەوە موژدەیەكی زۆر خۆشـەو بەردەوامبـە لەسەر وەدەستهێنانی زانست و "إن شــاء الله" ئایندەیەكی ڕۆشنت دەبێ.

# باسـێك لەبـارەی خەونــەوە

لە سۆنگەی ئەوەوە كە جاری دیكەش تووشی هەندێك خەون دەبین لە سـەفەری ژیانمـدا، كە بۆم دەركەوتوە خەونی ڕاستن، پێمخۆشە لێرەدا تیشكێك بخەمـە سـەر مەسـەلەی خـەون و لەوەشدا دوو ئامانجم هەن:

أـ ڕوونكردنەوەی هەڵوێستی ڕاست و دروست و شـەرعییانە لە بەرانبەر خەوندا.

بـ پووچـەڵكردنەوەی هەنـدێك قسـەو قسـەڵۆكی ناحەزانـە، كـە لەمـەڕ خەونـەوە لـە ڕابردوودا لەبارەی بەندەوە كراون و، دەرخستنی هەڵوێستی ڕاسـتەقینەم لەوبارەوە.

هەڵبەتە خەڵكێك لە مەسەلەی خەون (رؤيا)دا كورتهێنان و تێپەڕاندن، (تفريط وإفراط)یـان هەیە، منیش وەك ئەركێكی شەرعیی سەرشـانم، بەپێویسـتی دەزانم هـەر مەسـەلەو بابـەتێك خەڵك تێیدا دووچاری هەڵـەو لادان بـووبن، چ بـەباری تێپەڕانـدن، چ بـەباری بەزایەدانـدا، ڕوونی بكەمەوەو بیخـــەمەوە سـەر ڕاســـتەڕێی شـەرع، وە مـن لـە دوو كـتێبی خۆمـدا تـا ئەندازەیەك بەدرێژیی باسی خـەون و خورپـە (إلهـام)م كـردوە: لـە بـەرگی دووەمـی كتێبـی (ئیمـان و عەقیـدەی ئیسـلامیی)دا، وە لەكتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەوخوا چوون) دا، لە لاپـەڕە (٢٣٤ـ ٢٤٢)دا، لـەژێر ناوونیشـانی: {خورپـەو خـەون (الإلهـام والرؤيـا) و هەڵسەنگاندنیان} دا، چەند قسـەیەكم لـەوبارەوە كـردوەو، كورتەكـەی ئەوەیـە كـە دیـن لـە وەحییدا بەرجەسـتەیە، وەحییش لە قورئان و سوننەتدا كورت هەڵاتوە، واتە: ئەو دینەی كـە پابەندكەر (مُلْـزِم)ە بـۆ هـەموو كـەس، لـە هـەموو كـات و شـوێنەكاندا، تـەنیا وەحییـە، وەحییش تەنها لە قورئان و سوننەتدایە، چونكە وەحی بەگشتی دوو بەشـە:

**بەشی یەكەم**: ئەوەیە كە خوا بە شێوەی تایبـەت بـۆ پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم)ی ناردوە، ئەویش قورئانە، وەك خوای زانا دەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١ مَا ضَلَّ

﴿ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم، که دیاره مەبەستی قورئانه، هەندێکیش دەڵێن مەبەست پێی سوننەتیشه.

بەڵام دووەم: وەحی بریتییه لە سوننەتی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" کە ئەویش دەبێتەوە بە سێ جۆر:

فەرمایشتەکانی کە فەرمووونی، وەك فەرموویەتی: (اتق الله حيثما كنت..) رواه الترمذي.

کردەوەکانی کە کردوونی، وەك فەرموویەتی: "صلوا كما رأيتموني أُصلِّي" رواه البخاري، لەبەرچاوی هاوەڵانی نوێژی کردوەو فەرموویەتی: وەك منتان بینی نوێژم کرد، نوێژ بکەن، یان فەرموویەتی: (لتأخذوا مناسككم) رواه مسلم، حەجی کردوەو فەرموویەتی: ئێوەش ئاوا حەج بکەن.

وە جۆری سێیەمی سوننەت بریتیە لە دان پێداهێنانەکان (التقريرات)ی، واتە: شتێك لەبەرچاوی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" کراوەو ئەویش ڕەزامەندیی لەسەر دەربڕیوە، بۆ وێنە: عەمری کوڕی عاص "خوای لێ ڕازی بێ"، وەك لە سوننەتدا هاتوە: لە حاڵێکدا کە بەرپرسی کۆمەڵێك لە جەنگاوەران بووەو لە سەفەر بوون، شەوێك ئیحتیلامی بووە، تەیەمموومی کردوەو خۆی نەشۆردوەو، پێشنوێژیی بۆ کردوون، ئنجا کە گەڕاونەوە، هاوەڵەکانی ئەو مەسەلەیان بۆ پێغەمبەری خوا "عليه الصلاة والسلام" باسکردوەو ئەویش فەرموویەتی: ئایا پێشنوێژییت بۆکردن لە کاتێکدا کە خۆیشت نەشۆردبوو، لەشپیس بووی؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، چونکە لە خوای بەرزم بیستوە فەرموویەتی: ﴿ ... وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ النساء، واتە: خۆتان مەکوژن خوا لەگەڵتان بە بەزەییە، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم لەسەرمان بمرم، پێغەمبەری خواش "صلى الله عليه وسلم" پێکەنی و هیچی نەفەرموو، بڕوانە: (سنن أبي داود: ٣٣٤) و (صحيح ابن حبان: ١٣١٥)، دیارە کە هیچی نەفەرموو و پێکەنی، مانای وایە ڕازییە، ئنجا ئەوە پێیدەگوترێ: دانپێداهێنان (تقرير)، بەڵێ دین بریتیە لە قورئانو سوننەتو تەنیا ئەو دووانە

پابەندكەرن، ئەوی دی هەمووی: (ئنجا قسەی زانایانو ئیجتیهادی زانایانە، یان خەونە، یان ئیلهامە، یان فیراسەتە) هەمووی دەگونجێ وەربگیرێو دەشگونجێ وەرنەگیرێ، بەڵام هیچی پابەندكەر نیە بۆ كەس.

ئێمە هەوڵدەدەین لە دوو بڕگەدا بەكورتیی بابەتی (خەون) بتوێژینەوە، سەرەتا لە بڕگەی یەكەمدا لە ڕوانگەی قورئانی بەپێزەوەو، پاشان لە بڕگەی دووەمدا لە ڕوانگەی سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزەوە، هەوڵدەدەین دیاردەی خەون بینین هەڵسەنگێنینو، دەریبخەین كە تا چ ڕاددەیەك ئیعتیباری پێدەكرێو پشتی پێ دەبەسترێ؟

## ١- هەڵسەنگاندنی خەون لە ڕوانگەی قوڕئانەوە:

ئایا خەون متمانەی پێدەكرێ یان نا؟ دەڵێم: بەڵێ، چونكە خوای پەروەردگار لە قورئاندا، هەم بۆ پێغەمبەران "علیهما الصلاة والسلام" و هەم بۆ غەیری پێغەمبەران، بە گرنگیی و بایەخ پێدانەوە باسی خەونی كردوە، بۆ وێنە:

١) لەبارەی (إبراهیم)ەوە "علیه الصلاة والسلام" كاتێك كە خەون دەبینێ ئیسماعیلی كوڕی سەردەبڕێو، پاش بێداربوونەوە ئەم وتووێژە لەنێوان خۆیو كوڕەكەیدا ڕوودەدات: ﴿... قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾﴾ الصافات، واتە: (ئیبراهیم) گوتی: ئەی ڕۆڵە گیان! من لە خەونمدا بینیم كە تۆم سەردەبڕی! ئنجا بزانە ڕات چییە؟ (ئیسماعیل) گوتی: ئەی بابی خۆم! چیت فەرمان پێكراوە بیكە، ئەگەر خوا بیەوێ لە خۆڕاگرانم دەبینی، ئنجا كاتێك ملكەچ بوون (بۆ فەرمانی خوا) وە لەپەڕوو خستی.

بەڵێ دوای ئەوە خوا عزّوجلّ بە ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾﴾ الصافات، واتە: خەونەكەت بەڕاست گێڕا (جێبەجێت كرد) ئێمە بەوجۆرە پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە.

دیاره پاش ئەوەی ئیبراهیم "علیه السلام" ئیسماعیلی کوڕی دێنێتە سەر سەربڕین و لەپەوڕوو، دەیخاتە سەرزەوی و چەقۆی بەپشتەملدا دێنێ، بە فەرمانی خوا نایبڕێ و، پاشان خوا بەرانێك دەکاتە بەدیل و بەلاگێڕەوە (کبش الفداء)ی ئیسماعیل و لەجیاتی وی سەری دەبڕرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾ **الصافات**، واته: قوربانییەکی مەزنمان کردە قەرەبووی.

٢) لەبارەی پێغەمبەری خاتەمەوە موحەممەد "علیه الصلاة والسلام"، خوا فەموویەتی:

﴿ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الفتح، واته: بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی خۆی وەراست گێڕاو هێنایەدی، بەدڵنیاییەوە، بەبێ ترس دەچنە نێو مزگەوتی حەرامەوە، لە حاڵێکدا کە قژی سەرتان تاشراو و کورتکراوە دەبێ، بیمتان نابێ، ئەوەی ئەو دەیزانێ ئێوە نەتاندەزانی، بۆیە پێش ئەوە سەرکەوتنێکی نێزیکی هێنایە پێش.

٣) هەروەها ژیانی (یوسف) پێغەمبەر "علیه الصلاة والسلام" هەمووی بریتیە لە تەعبیری ئەو خەونەی کە لە سەرەتای تەمەنی منداڵییەوە دەیبینێ، وەك خوای زانا لەوبارەوە دەفەرمووێ: ﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾ یوسف، واته: کاتێك یوسف بە بابی گوت: ئەی بابی خۆم! من مانگ و خۆرو یازدە ئەستێرەم بینین کڕنووشیان بۆ من دەبرد، کە لێرەدا مەبەستی لە کڕنووش، واته: ڕێزیان لە من دەگرت، وە تەعبیرەکەی ئەوەیە کە دایك و باب و یازدە برایەکەی ڕێزی لێدەگرن و تەحییەی بۆ دەکەن، یانی: ئەو لە مەقامێکدا دەبێ کە ئەوان هەموویان ڕێزی لێدەگرن، ئەویش دوای ئەوەی کە براکانی دەیخەنە بیرەوەو دوایی دەردەهێنرێ و دوایی لە میسر دەفرۆشرێ، وەك کۆیلەیەك، ئنجا لە ماڵی عەزیزی میسر بوختانی خراپی پێدەکرێ و، دوایی زیندانیی دەکرێ، ئنجا کە لە

زیندان دەردەچێو کراسەکەی بە براکانی دا دەنێرێ، وە کاتێك کراسەکە بەسەر چاوی بابیدا دەدەنو بابی چاوی چاك دەبنەوە، دوایی بابو دایکیو هەر یازدە برایەکەی دێن بۆ میسر، وەك خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرمووێ: ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَىٰ يُوسُفَ آوَىٰ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ادْخُلُوا مِصْرَ إِن شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَا أَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي ۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَاءُ ۚ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾ يوسف، واتە: ئنجا کاتێك چوونە لای (یوسف) "علیه الصلاة والسلام" رێزی لە بابو دایکی گرتو حەواندنیەوەو لەسەر کورسی دانیان، وە گوتی: وەرنە میسرو نیشتەجێبن ئەگەر خوا بیەوێ، پاشان هەموویان رێزیان لێگرتو کڕنووشیان بۆبرد، (واتە: تەحییەیان بۆ کرد، چونکە وشەی سەجدە تەحییەو چەمانەوەو دەست بە سینگەوە نان دەگەیەنێ) وە گوتی: ئەی بابی خۆم! ئەوە تەئویل (تەئویل واتە: سەرەنجام)و هاتنە دی خەونەکەی پێشوومە، کە پەروەردگارم هێنایەدی، وەچاکەی لەگەڵ کردم کە لە زیندان دەربازی کردم، وە ئێوەشی لە بیابانەوە هێنا، پاش ئەوەی شەیتان نێوانی منو براکانمی تێکدابوو، بێگومان پەروەردگارم هەرچی بیەوێ بە پەنهانکاریی دەیکات، بەڕاستی خوا زانای کار بەجێیە.

٤) ئنجا ئەگەر بگوترێ: خەونی پێغەمبەران "علیه الصلاة والسلام" وەحییە، بۆیە متمانەی پێدەکرێ، بەڵام هی غەیری ئەوان وانیە، دەڵێین بەڵام دوو هاوەڵەکەیشی خەون دەبینن (یوسف) بۆیان تەعبیر دەکاتو خەونەکانیشیان ڕاست دەردەچن، وەك لە ئایەتەکانی (٣٦و ٣٧) و(٤١)ی (یوسف)دا هاتوون، کە یەکێکیان لە خەونیدا مەی (شەراب)ی گێڕاوەو، ئەوی دیکەشیان سینیە خواردنێکی لەسەر سەری داناوەو باڵندە لێیان خواردوەو، یوسفیش بە دەربازبوونی یەکەمیانو ئیعدامکرانی دووەمیان، خەونەکانیان لێکدەداتەوە.

٥) هەروەهـا پادشاش خـەون دەبینـێ، كە حەوت گوڵە گەنـمی بێـدانو حـەوت مانگـای لەڕ، حـەوت مانگـای قەڵـەو و حـەوت گوڵـە گەنـــمی پـڕدان دەخـۆن، وە (یوسـف) خەونەكەی بۆ تەعبیر دەكاتو، لە ئەنجامی ئـەوەدا نەخشـەیەكی ئـابووریی پـازدە سـاڵە دادەنێو، میسر لە قاتو قڕیی‌و گرانیی دەربـاز دەبێ، وەك لە ئایەتەكانی (٤٣ تـا ٤٩)دا هاتوە.

كەواتـە: بـەپێی ئایەتـەكانی قورئـانی بەپێـــز، هەرچـەندە خـەون وەك بەڵگەیـەكی شـەرعیی‌و بە بەشێك لە ئـایین (ئیسـلام) دانـانرێ، بەڵام دەروازەیەكـە دەگونجـێ لێیـــەوە پەی بـە هەنـدێك لـە نهێنییـــەكانی ئێســتاو داهـاتوو ببـرێ، بـەڵام بێگومـان بـە مـەرجی ڕاســتبوونی خەونەكە.

## ٢- هەڵسـەنگاندنی خەون لە ڕوانگەی سـوننەتەوە:

بەپێویستی دەزانم پاش سەرنجدانی (خەون بینین) لـە ڕوانگـەی قورئانـەوە، ئامـاژەش بكەم بە هەندێ فەرمایشـتی پێغەمبـەر "صلى الله علیه وسلم"، تاكو بزانـرێ كـە خـــەون وەك گوتم: بەڵگەی شـەرعیی نیـەو، بە خـەون هیچ شتێك حەڵاڵ یـان حـەڕام نابـێ، وە هیچ شتێك بە خەون واجب نابـێ یـان قەدەغـە نابـێ، بـەڵام خـەون متمانـەی پێـدەكرێو حیسـابی بـۆ دەكـرێ، بـۆ بەرچـاو ڕوونیـی‌و بەرپێـــی خـۆدیتنو، بـۆ دڵخۆشـكرانو ئاگادار كرانەوە:

١) پێغـەمبەر "صلى الله علیه وسلم" لە فەرمایشتێكدا كە (مسـلم) بـە ژمـارە (٢٢٦١) وە (بخـاري) بە ژمارە (٧٠٤٤)، هەروەها (أبـوداود) بـە ژمـارە (٥٠٢١) وە (ترمـذي) بـە ژمارە (٢٢٧٧) هێناویـانە، دەفـەرموێ: ﴿الرُّؤْيَـا مِنَ اللَّهِ وَالْحُلْـمُ مِـنَ الشَّـيْطَانِ، فَـإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ حُلْمًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثًا، وَلْيَتَعَـوَّذْ بِاللَّـهِ مِـنْ شَـرِّهَا فَإِنَّهَـا لَـنْ تَضُرَّهُ﴾، واتە: "خەونی چـاك لـە خواوەیـەو، زرە خـەون (یـان خـەونی نـاخۆش) لـە شەیتانەوەیە، ئنجا هەركامێك لە ئێـوە زرە خەونێكی، (یان خـەونێك كـە پێـی نـاخۆش بوو) بینی، با سێ جاران تف لەلای چەپی بكـات، وە با پەنا بە خوا بگرێ لـە خراپـەی ئەو خەونـە، ئەوە زیانی پێناگەیەنـێ".

٢) هەر لەوبارەوە پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" دەفەرموێ: ﴿الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَالرُّؤْيَا السَّوْءُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأَى رُؤْيَا فَكَرِهَ مِنْهَا شَيْئًا فَلْيَنْفِثْ عَنْ يَسَارِهِ، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ" لاَ تَضُرُّهُ، وَلاَ يُخْبِرْ بِهَا أَحَدًا، فَإِنْ رَأَى رُؤْيَا حَسَنَةً، فَلْيُبْشِرْ، وَلاَ يُخْبِرْ إِلاّ مَنْ يُحِبُّ﴾.رواه البخاري:٧٠٠٥، ومسلم، ٥٨٦٢، واتە خەونی باش لە خواوەیە، وە خەونی خراپ لە شەیتانەوەیە، (خەونی خراپ ئەوەیە کە دڵت پێی نارەحەت بێ، یان ترسناك بێ)، جا هەرکەسێ خەونێکی بینی، شتێکی لە خەونەکەدا بینی پێیی ناخۆشبوو، با سێ جاران تف لە لای چەپ بکات، وە با پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان، بێگومان زیانی پێناگەیەنێ، وە با بۆ هیچ کەسێکی نەگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر خەونێکی باشی بینی، با دڵخۆشبێ، وە با بۆ هیچ کەسێکی نەگێڕێتەوە، مەگەر خۆشی بوێ.

٣) هەروەها پێغەمبەر "علیه الصلاة والسلام" لە فەرمایشێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿إذا اقترب الزمانُ لم تكد رُؤيا المسلمِ تكذبُ، وأصدقُكم رؤيا أصدقُكم حديثاً، ورؤيا المسلمِ جزءٌ من خمسٍ وأربعين جزءًا من النبوَّة، والرؤيا ثلاثةٌ: فرؤيا الصالِحَةِ بشرى من الله ، ورؤيا تحزينٍ من الشيطان، ورؤيا مما يُحدِّثُ المرءُ نفسَه، فإن رأى أحدُكم ما يكره، فلْيَقُمْ فلْيُصلِّ، ولا يُحدِّثْ بها الناسَ﴾.رواه مسلم ٥٨٦٥، والترمذي ٢٢٧٠، وأبوداود ٥٠١٩، واتە: کاتێك کە دوارۆژ نزیك دەبێتەوە، (یان کاتێك کە کات کورت دەبێتەوە، لەوانەیە ئاماژە بێ بۆ تەکنۆلۆژیای پەیوەندییەکان) نزیك دەبێ کە خەونی مسوڵمان درۆ دەرنەچێ، (واتە خەونی ڕاست زۆر دەبێ) وە کامەتان قسەی ڕاستتر بێ، خەونەکەیشی ڕاسترە، وە خەونی مسوڵمان بەشێکە لە چل و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی، (لە فەرموودەکانی دیکەدا باسی چل و شەش بەش کراوە) وە خەون سێ جۆرە: خەونی باش موژدەیە لە خواوە، وە خەونێك دڵتەنگکردنە لە شەیتانەوە، وە خەونێکیش کە ئینسان بیر لە شتێك دەکاتەوە، شتێك لە دڵیدا هەیە خولیایەك، خەونی پێوە دەبینێ، ئنجا ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو، با هەڵسێ دوعا بکا، یاخود نوێژ بکات، وە با بۆ کەسی نەگێڕێتەوە.

٤) وە هەروەها لەبارەی بینـرانی خۆیـەوە لە خەوندا، فەرموویەتی: ﴿مَـنْ رَآنِي فِي الْمَنَـامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنّ الشّيْطَانَ لا يَتَمَثّلُ بِـي﴾. رواه مسـلم:٥٨٧٩، واتـە: هـەر کەسـێك لـە خەوندا منی بینـی، ئەوە بێگومان منی بینیوە، چونکە شـەیتان ناچـێتە سـەر شـێوەم، وە فەرموویەتی: (من رآني فـي النوم، فقد رآني، فإنه لاينبغي للشيطان أن يتشبه بـي) رواه مسلم: ٥٨٨٣ .

کەواتە: خەونی باشی ئینسانی ئیماندار بەگشـتی بەشێکە لە چل و شـەش، یـان چـل و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتیی، بەڵام خەون بیـنین بـە پێغەمبـەرەوە "صـلی الله علیـه وسـلم" بەتایبەت، ئەوە حوکمێکی دیکەی هەیە، چونکە خەون بینین بـە پێغەمبـەرەوە، هـەمووی هەر باشەو بەشی شەیتان و نەفسی پێوە نیـە، وەك خـەون دیـتنی گشـتی کـە سـێ جـۆرە، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە شەیتان توانای خۆبردنە سەر شێوەی پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" و خۆپێچواندنی نیـە، وەك لە فەرمایشـتەکاندا بەڕوونو ڕاشکاویی هاتوە.

شایانی باسیشە خـەون (رؤیـا) چ مرۆڤـ خـۆی ببینـێ، چ پێـوەی ببینـرێ، هەریـەك حیسـابە، وەك پێغەمبـەرمان موحەممـەد "صـلی الله علیـه وسـلم" فەرموویـەتی: ﴿رؤیـا الـمسلم یراهـا أو ترى له﴾ رواه مسلم: ٥٨٧٢ ، واتە: " خەونـێ مسـوڵمان ببینێ، یـان پێیـەوە ببینـرێ (هەر یەکـە)" .

## چـەند ئاگادارییـەکی گرنـگ لەبـارەی خـەون بیـنینـەوە

یەکەم: هەموو خەونێك بەشـێك نیە لـە چـل و شـەش بەشـی پێغەمبەرایـەتیی، بـەڵکو ئـەو خەونەی بەو شـێوەیە، دوو مەرجی هـەن:

یەك: خەونەکە لە خودی خۆیدا باشبـێ و خراپ نەبێ، واتە: نە لە شـەیتانەوە بێ، نە لە نەفسـەوە، چونکە پێغـەمبەر "صلی الله علیه وسلم" فەرموویەتی: ﴿الرؤیا الصالحة جُزءٌ من سـتةٍ وأربعین جـزءاً من النبـوَّة﴾ رواه مسلم: ٥٨٧٢.

واتە: " خەونی باش بەشێکە لە چل و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی " .

**دوو:** خـەون بینەرەكـەش مرۆڤێکـی مسـوڵمانو باشبـێ، وەك پێغەمبەری خـوا فەرموویـەتی: ﴿رؤیـا الرجـل الصالح جزءُ من ستة واربعـین جـزاً مـن النبـوة﴾ رواه مسلم: ٥٨٧٣، وە فەرموویەتی: ﴿رؤیا الـمؤمن جزءٌ مـن سـتة وأربعـین جـزءاً مـن النبـوَّة﴾ رواه البخاري: ٦٩٨٧.

**سێیەم:** خـەون پێویسـتی بە لێكدانەوەی ڕاسـت (تعبیر صحیح)، هەیـەو هـەموو كەسـێش ئـەو توانایـەی نیـە، هەربۆیـەش یەكێـك لـە موعجیـزەكانی (یوسـف) "علیـه السـلام" بریتی بووە لە لێكدانەوەی مانای خـەون، وەك خوا "عزّ وجلّ" فەرموویەتی:

﴿...وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ ...﴾ یوسف ﴿٢١﴾، واتە: وە ئاوا بەوشێوەیە یوسفمان دەسترۆیشتوو كرد لە زەویـدا، وە بـۆ ئەوەی لە مانای خەونانی فێر بكـەین.

**سێیەم:** وەك پێشتریش باسمان كرد سەرجەم زانایان، لەسەر ئـەوە یەكـدەنگن، كـە خـەون ئەگەر باشیش بـێ، تـەنیا دڵخۆشـیی و بەرچـاو ڕوونیـی و ئاگاداركردنەوەیـەو، بـەهیچ جۆرێك دروست نیـە بۆ بواری حەرامو حەڵاڵو فەرزو سـوننەت پشـتی پێببەسـترێ، چونكە سەرچاوەی دیاریكردنی حوكمە شەرعییەكان، تەنیا شـەریعەتی بەرجەسـتەیە لـە قورئانوسـوننەتدا، كەواتـە، هـیچ كـەس بـۆی نیـە بەپشـت بەسـتن بـە خـەونێك كـە بینیوویەتی، یان پێیـەوە بینراوە، شتێك لەسەر خۆی پێویست یـان قەدەغـە بكـات، یـان شتێك بۆخۆی بە ڕەوا یان ناڕەوا دابنێ.

هەر بۆیەش پێغـەمبەری خوا "صلى الله علیه وسـلم" نـاوی لـە خەونـە باشـەكان نـاوە: دڵخۆشكەرەكان (الـمبشّرات) وەك فەرموویـەتی: ﴿لـم یبـق مـن النبـّـوة إلاّ الـمبشّـرات، قالوا وما الـمبشّـرات؟ قال: الرؤیا الصـالحة﴾ رواه البخاري: ٦٩٩٠، واتە: هیچ شتێك لە پێغەمبەرایەتیی نەماوەتەوە جگە لـە دڵخۆشـكەرەكان، گوتیـان: ئنجـا ئایـا دڵخۆشـكەرەكان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە.

# سەردان کردنەوەی ماڵی بابم
# بۆ جاری یەکەم دوای لە ماڵ دەرچوونم

دوای ئەوەی کە ماوەیەك لەگوندی بەردەڕەش مامەوە، ڕەنگە چوار مانگێك بووبێ، بە پێویستم زانی کە سەرێکی ماڵەوە بدەمەوەو، بزانم چۆنن‌و بێمەوە بۆ باشووری کوردستان، ئەوە بوو کە بە پێیان‌و بە قاچاغیی هاتمەوەو، لە سەرەتای (١٩٨٢) بوو، کە ساڵێکی یەکجار بە سەرماو سۆڵەو تووشبوو، هاتم بە دۆڵی نێوزەنگ‌و زەڵێ‌و قاسمەڕەشدا، کوڕە خاڵێکم لەوێ پێشمەرگە بوو، ئەحمەد ئیبراهیم ڕەسووڵ، کوڕی خاڵ برایمم بوو، کە دوایی کوژرا خوا عەفووی بکا، برایەکی هەیە کاك (عەبدوڵڵا)، ئێستاش ماوە، کاك ئەحمەد ئەو کاتە پێشمەرگەی یەکێتی بوو، من کە چووم ئەویش لەوێبوو، گوتی: بۆ کوێ دەچی؟ گوتم: دەمەوێ سەرێکی ماڵەوە بدەمەوە، گوتی: باشە، ئێمەش لەم ڕۆژانەدا مەفرەزەمان هەیە، دەمانەوێ بەرەو قەڵاتووکان بچین، تۆش لەگەڵ ئێمە وەرە، لەوێشەوە ڕێنماییت دەکەین چۆن بڕۆی، ئاوا بڕۆیەوە ڕژێم دەتگرێ، چونکە قاچاغیی‌و ئەمری گرتنت هەیە، ئنجا لە گەڕانەوەمدا لە بنکەکانی یەکێتی نیشتمانیدا دەمامەوە لەگەڵ ئەو کوڕە خاڵەم داو، تووشی کۆمەڵێك وتوویێژ بووم، کە ئاڵقەکانی دووەم‌و سێیەمی کتێبی ئیسلام‌و ڕێچکانیان پێکهێناوە، کە یەکێکیان بەم ناوونیشانەیە: (ئیسلام ئیسلامە، نە ئایدیالیزمە، نە ماتریالیزم)، یەکێکی دیکەیشیان بەم ناوونیشانەیە: (ئیسلام ورياكەرەوەيە، نەك تریاك)، وە ئاڵقەی یەکەمیشیان ئەویش وتوویێژێکی دیکەبووە لەگەڵ کادیرێکی کۆمەڵەی ئێران، لە چایخانەی حیکمەت لە شارۆچکەی سەردەشت، ئەویش دوای ئەوەی کە لە ڕانیە گەڕامەوە، ناوونیشانی ئەویش بەم جۆرەیە لە کتێبی: (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان)دا، (سەلماندنی بوونی خوا) ئەو کابرایەش: بابایەکی ماددیی (ماتریالیست) بوو.

دیاره لەگەڵ ژمارەیەك لە بەرپرس و کادیرانی یەکیەتیدا وتوویژی زۆرمان بوو، بـەڕێوەیش کە دەڕۆیشتین هەر موناقەشەمان بوو، تا گەیشـتینە قەڵاتووکان، لەوێ بەرپرسەکەیان گوتی: هەڵوێستی تۆم زۆر پێ سـەیره، گوتم: بۆچی؟ گوتی: تۆ ئێسـتا بەتاقی تەنیا لەگەڵ ئێمـەدا، یەکێتی یەکی گەورەو زەبەلاح، باس و خواسی ئیسلام و ئیسـلامیی چیتـە؟ ئێسـتا کـوا کـێ لەگەڵ ئیسـلامە؟ منیش پێکەنیم و گوتم: باشە ئێوه بۆ هێندە بێئـاگان و هـەر خۆتـان دەبیـنن؟ لێره لەو شاخ و داخەدا سـەرتان پێکەوه ناوەو وا دەزانن دنیـا بەس ئێوەی تێـدان؟! کاکـە دنیـا زۆر قەڕەباڵغـە، وە ئیسلام دینێکی مەزنە، ئێوه بچن بخوێننـەوەو شارەزابن، وەك چـۆن مـن ئـەوەتا هەوڵمـداوه لـە مارکسـیزمەکەی ئێـوەو لـە بەرنامـەو فیکـرەی ئێـوه شـارەزابم و، موناقەشەتان لەگەڵ بکەم، کەچی ئێوه هیچ لە ئیسلام نازانن! بچن بخوێننەوەو شارەزابن، بۆ ئەوەی ئێوەش بتوانن موناقەشەیەکی عیلمییانەو بابەتییانە لەگەڵ مندا بکەن، دیـار بـوو زۆری پێسـەیر بوو، گوتی: بەڕاستی لەخۆڕابینینەکەتم پێسـەیره، ئێمە ئـەو هـەموو موناقەشـەیەت لەگەڵدا دەکەین و وتوویژمانە، کەچی بۆمان ناسـەلـمێنی!! گوتم: ئاخر ئێوه لەسەر ناهەقن و بەڵگەتان بەدەستەوە نیە! بەهەرحاڵ، ئاخیر ڕۆژ کە ویستم قەڵاتووکان بەجێبهێڵم، کـە تـەنها شەوێك لەوێ مامەوه، ئەو کوڕه خاڵەم لەگەڵم هات، هات، هەتا ئەو شـوێنەی کـە بـەدیوی گوندی (سێوەیس)دا دەیڕوانی، گوتی: کاکە جا لێرەوە دەڕۆی، بە (بێـپالان)دا تێدەپـەڕی، دوای ئەوە دەچیتـەوە دێیەکانی (سوورەدێ)و (ئاشقوڵکە)و پاشـان (قڕناقـەو)و (پشتئاشـان) دەچی بۆ ئەو شـوێنانە، بـەڵام ئاگاداربـە ئـەو نـاوه هـەمووی چـۆڵەو کەسـی لێنیـە، مەگـەر شوانێك، گاوانێك، دارکەرێك، ڕاوچییەك، کەسـێکی وا ببـینی، ئەگـەر نـا چـۆڵەو هـیچ کەسێك نیـە ڕێنماییت بکات! گوتم: باشە بەهەرحـاڵ دەڕۆم بەتەمـای خوا.

### لە قەڵاتووکانەوە بەرەو ڕانیــە:

ئیدی ئەوەبوو ڕۆیشتم، بەڵام حاڵ و وەزعێکی زۆر قورس بوو، سەفەرێکی زۆر زەحمەت بوو، چـونکە کەشــی زسـتان بـوو، ئـەو ڕۆژەش لـە بەیانییــەوە بـاران بەلێزمـە دەبــاری و نەوەســتا، منیش بەتاقی تەنیـا، نەشـارەزا، نەمدەزانی دوایی بۆ کوێ دەچم و پاشـان سـەرم

بەكویێ دەگـا، ئێستا كە بۆخۆم بیری لێدەكەمەوە، ئـەو مەسـەلەیەم دێتـەوە بەرچـاو: دەڵـێن جارێك كابرایەك، پڵنگ بووە، شێربووە كوشتوویەتی، بەڵام خۆی نەیزانیوە چیبـووە، بەڵام دوای كە تەماشای كردوە، پڵنگ یان شێرە زۆر ترسـاوە، منیش ئێستا كە بیری لێدەكەمـەوە، پێموایە موجازەفەو موغامەرەیەكی گەورە بوو: شـارەزا نەبی، نەزانی دوایی بۆكویێ دەچـی، زستانو سەرما، لە رژێم قاچاغ، ئنجـا بێ چەك، بە تاقی تەنیـا.

بەڵام بەهەرحاڵ پشـتم بە خوا قایم بوو، كومـەڵێك كتێـبـم پێبـوون بـە كۆڵـەوە، ئەگـەر جلێكی زیادەم پێ بووبێ، دڵنیـانیم جگە لە كتێبەكـان هیچی دیكەم پـێ بووبـێ، دیـارە وەك عادەتی خۆم بەخێرایی دەڕۆیشـتم، دنیـا هـەورو بـارانو تەمومـژاویی بـوو، هـیچ نیشـانەو شوێنێك دیارنەبوو، كە بڵێم ئەوە فلان شـوێنە، هەڵبەتە لە بناری قەندیلو لە قەڵاتووكانەوە تا دەچێتەوە ناوچەی قرناقەو پشتئاشـان، چـەندان وردەرێـی لـێ دەبوونـەوە، كاتێـك لەیادمـە سەعاتێك دوو سەعات ڕۆیشتم، دوایی تەماشام كرد هاتوومەوە شـوێنی خـۆمو یـەك بازنـەم دروستكردبوو، دیارە زۆر خەفەتم خواردو گوتم: مانای وایە من هەر دەبێ لەم شـاخو داخـە بخولێمـەوە! تۆزێك پەنیرم پێ بـوو، ئەوەنـدە خەفـەتبارو دڵ تونـدبووم نـان و پەنیرەكەیشـم پێنەدەخورا، ئنجا ویستم نوێژی نیوەڕۆو عەسر بكـەم گـوتم: پێكـەوە دەیانكـەم بـە قەصـرو جەمع، بەڵام شوێنێكم دەست نەدەكـەوت نوێـژەكانم بكـەم، قوڕبـوو، لـەنێو قـوڕدا نوێـژ نەدەكرا، بەوەش زۆر دڵم توند بوو، دوایی بیرم لێكردەوە: باشە ئەگەر شـەو بـمێنمەوە لـەو شاخو داخە، چی بكەم باشـە؟ بیرم كردەوە گوتم: ئەگەر شـەوم لـێ بەسـەرداهات، ئـەوە دەچمە سەر دارێك، بیرم لەوە دەكردەوە دارێكی وا بدۆزمەوە وابێ بشـتوانم بچـمە سـەریو شوێنێكی واش بێ، بتوانم ئیسراحەتێكی لەسەر بكەم، ئەوە بارانیش وەك كوندەی سەربەژێر دەبارێ، هەروا دەڕۆیشتم بە مەراقەوەو تەماشـای ئـەملاولام دەكـرد، هـیچ دیارنیـە، گـوێم هەڵدەخست، هیچ نابیستی، نە داركەرێ، نە ڕاوچییەك، نـە شـوانێك، نـە گاوانێـك، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: پەپوو لـێی دەخوێنـێ، وەختێـك ئـاوا بـە مەراقـەوە دەڕۆیشـتم نوێـژی عەسـرم بـەرەو درەنـگ بوونێـك دەچـوو، دیـارە لەبەرخۆمـەوە دوعایشـم دەكـردو دەپاڕامەوە: خوایە دەروویەكم لێبكەیەوە، وەختێ تەماشام كـرد لـە قـەراغ ڕێ، دووكـەڵێك

دیارە، باشە ئەو دووکەڵە چییە دیارە؟ تەماشام کرد خانوو بوو، من دیقەتی لادێیەکەم نەدابوو، دووکەڵ لە کلاورۆژنە (کولاوکە)کەیەوە دەهاتە دەرێ، ئیدی ئاهێکم هاتەوە بەرو زۆر دڵم خۆش بوو، لەدوورڕا سەلامم کرد، هیچ جواب نەبوو، (سلام علیکم) هیچ جواب نەبوو، کەستان لە ماڵ نییە؟ بۆ جاری سێهەم تۆزێك دەنگم بەرز کرد (سلام علیکم) ئەرێ ئاوەدانی کەسی لێیە؟ ئافرەتێك گوتی: کاکە چیت دەوێ؟ پیاومان لەماڵ نین، کەسی لێ نیە، منیش گوتم: خوشکی من! ڕێبوارێکم هیچ ئیشم نیە، بەس ئەوەندە بێم نوێژەکانم بکەم، نوێژی نیوەڕۆو عەسرم نەکردوون، با نوێژەکانم نەچن، ئەگەر هەر لە هەیوانەکەشتان بێ نوێژەکانم دەکەمو هیچ داواکارییەکم نیە، گوتی: ئاخر پیاومان لە ماڵ نیە، گوتم: خوشکی من، منیش هەر براتم، بۆئەوەی نوێژەکانم نەچن، خۆت دەزانی قوڕەو هیچ نوان و پەنایەکی لێنییە نوێژەکانی لێ بکەم! گوتی: باشە کاکە فەرموو مادام بۆ نوێژێ دێی، ئیدی چوو بەرماڵێکی بۆ هێنام و نوێژەکانم کردن، دوایی گوتم: ئەرێ خوشکم تۆ چی دەکەی لێرە؟ گوتی: ئێمە تاقە ماڵێین لێرە، کاتیش بەرەو شێوان دەچوو، گوتی: ئەگەر دەتەوێ ئەوە مقەڕی کاك موحەممەدی برای عەولا سوورە، (کاك عەولا سووری سۆشیالیست کاتی خۆی لەلایەن یەکیەتییەوە کوژرا) گوتم: کوا مقەڕەکەیان لە کوێیە؟ گوتی: ئەوەتا لەو بنارەیە: گوتم: زۆرباشە، ئیدی بەرەو مقەڕەکە چووم.

## چوونم بۆ مقەڕی برادەرانی سۆشیالیست:

کە ڕووەو بنکەکە چووم، دوورو نزیك بووم دەنگیان دام، کێی کاکە، گوتم: من ڕێبوارمو فەقێم، گوتیان فەرموو کاکە مەلا، دیاربوو کە چوومە پێشێ گوتیان: کاکە بەخێربێی، ئەوە چییە پێتە؟! گوتم: ئەوە کتێبنو هەندیکیان کەلوپەلی خۆمن، گوتیان: باشە بەخێربێی یاخوا، ئەدی لەکوێوە دێی هەموو لەشت تەڕ بووە؟ ﴿چونکە وەك دەڵێن: ددانم لە هەموو شوێنان وشکتربوون، چونکە لە بەیانی ڕا کە هاتبووم باران لێیداببووم، هەر دەڕۆیشتمو دەمگووت بگەمە شوێنێك، بەلام باران بەردەوام بوون، پاڵتۆیەکم لەبەردابوو هەموو تەڕ بوو، بەدەنم هەمووی تەربوو، بەلام چونکە بەرێدا ڕۆیشتبووم لەشم گەرم

داهاتبوو﴾ گوتیان: ئاوا نابێ با سۆپات بۆ دابخەین و خۆت وشك بكەوە، ئەگەرنا لەسەرمان ڕەق دەبیەوە، ئیدی سۆپایان بۆ داخستم و خۆم گەرم کردەوەو جوان جلەکانم وشك کردنەوەو گەرم کردەوەو ئاهێکم هاتەوە بەر، بەڵام برسیم بوو ئەمما برسیو، پێشتر لەبەر خەمو نارەحەتی ئاگام لە برسیەتی نەبوو، گوتیان: جا ئەوە تازە وەختی نوێژی شێوانیشە، ئینشائەڵا دوایی پێکەوە نان دەخۆین، گوتم: باشە ماڵتان ئاوەدان بێ.

نوێژەکەمان پێکەوە کردو نوێژی خەوتنانیشمان لەگەڵ هی شێوان (مغرب)دا کرد، بارەگاکە دوو بەش بوو، بەشێکیان ئەو ڕۆژە کەویان ڕاوکردبوو، دە دوازدە کەویان گرتبوون، هەندێکیان بە ساوار لێنابوو هەندێکیان بە برنج، گوتیان کاکە مەلا فەرموو: کامەت پێخۆشە، نانمان خوارد، ئاهێکم هاتەوە بەر، خوا دەرووی کردەوە، گوتم: خوایە پاکیی بۆ تۆ! کە دەروو دەکەیەوە، زۆر باشی دەکەیەوە، هەروەها کە دەرگایانیش دادەخەی، بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ، لە زۆرلاوە دایاندەخەی، بەڵام خوا پەکی کەس ناخا، دوایی پێش خەوتن یەکێکیان لە مقەرەکە بوو، پیاوێکی مەیلەو گێلۆکە بوو، کەوەکانیان بەش کردبوو، ئەو دوو کەوی بەرکەوتبوون، گوتی: من کەوەکانم دەبرژێنم، ئاوا بە چێشت لێیان نانێم، ئنجا هەر ئەویش گوتی: تۆ لێرە بخەوە؟، ئەو ژوورەی کە ئەو برایەی لێبوو، پشکۆکانی سۆپەی هێنابوونە پێشێ، گوتی: مامۆستا! جارێ ڕاوەستە نابێ بنووی هەتا لەگەڵ منیش گۆشت کەوی برژاو دەخۆی، گوتم: ئاخر کاکە من نانم خوارد، گوتی: نابێ، چۆن دەبێ من لەم ژوورەدا ئەوە دوو کەوە ببرژێنم و تۆش بۆن گۆشتی برژاوت بۆبێ و گۆشت نەخۆی؟!، گوتم: باشە کاکە، ئیدی تۆزێك گۆشتم خواردو ئینجا خەوتم.

بۆ بەیانی گوتیان: تۆ بۆ کوێ دەچی؟ منیش تۆزێك بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە، کە حاڵو حیسابم ئاوایەو دەبێ بچمەوە بۆ ڕانیە، گوتیان: ئنجا تۆ دەبێ بە گوندەکانی (کۆمتان)و ( بایەوان)و پاشان بە (کەندەبووکە)دا سەربکەوی و دوایی بە (سەرگۆڕان)و (زینووی ماخۆبزنان)دا شۆڕ بیەوە بۆ (گەڵووی ماخۆبزنان) پاشان دەچییەوە لای (دووگومان) و (زەنگلاڵن)و ناوچەی (پشدەرە ڕەقە)و دوایی بە کێوەڕەشدا بچیەوە ئەو دیو، ئنجا دەچیەوە ڕانیە، گوتم: باشە، گوتیان: بەڵام بێ خەم بە هەمووی ئاوەدانیی لێیە، بۆم

گێڕابوونەوە چۆن هاتووم، هەر پێیان سەیربوو، گوتیان: ئەمجارە وات لێنایەت، هەمووی ئاوەدانیی لێیەو جارجار بۆخۆت بپرسە، گوتم: زۆر چاکە.

## ڕۆیشتنم بەرەو گوندەكانی: (گەڵووی ماخۆبزنان)و (زەنگەڵان):

ئیدی ڕۆیشتم، چوومە گەڵووی ماخۆبزنانو دوایی چوومە زەنگەڵان، برادەریكم لەوێ بوو مەلا (عبدالله وەسمان ئادەم)ی زەنگەڵان كە ئێستا پێموایە بەرپرسی لقی یەكیەتی زانایانە، كاتی خۆی لە پەیمانگای ئیسلامیی پێكەوە بووین، لە ماڵی ئەوان بووم لە زەنگەڵان، یەك دوو شەو لەوێ بووم، لەوێش ئیسراحەتێكم كرد، ئنجا تێمكرد بۆ كێوەڕەش، كاك مەلا (عبدالله) لەگەڵم هات تا بناری كێوەڕەش، ئنجا كە لە كێوەڕەش ئاوابووم بەلای (هەنجیرە)و (تیتۆكە)دا {كە دوو گوندن} لە (تیتۆكە) چوومە ماڵێك گوتم: حاڵو حیسابم ئاوایە، گوتیان: ئێوارە لێرەبەو دوایی وردە وردە بەڕێكەوە و سەیتەرەی لێ نیە، دوایی بۆ لێڵی ئێوارە، بەلای گەڕەكی (ڕەشەمێرگ)و (گڵێنجان)دا شۆڕ بوومەوە بەرەو لای گەڕەكی (قولە)و چوومەوە ماڵێ، كە گەیشتمەوە بابمو دایكمو براو خوشكەكانم زۆریان پێ عەجایب بوو، وەك چۆن كەسێك لێی تەمابڕاو بووبن دۆزیبیانەوە، ئاوا دڵخۆش بوون، بەهەرحاڵ بەیەك شادبووینەوەو، چەند ڕۆژێك مامەوە، بەڵام هەر بە خۆشاردنەوەوە، چونكە ڕژێم پێی زانیبام دەیگرتم.

## بیرەوەرییەكی نەنكە (بەسێ)م:

نەنكێكم هەبوو "دایكی دایكم هەزار ڕەحمەتی لێبێ"، تاكو لەو سەفەرەم گەڕامەوە وەفاتی كردبوو، ئەو نەنكەم زۆر منی خۆش دەویست، ئافرەتێكی زۆر چاك بوو، دایكم "بەرەحمەت بێ" گوتی: ڕۆڵە گیان! نەنكت لە سەرەمەرگدا هەر چەندە مەلاو فەقێی دیكە دەهاتن (یاسین)یان لەسەر دەخوێند، بەڵام هەر دەیگوت: ئەوە فلان كەس لە كوێیە؟ پێمخۆشە ئەو لەسەرم بخوێنێ، گوتم: دایە لە كوێتان ناشتوە؟ گوتی: لە قەبرستانی كێوەڕەش، كە (كونەسە)ی پێدەڵێن، ئنجا یان دایكم لەگەڵم هات "بەرەحمەت بێ"، یان

یەکێك لە منداڵەکان لەگەڵم هاتن، قەبرەکەیان دەزانی، گوتم: لەگەڵم وەرن سەردانی قەبرەکەی دەکەم، چووم سڵاوم لێکردو گوتم: نەنکێ! پێمناخۆشە کە لێرە نەبووم قورئانت لەسەر بخوێنم، ئەگەر پێتخۆشە خەتمە قورئانێکت بۆ بکەم، ئەمشەو با خەونت پێوە ببینم، داخۆ بزانم حاڵو وەزعت چۆنە، ئیدی هەر ئەو شەوە پێموانیە، شەوی دیکەی پێچووبێ، خەونم بە نەنکمەوە بینی، لە خەونمدا نەنکم گەنج بوو بۆوەو، زۆریش جوان بوو، بەس هەر نەنکیشم بوو، منیش گوتم: نەنکێ ئەوە چۆنە وا گەنجو جوان بوویەوە، گوتی: ڕۆڵە گیان! لە بەهەشت هەر ئێمە ئاواین، گوتم: نەنکێ تۆ لە بەهەشتی؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: نەنکێ بەهەشت چۆنە؟ ئیدی بۆی باس کردم، گوتی: ڕۆڵە گیان! زۆر خۆشە، ئنجا لە حاڵێکدا کە لەگەڵ نەنکم ڕاوەستابوم، ئەحمەدی خاڵم کە گوتم: لەگەڵم هات تا (قەڵاتووکان) "بەرەحمەت بێ"، هات پارچە وەرەقەیەکی پێبوو، بە تۆزێك توورەییەوە بە منو بە دایکمو ماڵەوەمانی گوت: ئەو حەقەم بدەنەوە! نەنکیشم "بەرەحمەت بێ" گوتی: ڕۆڵە! لە شوێنی خۆی کە ئەو وەرەقەیان پێدای پێیان گوتی: بە لەباریی داوای حەق بکەوە، بۆچی توورە دەبی، تەنیا ئەوەندەی گوت، دیارە من هیچ سەرم لێیدەرنەچوو، کە مەبەست چییەو مەسەلە چۆنە؟ ئیدی خەونەکەم کۆتایی هاتو بێداربوومەوە.

منیش وەفام بە بەڵێنەکەی خۆم کردو خەتمە قورئانەکەم بۆ نەنکم کرد، بەڵام گوتم: ئەرێ دایە! شتێکی وام بینی ئەوە چیە؟ گوتی: نازانم، گوتم: دەبێ بیربکەنەوە، بێگومان سپاردەیەك شتێکی ئەوسێ خاڵۆزایەم لەلای ئێمەیە، واتە: ئەحمەدو عبداللە و ئامین، دوو براو خوشکێك بوون، بابیان "کە خاڵ برایم بوو" مردبوو، وە دایکیان (پورە بەس) "کە ئامۆزای بابمەو ئێستاش ماوە" شووی کردبۆوە، ئەوانیش هەتیو بوونو نەنکم بەخێوی دەکردن، گوتم: بزانە داخۆ چییان لەلای ئێمەیە؟، دایکم ڕۆژێك بیری کردەوە گوتی: ڕۆڵە! هیچم نایەتەوە بیر.

دوایی مریەمی خوشکم کە ئێستا ماوەو ماڵیان لە گوندی بۆسکێنە، خێزانی دکتۆر ئەحمەدە، وەبیری هاتەوەو گوتی: دایە! ئەدی نەنکم گوارە زێڕەکەی خۆی بەتۆ نەدان گوتی: ها ڕۆڵە ئەو گوارانە هەڵبگرە، ئەگەر ئەحمەدو عبداللە و ئامین فەقیربوونو پێویستیان پێی

بوو، بۆیان بفرۆشەو پارەكەیان بدەیە، ئەگەر ئەوانیش پێویستییان پێی نەبوو، بۆم بە فەرشێك بدەو بۆم بخە مزگەوتێ؟ دایكم گوتی: بەخوا ڕاست دەكەی ڕۆڵە وایە، هەر لەبیریشم نەمابوو، ئیدی دایكم گوارەكانی بۆ فرۆشتن و پرسیمان ماڵی كاك ئەحمەد "بەرەحمەت بێ" لە قەلاتووكان بوو، هەژارو نەداربوون، ئەوەبوو دایكم پارەكەی بۆ ناردن، واتە: نەنكم "ڕەحمەتی لێبێ"، لەویۆە ئێمەی ئاگاداركردەوە لە شتێك كە زیندووەكان لەبیریان نەمابوو!.

## دوو بیرەوەریی دایكی ڕەحمەتییم :

١- دوایی ئەوەی ساڵی ١٩٨١ز دا لە ڕژێم قاچاغ بووم و چوومە كوردستانی ئێران، دایكم گێڕایەوە گوتی: زۆر زۆرم پەرۆش بووی و خەفەتم دەخوارد و هەر دووعام بۆ دەكردی و دەگریام، هەتا شەوێك بەخزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گەیشتم و فەرمووی: بۆچی هێندە خەفەتان دەخۆی و پەرۆشی فلانكەستە؟ ئەدی نازانی من مامۆستا و چاوساغ و مشوورخۆرمی؟!

دایكم گوتی: ئیدی دوای ئەوە دڵم ئاسوودە بوو و زانیم كە سەلامەت دەبی.

٢- دایكم "بەرەحمەت بێ دەیگوت": هەر لەو سەروحەدەدا كە زۆرم پەرۆشبووی، بەیانیان و ئێواران لەماڵێ دەهاتمە دەرێ و لە زەوییەكەی بەرانبەر ماڵمان دا بەرەو كوردستانی ئێران ڕادەوەستام و، دووعام دەكردن و(آية الكرسي)یم بە نیەتی سەلامەتیی تۆ دەخوێندو، ڕووم لەولایە دەكرد كە پێموابوو تۆی بۆچووی و، بەزار فووم لێ دەكرد، ڕۆژێكیان كە ڕەشەبایەكی توندی دەهات (عبدالواحد)ی برات بە ڕاكردن هات و گوتی: دایە! ئەمڕۆ ڕەشەبایەكی توندی دێ - دیارە ئاراستەی ڕەشەبایەكە پێچەوانەی ئاراستەی فوولێكردنی دایكم بووە - بۆیە ئەمڕۆ خۆت ماندوومەكە و دووعایەكانت بۆ كاكم ناچن و بایەكە دەیانگێڕێتەوە!

# چەند بیرەوەرییەکی ڕۆژگاری فەقێیەتیم

بەر لەوەی درێژە بە نووسینی یادداشتەکانم بدەم، لێرەدا بە باشی دەزانم هەڵوەستەیەك بکەمو هەندێك هەڵوێستو ڕووداوی سەردەمی فەقێیەتییم بگێڕمەوە، کە کەمو زۆر پەندو عیبرەتیان تێدایەو، تیشکیش دەخەنە سەر هەندێك لایەنی فیکریی‌و سیاسیی‌و کۆمەلایەتیی گەلەکەمان.

## گردبوونەوەیەکی حیزبی دیموکرات لە مزگەوتی بەردەڕەشدا :

ئەوکاتەی لە گوندی (بەردەڕەش)بووم، لە (١٩٨١ـ١٩٨٢) شەوێکیان گردبوونەوەیەکی حیزبی دیموکرات هەبوو، لەویێ خەڵکیان کۆکردبۆوە، بۆ دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ، کە ئەو کاتە وەك ئەوان دەڵێن: (دبیر کل) سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو، کۆبوونەوەی بە خەڵکەکە کرد، بەلاَم لە سۆنگەی ئەوەوە کە من ئێرانیی نەبووم، گوتم: نەوەك پێیان ناخۆش بێ، بەشداریی گردبوونەوەکەم نەکرد، دیارە ئەوکاتە بەشێکی زۆری کوردستانی ڕۆژهەلاَت بەدەست ئۆپۆزیسیۆنەوە بوو، لە حیزبی دیموکراتو کۆمەڵەو موجاهیدینی خەلْقو . . هتد.

## کۆبوونەوەی زانایانی ئایینیی :

هەروەها لەوکاتەدا کە لە (بەردەڕەش) بووم، مەلایەکان کە ئەوان پێیان دەگوتن: (إتحادیەء روحانیون کردستان) واتە: (یەکێتی زانایانی کوردستان) کۆبوونەوەیەکیان کرد، لەیادمە مامۆستا مەلا موحەممەدی شێلمجاڕان، کە بە مامۆستا مەلا موحەممەدی بداغیی "هەزار ڕەحمەتی لێبێ" ، ناسرابوو، ئەویان وەك ڕیش سپی دانابوو، مامۆستا وتارێکیدا کە من ئەوکاتە (واتە: لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٢)دا تەمەنم (٢١) ساڵ بوو) تێبینییم لەسەر وتارەکەی هەبوو، دیارە هەندێ قسەی باشی کردن، بەلاَم ئەوەی من تێبینییم لەسەری

بوو ئەوە بوو، کە گوتی: خەڵکینە! ئەو گرۆهانە (واتە: ئەو لایەنە سیاسییانە) بۆ میللییەت کار دەکەن، (یانی: نەتەوایەتیی) میللییەتیش بۆ دنیایە، ئێمەش بۆ دین کار دەکەین و، دینیش بۆ قیامەتە، ئنجا بۆخۆتان سەرپشك بن، لەنێوان دنیاو قیامەتدا!

دیارە من وەك ئایەتەکەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿تِلۡكَ إِذٗا قِسۡمَةٞ ضِيزَىٰٓ ٢٢﴾ النجم، ئەوە بەراستی دابەشکردنێکی نادادگەرانەیە، پێم سەیربوو، گوتم: مامۆستا چۆن ئەو قسەیە دەکا! دین چۆن تەنیا بۆ قیامەتە؟ ئێمە چۆن پەیوەندییمان بە دنیاوە نیە؟ دوایی پاش چەند ڕۆژێك کۆبوونەوەیەکی فەقێیان هەبوو لەگوندی (کاژێ)، کۆبوونەوەکە زیاتر بۆ فەقێیانی موستەعید بوو، لەوێ وتاریان بۆ من دانا، گوتیان: دەبێ کاك مەلا عەلی عێراقیش وتارێك پێشکەش بکا، لە یادمە کە کاك مەلا سەید مستەفای (زمزیران)یش وتاری هەبوو، من لە وتارەکەی خۆمدا باسی وتارەکەی مامۆستای بداغییم کردو گوتم: "مامۆستایەکی بەڕێز ئاوا وتاری داوە، کە بەراستی ئەگەر نەیارەکان گوێیان لەو قسەیە بێ، دەیقۆزنەوەو دەڵێن: خەڵکینە! وەرن بە ئیعتیرافی مامۆستایان، ئەوان تەنیا ئیش بۆ قیامەت دەکەن و ئێمەش کار بۆ دنیا دەکەین، ئنجا کێ دەیەوێ مەداری دنیای ساز بێ و کاری چاك بێ، با بێ بۆ لای ئێمە، کێش دەیەوێ کارو مەداری قیامەتی سازبێ، با بچێ بۆلای مامۆستایان، گوتم: ئنجا خەڵکیش دەڵێن: ئێمە جارێ لە دنیادا گرفت و کێشەمان هەیەو، ئێستا ئێمە لەگەڵ ئەوکەسەین کە کێشەی ئێرەمان بۆ چارەسەر دەکات و، بۆ قیامەتێش خوا کەریمە" .

وە گوتم: بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە هەڵەیە، چونکە پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" هاتوون گرفت و کێشەکانی دنیای خەڵك: کێشەو گرفتی نەتەوەییان، سیاسییان، کۆمەڵایەتییان، ئابوورییان، فەرهەنگییان، ڕەوشتییان، خێزانییان، چارەسەر بکەن، وە ئاماژەم بە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سوورەتی (الحدید) کرد، کە خوا دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەرانم "علیهم الصلاة والسلام" ناردوون کە دادگەریی بچەسپێنن: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا

ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ...﴿٢٥﴾، واتە: ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە ناردوونو، کتێبو تەرازووشمان پێدا ناردوون، تاکو خەڵك بەدادگەریی بەڕێوەبچێ، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوار هێزی زۆرو سوود گەلێکی بۆ خەڵك تێدایە، "کە ئەوە ئاماژەیە بەوەی دادگەریی و هەق بەبێ هێز ناچەسپێ" ئنجا دادگەریی، لێرەدا بەرەهایی هاتوە، بۆیە: دادگەریی نەتەوەیی، دادگەریی سیاسیی، دادگەریی ئابووریی، دادگەریی کۆمەڵایەتیی... هەموو لایەنو ڕەهەندەکان دەگرێتەوە، بەڵێ، هەموو پێغەمبەران "عليهم الصلاة والسلام" هاتوون دادگەریی بچەسپێنن، چونکە: ژیانی خەڵكو دنیای خەڵك، بەدادگەریی، هێمنیی و ئاساییش و ئازادیی تێدا بەرقەرار دەبێ، وە برایەتیی و یەکرێزیی دەبێ، وە خۆشگوزەرانیی و ئاوەدانیی دەبێ، بەڵێ دادگەریی بناغەی هەموو شتێکی باشەو سایەو سێبەریشە بۆ هەمووان، هەر وەك چۆن ستەمو چەوسانەوە، هەموو شتێکی باش لەبەین دەبات، وە گوتم: "لەڕاستییدا ئێمە خوا لەسەری فەرزکردووین کە وەك ئەهلی ئیسلام، بەمەلاو غەیری مەلاوە، بەپیرو گەنجەوە، دنیای خەڵك چاك بکەین، پێش قیامەتیان، وەك خوای پەروەردگار لەسەر زمانی بڕواداران دەفەرموێ: ﴿...رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً...﴿٢٠١﴾﴾ البقرة، واتە: ئەی خوایە! لە دنیادا چاکەمان بەنسیب بکە، وە لە دوارۆژیشدا چاکەمان بەقسمەت بکە، چونکە بێگومان لەڕووی ڕیزبەندیی کاتیی "الترتيب الزمني" یەوە دنیا لە پێش قیامەتەوەیە، ئیدی تیشکم خستە سەر ئەو مەسەلەیەو، ئەوکاتە ئەو قسانە بۆ ئەو خەڵكو فەقێیانە، شتی تازە بوون.

### کۆبوونەوەی مامۆستایان بۆ نووسینی بەرنامەو پەیڕەوی یەکیەتی زانایان:

هەر لەو سەرو حەددەدا لەشارۆچکەی ڕەبەت کۆبوونەوەیەکی هەندێ لە مامۆستایان هەبوو دەربارەی ئەوە کە ئەوان پێی دەڵێن: (أساسنامه و مرامنامه) واتە: بەرنامەو پەیڕەوی نێوخۆی یەکێتی زانایان (اتحاديهء روحانيون) دیارە منیشیان بەشداری پێکرد گوتیان: کاك

مەلا عەلی عێراقیی هەرچەندە جارێ هەر فەقێیەو مەلا نیە، بەڵام سوودی لێوەردەگرین، با ئەویش دابنیشێ، ئیدی من دانیشتبووم، باسیان كرد كە ئایا ئەو بەرنامەو پەیڕەوەی نێوخۆی زانایان، چۆن ڕێك بخەن، بەتایبەت پێشەكیی و دیباجەكەی!

یەكێكیان ناوی مامۆستا مەلا مەحموود بوو، دەیانگوت: ئەو زیاتر سەری دەردەچێ لە كاری حیزبیی و ڕێكخراوەیی و لە حیزبی دیموكراتیشەوە نزیكە، ئەوانی دیكەش كۆمەڵێ مامۆستابوون كە لە یادم نین، كێ و كێ بوون، تەنها مامۆستا مەلا مەحموودم لە یادە، دیاربوو گوتیان: با بزانین چۆنی دەست پێبكەین، دیباجەكەی چۆن بێ، گوتیان: با بەوە دەست پێ بكەین: (بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، والصلاة و السلام على محمد رسول الله...) مامۆستا مەلا مەحموود گوتی: ئاوا نابێ، خۆ مەولوودنامەو میعراج نامە نیە!! گوتیان: بۆچی؟ گوتی: ئاخر دوایی حیزبەكان گاڵتەمان پێدەكەن، نابێ (بسم الله و الحمد لله)ی تێدابێ، ئیدی بوو بە موشكیلەیان، ئەوانەی تێدابن یان تێیدا نەبن؟ چی لێبكەن چی لێنەكەن؟ دیار بوو بۆخۆیان ئاوا مشتومڕیان بوو، دوو تەرەف بوون، یەكێكیان ئاوڕی لە من دایەوە گوتی: با بزانین كاك مەلا عەلی عێراقیی چی دەڵێ؟

منیش گوتم: مامۆستایان! من پێم سەیرە كە لەوبارەوە مشتومڕ دەكەن، گوتیان: چۆن؟ گوتم: ئێوە كە مەلانو كۆدەبنەوە بۆچی كۆ دەبنەوە؟ ئایا (یەكێتیی زانایان) بۆچی پێكدێنن؟ بۆ ئەوە كۆنابنەوە بەرگریی لە ئیسلام و مسوڵمانێتی بكەن؟ گوتیان: با، گوتم: زۆر باشە، دەجا پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" دەفەرموێ: (كل كلامٍ لا يبدأ فيه بالحمدلله فهو أجذم) رواه أبو داود: ٤٨٤، والنسائي: ٤٩٤، وابن ماجه: ١٩٨٤، وابن حبان: ١٩٩٣، وغيرهم وحسنه النووي، واتە: هەر قسەیەك بە (الحمد لله) دەستی پێنەكرد، نەگریس و بێخێرە، گوتم: پێم سەیرە ئێوە مشتومڕتان لەسەر ئەوە بێ، ئەدی مەلا نابێ (بسم الله) بكات و (الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله) بڵێ؟

گوتم: ئنجا ئێوە هەر لە ئێستارا دەستبەرداری (بسم الله) و (الحمدلله) و (الصلاة والسلام على رسول الله) (عليه الصلاة والسلام) بن، ئەدی دوایی چی دەكەن؟ دیارە ئەوانیش ئەهلی ئینساف بوون، گوتیان: ڕاست دەكەی، وە دایاننایەوە.

### هەندێك ڕێو ڕەسمی فەقێیەتی توندو بێجێ :

یەكێك لە بیرەوەرییەكانی دیكەی ئەوساكەم ئەوەیە كە حوجرەكانی ئەوكاتە هێندێك ڕێو ڕەسمو دابو دەستووری زۆر توندیان هەبوو، بۆ وێنە : نەدەبوو فەقێ چوارمەشقی دابنیشێو دەبوو تەنها لەسەر ئەژنۆ دابنیشێ، بەڵام من وا دانەدەنیشتم، دوایی كە دەچوومە هەر حوجرەیەك، فەقێو سوختەكان زۆریان پێخۆش بوو دەیانگوت : مامۆستا مەلا عەلی عێراقیی هات، بۆخۆمان تۆزێك سەربەست دەبین، چونكە ئەو دەڵێ هەرچۆن دادەنیشن دابنیشنو، وەرن پرسیارم لێبكەنو قەیناكات ئەگەر كڵاو و جەمەدانەش دانێن! هەڵبەتە فەقێو سوختەكان لەلای موستەعیدو مامۆستا نەدەبوو جەمەدانیی دابنێن، وەك نوكتەی خۆش دەیگێڕمەوە، یەكێك لە موستەعیدەكان كە ئێستا مەلایەكی قابیلو باشە، لەم بەینەدا سەردانی كردمو بینیمەوە، دەیگوت : مامۆستا! ئێمە ئەوكاتە دوای ئەوەی كە دەچووینە بن پێخەفو لێفە، ئنجا دەبوو كڵاوو جەمەدانەكەمان دابنێین، وە بەیانی كە لە خەو هەڵدەستاین، پێش هەموو شتێك دەبوو كڵاو و جەمەدانەكەمان لەسەر بنێین، ئەمجار لەژێر پێخەفو لێفە بێینە دەرێ، ئنجا ئەو مامۆستایە كە لەو بەینەی پێشوودا هاتبوو بۆ خۆشیی دەیگوت : مامۆستا! ئێمە ئەو كاتە واماندەزانی سەر عەورەتە!

### لاق ڕاكێشانی منو نوێژ چواندنی مامۆستایەك :

لە یەكێك لە سەفەرەكانمدا بۆ شارۆچكەی ڕەبەت، كۆتایی ساڵی : (١٩٨١) لە حوجرەی مامۆستا مەلا سەید موحەممەدی ڕەبەت دانیشتبووم، ئیجازەم لە مامۆستا وەرگرتبوو چونكە لاقم دێشا، ڕامكێشا بوو، مامۆستایەكی دیكەش لەگەڵ كۆمەڵێك لە مامۆستایان لەوێبوون، ئەوانیش لە سەفەر گەڕابوونەوە، وەخت بولێڵی ئێواریێ دەمەو نوێژی شێوان بوو، یەكێك لە مامۆستایەكان بەوانی دیكەی گوت : دەزانن نوێژەكانیشمان نەكردوون؟ نوێژی عەسرو نیوەڕۆ بە قەسرو جەمع، گوتیان : ڕاستە، بەڵام دەیانكەین، تۆزێك خافڵان، وەختیش خەریكی ڕۆژئاوابوونە، منیش لاقم ڕاكێشابوو، دیاربوو مامۆستایەكیان ڕووی لە من كرد، ناوی مامۆستا مەلا ڕەئووف بوو، ئێستا بە ڕەحمەتی خوا

چووه، "خوا لـێی خۆش بێ"، گوتی: كاكـه مەلا؟ گوتم: بەڵـێ؟ گـوتی: تێبینییەكم هەیـە دەبـێ پێـت بڵـێم، گـوتم: فـەرموو، گـوتی: ئـەوه خیـلافی ئەدەبـە ئـاوا لاقـت ڕاكێشـاوه، گوتم: ئاخر مامۆسـتا ئیجازەم وەرگرتوه لـه مامۆسـتا مـەلا سـەید موحەممـەد، دیـاربوو مامۆسـتاش گوتی: بەڵێ ئیـزنی وەرگرتووەو لاقی دێشـێ، گوتی: نا، نابـێو هـەر دروسـت نییه، منـیش گـوتم: مامۆسـتا! ئـەدەب لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاریش لەقـەدەر توانایه، ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ ...﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة، خۆ لەگەڵ بەنـدەكانی خوادا مەجالی زیـاتری تێدایه، گوتم: بـەڵام مامۆسـتا! مـن سـەرم لـه شـتێك سـوڕماوه: جەنابت ڕەخنـه لەمن دەگری كه لاقم ڕاكێشاوه، ئـەویش بـە مۆڵـەتو مەعزووریشـمو لاقـم دێشـێت، بەڵام جەنابت دیاره باسـتكرد گوتت: نوێژی نیـوەڕۆو عەسـرتان نـەكردووەو ئـەوه ڕۆژیـش ئـاوابوو! ئـەدی ئـەوه خیلافـی ئـەدەب نیـە بەرامبـەر بـە خـوا، كـە دوو نوێـژت چواندوونو خەمیشـت لەبەر نیـه؟

گوتی: وەڵڵا خۆ ڕاست دەكەی، ئیدی بەپەلـه هەڵسـانو گـوتی: ئـەوەی پـێم گـوتی، هەروا وەك دڵسـۆزیی بوو.

منیش گوتم: سوپاست دەكەم، دیـاره منیش هەر مەبەستم دڵسـۆزیی بـوو، بـەڵام دیـاره ئەدەب لەگـەڵ خـوا "سـبحانه وتعـالى" لەپێشـتره ڕەچـاو بكـرێ، تاكـو ئـەدەب لەگـەڵ بەندەكانی خـوادا.

مەبەستم لێرەدا ئەوەیه كه بەڕاستی ئەو كاته پێم وایه له خوێنـدنی زانسـته شـەرعییەكاندا، ئەوەنـدەی گرنگیـی بەشـتی شـكڵیی دەدرا، بـە ئـەدەبو ڕێـز لەگـەڵ مامۆسـتاو، هەنـدێ هەڵسوكەوتو ڕێو ڕەسمی فەقێیـایەتیی و شـتی ڕواڵـەتیی و ڕووكەشـیی، هێنـدە جـەخت لەسەر ئەوه نەدەكرا، كه له ڕووی عەقیـدەو عیبـادەتو پـەروەردەوەو، لـه ڕووی ڕەوشـتو خووی كۆمەڵایەتیی و، خێزانییـەوه، فەقێو قوتابییەكان پێبگەیەنن، واتـه زیـاتر گرنگیـی بـە شتی ڕووكەشـیی و ڕواڵەتیی دەدرا، لەسەر حیسابی نیوەڕۆكو جەوهەرو شـتی بناغـەیی، وه ئەو زانستانەش كـه دەخوێنـدران، زیـاتر زانیارییـه ئالییـەكان بـوون، وەك (نحـوو صـرفو بلاغة)، دیاره فیقهیش دەخوێنـدرا، بەڵام دیسان بەشێوەیەكی زۆر ڕەقو وشكو بێ ڕووح،

ئـەمما ئاشــنایی بـەقورئانو سـوننەتو، لەبـەرکردنی قورئــانو لەبـەرکردنی فەرمایشــتی پێغـەمبەر "صلى الله عليه وسلم" و قووڵکردنەوەی ئیمانو عەقیدە، ئەوە بەڕاستیی هـەر زۆر دەگمەنو نامۆ بوو، لەنێو پڕۆگرامی خوێندنی فەقێیـەتی ئەو کاتەدا.

## خزمـەتکردنی خـەڵکی بـەردەڕەش بـۆ فەقێیـانو خـواردنی یـاپراغ (دۆڵمـە)ی شــیرین:

بەڕاسـتیی خەڵکی بەردەڕەش زۆر لەگەڵمان باشـبوون، هەرچـەندە خەڵکەکـە بۆخۆیـان نەدارو هـەژاریش بوون، بەڵام زۆرجار دەعوەتیـان دەکردین وەك فەقێیـەکان، لەبیرمـە هـەتا لەوێ بووم ئەو شـەش مانگــە، دوو، ســێ جـار گۆشــتمان خـوارد، جارێکیــان، یـان دووان، ماڵێك کەروێشکیان هەبوون، بەکەروێشکێ دەعوەتیان بۆ کردین، جارێکی دیکەش ڕەشـە وڵاخێك سـەربڕابوو.

ئەوەی لەوێ بۆ من شتێکی سەیر بوو، یاپراغ (دۆڵمـە) لـەلای خۆمـان مـزری دەکــەن، ترشی دەکەن، کەچی ئەوان یاپراغیان بە شـیرینی دەخـوارد! واتـا شـەکریان تێـدەکرد، پـێم شتێکی تازەو نامۆ بوو، دیارە هەندێك جۆرە خواردنیان هـەبوون کـە لـەلای ئێمـە نـەبوون، بەڵام بە گشتی خەڵکەکە زۆر ڕێزیــان لە فەقــێو مـەلایان دەگـرت، دەیانویسـت خزمـەتمان بکەن، بەڵام کەم ئیمکـانیەتیی و بێ دەرامەتیی بوو، وە ئەو کاتە ئاسـتی ژیان لەوێیش و لێرەش لەڕووی خواردنو کردنـەوە، لە ئێســتا نزمتر بوو.

## وتووێــژێك لەگــەڵ هەنــدێك کــادیری کۆمەڵــەداو نامیلکــەی: دادگــەریی کۆمەڵایەتیــی:

لە یەکێك لە سـەفەرەکانمدا لە نزیـك گونـدی (بناویلـە)ی پشـتی شارۆچـکەی ڕەبـەت، تووشی چەند پێشـمەرگەو کادیرێکی (کۆمەڵــە)ی کوردسـتانی ئێـران بـوومو وتووێژێکــی گەرمو گوڕمان بوو، کە دواتر وەك چۆن وتووێژەکانی دیکەم، کتێبــی "دەبەرێك ڕاچـوونی ئیسـلامو ڕێچـکان" و کتێبــی" ســۆزی نەتەوایـەتییو بـیری ناسـیۆنالیزم لـە تـەرازووی

ئیسلامدا" یان لـێ پێـکهات، ئەو وتوویژەشـــم ئاڵقـەی پێنجەمی "دەبـەرێك ڕاچـوونی..." پێکهێنـا بـەناوی: "دادگـەریی کۆمەڵایـەتیی لـە ڕوانگـەی ئیسـلامەوە" کـە بەداخـەوە هـەر دەستنووسـەو نەمپەررژاوە، دەسـتێکی پێـدابێنمو ئامادەی بکـەم بۆ چاپ.

شایانی باسیشـە ئەو برادەرانەی کۆمەڵەی کوردسـتانی ئێـران، ئەوکاتـە زۆر ناشـێبوونو قسـەیان زۆر زەقو ڕەق بـوو، وەك زۆر لایـەنو ڕێکخـراوی دیکـەی سیاسـیی ئەوسـاکەی سەرجەم بەشـەکانی کوردستان، هێندەی بە خەبـاتی فیکریی و ئایـدۆلۆژیی و بڵاوکردنـەوەی مارکسیزم – لینینـزمەوە، سـەرقاڵ بوون، نیو ئەوەندەش نەیاندەپەررژایە سەر خەمخواردن لـە گـەلو هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی.

## گـەڕانەوەم بۆ ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتانو گونـدی بـەردەڕەش:

چـەند ڕۆژێـك لـە ڕانیـە مامـەوەو دوایـی دووبـارە گەڕامـەوە، ئەوجـارە بـە دەربەنـددا چوومەوە، "دەربەنـدی ڕانیـە" پێش سـەیتەرەکە بەپێیان چوومە خواریێ، دوایـی چـوومەوە سەر جادەو سـەیتەرەکەم بوارد، ئیدی لە بەسـتەسـتێنەوە کـاك مـەلا ئەحمـەدی هـەنارۆکیێ یادی بەخێر، کە دایکی لەگەڵ دایکم کچـە خاڵـنو دایکـی ئێسـتاش مـاوە، چـوومە مـاڵی ئەوانو ئێوارە دوای نوێژی شێوان، کاك مەلا ئەحمـەد لەگەڵم هات تا بەرێی کردم.

لەرێیـە هەندێ کاروانچیم بینین، ئێرانیی بوون، گوتیان: کاکە لەگەڵ ئێمـە وەرە، بـەڵام ئایا ئێمـە سوارو تۆ پیادە لەگەڵمان دەردەچی؟ گوتم: هەوڵ دەدەم لەگەڵتان دەربچـم، بـەڵام ئەگەر ئەو جانتـایەم بۆ هەڵگرن، سوپاستان دەکەم، جانتـایەکەم نەختـێ کتێبو جلو بەرگو کەلوپەلی دیکەی تێـدا بوون، جانتاکەیان بۆ خستمە سەر بارەکەو ئنجـا گوتیان: کاکـە دەبـێ ڕابکـەی، دیارە کاروانچی هەموویان سـوار بوونو منیش بە پێیان، ئیدی دەبوو بـە ڕاکـردن بەدوایاندان بڕۆم، موشکیلەم ئەوە بوو کە دەگەیشتمە ڕووبـارو جۆگەلـە ئـاو، هـەتا پـێڵاوو گۆرەویم دادەنان دوادەکەوتم، سەرماو زستانیش بوو، بۆیە سەرەنجام هەر بە پێڵاوەوە بە نێـو دەکەوتم گوتم: نەدەکرا هەمووجارێ پێـڵاوو گـۆرەوی دابنـێم، ئنجـا ئـەو شـــەوە لـە چـیا ماینەوەو کاروانچییەکان ئاگرێکی گـەورەیان کـردەوە، بـۆ بـەیانی جانتایەکـەم ونکـرد لـەنێو

بارەکاندا، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو کاروانەی لەگەڵی بووم "چونکە زۆر کاروان دەهاتن و دەچوون" ئێسترێکی سپییم لێکردبووە نیشانە، چونکە شەوێکی تاریک و ئەنگوستە چاو بوو هەر بەدوای ئێسترە سپییەکە دەکەوتم، وەختێك تەماشام کرد، لەگەڵ کاروانێك کەوتووم، ئێستری سپی بوونە دوو سێ یەك! باشە ئەوە دەبێ چۆن بێ؟ بانگم کرد، گوتم: فلانکەس "ئەوەی کە جانتایەکەم وێدابوو"، ئنجا ئەوان بە جانتا دەڵێن (ساك) گوتم: کوا ساکەکەمت پێماوە؟ گوتی: کاکە ساکی چی؟ گوتم: مەگەر تۆ کاك فلان کەس نی؟ گوتی: نەوەڵڵا، گوتی: کاکە ئەوە تاقمێکی دیکە بوون، تۆ ساکت نەداوە بە ئێمە، زۆر خەفەتم خوارد، دوایی بۆ بەیانی لەلای قاسمەڕەش و زەڵێ و نۆکان، جارێکی دیکە ئەو کاروانچییانەم بینیەوە، یان ڕاستتر بڵێم ئەوان منیان بینییەوەو ناسییەوە، یەکێ بانگی کرد: هۆو کاکی ساکی! یانی: کاکی جانتای، کاکە وەرە ئەوە لەکوێی ساکەکەت لە لای ئێمەیە، لێمان ون بووی، ئیدی چووم جانتایەکەم لێوەرگرتنەوەو سوپاسم کردن.

## دووبارە گەڕانەوەم بۆ ماڵی بابم لە ڕانیە:

دەوری شەش مانگ لە (بەردەڕەش) مامەوە، لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا، یەك جار گەڕامەوە بۆ ماڵی بابم لە ڕانیە، دوای ئەوەی شەش مانگەکەم تەواو کرد، جارێکی دیکە گەڕامەوە، ئنجا کە گەڕامەوە لەگەڵ دوو سێ کەسی دیکەدا تەگبیری ئەوەمان کرد بچین بۆ تاران.

دوای ئەوە چووین بۆ تاران و، لەوێ شوێنێك هەبوو پێیان دەگوت (ساختمانی جنبشهای آزادی بخشی جهان) واتە: (بینای بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی دنیا) لەوێ کۆمەڵەیەك هەبوون پێیان دەگوترا: (حركة الفتح) (بزووتنەوەی فەتح) بەرپرسەکەیان (شیخ محمد حاتمي) کە مەلایەکی شیعەی عێراقیی بوو، وە ئێستا ڕاوێژکاری (ئوسامە نۆجەیفیی)ە، سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، یەك دووساڵ لەمەوبەر لە ئەنجوومەنی نوێنەران بینیمەوە، ئەو منی ناسییەوە، جا لەوێ عەمامەی لەسەر بوو، بەڵام ئێستا ئەفەندییەکەو ناویشی (ندیم)ە، گوتم: ئەرێ تۆ فلان کەس نی؟ گوتی: با، گوتم: ئەدی ناوەکەت بۆ

گۆڕاوە؟ گوتی: ناوی ( موحەممەد حاتـەمیی) ناوێكی خـوازراو (مســـتعار)م بـوو، خــۆم ناوم (ندیـم)ە.

لە تاران شـەش مانگێك مامەوە فارسـییەكەم زیاتر بەهێز بوو، وە ئەو شەش مانگـەی كـە لەویَ مامەوە، مامۆســتا (صلاح الدین **محمد** بهاءالدین) جاریَ سەردانی كـردین، هـەروەها مامۆسـتا (حەسەن پێنجوێنیی)یش چونكە برایەكی ئەویشمان لەگەڵـدا بـوو، بـە نـاوی كـاك حوسەین، بۆ سەردانی وی هاتبوو، دیارە من لـەویَ زیـاتر خـەریكی خوێنــدنەوەو گــەڕان بەنێو تارانداو بەهێزكردنی فارســییەكەمو كتێب خوێندنەوە بووم.

## گەڕانەوەم بۆ ڕانیەو چارەسەربوونی كێشەی قاچاغبوونم لە ڕژێم بە شێوەیەكی كاتیی

ئنجا دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ ڕانیە، وە ئەو كێشەیەی كە هەمبوو (قاچاغیی لە ڕژێم)، هەندیێ لە مامۆستایان وەك (مامۆستا مەلا سەید سولەیمان) و (مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازیی "سكتانیی") كە مامۆستام بوو، "خوا لێیان خۆشبێ"، لەگەڵ هەندێك لە خەڵكی ڕیش سپیو سەرۆك عەشیرەت، گرفتەكەیان بۆ چارەسەركردمو توانیم لە هەولێر "لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەوقاف" تاقیكردنەوەیەكی مەلایەتیی ئەنجام بدەمو، بە ئیمام دابمەزرێم لەجیاتی سەربازییكردن، كە پێی دەگوترا: ئینتیداب، وە لە ساڵی (١٩٨٣) دامەزرام بە سیفەتی (ئیمام)، لە (مزگەوتی نەورەسیی) لە ڕانیە.

### مشتومڕم لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەمنی ڕانیەداو، هەڵوێستی جوامێرانەی حاجی حەمە ئاغا:

لێرەدا دەمەویێ وەك وەفایەك یادێكی كاك (حاجی حەمە ئاغا، كوڕی كانەبی ئاغا، كوڕی باڵواغا) بكەمەوە كە ئێستا ماڵی لە هەولێرەو ئامۆزای كاك (حاجی عەباس بایز)ەو یەكێكە لە ڕیش سپیو قسە ڕۆیشتووانی عەشیرەتی (ئاكۆ)، چونكە هیممەتێكی باشی كرد، دوای ئەوەی كە مامۆستا مەلا سەید سولەیمانو مامۆستا مەلا ئەحمەدی سكتانییو مامۆستایەكانی دی پێیان گوتبوو: فلاَن كەس حاڵو حسابێكی وای هەیەو وا باشە ئەو كێشەیەی لەگەڵ ڕژێم نەمێنێ، حاجی حەمە ئاغا لە گەڵم هات بۆلای بەڕێوەبەری ئەمنی ڕانیە، كە (نەقیب ئەنوەر) یان پێدەگوت، دوای ئەوەی كە زەمانەتی تەواوم لە حاجی حەمە ئاغا وەرگرت، كە نامگرنو گوتی: بەتەواویی قسەم لەگەڵ كردوون، دوایی چووینو سەعاتێك لەلای بەڕێوەبەری ئەمن دانیشتین، لەیادمە ئەو ڕۆژە پێموایە دووشەممەبوو بەڕۆژوو بووم، چونكە دەیانگوت: ئەوانە خەڵك ژەهرخواردوو دەكەن، چایان هێنا

نەخواردەوە، نەقیب ئەنوەر گوتی: چۆن دەبێ نمەکمان نەکەی؟ گوتم: دڵنیـــابە بـەڕۆژووم، ئنجا مشـتومڕێکیشـمان بوو گوتی: باشە تۆ بۆ نایەی بۆ لای ئێمـە؟ تـۆ لـەزۆر شـوێن وتـار دەدەی، بۆ جارێك مەدحی ئێمە ناکەی؟ حکوومەت، حکوومەتی خۆتـانە؟! منیش گـوتم: ئێوە ناڵێن: زانایان نابێ تەداخولی سـیاسەت بکەن؟ گوتی: با، گوتم: نامـەوێ بچمــە نێـو سـیاسەتەوە، گوتی: ئاخر نا ئەوە قەیناکات، گوتم: بۆچی؟ یانی ئـەو سیاســەتەی کـە بـە قازانجی خۆتانبـێ قەیناکا باسی بکەین، بەڵام کە بەزەرەر بێ، نابێ باسـی بکـەین!! گـوتم: دیارە من بە پێویستم نەزانیوە، باستان بکەمو مەدحتـان بکەم! گوتی: باشە بۆچی هاموشۆمان ناکەی؟ گوتم: دیارە ئیشـم نەبووە، ئەگەر ئێوە ئیشـتان هەبوو دەتوانن تەشریف بێنن! دیـارە ڕووی لە حاجی حەمە ئاغا کردو گوتی: شێخ قسـەی زۆر ڕەقە!

دوایی گوتی: ئەدی باشە بۆ زەمێکی خومەینیو ئێـران ناکەی؟ "ئەو کاتە شـەڕی ئێـرانو عێراق گەرم بوو، گوتم: ئاخر ناڵێم باسی سیاسـەت ناکـەم، ئێـوە دەڵـێن باسـی سیاسـەت مەکەن، گوتی: نا ئاخر ئەوە قەیناکا، تەماشای ئەو بۆمبابارانو تۆپ بارانە بکـە، "ئەوکاتـە ئێران بە فڕۆکە بۆردوومانی هەندێك شوێنی دەرکردو، تۆپبارانی دەکرد" گـوتم: دەی باشـە ئەگەر باسی تۆپباران بکەین، ئێوە زیاترتـان کـردوە، ئێـوە دێهاتتـان زیـاتر کـاول کـردووەو، خەڵکتان کوشتووەو ڕاگواستوە!

حاجی حەمە ئاغایش گوتی: ئاخر مامۆستا ئەوان دوژمنـن، ئنجا حـاجی حەمـە ئاغـا لـە شـەڕێکدا نازانم کوێی بریندار بوو بوو، گوتی: مامۆستا فەرموو! ئەوە شوێنی بـرینی تـۆپی ئێرانیێـە، منیش بەکوردیی گوتم: ئنجا کاك حاجی حەمە ئاغا! ئەگەر چـەکدار نەبووایـەی، خۆت بەو دەردە نەدەبرد، گوتی: دە فەرموو من هاتووم دیفاعت لێبکەم، کەچـی تـۆش چـی دەڵێی! بەڵام پێکەنیی و بەسـەرخۆی نەهێنا، ئەوە یەکەمجاربوو لەگەڵ نەقیب ئەنوەردا یەکـدی ببینـین، هەرچەندە چەند جارێـك گـوتی: پێمانخۆشـە جارجـار سـەردانمان بکـەی، منـیش گوتم: باشـە ئەگەر مەجالم هەبوو، گوتیـان: دەباشە ئێمە سەردانی تۆ دەکەین، ئیدی نە من سەردانی ئەوانم کرد، نە ئەوانیش سەردانی منیان کرد، تا دواجار کە یەکـدیمان بینییـەوە، بـۆ هەڕەشـە لێکردنمو بۆ گرتنم هاتبوون، کە ئەوە دوایی باسی دەکەم، ئـەو کاتـە پـایزی سـاڵی (١٩٨٥)بوو ماڵمان لە (سـەرسـییان) بوو.

# جموجوڵی چڕو پڕ بۆ بانگەوازو هۆشیاركردنەوەی خەڵك

پاش گەڕانەوەی یەكجارییم لە ئێران، لە نیوەی دووەمی ساڵی (١٩٨٢)دا دەستم كرد بە چەند جموجوڵو چالاكییەك بۆ بانگەوازكردنی خەڵكو هۆشیار كردنەوەیانو ئامۆژگاریی كردنیان، كەدیارە ئەوەش چەند حاڵەتێكی جۆراوجۆری بەخۆوە دەبینی، كەئەمانە سەرەكییەكانیانن:

## ١) وتاردانی هەینی:

ئەو شوێنانەی كە لەو ماوەیەدا وتاری هەینیم تێدا داون، وەك لە یادم مابێ، ئەوانە بوون:

١- دەڤەری ڕانیەو بیتوێن: (ڕانیە، چوارقوڕنە، گردجان، دۆڵی شاوریێ، گوندەكانی: بێردبی، بەردانگە، مێدێرێ).

٢- دەڤەری خۆشناوەتی: (بالیسان، بێراوە)

٣- دەڤەری بەری مەرگە: (بنگرد، نۆڵچكە، لۆتەر، قەرەتەپە، مەمەنداوە، دێلیژە، سەرسیان) دەڤەری دووكان – سەرگەڵوو: (دووكان، شەدەڵە، سەرگەڵوو، گاپیڵۆن).

٤- دەڤەری قەڵادزێ – سەنگەسەر: (بەستەستێن، تووە سووران، ژاراوە، سندۆلان، دێرێ).

شایانی باسیشە لە وتارەكانمدا، جەختم لەسەر بوارەكانی: فیكرو عەقیدەو، تەزكیەو ئەخلاقو، فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لە خراپەو، هێرشكردنە سەرستەمو زۆری ڕژێمی بەعسو، بەرپەرچدانەوەی فیكرو ڕێچكە نامۆیەكان دەكردەوە، دیارە سەرجەم

وتارەکانیشم لەبەر (إرتـجالي) دەگوتن، کە ئەو کاتە بەدەگمەن مامۆستایان وتاریان لەبەر دەخوێندەوەو، هەر لەسەر کاغەزو، جاری وابوو لەسەر کتێبیش وتاریان دەخوێندەوە.

## ٢) یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم":

حاڵەتێکی دیکەو شێوازێکی دیکەی ئەوساکەم بۆ بانگەوازو هۆشیار کردنەوەی خەڵك و جەماوەر بەگشتی، بریتی بوو لە بۆنە (مناسبة)ی لەدایك بوونی پێغەمبەرمان موحەممەد "صلى الله عليه وسلم"، کە جاری وا هەبوو لە یەکێك لەو ماڵانەدا بەڕێوە دەچوو، کە بەو بۆنەیەوە بانگهێشت (دعوة) یان ساز دەکردو، خواردن و خواردنەوەیان ئامادە دەکردو، جاری واش بوو لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا، یان لە دەشتێکدا، بەو بۆنەیەوە گردبوونەوەیەکی جەماوەریی پێك دەهات و منیش وتارم دەدا.

ئەو شوێنانەی کە بەو بۆنەیەوە وتارم تێدا داون لەو ماوەیەداو، دواتریش ئەوانەی لە یادم مابن: ڕانیە، چوارقوڕنە، تووە سووران، قورەگۆ، بەستەستێن، ژاراوە، سەرکەپکان، دووگۆمان...

**ئنجا لێرەدا با دوو بیرەوەریی خۆش بگێڕمەوە:**

- جارێکیان لە ئوردوگای زۆرەملێی تووەسووران، ماڵێك بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" نان و چێشتیان ساز کردبوو و منیشیان دەعوەتکرد کە وتاریان بۆ بخوێنمەوە.

دیارە منیش وەك عادەتی خۆم دەستم کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیانی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم"، ئیدی من گەیشتبوومە گەرمەو نێوەڕاستی وتارەکە، خانەخوێیەکە، کە مام حاجی یەك بوو – بە شەرمێکەوە گوتی:

بەڕاستی مامۆستا قسەکانت زۆر بەسوودو زۆر بەتامن، بەڵام ئەگەر دەست بە خوێندنەوەی مەولوودنامەکە نەکەین، درەنگەو فریا ناکەوین.

منیش بە شێنەیی گوتم: مام حاجی گیان! ئەوەی ئێستا باسی دەکەم، ئەوە ئەسڵی بابەتەکەیەو، ئەوەیە مەولوودنامەکەی من! ئەویش ڕووی کردە چەند مامۆستایەکی

ڕیش سـپی، دانیشـتبوونو لێی پرسین: ئەریێ مامۆسـتایان وایە؟! گوتیان: بەڵێ وایـە، ئەریێ وەڵڵا ئەوە مەولوودنامەی ڕاستەقینەیە. ئەویش گوتی: چـۆن وایـە! ئـەدی بۆچـی هەتا ئێسـتا ئێوە مەولوودنامەی واتان نەخوێنـدۆتەوە؟!

یەکێکیان گوتی: ڕاسـتییەکەت دەویێ، ئێمە ئاوا نازانین، ئەگـەرنا دەبـیێ ئـاوا باسـی ژیانو بەسـەرهاتی پێغـەمبـەری خوا "صلی الله علیه وسلم" بکریێ.

بەڕاستیی ئەو مامۆستا بەڕێزو بە ئینسـافانە باشم فریا کەوتن، خوا پاداشتیان بداتەوە.

دیارە هەڵوێستی مام حاجی لە وتارەکەی مـن، وەك ئـەوەی لێهـات دەڵـێن: جارێـك حیکاتخوانێـك باسـی ڕۆسـتەمی زاڵ دەکـاتو دەگاتـە کۆتـایی حیکایەتەکـەو، یـەکێك دەپرسـیێ: ئەریێ ڕۆسـتەم نێر بووە یان میێ؟!

- جارێکی دیکەش لە گونـــدی (قورەگـۆ)ی نیزیـك دەرەبەنـدی ڕانیـە، داوایـان لێکـردم وتاریان بۆبدەم بەو بۆنەیـەوە، منیش وەك عادەتی خـۆم باسـی چـەند لایـەنێکی سـیرەو ژیانی پێغەمبـەرم "صلی الله علیه وسلم" کرد، دیارە ئەو کاتە چ خەبـەر نـەبوو، بـەلام دوایی بیسـتمەوە کە ماڵەکە دووبارە نانو چێشـتو دەعوەتێکی دیکەیان ساز کردبـۆوە، چـونکە پرســـیبوویان: کـە ئایـا مەولوودەکـەیان وەبـەر کـەوتوەو قبووڵـە؟! دیـارە وەلامەکەشی نەرێنیی (سـلبـي) بووە، بە بیانووی ئەوە کە لە وتارەکەمـدا باسـی (گـا) و (ماسـی)م نەکردوە!

چونکە ئەو کـاتەی مامۆستاکان بـە زۆریـی کـتـێبی (مەولوودنامـە)یان دەخوێنـدەوە، کەپڕە لە شتی ناڕاستو ئەفسانەیی، لەنێویان دا باسی ئـەوە دەکـات، کـە زەوی لەسـەر پشـتی گایەو گا لەسـەر پشـتی ماسـیو ...هتد!!

ئنجا عادەت وابوو کە ئەو کتێبـە بخوێندرێتەوە، کە باسی پێش لە دایکبـوون پێغەمبـەر دەکـاتو پاشـان کـە دەگەیشـــتە سـەر لـەدایك بـوونی، مـەجلیس هەڵدەسـتانە پـیێو مەولوودنامە کۆتایی پیێ دەهات!

واتە: کە ژیانی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسـلم" دەسـت پێدەکـات مەولوودنـامە "کە ئەو وشەیەش هەڵەیـەو دەبیێ بگوتریێ: (مولدنامـە) واتـە: کـاتی لـە دایـك بـوون"

كۆتـايي دەهـات، لـە حاڵەتێكـدا كـە ژيـانی هەركەسـێك لـە لەدايكبوونـەوە دەسـت پێدەكاتو موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلاش پاش بوونی بە پێغەمبـەری خـوا (رسـول الله "صلى الله عليه وسلم" سـەرمەشقی ئێمەيـە، نەك پێش ئەوە، وەك خـوا فەرموويـەتی:

﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ...﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: بێگومان لـە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقييەكی باش بۆ ئێوە هەيە. .

شـــايانی باسيشـــە مـن نـاوم لـەو كتێبــە نـابوو: (كتێبـــی پـلاوان)و ژمارەيـەك لـە مامۆستايانی كەم شارەزاش لەسەر ئەوە لێـم نيگەران بوون، هـەروەها لەسـەر ئـەوە كـە گوتبووم: وتەی: (لولاك لولاك لـــما خلقـــتُ الأفـــلاك) حـەديس نييـــەو نـە سـەنەدی راستەو نە نێوەرۆكەكەيشـی، وەك لە كتێبـی "مسوڵمانی كامڵ" بـەرگی يەكەمـدا باسـم كردوەو (العَجْلـوني)يش لە (كشـف الخفـا ومزيل الإلبـاس، عما اشـتهر مـن الأحاديـث علی ألسـنة النـاس) ج٢، ص٢٤٢دا گوتوويەتی: هەڵبەسـتراو (موضوع)ە.

### ٣) پرســەو ســەرەخۆشـيی:

ئەميش حاڵەتو شێوازێكی ديكەی بانگەواز كـردنم بـوو، كـە مەگـەر چـۆن دەنـا هـيچ كۆڕێكی تازيە نەبوو، كە بەشداريی تێدا بكەمو قسەی خێـری تێـدا نەكـەم، ديـارە بـەزۆريی باسی مەرگو ژيانو زوو تێپەڕينی دنياو، لێپرسـينەوەی رۆژی دوايـیو، جاروبـاريش باسـی سياسيیو كۆمەلايەتيیو فيكرييم دێنايە پێش، با لێرەدا ئاماژە بە نـموونەيەك بكەم:

لە ساڵی (١٩٨٣)دا لە گوندی (بەردانگـە)ی دۆڵـی شـاوریٚ بەشـداريی تازيەيـەكم كـرد لەگەڵ خاڵ ئەحمەدە رەشی گەڵووی ماخۆبزناندا، خوا لێيـی خۆشـبێ، لـە ميـانی قسـەكانمدا سوورەتی (الـماعون)م تەفسيركرد، ديـارە لـە كـۆڕو مەجليسـەكەدا ژمارەيـەك پێشـمەرگەو كاديرانی يەكيەتی نيشـتيمانيی هەبوون، كـە ئەوكاتـە زۆر هێرشـيان دەكـردە سـەر ئيسـلامو قسەكەی ماركسـيان دووبارە دەكـردەوە: (ئـايين تلياكی گەلانـە) منـيش لـەميانی تەفسـيری سوورەتی (الـماعون)دا، باسی ئەوەم كرد، كە ئەوەتـا خوا لـە قورئـــاندا دەفـــەرمووێ:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي

﴿يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ۝٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ۝٣ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ۝٦ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ۝٧﴾، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دەزانی كێ بڕوای بە ئایین (یان ڕۆژی سزاو پاداشت) نیە؟ ئەوە كەسێكە كە بەتووڕەیی پاڵ بە هەتیووەوە دەنێ و دەریدەكات، وە هانی خەڵك نادات بۆ خواردندان بە نەدار، دەجا سزای سەخت بۆ ئەو نوێژكەرانەی كە لە نوێژەكەیان بێئاگان، ئەوانەی ڕیابازیی دەكەن، وە هاوكاریی لە موستەحەققان دەگرنەوە.

ئنجا گوتم: كەواتە: ئەوانەی بە ئیسلام دەڵێن: تلیاك و لەگەڵ ئاینی شێوێنراوی نەسرانییەتدا قیاسی دەكەن و دەیخەنە تەرازووەوە، ئەوانە قیاسی كەشكێ لە مەشكێ دەكەن و، هەموو سمێڵ سووران بەهەمزاغا تێدەگەن! ئەگەرنا ئەوەتا ئیسلام دەڵێ: كەسێك یارمەتی هەتیو و نەدارو لێقەوماو نەداو، مشووریان لێنەخوات، ناتوانێ بڵێ ئیماندارم و، ئەگەر نوێژكەریش بێ، نوێژەكەی ناوی بێ نێوەڕۆكە!

دیارە پاش تەواو بوونی قسەكانم، چەند پێشمەرگەو كادیرێكی یەكیەتی بانگیان كردم و گوتیان: بێزەحمەت فلانەكەس ئیشمان پێتە! ئیدی ماوەیەك پێكەوە دانیشتین لەژێر سێبەری درەختێكداو، هەندێك قسەو باسمان پێكەوە كرد، كە قسەكانی ئەوان زیاتر هەڕەشە بوون كە: قبووڵ ناكەن ئەو كوردستانەی ئەوان بەخوێنی سەدان شەهید ئازادیان كردوە، كەسانی دیكە بێن فیكری دیكەی تێدا بلاوبكەنەوە!

منیش گوتم: ئێمە وامانزانی خەباتی ڕزگاریخوازیی بۆ خەڵك و میللەت كراوە بەگشتی، نەك بۆ حیزب و ئیدۆلۆژیایەكی تایبەت، بەهەرحاڵ نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێك و هەركەسەمان لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، بەلام لەبەر ئەوەی ژمارەیەك لە خەڵكی تازیەكە، وێڕای خاڵ ئەحمەدە ڕەش پێیان زانی، (واتە: بە مشتو مڕی نێوانمان) ئەوان كۆتایی یان پێهێنا.

### ٤) بانگهێشــت (دعــوة) و نانخواردن:

ئەمیش شێوازێكی دیكەی كارو چالاكیی و بانگەوازم بـوو، كـە لێـرەدا بەپێویسـتی دەزانم ناوی سێ كەس دۆسـتە دێرینـەكانم بێـنم، كـە چـەند كـۆڕو مەجلیسـێك لـە مـاڵی ئـەوان و خزمەكانیاندا بەڕێوە دەچوون، لە دەڤەری بیتوێن و پشدەر، ئەوانیش:

١ـ كاك (خـدر عبدالله قەرە)ی مامـەش.

٢ـ كاك (فەقـێ مینـە)ی شـێخاوەلانیـی، مامەش.

٣ـ كاك (تەهـا حاجی زاهیر)، كە ئێستاش هەر سـێكیان[1] لە ژیاندا ماون، یادیـان بەخێـر بێ و، لە بەلاو گرفتاریی بەدووربن.

شایانی باسیشە زۆرجاران بەشێوەیەكی بەرنامەو نەخشە بۆ دارێژراو، ئەو بانگهێشتانە ساز دەكران، وە موناقەشەو باس و خواس و پرسیارو وەلامی زۆریان تێدا بوون.

**لەوبارەوەش ئاماژە بە نـموونەیەك بكەم باشـــە:**

لە ساڵی (١٩٨٣)دا لە یەكێك لەو بانگهێشتانەی كە كاك (خدر عبدالله قەرە) لـەماڵی كـاك عوسمانی ژنبرای لەقەلادزێ سازی كردبوو، ژمارەیەك لەو كەسانەی كـە گومـان و پرسـیارو ئیشكالیان لەبارەی ئیسلامەوە هەبوو، یان هەر بێبڕوا بوون، كۆبوونەوە، كە مـن وتووێـژیان لەگەڵ بكەم، مامۆستا (مەلا)یەكیش كە دراوسێیان بوو و لە ئەسڵی بابەتەكەش بێخەبەر بوو، لە مەجلیسەكەدا بوو، بەلام وا دیاربوو یەكێك لە ئامادەبووانی كۆڕەكە بە موخەننەتی بە هەڵـە لە دژی منی تێگەیاندبوو، بۆیـە لـە سـەرەتاوە هـەر قسـەیەكم دەكـرد، مامۆسـتا پەرچـێكی تێدەخست، منیش زانیم خراپ حـاڵی كـراوە، بۆیـە لـە دەرفەتێكـدا سـەرم بـردە بنگـوێی و تێمگەیاند، كە ئامانجی ئەو كۆڕو مەجلیسە چییـەو چۆنـە؟

ئنجا دوای ئەوە مامۆستا بوو بە پاڵپشتم و هەرچیم گوتبایە، پشتگیریی دەكردم، دوایی كـە قسـەكانمان درێژبوونـەوە، هەڵسـایە سـەر پـێ و گـوتی: كاكـە مـن دەڕۆم، تاقـەتی ئـەو

---

١) بەلام كاك فەقـێ مینە لـە ساڵی (٢٠١٣)دا كۆچی دوایی كرد پاش نەخۆشییەكی درێژخایەن خوالێی خۆشبێ.

شـەڕەقسەیەم نیـە، بەڵام با وەصیەتێكتان بـۆ بكـەم: فلانكـەس زۆر شـارەزایە لـە ئیسـلامو هەرچی دەیڵـێ، گوێی بۆ بگرنو لێی وەربگرنو من خواحافیـز!

### ٥) دەرس گوتنـەوە و ئامۆژگـاریی:

ئەمیش شێوازێكی دیكەی كارو بانگەوازم بوو، بەتایبەت لەمزگـەوتی گـەورەی ڕانیـەدا، هەروەها لە سەردانی مزگەوتەكانی دیكەو دانیشتن لەگەڵ فەقێیەكانو قوتابیانی دیكەدا.

دەرسەكانیشم جۆراوجۆر بوون، وەك:

ئیمانو عەقیدە، فێركردنی قورئان، فەرموودە، بابەتە شەرعییەكان، ڕەوشـتو ئـەدەب، بەسەرهاتو مێژوو، زیكری خوا، هۆشیاریی فیكریی و سیاسیی... .

### ٦) وتووێـژو شەڕەقسـە، شـێوازێكی دیكەی بانگـەواز:

ئەمیش شێوازێكی دیكەی بانگەوازو چالاكیی فیكریم بوو، هەرەچـەند خـۆم حـەزم بـە شەڕە قسـە (جدال، نقاش) نەدەكرد، بەڵام جاری وابوو ناچار دەبووم لە بەرانبـەر ئەوانـەدا كە ڕەخنەیان لە ئیسلام دەگرت، موناقەشە بكەم.

لێرەش حەز دەكەم ئاماژە بە دوو نموونـە بكـەم بـەكورتی، ئەگـەرنا بەدرێـژیی زنجـیرەی: (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان) نموونەی ئەو جۆرە موجادەلانەیە:

❁ جارێكیان كادیرێكی ماركسیی لە گەرمەی موناقەشەكەماندا گوتی: بەڵگە لەسەر ئەوەی كە ئیسلام بەكەڵكی ئێستا نایـەتو، كـاتی خـۆی بـۆ كۆمـەڵگای كشـتوكاڵیی (مجتمـع زراعي) هاتوە، ئەوەیە كە لە بانگ (أذان)دا تەنیا باسی جوتیار (فـلاّح)، دەكاتو دەڵـێ: (حيَّ على الفـلاح)، بەڵام باسی چینی كرێكار (پرۆلیتـار – عمال) ناكات!!

منیش گوتم: ئاخرگرفتی ئێوە نەشـارەزاییو تێنەگەیشـتنە، ئەگـەرنا دەبـوو بزانـی كـە وشەی (فلاح) لە بانگدا بەبێ گیـرە (شـدَّة)یـەو بـە مانـای سـەرفرازیی دێ، ئـەوەی تـۆ دەڵێـی: (فلاّح)ە، نـەك (فلاح)!

دیـارە سەرفرازییش گشتگیرە، بۆ هەموو چینو توێژەكانی كۆمەڵگا.

❁ جارێكی دیكەش لەگەڵ بابەیەكی كۆمۆنیستدا شەڕەقسەمان بوو، ئەو گوتی: ئیسلام دەڵێ: خوا چۆنی دنیا داناوە، دەبێ پێی ڕازیبین‌و، دەوڵەمەندو فەقیر، خوا وایلێكردوون‌و نابێ دەستكاریی ئیشی خوا بكەین، وە ئیسلام بەهیچ جۆرێك ڕێ بە شۆڕش‌و گۆڕانكاریی نادات، منیش گوتم: ئایا بەڵگەت چییە لەوبارەوە، گوتی: پێویست بە بەڵگە ناكات‌و شتەكە ڕوون‌و ئاشكرایە، منیش گوتم: كە تۆ بەڵگەت نیە بۆ ئیسپاتی قسەكەت، بۆ خۆی هەڵدەوەشێتەوەو پێویستی بەهەڵوەشاندنەوە ناكات، بەلاَم بۆ زێدە دڵنیایی دەڵێم: یەكەمین پیتی، یەكەمین وشەی، یەكەمین‌و گەورەترین ڕستە لە ئیسلامدا، قسەكەی تۆ هەڵدەوەشێنێتەوە، كە بریتییە لەپیتی (لا)ی وشەی (لا إله) لە ڕستەی: (لا إله الا الله)دا، چونكە (لا إله الا الله) یانی: جگە لە خوا هیچ پەرستراوی بەهەق نین، كەواتە: (لا) شمشێرێكە ملی هەرچی تاغووت‌و دیكتاتۆری خۆ بە پەروەردگارو بە پەرستراو زانە، دەپەڕێنێ، وە وشەی بەرزی خوا بەیەكگرتن (كلمة التوحید) ڕەفزی هەرچی كۆیلایەتیی‌و ژێردەستیی مرۆڤەكانە بۆ تاغووت‌و دیكتاتۆرەكان، دەكات، چ لە بەرگی سیاسیی دابن، چ لە بەرگی دینییدابن، چ لە بەرگی حیزبیی، چ لە بەرگی چین‌و توێژ، چ لە بەرگی ڕژێم. . . هتد.

### ٧) دۆستایەتیی‌و برادەرێتیی:

ئەمیش یەكێكی دیكەبوو لە ڕێبازو شێوازەكانی بانگەوازو چالاكیی فیكرییم‌و، ئێستاش لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لەو دۆست‌و هاوەڵانەی ئەو كاتەم، لە هاوەڵایەتیماندا بەردەوامین، چ لەنێو بازنەی كاری حیزبیی‌و ڕێكخراوەیی ئیسلامییدابن، چ لەدەرەوەی بن، لەدەڤەری بیتوێن‌و پشدەر بەتایبەتیی‌و، لەزۆربەی ناوچەكانی كوردستاندا بەگشتی.

دیارە زۆربەی ئەو دۆست‌و هاوەڵانەشم، پێشتر هەڵگری فیكرەیەكی دیكەی غەیری ئیسلام بوون‌و، لە ئەنجامی نزیكیی‌و ڕەفیقایەتییدا گۆڕاون.

هەڵبەتە دواتریش ساڵ بۆ ساڵ بازنەی هاوەڵایەتییەكانم فراوانترو ژمارەی دۆست‌و برادەرەكانم زیاتر دەبوو، شانازییش بەیەك بەیەكی هاوەڵە دڵسۆزو مەبدەئییەكانمەوە دەكەم، كە لە هەموو قۆناغەكانی ژیان‌و گوزەرانی پڕ كەندو لەندو بە هەورازو نشێومدا، هاوكارو دەستبارگرم بوون‌و هەن، خوا پاداشتیان بداتەوەو سوپاسگوزاریانم.

# نووســینی یەکەمین بەرهەمــم و چاپکردنــی یەکەمـین بەرهـــەم

یەکەمین بەرهەمی نووسراوم، کتێبــی: (ڕێبازی تێکۆشان) بوو کە لە ساڵی (١٩٨١) ز دا نووسیمو بە دەستنووسیی لێم ونبوو، ئەگەر کەسێك لـەلای بــێو بـۆم بێنێتــەوە، مـەمنوونی دەبم، کە لە ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٩٣)دا وێڕای کتێبخانەکەم، فەوتا، وە لـەماوەی سـاڵی (١٩٨٣)دا کتێبــی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام)م نووسی، کە یەکەمین بەرهەمم بوو چاپ کرابێ، تەفسیری سـوورەتی (فاتحــە)یەو، دواتـر لـە سـاڵی ١٩٨٤دا سـێ هـەزار (٣٠٠٠) نوسخەی لـێ چاپ کراو، سەداو کاریگەرییەکی باشی هـەبوو، بەرچـاوی زۆر کەسـی پـێ ڕۆشن بۆوە، وە لە ساڵی (٢٠٠٦)دا بۆ جاری دووەم چاپ کرایەوە.

شایانی باسیشە بۆ چاپکردنی ئـەو کتێبــەم هـەرکام لـە کـاك (خـدر عبـداللە قـەرە)و کـاك (موحەممەد مەلا برایـماغا مەرگـەیی) "خـوا لێی خۆشبـێ"، هاوکاریان کردم، کـاك خـدر عبـداللە پـارەی چـاپکردنی دابـین کـرد بـە قـــەرزو، کـاك موحەممـەدی مـەلا برایـــماغاش سەرپەرشتیی چاپکردنی کـرد.

ئنجا لێرەدا لەبارەی ئەو کتێبــەمو چـۆنیەتی ڕالێبـوون (موافقـە)ی حکوومـەت بـۆ چـاپ کرانییەوە، با ئەم بەسەرهاتەم بگێڕمەوە:

## چـۆنیەتی یەکـدی ناسـینمان لەگـەڵ مامۆسـتا شـێخ عبـداللطیف دا بـەهۆی (پوختەیەك دەربارەی ئیسـلام)ەوە:

ڕۆژێکیان لە مانگەکانی کۆتـایی سـاڵی (١٩٨٣)دا مـن لـە مزگـەوتی گـەورەی ناحیـەی (بنگرد) بووم، مامۆستایەکە مۆڵەتی دابووم وتاری جومعە بخوێنمەوە، پێش وتارەکـەم، یـان دوای ئەوە، هەرکام لە: کاك (گەیلانیـی) "ملا سـلمان" و کاك (عبدالباسط کوشنچیی) کـە پێشتر یەکدیـمان بینیبوو لە هەولێر، بەرەو پیریـم هـاتنو گوتیـان: ئێمـە لـە هـەولێرەوە بـۆ

سەردانی تۆ هاتووین و مامۆستا (شیخ عبداللطیف) واژەیی ئێمەی ناردوە، (مامۆستا شێخ عبداللطیف " خوا لێی خۆشبێ " دووەمین ڕابەری گشتی بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی بوو، لە ساڵی (١٩٩٢) بەرووداوی سەیارە کۆچی دوایی کرد لەرێگای بۆکان – مهاباد) دیارە ئەو کاتە مامۆستا (شیخ عبداللطیف) مامۆستای زانکۆ بوو لەهەولێر.

پاشان باسیان کرد، کە کتێبی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام)ی بەندە لەلایەن فەرمانگەی چاودێریی (دائرة الرقابة)وە وەك شارەزای پشکنەر (خبیر مفتش) دراوە بە مامۆستا، کە تەماشای بکات، ئایا چاپ بکرێ یان نا؟

ئیدی منیش بە قەمەرە سپییەکەی کاك (عبدالباسط) لەگەڵ ئەو و کاك (مەلا سلمان)دا چوومە هەولێرو، کە چووینە خزمەت مامۆستا (شێخ عبداللطیف) " بەرەحمەت بێ "، زۆر خۆشحاڵ بوو، بەلاّم دوو سێجار هەر دەیپرسی: ئایا تۆ ئەو کتێبەت نووسیوە؟ دیارە پێی سەرسام (مُعْجَب) بوو، پاشان گوتی: زۆر باشم بۆ نووسیوی کە چاپ بکرێ و نووسیویشمە کە هاوکاریی مادییت بکەن بۆ چاپکردنی، کە ئەوکاتە پێی دەگوترا: پشتگیریی (تعضید)، بەلاّم هیچ هاوکارییم نەکرا.

دیارە ئەوە سەرەتای یەکدی ناسینمان بوو لەگەڵ مامۆستا (شیخ عبداللطیف)دا " خوا لێی خۆشبێ ".

## چۆنیەتی یەکدی ناسینمان لەگەڵ کاك خدر عەبدوللا قەرەدا :

چۆنیەتی یەکدی ناسینمان لەگەڵ کاك حاجی خدر عەبدوڵلای قەرەی مامەشدا، خوا سەلامەت و سەرفرازی بکات، کە یەکێکە لە دۆست و برا دڵسۆزو نزیك و بەهەڵوێستە دێرینەکانم، بەسەرهاتێکی هەیە، بۆ گێڕانەوە دەشێ:

لەو کاتەدا کە سەرگەرمی نووسینی کتێبی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) بووم، لە کەشی بەهاری ساڵی (١٩٨٣)دا رۆژێکیان کە لەسەر خوانە (پنە)یەك دەمنووسی، (مامۆستا مەلا ئیبراهیم مەمەنداوەیی)و برادەرێکی لێم وە ژوور کەوتن، کە دوایی زانیم ناوی (خدر عبدالله قەرە)یەو لە عەشیرەتی مامەشە، دیارە منیش بەخێرم هێنان و رێزم

لێگرتن‌و، پێشتریش لەگەڵ (مامۆستا مەلا ئیبراهیم)دا پێكەوە لە پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی خوێندبوومان‌و یەكدیمان دەناسی.

ئنجا پاشتر كاك حاجی خدر بۆی باسكردم، كە پاڵنەری سەرەكیی وی بۆ ئاشنابوونی بە من، ئەوە بووە كە پێشتر بێئەوەی ئەندامی فەرمیی (یەكیەتی نیشتمانیی) بێ، بەپارەو سەیارەو ماڵی خۆی زۆری خزمەت دەكردن، بەڵام رۆژێكیان لە كۆڕێكدا باسی بەندە (عەلی باپیر) كراوەو هەندێكیان زەمم‌و هەندێكیان مەدحیان كردووم‌و، لە میانەی قسەكانیاندا گوتوویانە:

ئێمە ئەگەر دەستەڵاتمان بكەوێتە دەست، نابێ بهێڵین بابای وەك فلانكەس لە نانەواخانەش نانی پێبفرۆشرێ! كاك خدریش گوتوویەتی: لەبەر چی، ئایا لەگەڵ رژێمەو دژی خۆمانە؟! گوتوویانە: نەخێر، ئەو زۆر دژی رژێمەو بە خراپ باسی دەكات، وە لە ماركسیزم‌و لە ئیسلامیشدا زۆر زیرەك‌و شارەزایە، بەڵام دژی فیكرەی ئێمەیەو، ئەو جۆرە كەسانە دەبنە هۆی وازهێنانی خەڵك لە ئێمە!

ئیدی كاك خدریش بۆ كاك مەلا ئیبراهیمی برادەری باس دەكات‌و دەڵێ: حەز دەكەم ئەو كورە ببینم، ئەویش دەڵێ: فلانكەس برادەرمە، بەو جۆرە مامۆستا ئیبراهیم لەگەڵی دێ بۆ لای من.

شایانی باسیشە كاك خدر قەرە پاش ئاشنایەتیی لەگەڵ من، لە دۆست‌و برادەرە پێشووەكانی دابڕاو لەگەڵ ئێمەو مانان تێكەڵ بوو، جا یەكێك لە برادەرە قۆشمەكانی كاك خدر گوتبووی: من بەلامەوە گرنگ نیە خدر لەگەڵ فلانكەس بۆتە ئاشناو برادەر، بەڵام گرفتم ئەوەیە خێرو بێری بۆ ئێمە نەماوەو، دەعوەت‌و بانگهێشتەكانیمان چوو!

# سەفەری بەغدادو دیتنی چەند کەسایەتییەك

لە ماوەی سالآنی (١٩٨٣ و ١٩٨٤)دا چەند جارێك لەگەڵ کاك خدر قەرەو بە سەیارەکەی وی سەردانی بەغدادم کرد، بە پلەی یەکەم بۆ چاپکردنی هەردووك کتێبی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام)و (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان) کە دواتر لە ساڵی (١٩٨٤)دا نووسیمو لە ساڵی (١٩٨٥) چاپ کرا.

ئنجا لەو سەردانەمدا کە هەموو جارێ هەر لەگەڵ کاك خدردا دەچووین، چەند دیدارێکی گرنگم بوون لەگەڵ چەند کەسایەتییەکداو، سەرو تیشك دەخەمە سەر ئەو دیدارانە:

## ١) دیدار لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس دا:

ئەمجارەیان بەندەو کاك خدرو مامۆستا بەکر سەید غەریب بووین‌و، وێڕای سەردانی چەند دۆست‌و برادەرێکی مامۆستا بەکر لە (سامراء) و (رمادي) لە بەغدادیش بەخزمەت مامۆستای ڕەحمەتی (مەلا عبدالکریم)یش گەیشتین‌و، کۆمەڵێك ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریی کردین‌و، چەند پرسیارێکیشمان لێکردن "مامۆستا بەکر غەریب کردنی" کە بوونە مایەی قەڵس بوونی!

دیارە من پێشتریش چەند جارێك بەخزمەتی مامۆستا گەیشتبووم‌و، دوایش هەتا پێش کۆچی دوایی لەرێی (دکتۆر موحەممەد شەشۆیی)یەوە کە ئیجازە دراو (مُجاز)ی مامۆستایە، نامەو قسەو باسی زارەکیی (شفهي)مان هەر ئاڵوگۆڕ دەکردو، لە وەڵام‌و ڕێنماییەکانی سوودمەند دەبووم.

خوا پلەو پایەی مامۆستای مودەڕڕیس بەرزتر بکاتەوەو، پاداشتی باشی مامۆستا مەلا موحەممەدی شەشۆییش بداتەوەو، هەر سەرکەوتوو و بەختەوەر بێ.

**٢) دیدار لەگەڵ مامۆستا مەلا شێخ موحەممەد تەها بالیسانیی دا :**

لە یەکێك لەو سەفەرانەی کە لەگەڵ کاك خدردا کردمانن و لە خزمەت بابیشمدا بووم، کە بۆ چارەسەر بردمانە بەغداو، بەخزمەت مامۆستا مەلا شیخ محەمەد تەها بالیسانیی گەیشتین، " خوا لێی خۆشبێ و پلەو پایەی بەرز بێ "، وە شەویش لە ماڵیان ماینەوە، شایانی باسیشە ئەو مامۆستا ڕەحمەتییە زۆر شارەزاو ئاسۆی عەقڵ و بیرفراوان و خۆشخوڵق بوو و، خاوەنی کۆمەڵێك کتێب و بەرهەمیش بوو، کە بۆ ئەو کاتە شتی تازەو نایاب بوون، بەتایبەت ئەو چەند جوزئەی قورئان کە بەعەرەبی تەفسیری کردبوون.

**٣) دیدار لەگەڵ مامۆستا موحەممەد صادق باڵەکیی دا:**

هەر لەو سەفەرانەماندا، لە مانگی ڕەمەزاندا شەوێکیان میوانی مامۆستا مەلا موحەممەد صادق باڵەکیی بووین، کە ئەوکاتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی گەورەی (سەلمان پاك) بوو، ئەو مامۆستایەش " خوا لێی خۆشبێ " و پلە و پایەی بەرز بکاتەوە، سەرەتا بەهۆی کاك مەلا زراری کوڕییەوە، کە پێکەوە لە پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی قوتابی بووین، پێی ئاشنا بووم، مامۆستایەکی زاناو وردو یەکجار بەئەدەب و شەرم و ڕێز بوو، زۆر میوانذۆست و خۆ بەکەمگرو خاکیی بوو، هەموو تەمەنی بە دەرس گوتنەوە (تدریس) بەڕێکرد، کە لە مزگەوتی (حاجی برایمی گەردیی) لە هەولێر هەتا ماوەیەك پێش کۆچی دواییشی، لەسەر دەرس گوتنەوە هەر بەردەوام بوو.

**٤) دیدار لەگەڵ شێخ عوسمانی بیارەیی دا:**

هەر لەو سەفەرانەماندا دوو جار بەخزمەت شێخ عوسمانی بیارەیی " شێخی تەریقەتی نەقشبەندیی گەیشتم "، هەڵبەتە جارێکی دیکەی سێیەم و کۆتاییش هەر بینیم، لە ساڵی (١٩٩٦)دا لە ئەستەمبووڵ کە دوایی " ان شاء الله " باسی دەکەم.

جاری یەکەمیان پێموایە لە ساڵی (١٩٨٣)دا بوو، لەخزمەت (مامۆستا مەلا موحەممەدی نوورەددینی)داو هاوڕێ لەگەڵ مامۆستا مەلا برایمی مەمەنداوەیی و، کاك خدرە قەرەو،

عەلی کوڕی مامۆستا نوورەددینیدا چووینە بەغدادو، لەمیانی سەردانەکانماندا سەردانی جەنابی شێخ عوسمانیشمان کرد.

جاری دووەمیش کە سەردانی شێخ عوسمانمان کرد "خوا لێی خۆشبێ" و پلەو پایەی بەرز بێ"، وێڕای کاك خدر بەخۆی و سەییارەکەیەوە، هەرکام لەکاك (فەقێ مینەی شێخاوەلان) کە بە ئەسڵ لە عەشیرەتی مامەشەو، کاك (عەلی فەقێ رەسووڵ قەڵادزەیی)یش هەبوون، یادیان بەخێر بێ.

دیارە ئەمجارەیان کۆبوونەوەیەکی تایبەتییان لەگەڵ جەنابی شێخدا بۆ ڕێکخستین، مامۆستا حەسەنی قەڵادزەیی ڕێکیخست، وە پاش چەند قسەو باسێك، شێخ ڕووی تێکردمو گوتی: تۆ ئینسانێکی صاڵحیو حەز دەکەم بێیە نێو تەریقەتەوە، بۆئەوەی صاڵحتر ببی، ئنجا شێخ ڕووی کردە مامۆستا مەلا عبداللە ی کاتب، کە بە فەنایی ناسرابوو "خوا لێی خۆشبێ"، یان بە مامۆستا حەسەنی قەڵادزەیی گوت کە بە مامۆستا مەلا عبداللە بڵێ: با هەردووك تەریقەتی نەقشییو قادریی بدا بە فلانکەسو (تلقین)ێکی عالمانەشی بدات!

ئنجا لەو کاتەدا کە جەنابی شێخ باسی پێدانی هەردووك تەریقەتی نەقشییو قادریی بە من کرد، دوو سێیەك لەوانەی لە کۆڕەکەدا دانیشتبوون، کە یەکیان مامۆستا حەسەن قەڵادزەیی بوو، بە دەنگێکی بەرز (الله اکبر)یان کردو گوتیان: ئەوە دووەم یان سێیەم کەسە، کە شێخ هەر دووك تەریقەتەکەی پێدەدات!

پاشان مامۆستا مەلا عبداللە لەگەڵم دانیشتو، کۆمەڵێك قسەو باسی لەبارەی تەصەووفو تەزکیەی نەفسەوە بۆ کردمو، هەندێك شتی باس دەکرد کە بۆ من شتی زانراو بوون، بۆیە عەرزم کرد:

مامۆستای بەڕێز! من هەرکام لە کتێبەکانی: (إحیاء علوم الدین)ی (غزالي) و (الرسالة)ی (قشیري)و (عوارف المعارف)ی (سهروردي) و (إیقاظ الهمم في شرح الحکم)ی (ابن عجیبة) و (مدارج السالکین شرح منازل السائرین)ی (ابن قیم الجوزیة)و هی دیکەشم لەبارەی تەزکیەو تەصەووفەوە خوێندووەتەوەو لەوبارەوە شتێك دەزانم.

ئەوجار مامۆستا "بەڕەحمەت بێ" قسەکانی کورت کـردەوەو گـوتی: الحمـدلله الحمـدلله دیارە جەنابت لەو بوارەدا تازەنی، پاشان مامۆستا باسی چۆنیەتی زیکرکردنو (رابطـة)کردنی بۆ کردم، بەڵام هەرچیم کرد بە عەقڵمـدا نەچوو!

(رابطـة)ش بە تەعبیرێکی سادە ئەوەیە کە تۆ پێش زیکرکردن، دڵی خۆت وەك دەفرێـك، قاپێك بگریەوەو وا وێنـا (تصـوّر) بکەی کە نـوورو بەرەکـەت لـە خـواوە بـۆ جیبریـل دێو، لەوەوە بۆ سەر دڵی پێغەمبـەر "صـلی الله علیـه وسـلم" و لـە دڵـی ئەویشـەوە بـۆ سـەر دڵـی خەلیفەکانیو، پاشان ئەو شـێخو پێشـەوایانەی تەریقەت، هەتا دەگاتە شێخ عوسمـانو، لـە دڵی شـێخیشـەوە وەك بلووسکەی ئاو، بۆ سەر دڵی تۆ دەڕژێ!

شایانی باسیشە بەڵگـەو پاساوی ئەو ئاڵقـەبەندییە ئەوەیـە "وەك خۆیـان دەڵـێن" کـە دڵـی بابای صۆفیو مورید بێهـێزەو تەحەممولی ئەو بەرەکەتو نوورە بەهێزە ناکات، کە یەکسەر لـە خواوە "عزّ وجل" وەری بگرێ، وەك چۆن وزەی کارەبا لە ڕێـی (محوِّلة)وە دابەش دەکرێ! بەڵام من ئەو مەسەلەیەم نە ئەوساو نە ئێستاش پێ ڕاست نەبوو و نیـە، چونکە:

ئەم مەسەلەیە نەك هەر هیچ بەڵگـەیەکی شـەرعیی لەسـەر نیـە، بگـرە بەڵگـەی شـەرعیی لەسەر پێچەوانەکەی هەیـە، ئەوەتا خوا سبحانەو تعالـی بـە پێغـەمبـەری خاتـەم "صـلی الله علیــه وســلم" دەفــەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقـرة، واتە: وە هەرکات بەندەکانم پرسیاری منیان لێکردی، ئەوە بێگومـان مـن نیـزیکم، وەڵامـی داوای داواکەر ئەگەر بانگم بکات، دەدەمەوە، دەجا با بەدەنگمەوە بێـنو ئیمـانم پـێ بێـنن، بـەڵکو سەر ڕاستو سەرفراز بن.

هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ... ﴿٦٠﴾ ﴾ غــافر، واتە: وە پەروەردگارت فەرمووی: لێم بپـاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

ئنجا لەڕاستییدا جیاوازییەکی بنەڕەتییو گەورەی نێوانی ئیسلام، تاکە بەرنامـەی ڕاسـتو دەستکاریی نەکراویی خـواو، ئایینـە شـێوێنراوەکان، بـۆ وێنـە: نەصـڕانییەت، ئەوەیـە کـە لەئیسلامدا مرۆڤ ڕاستەوخۆ لەخزمەت خوادا دەبێو پێویستی بەواستە نیە!

ئنجا بەهەرحاڵ ئەو دیدارەم لەگەڵ جەنابی شێخ عوسماندا بوو، بەلاَّم هیچ گۆڕانكارییەك بەسەر شێوەی تێگەیشتنم لە ئیسلامو دینداریيمدا نەهات.

پاشان كە گەڕامەوە یەكێك لە خەلیفەكانی شێخ سەردانی كردم "كە ئێستاش لە ژیان دایەو مامۆستایەكی بەڕێزە" وە پیرۆزبایی لێكردم، منیش چەند تێبینییەكم لەسەر هەڵسوكەوتی شێخو سۆفییەكانی و خانەقایەكەی پێگوتن و، داوام لێكرد كە وەك ئەركێكی شەرعیی بیانگەیەنێ، بەلاَّم ئەو داوای لێبووردنی كردو گوتی: من ناتوانم، خۆت بیانگەیەنە!

دیارە ڕەخنەو تێبینییەكانیشم[1] چەند شتێك بوون:

١) بە پێوەو دەست لەسەر سینگو بە ملكەچیی ڕاوەستانی هەندێك لە ئامادەبووانی كۆڕو مەجلیسی شێخ، كە ڕاست پێچەوانەی هەڵوێستی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" بوو كە لەوبارەوە هاتوە: ﴿ماكان شخص في الدنيا أحب اليهم رؤية من رسول الله "صلى الله عليه وسلم" وكانوا لايقومون له لما يعلمون من كراهيته لذلك﴾ أخرجه البخاري في "الأدب المفرد" والترمذي وصححه والضياء المقدسي في "الأحاديث المختارة" وأحمد أيضاً في "المسند" وسنده صحيح على شرط مسلم، و صححه الألباني في السلسلة الصحيحة) واتە: دیتنی هیچكەس لە دنیادا لەلای هاوەلاَّن لە هی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" خۆشەویستتر نەبوو، بەلاَّم لەبەری هەڵنەدەستان، چونكە دەیانزانی پێی ناخۆشە!

٢) ئنجا بێگومان ئەگەر لەبەر هەڵسان (القيام لَهُ) خراپ بێ، بۆ ڕاوەستان (الوقوف لَهُ) خراپترە!

٣) بە گاگۆڵكە بەرەو لای شێخ چوونو ماچكردنی لاقی، كە دیارە ئەوەش پێچەوانەی ئەو ڕێزەیە كە خوا لە مرۆڤی ناوەو فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ...۝٧٠﴾ الإسراء،

---

[1] ) وێڕای ڕەخنەو تێبینییەكانیشم ڕێزوخۆشەویستییم بۆ جەنابی شێخ عوسمانی بیارەو هەبووەو هەیەو، لە كتێبی (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خواچوون)دا وەسیەتێكی ئەوم هێناوە كە مەدحێكی گەورەی بۆوی تێدایە، بڕوانە: لاپەڕە (٢٥٢) چاپی پێنجەم، بێگومان جگە لە پێغەمبەرانیش "صلى الله عليهم وسلم" هیچ كەس لە هەڵە پارێزراو (معصوم) نیە.

واتە: وە بێگومان ئێمە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم ناوە، بۆیە خۆشوبهاندنی بە ئاژەڵ‌و پێچەوانەی ڕێزو حورمەتیەتی‌و نەدەبووایە شێخ ڕێی پێبدات!

٤) شیعرو گۆرانیی‌و هۆرە پێداهەڵدانی ڕووبەڕووی شێخ، کە دیارە مەدحی ڕووبەڕووش شتێکی ناپەسەندو خراپە، وەك پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" فەرموویەتی: ﴿إذا رأیتم المدّاحین فاحثوا في وجوههم التراب﴾ رواه مسلم: ٣٠٠٢، واتە: ئەگەر مەدحکارانتان بینی خۆڵیان بەڕوویدا بکەن، (کە دیارە مەبەست مەدحی ڕووبەڕوویە، چونکە "النووي" لە (ریاض الصالحین)دا لەژێر ناوونیشانی (باب کراهة المدح في الوجه..)دا هێناویەتی.

٥) پابەند نەبوونی ئەو ئافرەتانەی خزمەتیان دەکرد بە پۆشاکی شەرعیی یەوەو، تێکەڵییان لەگەڵ پیاوەکانیش[1].

٦) گوێبیست نەبوونم لە کۆڕی شێخدا بۆ ئایەت‌و فەرموودە یان ئامۆژگارییەکی گشتگیر، بەڵام بێگومان من لێرەدا تەنیا قسە لەسەر ئەو دوو دیدارەی خۆم دەکەم‌و، ناڵێم هەموو کۆڕو مەجلیسەکانی شێخ هەر وابوون!.

٧) یەکێك لە ئامۆژگارییەکانی شێخ ئەوە بوو کە خۆم لە لایەن‌و حیزبە ئیسلامییەکان بەدوور بگرم، بەتایبەت برایانی مسوڵمان (إخوان المسلمین).

٨) گرنگی دان بەمن‌و نۆرەبڕیی بۆکردنم، کەچی مەلایەکی ریش سپی لێبوو کچێکی نەخۆشی هێنابوو، گوتی: سێ ڕۆژە لێرە چاوەڕێی دیتنی شێخم! هەرچەندە پێم وانیە ئەوە لەسەر خودی شێخ حیساب بکرێ‌و، ڕەنگە هەڵسوکەوتی مشوورخۆرانی ئیشوکارەکانی بووبێ.

٩) پارەو هاوکاریی وەرگرتن لە خەڵکێکی هەژار کە خێرو زەکاتیان پێ دەشیا[2]!

---

١، ٢) یەکێك لە مامۆستایانی موعتەبەر کە دۆست‌و دڵسۆزی جەنابی شێخیش بووە، بەوە عوزری بۆ ئەو مەسەلانە هێنایەوە، کە ئەو کاتە جەنابی شێخ زۆر لەژێر فشاری رژێمی بەعس دابووو جێگاو شوێن‌و ئیمکانیەتیان زۆر ناتەواو بوو.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەزانم كە شێخانی تەویلەو بیارە لەزۆر ڕووەوە خزمەتیان كردوە، بەتایبەت بە مامۆستایانو فەقێو قوتابخانە شەرعییەكانو، گەلێك كەسی خراپ لەسەر دەستیان گەڕاوەتەوە بۆ جۆرێك لە دینداریی و تاعەت!

ئنجا من هەڵوێستی خۆم لەبارەی تەزكیەی نەفسو ڕێبازەكانی تەصەووفەوە لە كتێبی: (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا خستۆتە ڕوو، كە لێرەدا مەودای ئەوەم نیە قسەی لەبارەوە بكەم و هەر بە كورتی دەڵێم:

((تەزكیەی نەفس)) لایەنێكی گرنگو بنەڕەتی یە لە ئیسلامو موسوڵمانەتیداو، خوا سەرفرازیی مرۆڤی پێوە بەستوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾ ﴾ الشمس، واتە: سوێند بە نەفسو بەوەی ڕێكی خستوە (دروستی كردوە)، وە خراپەكاریی و پارێزگاریی فێركردوە، بەدڵنیاییەوە هەركەسێك تەزكیەی بكات سەرفرازە.

وە بە یەكێك لە چوار ئەركە سەركییەكەی پێغەمبەری خاتەمی "صلى الله علیه وسلم" داناوە، كە دەبێ لەنێو ئومەتەكەیدا ئەنجامی بدات، وەك فەرموویەتی: ﴿ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة.

بەڵام ڕێبازەكانی تەصەووف (طرق التصوف) چەند قوتابخانەیەكی پەروەردەیی و چەند ئەزموونێكی بەشەریین، بۆ خزمەتكردنی لایەنی مەعنەویی و ئەخلاقیی موسوڵمانان، وە وەك هەر كەلەپوورو بەرهەمێكی دیكەی زاناو پێشەوایان، هەقو ناهەق چاكو خراپو ڕاستو چەوتی تێدایە، هەرچەندە بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا زۆربەی ئەوانەی لەبەرگی شێخایەتیی تەریقەتدان، كەسانی ناشایستەو نەشارەزا بە ئیسلامو ئەهلی دنیان!!

هەر كەسێكیش بە وردیی تەماشای مێژووی موسوڵمانان بكات، دڵنیا دەبێ كە وێڕای لایەنە ئەرێنییەكان (الجوانب الإیجابیة)ی ڕێبازەكانی تەصەووف، زۆرترین هەڵەو پەڵەو بە لاڕێدا چوونو سەرگەردانبوونی موسوڵمانان بەگشتی، هۆكارە سەرەكییەكەی شیعەگەریی و

صۆفیگەریی (التشیع والتصوف) بووەو، لەو دوو ڕێیەوە خلّتەو خاڵ و لیتەو لاڵی زۆری هەڵەو لادانی مسوڵمانان و شێوێنرانی ڕووی گەشی ئیسلام، بە عەقڵ و دڵی مسوڵمانانەوە نیشتوە.

## ٥) دیدار لەگەڵ مامۆستا مەسعوود موحەممەددا:

هەر لەو سەفەرەدا کە لە خزمەت مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا موحەممەدی نوورەددینیدا کردمان، چاومان بە مامۆستا (مەسعوود موحەممەد عەبدوڵلا جەلیزادە) "خوا لێیان خۆشبێ"، کەوت.

شایانی باسیشە سەرەتا چووینە (کۆڕی زانیاری کورد) بە مەبەستی بینینی ناوبراو و لە ڕێرەوەکەدا بە مامۆستا موحەممەدی کوڕی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس گەیشتین و، سەرەتا زۆرمان لەگەڵ گەرم و گوڕ بوو، بەلاّم کە زانی بە مەبەستی سەردانی مامۆستا مەسعوود موحەممەد هاتووین، بەجێیهێشتین و وەك هەر نەیدیبین وابوو!

پاشان چووینە ماڵی مامۆستا مەسعوود موحەممەد، دیارە من یەکەمجارم بوو مامۆستا مەسعوود موحەممەد ببینم، کۆمەڵێك قسەو باسمان بوون، کە ئەو کاتە من دوو بەرگ کتێبی: (مرۆڤ و دەوروبەر)و نامیلکەی (بۆ ئەمیری حەسەن پوور لە هەر کوێیەك هەی)و نامیلکەی (الی العظیم گورباتشوف)ی مامۆستام خوێندبوونەوە، وێڕای سێ بەرگی (حاجی قادری کۆیی)و زۆر وتارو نووسینی دیکەی، کە لە گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)دا بلاّو دەبوونەوە.

وە لەمیانی قسەکانمدا، ئەم وتووێژەمان بوو:

گوتم: مامۆستا! تۆ لەکتێبەکانتدا ڕەخنە لە مارکسیزم و کۆمۆنیزم دەگری، بەلاّم لە بەرانبەردا هیچ فیکرەو بەرنامەیەکی دیکە، وەك ئەلتەرناتیڤ (بدیل) ناخەیتە روو.

گوتی: ڕاستە، من دەمەوێ بە خوێندەواری کورد بڵێم: کە ئەو ڕێیەی دەتەوێ بیگریەبەر، ڕاست نیەو ڕێیەکی دیکە بدۆزەرەوە!

منیش پێمگووت: ئەدی بۆچی تۆ هاوکاریی خوێنەری کورد ناکەی‌و ڕێی بۆ نیزیك ناخەیتەوە؟ چونکە لە قسەکانتەوە دیارە کە بڕوات بە ئیسلام هەیە، دە بەکورت‌و کرمانجیی بڵێ: ئیسلام بەرنامەی ڕاستی ژیانە!

ئەویش گوتی: کاکە! من دەمەوێ خوێندەواری کورد کتێبەکانم بخوێننەوەو لێیان نەسڵەمنەوە، ئەگەر باسی ئیسلام بکەم، لێم دەسڵەمنەوە!

منیش گوتم: بەڕێز مامۆستا! تۆم وەك کەسێك دێتە بەرچاو، کە ڕوو لە کەسێك دەکات کە لەبن کەپرێکی شڕدا دانیشتوە، کە تیشکی خۆری لێناگێڕێتەوەو پێی دەڵێ: لەبن ئەو کەپرە شڕە هەڵسە! ئەویش دەڵێ: ئەدی بچمە کوێ دابنیشم؟!

ئەویش پێی دەڵێ: نازانم، بەڵام گرنگ ئەوەیە کەپرەکەت کەڵکی لەبن دانیشتنی نیە، ئەویش دەڵێ: کاکە! هەرچۆن بێ مادام هیچ بەدیلم نیە، هەر شتێك لەهیچ باشترە!

ئنجا من لەو کاتەدا سەرگەرمی نووسین‌و لەچاپدانی کتێبی: (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان) یش بووم‌و پێم گوت:

مامۆستا! من کتێبێکم لەبارەی بەرپەچدانەوەی مارکسیزم‌و کۆمۆنیزم‌و خستنە رووی ئیسلام وەك بەدیل‌و بەرنامەی راستی ژیان بەرێوەیەو، کە چاپ کرا نوسخەت بۆ دەنێرم، دواییش لە ساڵی (١٩٨٥)دا کە (ئیسلام و ڕێچکان) چاپ کرا، بۆم نارد.

# یەكدی ناسین و هاوسەرگیرییم

# لەگەڵ ڕوخسار ئیبراهیم ( خاتوون مەلاژن ) دا

لە نیوەی دووەمی ساڵی (١٩٨٣)دا لەگەڵ (ڕوخسارخان، خاتوون مەلا ژن)دا یەكدیمان ناسی بەهۆی (خاڵ ئەحمەدە ڕەشی ماخۆبزنان)ەوە، "بەڕەحمەت بێ" كە ماوەیەك لەمەوبەر لەكۆتایی ساڵی (٢٠١٢)دا نامیلكەیەكم لەبارەی ئەو هاوسەرە لێهاتووەمەوە دەركردوە بەناوی: (خاتوون مەلاژن، ئافرەتێكی هەڵكەوتوو هاوسەرێكی ناوازە) كە ئاڵقەی نۆزدەیەمە لە زنجیرەی: بابەتە هەنووكەییەكانو، بەشی نۆیەمیشە لە كتێبی: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت)داو، لە (٣٠) خاڵدا باسی ژمارەیەك لە هەڵوێستو ڕەوشتو ئاكارەكانیم كردوە، بۆیە بەپێویستی نازانم لێرە وەسفو ستایشتی بكەم، ئەگەرنا بەڕاستی مەدحو زیكری خێری ئەو شێرە ژنە، زۆر هەڵدەگرێ، چۆنیەتیی و سەرەتای یەكدی ناسینەكەشمان ئاوابوو:

ڕۆژێكیان (خاڵ ئەحمەدە ڕەش) "خوا لێی خۆشبێ" كە یەكێك بوو لەڕیش سپیو پیاوماقوولانی گوندی گەڵووی ماخۆبزنانو، دەڤەری پشدەرە ڕەقە بەگشتیی، وەپیاوێكی دیندارو باشو دۆستێكی نیزیكو دڵسۆزی منیش بوو، بۆ زۆر لە سەردانو جەولەكانم كە لە دەڤەری بیتوێن – پشدەر دەمكردن، هەر لەگەڵم دەبوو، پێی گوتم: فلانكەس! ئەگەر دەتەوێ ژن بێنی، كچێكی زۆر باشم پێ شك دێ، هەر بەشایستەی تۆی دەزانم، حەزدەكەم ئەو بێنی!

منیش گوتم: ناوی چییەو خەڵكی كوێیەو كچی كێیە؟

گوتی: ناوی: ڕوخسار ئیبراهیم ماماغایە، بابی برای مام حوسەینی ماماغایە، كە سەرۆك عەشیرەتی (میرزا ڕۆستەمیی)یانە، بەڵام كۆچی دوایی كردووەو، دایكیشی كچی غەفوورخانی لێوژەییەو، ئەو كچە دەبێتەوە خوارزای حاجی سمایلاغاو حاجی جەوهەر ئاغاو ئەوان.

ئیـدی ئەوە بوو یەکدیـمان بینـیو ناسی ، لەڕێی چەند خزمێکیـەوە .

شـایانی باسیشـە مـاوەی شـەش مانگێـك بەدەستگیرانیـی ماینـەوە، چونکـە مـن لـەو ماوەیـەدا – نیـوەی دووەمـی سـاڵی ١٩٨٣ ـ زۆر سـەرقاڵ بـووم بـە نووسـینو چـاپکردنی کتێبەکانمو سەفەرکردنم بۆ بەغدادو جەولەکـردنو سـەردانی هەنـدێك دەڤـەرو گونـد وەك عادەتی خۆم .

## سـەردانێکی حـاجی شـێخ قـادری سەرگەڵـوویی (بـە ئەسـڵ سـۆتکـەیی) بـە نوێنـەرایـەتی (بزووتنـەوەی پەیوەنـدی ئیسـلامیی)

هەر لەوماوەیەدا – نیوەی دووەمی سـاڵی ١٩٨٣ ـ بەنوێنەرایـەتیی بزووتنـەوەی پەیوەنـدیی ئیسـلامیی لەڕێی ئۆردوگای (شانەدەری)و پاشـان شاری مەریوانەوە چوومە ئێـرانو چـوومە شاری (کەرەج) بۆ سەردانی حاجی شـێخ قادری سەرگەڵوویی ، کە پێشتر کەسی دووەم بـوو لە (لەشـکری ئیسـلامیی)دا کـە عـەباس شــەبەك (أبـو أسـامة) بەرپرسـی بـوو و یەکیـەتیی نیشتیمانی لەگەڵیان بەشـەڕهاتو ، چەکی کردن .

پاشـان لەڕێی (مەریوان)ەوە گەڕامەوە بە شارۆچکەی (سیروان)دا .

ئەوەی لەیادیشم مابێ لە قسەو باسێك کە لەگەڵ حـاج شـێخ قـادردا کـردمن " خـوا لێـی خۆشـبێ " ئـەوەبوو کـە دڵـم دانـەوەو هاوخـەمییم لەگـەڵ پێشـاندان بـەناوی (بزووتنـەوەی پەیوەندیی...)یەوە، وە باسی هۆکارەکانی شــکستە خێرایەکـەیانمان کـرد، کـە بـۆمن " وەك پێشتر باسم کردوە " شتێکی چاوەڕوانکراو و پێشبینی کراو بوو .

وە باسی ئەوەشمان کرد کە ئێمەش بەرنامەی جموجـۆڵێکی ئیســلامیی چـەکدارمان هەیـە دژی ڕژێمی دیکتـاتۆری بەعس .

## دوو بیـرەوەریی گرنگی ئەو سـەفەرە :

### یەك : بە نەشـارەزایی کەوتنـە پێش چەند شـارەزایەکی ڕێگـا!

هەرچەندە ئەو ناو و نیشـانەی سەریێ سەیرە، بەلاَم ئەوە ڕووداوێکـی ڕاسـتەقینەبوو، کـە کورتەکەی ئـاوابوو:

هـەر لـەو سـەفەرەی سـاڵی (١٩٨٣)دا کـە بەنوێنەرایـەتیی : (بزووتنـەوەی پەیوەنـدیی ئیسـلامیی) لەڕێی (شـانەدەریی)و پاشان شاری ( مەریوان)ەوە کە شەو لە مـاڵی (کـاك شـێخ زرار) کوڕی (حاجی شێخ قادری سۆتکەیی) مامـەوەو، پاشـان چـوومە (کـەرەج)و لەگـەڵ حـاجی شـێخ قـادردا "بەرەحمـەت بـێ" دانیشـتم، لەسـەری گەڕانەوەمـدا کـە هـەر لـەڕێی مەریوانەوەو بەگوندەکانی (دەرەتفێ)و (پیرسەفا)دا هاتـمەوە، لەگەڵ چەند کەسـێکی خەڵکی ئەو دەڤـەرەدا.

سـەرەتا هەتا بووڵێڵی ئێوارە، لەسەر کانییو سـەرچاوەیەکو لەبن چەند درەختێکدا کە لـە پشـتمانەوەو لەسەر گردێـك ڕەبیـەی ڕژێـم هـەبوو و بەسـەریدا دەڕوانـین! ماینـەوەو نانمـان خوارد، نانخواردنەکەشمان بریتی بوو لەگۆشتی بـرژاو، چـەنکی هـەر ئـەو ڕۆژە یـان ڕۆژی پێشـتر، فڕۆکەکـانی ڕژێمی بـەعس بۆمبـارانی گـاڕانو ئـاژەڵی خـەڵکی ئـەو گوندانـەیان کردبوو و، هەندێك لە ئاژەڵەکان چەقۆیان پێ ڕاگەیشـتبوو و، ئێمەش لەو گۆشتە پشـکمان پێ بڕابوو!

ئنجا پاش نانخواردنو نوێژکردن وردە وردەو بـە پـارێز بـەرەولای ئۆردوگـای (سـیروان) بەڕێ کەوتین.

شایانی باسیشە ئەوانەی لەگـەڵیان بـووم، کـە پێـنج شـەش کەسـێك بـوون، هـەموویان شارەزای ڕێگابوون، بەس من نەشـارەزابوومو خـەڵکی دەڤەرەکـە نـەبووم، بـەلاَم دیـاربوو لەبەرخۆیانـەوە قسـەیان دەربـارەی شـوێنێك دەکـرد، کـە هـەتا ئەوکاتـە چـەندان کەسـی کاروانچییو غەیری ئەوانیش بەدەستی چەکدارانی ڕژێم، کە بۆسـەیان لـەو شـوێنە دانـاوە، کوژراون!

ئیدی هەتاگەیشتینە ئەو شوێنە خەتەرو ترسناكە، هیچ باس نەبوو و یەكێكیان لەپێشـمانەوە بوو، چونكە شەو تاریك بوو، بەڵام دیاربوو كە گەیشتینە شوێنی ناوبراو، هیچیان ئامـادەیی پێشكەوتن‌و بوونە دەلیلیـان نەبوو!

بۆیە بەناچـاریی مـن كەوتـمە پێشـەوە، هەرچـەندە لەنێوخۆیـاندا كەوتنـە مشـتومڕو گلەیی‌و بناشت، كە: عەیبـە ئەو كابرایە پێش بخەین كە شـارەزای ڕێگاكەش نیـە!

منیش گوتم: كاكە گیان! ئەوە گرفت نیـەو ئەجەل‌و مەرگ تەنیـا بەدەست خوایە، مـن لـە پێشـەوە دەڕۆم‌و ئەگەر تەقەشمان لێكرا باهەر یەكێكمان پێوە بـێن، بـەلام هـەتا دەگەینـە ئـەو شوێنەو لێی تێدەپـەڕین، یـەكێكتان بـا دوورو نیزیـك لـە پشـتمەوە بـێ‌و، ئەگـەر ڕێیەكـەم هەڵەكرد، با بەردێك بە ئاراستەی ڕێیـەكەدا فڕێ بدات، تاكو بێمـەوە سەر ڕێ!

ئنجا شایانی باسە لەپێچێكی ڕێیـەكەدا، كە بەسەر نەدیوێكدا دەكەوتی، بۆگەنی هەنـدێك كەلاكم بۆهات، كە دیقەتـمدا چەند كەلاكە ئێسترێك لەو دەوروبەرە كەوتبوون، ئیدی زانیم كە ئەو شوێنە، شوێنە ترسـناكەكەیە، هەربۆیەش كە ئاوڕم دایەوە ڕەفیقەكانم ماوەیەكی بـاش دووربوون‌و، منیش هەموو لەشم بوو بەگوێ‌و هەر لەسـەر هەسـت بـووم، كـەنگێ دەبێتــە تەقەو هـاڕژنی دەستڕێژی گوللە!

بەلام ستایش بۆ خوا لەو شوێنە تێپەڕیم‌و هیچ بـاس نـەبوو، ئیـدی دوایـی ئـەوانیش پـێم گەیشتنەوەو، پێكـەوە چووینە ئۆردوگای سیروان‌و شـەو لەوێ خەوتم.

**دوو: دەربازبوونێكی چاوەڕواننەكراو لە بازگەی سـلێمانی – عەربەت:**

هەر لەو سەفەرەمدا دوای ئەوەی بەیانیـیەكەی لە سیروانەو بەڕێكەوتم بەرەو سلێمانیی، لە حاڵێكدا كە چەند نامەیەكی جۆراوجۆری كوردیی‌و عەرەبییم پێ بوون، هی چەند دۆسـت‌و ناسیاوێكی جۆراوجۆر، كە بۆ كەسوكاریان ناردبوویاننەوە، لە سلێمانیی‌و هەولێرو موسـڵ‌و بەغدادو بەصرە! هەروەها چەند كاسێتێكیش كە یەكیان وتارێكی (سـید قوتـب)بوو، وە دوو سێیەكیان هی (شیخ عبدالحمید كشك) بوون، "خوا لێیان خۆش بێ"، هـەروەها یـەكێكیان هی قورئان‌و، یەكیشـیان سروودی ئایینی تێدابوو.

دیاره كاسێته‌كان له‌ عه‌لاگه‌یه‌ك دابوون‌و، نامه‌كانیشم خستنه‌ ژێر پارچه‌ فه‌رووه‌یه‌ك كه‌ به‌سه‌ر دژبوولْی سه‌یاره‌كه‌دا درابوو، سه‌یاره‌كه‌ش یان ڕاڤ بوو یان پاسێكی گچكه‌ بوو.

ئنجا كه‌ گه‌یشتینه‌ بازگه‌كه‌، سه‌ربازێك سه‌ركه‌وت‌و ته‌ماشایه‌كی كردین‌و یه‌كسه‌ر داوای هه‌ویه‌ی له‌ من كرد، به‌ئه‌قڵ به‌هۆی چڵكنیی جله‌كانم‌و شه‌كه‌تیی سه‌فه‌ره‌وه‌، هه‌ستی كرد كه‌ له‌ شوێنێكه‌وه‌ هاتوومه‌وه‌، پاشان عه‌لاگه‌كه‌ی لێوه‌رگرتم پرسیاری كاسێته‌كانی كرد، منیش گوتم: ئه‌وانه‌ كاسێتی قورئان‌و وتارو سروودی ئایینین!

ئه‌ویش یه‌كسه‌ر بانگی ئه‌وانی دیكه‌ی كرد، كه‌ هه‌ندێكیان پیاوانی ئه‌من (رجال الأمن) بوون، دیاره‌ منیش ترسێكی زۆرم لێنیشت، به‌ڵام هه‌وڵمدا پێمه‌وه‌ دیارنه‌بێ، ئیدی هاتن‌و منییان دابه‌زاندو به‌ تسجیل (مُسَجّلة)ی نێو سه‌یاره‌كه‌، ده‌ستیان كرد به‌ تاقیكردنه‌وه‌ی كاسێته‌كان‌و خوا كردی كاسێتی یه‌كه‌م قورئان بوو، وه‌ هی دووه‌م سروود بوو، ئنجا كه‌ گه‌یشته‌ ئه‌وانی دیكه‌، ته‌سجیل گوتی: ئیش ناكه‌م‌و هه‌رچه‌ندی هه‌وڵیاندا كاری نه‌كردو نه‌كرد، ئیدی به‌تووڕه‌یی یه‌كه‌وه‌ پێیان گوتم: سواربه‌وه‌ وه‌ ستایش بۆ خوا ده‌ربازبووم‌و، ئه‌گه‌رنا هه‌رده‌ستیان بۆ بن فه‌رووه‌ی سه‌ر دژبۆڵه‌كه‌ بردبایه‌، نامه‌كان ئاشكرا ده‌بوون‌و منیش خراپ گرفتار ده‌بووم، به‌ڵام خوای به‌ به‌زه‌یی ئه‌وجاره‌ش وه‌ك زۆرجاری دیكه‌، له‌ فریام هات‌و قوتاری كردم.

## ماره‌كردن‌و گواستنه‌وه‌ی هاوسه‌ری یه‌كه‌مم خاتوون مه‌لاژن :

پاشان كه‌ له‌ سه‌فه‌ری ئێران گه‌ڕامه‌وه‌، كه‌وتمه‌ مشوورخواردنی ماره‌كردن‌و گواستنه‌وه‌ی خاتوون ڕووخسارو، ئه‌وه‌بوو كه‌ له‌: (١/ ١/ ١٩٨٤)دا ماره‌م كرد و له‌ (٤/ ١/ ١٩٨٤)دا نیشانه‌كراو، له‌: (١٩/ ١/ ١٩٨٤)دا گواستمه‌وه‌و ژیانی هاوسه‌رییمان پێكه‌وه‌نا له‌ ڕانیه‌، هه‌ر له‌ ماڵی بابمدا، ئه‌و كاته‌ ئه‌و وه‌ك په‌رستار له‌ نه‌خۆشخانه‌ی ڕانیه‌ ده‌وامی ده‌كرد، منیش له‌ مزگه‌وتی: نه‌وره‌سیی مه‌لا بووم، به‌ڵام وه‌ك گوتم: ده‌وامی مه‌لایه‌تیم به‌و شێوه‌یه‌ تێدا نه‌ده‌كردو، مامۆستایه‌كی دیكه‌شی لێبوو، ئه‌وكاته‌ش نوێژی جومعه‌ به‌س له‌ مزگه‌وتی گه‌وره‌ی ڕانیه‌دا ده‌كرا، دیاره‌ كه‌متر له‌ مانگێك له‌ ڕانیه‌ ماینه‌وه‌و، پاشان گواستمانه‌وه‌ بۆ گوندی (سه‌رسیان) ئه‌ویش زیاتر به‌هۆی ئاشنایه‌تییم له‌گه‌ڵ ماڵی (مامۆستا مه‌لا سه‌ید

عبدالرحمن) لۆتەرییەوە، ئیمامو خەتیبی مزگەوتی: گوند، كە زۆر هاوكارو دەستبار گرێكی دڵسۆزمان بوون، خۆیو خێزانیو بابیو دایكی، خوا پاداشتیان بداتەوەو، هەرگیز سوپاسیان تەواو ناكەم، چونكە پاش ماڵ پێكەوەنانمانو یەكەم كۆچمان، كاڵەی غەریبیم لە ماڵی ئەواندا كرایەوەو، بۆخۆمو خێزانم كەلێنی بابو دایكوخزمو كەسیان بۆ پڕ كردبووینەوەو، ئەو نەجابەتو ڕێزو خانەدانییەی لەوانم بینیوە، لە كەم كەسم بینیوە، نەك هەر لەگەڵ ئێمەدا، بەڵكو لەگەڵ خەڵكو میواندا بەگشتیی، شایانی باسە ئێستاش مامۆستا مەلا سەید عبدالرحمن لە (حاجیاوا) هەر سەرگەرمی مەلایەتییو وتاربێژییە.

## ماڵ گواستنەوەمان لە شاری ڕانیەوە بۆ گوندی (سەرسیان):

كە چووین بۆ گوندی (سەرسیان) لە(بەری مەرگە) لەوێ خانوویەكمان گرتو پێش ئەوە ماوەیەك لە ماڵی مامۆستا مەلا سەید عەبدولڕەحمان لۆتەریی بووین، دوایی خانوویەكمان دۆزیەوەو لەوێ نیشتەجێ بووین، هاوسەریشم كە پەرستار بوو، دەوامەكەی گواستەوە بۆ ئەوێ.

ئیدی لە سەرەتای مانگی (٢)ی ساڵی (١٩٨٤)وە هەر لە(سەرسیان) بووم تا پاییزی (١٩٨٥) كۆتایی مانگی (٩)و سەرەتای مانگی (١٠) لەوێ ماینەوە، واتە: ساڵێكو هەشت مانگ.

ئنجا لەو ماوەیەدا كە لەوێ بووین، هەندێ شتی گرنگ هەبوون، پێویستە سەرو ئاماژەیان پێ بكەم:

## نووسینی كتێبی (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان):

یەكێك لەوانە كتێبی: (ئیسلام و ڕێچكان)م نووسی لەو سەروحەدەدا، كە لە سێ ئاڵقە پێكدێ: ئاڵقەی یەكەمی: (سەلماندنی بوونی خوا)، ئاڵقەی دووەمیان: (ئیسلام ئیسلامە، نە ئایدیالیزمە نە ماتریالیزم)، ئاڵقەی سێیەمیان: (ئیسلام ورياكەرەوەیە، نەك تلیاك).

ئاڵقەی یەكەمیان وتووێژێك بوو لە نێوان منو كوڕێكی كۆمەڵەی كوردستانی ڕۆژهەڵاتدا، لە چایخانەی حیكمەت لە شاری سەردەشت، وتووێژێكمان بوو، دەقی

وتوویژەكەم هێناوە، هی دووەمیان، وە هی سـێهەمیان دەقی ئەو دوو وتوویژەیە كە جارێكیان لەكاتی گەڕانەوەمدا لە بەردەڕەشەوە بەگوندەكانی: (زەڵێ)و (قاسمەڕەش) و (نێـوزەنگ)دا، كە یەك دوو شەو لێیان مامەوە، كە وەك پێشتر باسم كرد، ئەحمەدی كـوڕی خـاڵم كـە لـەوێ پێشمەرگەی یەكێتـی بوو، دوایی بەیەكەوە هاتین تا گوندی (قەڵاتووكان)، ئەو دوو وتوویـژە لەو سەفەرەمدا ڕوویانداوەو، بەشێكیان بەدەم ڕێگا بڕینـەوە بووە.

بەڵێ ئەو سـێ وتوویـژەم لـە سـاڵی: (١٩٨٤)دا نووسـین، بـەلام لـە سـاڵی (١٩٨٥)دا كتێـبـی: (ئیسلامو ڕێچكان) چـاپ كـرا، كـە دووەم كتێبـی چـاپ كـراوم بـوو، پێشـتر كتێبـی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسـلام) چاپكرا، كە ئەو كاتـە سـێ هـەزار نوسـخەمان لـێ چاپ كردو باش بلاوبووەوەو پێموایە سوودێكی زۆری بـۆ بەرچـاو ڕوونكردنـەوەی خـەڵك بەتایبەت توێژی گەنجان، هـەبوو، كتێبـی: (ئیسـلامو ڕێچـكان)یش (٥٠٠٠) دانـەی لـێ چاپكرا، (٢٥٠٠) هـەزار دانـەی تـەنها لـە سـلێمانی بلاوبـۆوەو فرۆشـرا، وە زۆر دەنـگو سەدایەكی باشی هەبوو، بەلام (یەكیـەتی نیشتیمانیی)و خەڵكی هەڵگری فیكری ماركسـیزم، ئەوكاتە زۆری پێ قەڵـس بوون، دیارە كتێبەكـە لـە فیكـری مـاددیی دەدا، وە باسـی ئیسـلام دەكات كە بەدیلەو تەنیا چارەسەرەو . . . هتد، دیارە ئەوانیش پێیـان ناخۆشـبوو، چـونكە، ئەوكاتە ماركسیزمو لینینیـزمو ڕێڕەوی چەپگەرایی لە گەرمەیدا بوو، لەیادمە ئەوكاتە لە ڕانیـە ژمارەیەك لەو كتێبەیان كڕیبوو لە كتێبخانەكەو لەنێو بازاڕ سـووتاندبوویان، شـایانی باسیشـە (یەكیەتی) ئەوكاتە لە موفاوەزەدابوو لەگەڵ ڕژێمـدا، لە ساڵانی (١٩٨٣)و (١٩٨٤)دا تـاكو لە(١٩٨٥)دا موفاوەزەكەیان هەڵوەشایەوە، دیارە (ئیسـلامو ڕێچـكان) لـە سـاڵی (١٩٨٧)دا سێ هەزار نوسخەی بۆ جاری دووەم لە شاری سەقز لـە چـاپخانەی (محەمـەدی) لـێ چـاپ كرایەوە، دواتریش لە ساڵی (٢٠٠٦)یشدا بۆ جاری سێیەم (٣٠٠٠) نوسخەی دیكەی لـێ چاپ كرا لە نووسینگەی تەفسیر، دەشتوانم بڵێم: زۆر كەس بـەهۆی ئـەو كتێبـەوە، خـوای پەروەردگار هیـدایەتی دانو وازیان لە ماركسیزم هێناو گەڕانەوە بۆ باوەشی ئیسـلام.

## نووسینی کتێبی: (گەورەترین ڕاستیی) :

هەروەها کە لە (سەرسیان) بووم کتێبی: (گەورەترین ڕاستیی)م نووسی، کە دوایی هەندێ لە بەشەکانی فەوتانو، ئەوەی کە مابوو لە ساڵی (٢٠٠٠) لە دووتوێی کتێبێکدا بەناوی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان: ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە)، چاپ کرا، وە لە ساڵی: (٢٠٠٨)دا خێرخوازێك جارێکی دیکە لە وڵاتی (چین) لەسەر ئەرکی خۆی چاپی دووەمی کردەوە، کە کتێبێکی (٥٠٠ – ٦٠٠) لاپەڕەییەو، یەکێکە لەو کتێبانەم کە زۆرم خۆ پێوە ماندوو کردوونو، زۆر بوارو لایەنی ئیسلامم پێ گرتوونەوەو، هەوڵمداوە بەپەرچی ژیرانەو زانستییانەی زۆر لەو تۆمەتو گومانانە بدەمەوە، کە ئاڕاستەی ئیسلام دەکرێن، چ لەبواری فیکرو عەقیدەو چ لە بوارەکانی دیکەدا.

## نووسینی کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی) :

هەروەها لە ماوەی ئەو یەك دوو ساڵەدا کە لە سەرسیان بووین، سەرگەرمی نووسینی کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی) بووم، کە دوایی چاپ کردنو بڵاوکردنەوەی تۆزێك دواکەوت، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە ماوەی چەند ساڵێك لە بەغداد لە فەرمانگەی چاودێریی (دائرة الرقابة) گیری خوارد، وێڕای بەرگی یەکەمی (گەورەترین ڕاستیی) هەتاکو سەرەنجام کاك خدر عەبدوڵلا قەرە، پاش هەوڵدانی زۆرو هاوکاریی هەرکام لە مامۆستا مەسعوود موحەممەد "خوا لێی خۆشبێ" و مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغیی "خوا پاداشتی بداتەوەو سەلامەتو سەرفراز بێ"، توانی کە هەردووکیانم بۆ بگێڕێتەوە، دوای ئەوەی کە ڕەفز کرا چاپ بکرێن.

دیارە دواتریش لە چاپی دووەمو سێیەمدا، چەند بەشێکم لێ زیادکردنو کتێبەکە فراوانتر بوو بەتایبەت بەشی چوارەم: (کوردایەتییو مسوڵمانەتیی لە ڕوانگەی ئیسلامییو عەلمانییەکانەوە)، کە لە (١٠) کورتە باس پێکهاتوە.

## وتارێکی ئاگریــن لە مزگەوتــی ئۆردوگـای (بنگــرد)دا :

لە ساڵی (١٩٨٤)دا رۆژێکیـان پرسـەیەك هـەبوو، یـان هـی مامۆسـتا مـەلا موحەممـەدی (یاخیانی) یان هی مامۆستا مەلا خـدری (خورخـورەیی) بـوو "هـەزار رەحمـەتیان لێبـێ"، هەردووکیان مامۆستای ریش سپی‌و بەناوبانگ بوون‌و، هەردووکیان لەو ماوەیەدا کە مـن لـە (سەرسیان) بووم کۆچی دواییان کرد، مامۆستا مەلا موحەممـەد کورەکەیشـی دوایـی ئیعـدام کرا، کاك مەلا عوسمان "هەزار رەحمەتیان لێبێ" لـە گەرمـەی تەعزیەکـەدا، ئـەو ئایەتانـەم خوێندەوەو تەفسیریشم کردن کە لە سەرەتای سوورەتی (البقـرة)دا خـوا باسـی مونافیقـەکان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: کەسانێك هەن لە خەڵکی کە دەڵێن: بڕوامان بە خواو بەرۆژی دوایی هێنـاوەو بـڕواداریش نـین. (بـە خـەیاڵی خۆیان) فێـڵ لە خواو لەوانەی بڕوایان هێناوە دەکەن، بەڵام تەنیا خۆیـان فریـو دەدەن، بـەس هەست ناکەن، دڵیان نەخۆشیی تێدایە، خوا نەخۆشییان زیاد بکات‌و سـزایەکی بەئێشیشـیان هەیە، بەهۆی ئەوەوە کە درۆ دەکەن، وە ئەگەر پێیان بگـوترێ: خراپـە لـە زەوییـدا مەکـەن، دەڵێن: ئێمە بەس چاکسازیی کارین، ئاگاداربن بەدڵنیاییـەوە هەرئـەوان خراپـەکارن، بـەڵام هەست ناکەن.

هەڵبەتە هۆی هەڵبژاردنی ئەو ئایەتانەش لەوکاتەدا ئەوەبوو کە کۆمەڵێك خـەڵکی بـەرپرس هاتن، گوتم: ئەوانە کێـن؟ گوتیان: ئەوە مودیری ئەمن‌و کێ‌و کێـن، لە پیاوانی ڕژێم.

ئنجا کە تەفسیریشم دەکردن، جاروبار ئاماژەشـم بـۆ دەکـردن، مـەجلیس زۆر قـەرەباڵغ بوو، زۆربەی خەڵك دەیانزانی کە لەگەڵ ئەوانمە، ئیدی وتاری خۆم داو، دوایی هاتمـەوە بـۆ سەرسیان، ماڵم لەوێ بوو، لە سەیارەکەدا مامۆستایەکم لەگەڵ سـوار بـوو، گـوتی: ئـەرێ کاکە ئەوە بۆچی ئەو وتارەتدا؟ کاکە ئەوە بۆ وات لێکردین!! گوتم: بۆچی؟ گـوتی: چـۆن

بۆچی؟ نە تۆ لێدەبوویەوە نەجاتم بێ، نە دیوار واوە دەڕۆی بێمەدەرێ، بەڕاستیی ئێمە دەترساین و گوتم: ئێستا ئێمەش بەتۆوە دەگرن! گوتم: جەنابی مامۆستا من هەرئاوا قسەدەکەم و، خۆیشت دەزانی ئەو ستەمکارانە چییان بەسەر گەلی ئێمەو خەڵکی عێراق بەگشتیی هێناوە، کەچی دەشیانەوێ بە مسوڵمان و دینداریشیان بزانین!!

## کوژرانی حاجی ئاغای سەرسیان "خوا لێی خۆشبێ":

حاجی ئاغای سەرسیان "ڕەحمەتی لێبێ"، بابی کاك حوسەین و کاك حاجی عەباس کە ئێستا لە هەولێرن، پیاوێکی ناودار بوو لە هۆزی (ترکە ڕەشە)، من بەهۆی ئەوەوە پاش هەولێ و تەقەللای مامۆستا مەلا سەید عەبدولڕەحمان لۆتەریی مامۆستای گوند، چوومە سەرسیان، ئەوکاتە حاجی ئاغا هەرچەندە چەکی ڕژێمی پێبوو، بەڵام ڕیش سپییەکی نێو خزمەکانی خۆی بوو و پیاوێکی ناسراو بوو، کێشەو دوژمنایەتیی هەبوو، لە ئەنجامی ئەوەدا "بە قەناعەتی خۆی" ناچاری چەك هەڵگرتن بوو بوو، ئیدی ڕۆژێکی گەرمی هاوین حاجی ئاغا خۆی و کوڕێکی و سێ کەسی دیکە، واتە پێنج کەس کوژران، لە ڕێگەی دووکان- بنگرد، جا من لەم ماوەیەدا {لە ساڵی (٢٠١٤)زدا} کاك حاجی عەباسی کوڕی بۆی گێڕامەوە گوتی: "مامۆستا! دەزانی ئەو ڕۆژە بابم دەچوو بۆ کوێ؟ گوتم: نەخێر، گوتی: ئەو ڕۆژە مودیری ئەمنی دووکان بەدوایدا ناردبوو بۆ مەسەلەی تۆ دەچوو، کە قسەیان لەگەڵ بکا"، وە بە پێی قسەی کاك حاجی عەباس لەسەری چوونیدا بووە، ئەوە بوو کە خەڵکێکی (یەکیەتی) بۆسەیان بۆداناو خۆی و کوڕەکەی و سێ نەفەری دیکەش کوژران.

ئیدی ئەو ڕۆژە پێنج جەنازە هاتنەوە بۆ سەرسیان، بۆ خەڵکی دێیەکە زۆر موسیبەتێکی گەورە بوو، ئێمەش لەوێ بووین، ئەوەبوو پێنج قەبر هەڵکەندران، ئنجا ئەو پێنج کەسە چۆن تەڵقین بدرێن؟ بەتایبەتیش کە کەشی هاوین بوو و سەرسیانیش هەر بۆخۆی وشك و گەرمە، تەڵقینی مامۆستایانیش پێی دەچوو! لێرەدا بەرلەوەی بابەتی چۆنیەتی تەڵقیندرانی ئەو پێنج جەنازەیە لەلایەن مامۆستای گوندەوە تەواو بکەم، بەپێویستی دەزانم کورتە باسێك لەبارەی تەڵقینەوە بخەمەڕوو:

# ڕوونكردنەوەیەك لەبارەی تەڵقیـندانی مردووانەوە

من ئەوساو ئێستاش قەناعەتم وایە كە ئـەو جـۆرە تەڵقیندانـەی مـردوو "كـە ئامۆژگـاریی مردوو بكرێ" نەك فەرز بگرە سـوننەتیش نیـە، وەك لـەوبارەوە لـە (مجمـوع فتـاوى شـيخ الإسلام ابن تيمية) ج٢٤، ص٢٩٧,٢٩٨دا هاتوە: {سئل شيخ الإسلام ابن تيميـة رحمـه الله هل يجب تلقين الـميت بعد دفنـه أم لا؟! فأجاب رحـمه الله يقـول: تلقـين الــميت بعـد دفنـه ليس واجبـاً بالإجـماع، ولا كان من عمل الـمسلمين الـمشهور بينـهم بعد عهـد رسـول الله "صلى الله عليـه وسلم" وخلفائه، بل ذلك مَأْثـورٌ عن طائفة من الصحابة، كأبي أُمامـة ووائلـة بن الأسقع، فمن الأئمة مـن رخـص فيـه كالإمـام أحـمد وقـد اسـتحبَّه طائفـة مـن أصـحابِهِ وأصحاب الشـافعي، ومـن العلمـاء مـن يكرهـه، لإعتقـاده أَنـه بدعـة، فـالأقوال فيـه ثلاثـة: الإستحباب، والكراهة، والإباحـة، وهذا أعدل الأقوال}.

پوختەی مانای قسەكانی ئەوەیە كە: تەڵقینـدرانی مـردوو پـاش نێـژرانی بـە یەكـدەنگیی زانایان پێویست نیـەو بگرە لە ڕۆژگاری پێغەمبـەر "صـلى الله عليـه وسـلم" و خەلیفەكانیـدا شتێكی باویش نەبووە، وە كۆی بیروڕای زانایانیش لەبارەی تەڵقینـەوە، ئەوەیـە كە هەندێك بە پەسەندو هەندێكیش بە ڕەوای دادەنێن و، هەشـیانە بەداهێنراو و خراپی دادەنێ.

وە لەڕاستیدا ئەوەی لەوبارەوە بەڵگەی لەسەرە تەنیا ئامۆژگاریی كردنـی زینـدووان و دوعـا كردنە بۆ مردوو، وەك (عثمـان بن عفان) "خوا لێـی ڕازی بـێ" گێڕاویەتـەوە: ﴿كان النبــي "صلى الله عليه وسلم" إذا فرغ من دفن الـميت وقف عليه وقال: استغفروا لأخـيكم وسـلوا له التثبيت فإنه الآن يُسْـأل﴾ أخرجه أبو داود (٢/٧٠)و الحاكم (٣٧٠/١) وصححه الحـاكم ووافقه الذهبـي، (أحكام الجنـائز وبـدعها)، ص١٩٨، لــمحمد ناصـرالدين الألبـاني، واتـە: پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسـلم" عـادەتی وابـوو كاتێـك لـە بەخاكسـپاردنی مـردوو

دەبۆوە، لەسەری دەوەستاو دەیفەرموو: داوای لێبوردن بۆ برایەکەتان بکەن‌و، داوای دامەزراویی "لە وەڵامدانەوەدا" بۆ بکەن، چونکە ئێستا پرسیاری لێدەکرێ.

بگرە هەندێك لە زانایان ئامۆژگاریی کردنی زیندووانیش لەکاتی ناشتنی مردوودا بە داهێنراو دەزانن! بڕوانە: (أحكام الجنائز)، لابن عثيمين، ص١٢١، ١٢٠، ط١/ ١٤٢٧، بەڵام زۆربەیان بە دروست‌و ڕەوای دەزانن، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە (البراء بن عازب) گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" لەکاتی ناشتنی مردوویەکدا ئامۆژگاریی مسوڵمانانی کردوە کە لەسەر گۆڕستانەکە بوون، وەك هەرکام لە أبو داود (٢/ ٢٨١) و الحاكم (١/ ٣٧ـ٤٠) و الطيالسي و ٧٥٣و أحمد (٤/ ٢٨٧) هێناویانەو، النسائي (١/٢٨٢) و ابن ماجه (١/٤٦٩)ش بەشی یەکەمیان هێناوە، بڕوانە: (أحكام الجنائز وبدعها)، لمحمد ناصرالدين الألباني، ص١٩٨ـ٢٠٢.

ئنجا ئەو دەقەش کە بۆ ڕەوایی‌و بگرە فەرز یان سوننەت بوونی تەڵقینداني مردووانیش بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، پسپۆڕانی فەرموودەناس بە ناڕاست (غير صحيح)ی دادەنێن، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: {اذا مات أحدٌ من إخوانكم فسويتم التراب على قبره، فليقم أحدكم على رأس قبره، ثم ليقل: يافلان ابن فلانة! فإنه يسمعه ولا يجيب، ثم يقول: يا فلان ابن فلان! فإنه يقول: أَرشِدْنا يرحمك الله ! ولكن لاتشعرون، فليقل: أُذكر ماخرجت عليه من الدنيا: شهادة أن لا إله الا الله وأن محمداً عبده ورسوله، وأنك رضيت بالله رباً، وبالاسلام ديناً، وبمحمدٍ نبيّاً، وبالقرآن إماماً، فإن منكراً ونكيراً يأخذ كل واحد بيد صاحبه ويقول: انطلق بنا ما يُقْعِدُنا عند من لُقِّن حُجَّتَهُ، فقال رجل: يارسول الله ! فإن لم نعرف أمه؟ قال يَنْسِبُهُ الى أمه حواء، فيقول: يافلان بن حواء} رواه الطبراني عن أبي أمامة، بڕوانە: نيل الأوطار ج٤، ص٩٠،٨٩.

کورتەی مانایەکەی ئەوەیە کە: هەرکات یەکێك مرد با پاش ناشتن‌و خۆڵ بەسەرداکردن، یەکێك لەمسوڵمانان لەلای سەری گۆڕەکەیەوە بوەستێ‌و بەناوی دایکی بانگی بکات‌و ئامۆژگاریی بکات، کە ئیمان‌و مسوڵمانییەتییەکەی خۆی، بێنێتەوە بیرخۆی لەبڕوا هێنان بەتەنیا پەرستراوێتیی خواو، بەرنامەیەتیی ئیسلام‌و، پێغەمبەرایەتیی موحەممەدو،

پێشەوایەتیی قورئان، ئیدی دوای ئەوە مونکەرو نەکیر "کە ناوی دوو فریشتانن" لە بەگیرهێنانو عاسێکردنی نائومێد دەبنو بەجێی دەهێڵن!!

هەڵبەتە زانایان ئەو دەقە بە فەرمووده دانانێن، وەك هەرکام لە: (النووي)، و (ابن قيم الجوزية) لە (زاد المعاد "ج١، ص٢٠٦")و (الصَّنعاني) لە (سبل السلام) "ج٢، ١٦١"و الألباني لە (سلسة الأحاديث الضعيفة: ٥٥٩)دا گوتوویانە، بڕوانە: (أحكام الجنائز وبدعها) محمد ناصرالدين الألباني، ص١٩٨.

ئەوە لە ڕووی سەنەدەوە، لە ڕووی نێوەڕۆك (متن)یشەوە، دیسان هیچ لەفەرموودەی پێغەمبەر "صلی علیه وسلم" ناچێ، چونکە:

١- لە هیچ دەقێکی سوننەتدا نەهاتوە، کە پێغەمبەر ئامۆژگاریی مردووانی کردبێ.

٢- بانگکردنی مردووەکە بە ناوی دایکییەوە، تۆمەتبارکردنی دایکیەتیی و تانەدانە لە ڕەچەڵەك (نسب)ی بابای مردوو، کە ئەوەش قەدەغەیەو سزای گەورەی لەسەرە!

٣- نەکیرو مونکەر وا وێنا کراون، کە لە مردووەکە بە بیانوونو هاتوون شەڕی پێ بفرۆشن!

٤- کەسێك بە زیندوویی لە قسەی خێرو ئامۆژگاریی بەهرەمەند نەبوونی، چۆن بە مردوویی سوود وەردەگرێ؟!

**ئنجا بێینەوە سەر ئەسڵی مەبەست:**

ئیدی بۆ چۆنیەتی زوو تەواوکردنی تەڵقینەکە، پێشنیارێکم بۆ مامۆستا مەلا سەید عەبدولڕەحمان (مامۆستای گوند) کردو گوتم: جەنابی مامۆستا! هەتا پێنج جەنازە تەڵقین دەدەی زۆری پێدەچێ، وەرە با من تەگبیرێکت بۆ بکەم: لەنێوان هەر پێنجیان بوەستەو یەکجار ناوی هەرپێنجیان بهێنەو تەڵقینی هەموویان بدە، بەوجۆرە بۆت کورت دەبێتەوە، ئیدی ئەوەبوو بەو شێوەیە تەڵقین دران.

## مشتومڕێکم لەگەڵ ئامیر سریەیەکی ڕژێمدا :

تەعزیەکەی حاجی ئاغا زۆر قەرەباڵغ بوو ، بە حوکمی ئەوەی ڕیش سپی عەشیرەتێك بوو و ناسراو بوو ، هەرچی سەرۆك عەشیرەت و ئەوانەی فەوجیان هەبوو ، هەموویان دەهاتن ، خەڵکی ناسراوی پشدەرو بیتوێن و سلێمانی و هەولێر ، ئنجا رۆژێك زۆر قەرەباڵغ بوو ، منیش هەندێ قسەم کردو وتارمدا ، کە لە قسانەکانم بوومەوە ، یەکێك کە دیارە سەر بە رژێم بوو ، پێموایە ئامیر سریە بوو گوتی : خۆزگە هەرکەسێك خومەینی خۆشدەویست گۆشاو گۆش سەری ببڕی! دیارە ئەوانەی کە لەوێ بوون خەڵکی سەرسیان و دەڤەرەکەش دەیانزانی کە من قسەی خۆم دەکەم و وەك دەڵێن : قسەم لە کەس نەدەخواردەوە ، منیش گوتم : جەنابت ناوت چییە؟ خەڵکەکە گوتیان : مامۆستا! ئەوە جەنابی کوێخا فلان کەسە ، کە ئێستاش ناوەکەم لەیادە ، بەڵام ناوەکەی نالێم ، خەڵکەکە مەبەستیان ئەوەبوو کە پیاوێکی بەڕێزەو ئاگات لێبێ! منیش گوتم : کاك فلان کەس ، نازناوی کوێخایەکەم لێ لابرد! گوتی : بەڵێ مامۆستا! گوتم : جارێ خومەینی هیچ پەیوەندیی بە ئێمەوە نیە ، بەڵام مەبەستت لەوە چییە کە دەڵێی : دەبێ هەرچی خومەینی خۆشبوێ گۆشاو گۆش سەرببڕێ؟ گوتی : مەبەستم ئەوەیە کە وڵاتی کوردستان ئاوا بۆردومان دەکات بە تەیارەو بە تۆپ و شەڕمان پێدەفرۆشێ ، گوتم : جا ئەگەر لەسەر قەسف و خەڵك کوشتن ، هەرچی خومەینی خۆش بوێ ، دەبێ گۆشاوگۆش سەری ببڕێ ، کە وەك تۆ گومان دەبەی ، من وانیم ، بەڵام ئەگەر لەسەر ئەوە بێ ، ئێستا جەنابت دەبێ بەو قاییش و قوروشەی تفەنگ و دەمانچەیەی خۆت ، خۆت بخنکێنی ، گوتی : بۆچی؟ گوتم : چونکە تۆ دیفاع لە ڕژێمێك دەکەی کە هەزار هێندەی خومەینی خەڵکی کوشتوە ، دیارە کوێخا هەر ڕەنگی پەڕی ، گوتم : ئنجا من ئەوە ئامۆژگارییتان دەکەم و ، باسی کەسم نەکردوە ، تەنیا ئایەت و فەرموودە دەخوێنمەوەو دەڵێم : دەبێ لەنێو خۆماندا تەبا بین و پێکەوە شەڕ نەکەین ، وە با بگەڕێینەوە بۆ ئیسلام و ڕێز لەیەکدی بگرین ، نەك هەر یەکەمان بەدوای ڕێچکەو بەرنامەیەك بکەوین و لەنێو خۆماندا تێکبەربین ، ئنجا ئایا قسەکانی من چ عیلاقەی بە خومەینییەوە هەیە؟ دیارە خەڵکەکەش قسەیان کرد و تۆزێ وەزعەکەیان خاوکردەوە .

## دیدار لەگەڵ نەقیب ئەنوەر مودیری ئەمنی ڕانیەدا

لەو ماوەیەدا دوای ئەوەی كە حاجی ئاغا وەفاتی كرد، ڕۆژێك كاك حوسەین و كاك حاجی عەباس كە ئیستا ماڵیان لە هەولێرەو هامووشۆمان پێكەوە هەیە، بەدوایاندان ناردم گوتیان: با مامۆستا بێ ئیشمان پێیەتی، كە چووم هەندێ میوانی لێبوون، نەمزانی كێن؟ گوتم: فەرموون! كاك حوسەین كاك حاجی عەباس، گوتیان: مامۆستا! ئەوە كاك نەقیب ئەنوەرە مودیری ئەمنی ڕانیەو، دوو كەسی دیكەشی لەگەڵ بوون گوتیان: ئەوانیش هەر هاوكاری ئەون، گوتم: فەرموون! گوتیان: هەر پێیان خۆش بوو جەنابت ببینن، {ئنجا لەم بەینەدا ﴿لە ساڵی (٢٠١٤)زدا﴾ كە سەردانی كاك حاجی عەباسم كرد، بۆی گێڕامەوە گوتی: مامۆستا! ئەو ڕۆژە نەقیب ئەنوەرو ئەوان هاتبوون بتگرن، بەڵام ئێمە گوتمان: شتی وا نابێ‌و عەیبدار دەبین، چونكە فلانكەس لەسەر قسەی بابمان هاتوە بۆ ئێرە، چۆن دەبێ لێرە بیگرن!! ئیدی گوتبوویان: دە باشە با هەر ببینین} .

ئنجا نەقیب ئەنوەرو دوو هاوەڵەكەی دەستیان بە قسەكردو گوتیان: پێمانخۆش بوو جەنابت ببینین‌و چاوەڕێش بووین سەردانمان بكەی، گوتم: حەیفێ من دەرفەتم نەبوو، نەقیب ئەنوەر گوتی: من هەر ئەو نەقیب ئەنوەرەم كە بیننیمیت لە ڕانیە، دیارە من تەركیزم لەسەری نەبوو، گوتم: ئایا جەنابت هەر ئەو نەقیبەی؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: دیارە دەرفەتی سەردانم نەبووە، گوتی: باشە ئێمە پێمانخۆشە دەعوەتت بكەین، گوتم: كەنگێ دەعوەتم دەكەن‌و چۆن دەعوەتم دەكەن؟ گوتی: بەمزووانە دەعوەتت دەكەین‌و زۆر پێمانخۆشەو بە درێژیی قسە دەكەین، دوایی لەنێو قساندا قسەیەكی بەدەستەوەدا، گوتی: من بەڕاستی مانگێكە نەقڵ كراوم بۆ بەغدا، بەس پێمخۆش بوو بە خزمەت جەنابت بگەم‌و بتبینم‌و پێكەوە دابنیشین، منیش وەك دەڵێن: زمانی خۆم گەست‌و گوتم: شەرت بێ وادیارە مانگێكە نەقڵ كراوەو لەسەر من وەستاوە، كە من وەك دەسكە گوڵی خۆی بەرێتەوە بۆ

بەغدا، تا ئەو گرفتە لەو ناوچەیـە نەهێڵێ! دیارە ئەوكاتە بەسەر خۆمم نەهێناو گوتم: باشـە، بەڵام من سەرقاڵیی و ئیشوكارم زۆرە، {ئنجـا شـایانی باسیشـە كـە مـن ئەوكاتـە بـە جـادەدا هامووشۆم نەدەكرد، یان بە بەلەمێ بە بەحرێدا هامووشۆم دەكرد، كە كاك عومـەری حـاجی مەلا، (كاك سەركەوت) كە ساڵانێك سایەقی سەیارەكەم بوو، وەكاك حەسەنی مامە شـەلە، كـە هـەردووكیان لەسەرسـیان بـوون، یادیـان بـەخێر، وەئێسـتاش هـەر بـرای دڵسـۆزو مشوورخۆرن، وەكاك حەمە بەگ لە گوندی (بۆسكێن) "خوا لێـی خۆشـبێ"، كـە بەلـەمیان هەبوو هاموشۆیان پێدەكردم، یان دەبوو بە پێیان بە شاخیدا هاتوچۆم كردبایە} بۆیـە مـودیری ئەمن گوتی: بیسـتوومانە بە جادەدا هاموشۆ ناكەی؟ گوتم: ڕاسـتە تۆزێـك پـارێز دەكـەم، گوتی: لەمەودوا پێویست ناكات خۆت ئەزیەت بدەی‌و دەبێ بەسواری سەییارەو بـە جـادەی ئاساییدا بێی، منیش گوتم: ئەدی ئەگەر مەجالم نـەبێ؟ یـەكێكیان دیـار بـوو نـەزان بـوو، گوتی: نا دەبێ هەر بـێی، گوتم: یانی هەر پێویسـتە بێم؟ ئنجا ویستی هەڵەكەی زمانی پینـە بكات‌و گوتی: بەڵێ بەڵێ، بەڕاستی ئێمە ئەوەندە موشـتاقین بـۆ دیـتنی جـەنابت زۆر پێمـان چاكە هەر بێی، لە دڵی خۆمدا گوتم: وەڵامەكەم وەرگرت! ئنجا پـێش كۆتـایی قسـەكان‌و پێش هەڵسان گوتیان: بێگومان جەنابت دێی؟ یەكێكیان لەجیاتی من گوتی: شێخ كە وەعدی دا دەیباتە سەر، گوتم: بەڵێ بەڵێ خەمتان نەبێ لە دڵی خۆمـدا گـوتم: مـن وەعـدم نـەداوەو خۆتان لە جیاتی من قسە دەكەن، وە ئەگەر بە وەعدیشی بزانن، ئەوە یەكەمجارو دواجار دەبێ، كە وەعد جێبـەجێ ناكەم، چونكە دەمزانی تەڵەیە دایاننابوو، ئیدی ئەوە بوو بۆ ئەوەی وەعـدە خیلاف نەبم، هەركە ئەوان ڕۆیشتن، چوومە لای كـاك حـاجی عـەباس‌و كـاك حوسـەین، گوتم: چۆنی تێدەگەن؟ كاك حوسەین گوتی: مامۆستا! جا چۆنی تێدەگەین، كاكـە بـەخوا ئەمانیان نیە! گوتم: كاك حاجی عەباس تۆ چۆنی تێدەگەی؟ حاجی عـەباس گـوتی: بـەخوا مامۆستا دیفاعت لێدەكەین، ئەگەر نیەتیشیان خراپ بێ! منیش گوتم: كاك حـاجی عـەباس ئەو چەكانەی پێتـانن هی كێن؟ هی ڕژێم نین؟ گوتی: با، گوتم: ئەدی چـۆن چـەكێ ڕژێـم پێیدابی دەتوانی بەرانبـەر خۆی شەڕی پێبكەی؟ ئیـدی سـەرەنجام خـوا هـەڵناگرێ گوتیـان: مامۆستا! بەڕاستی ئێمە زەمانەتیی تۆمان پێناكرێ، تۆ خۆت چۆنت پێ چاكە، وابكە، ئـەوە

بۆخۆت حاڵەکە دەبینی، گوتم: کاکە سوپاستان دەکەم مـن لێـرە دەڕۆم، ئیـدی چـوومەوە گوتم: خاتوون مەلاژن ئێرەیشمان لـێ تێکدەچێ، گـوتی: چـۆن؟ گـوتم: حـاڵ‌و واقیـع ئاوایە، ئیدی کتێبەکانم بە ماڵاندا بڵاوکردنەوەو، کەلوپەلەکانمان بڵاوکردنەوەو بە هاوسەرمم گوت: تۆ بچۆ ماڵێك‌و بۆخۆیشم نەفەرێکم ڕاسپارد گوتم: بۆ ئەوەی وەعدە خیلاف نـەبم، کاك تەهام ڕاسپارد، (حاجی تەهای حاجی زاهیر) یـادی بـەخێر، ئێـوارە کاتـژمێر چـواریان دانابوو ڕۆژی جومعە، گوتم: تەلەفۆنێکیان بۆ بکە، بلێ: فلانکەس ئیشـێکی زەروری بـۆ پەیدابووەو ناتوانێ بێ بۆ مەوعیدەکەی، دیارە کاك تەهاش منداڵێکی ڕاسپاردبوو تەلەفۆنی بۆ کردبوون، ئەوانیش زۆر تووڕە بووبوون‌و گوتبوویان: چۆن نایەت، ئێمە لێـرە چـاوەڕێیین؟ ئەویش تەلەفۆنەکەی داخستبووەوە، ئیدی ئاوا بەو شێوەیە پاش ساڵێك‌و هەشت نۆ مـانگ لـە گوندی سەرسیانیش هەڵقەناین‌و ڕوومان کردە گوندی گەڵووی ماخۆبزنان لە دەڤەری پشدەرە ڕەقە، پاش لەیەك تێگەیشتن (تفـاهم) لەگـەڵ کـاك عـەبباس بـایز بـاڵوو ئاغـا، کـە ئـەوەش بەسـەرهاتێکی دیکەیـەو دوایـی باسـی دەکـەم، بـەڵام دوای ئـەوەی چـەند بەسـەرهات‌و بیرەوەرییـەکی ئـەو سـاڵێك‌و هەشـت نـۆ مانگـەی کـە لـە دێ‌ی سەرسـیانی بـەری مەرگـە گوزەرانـدمان، دەگێڕمـەوە، کـە پێموایـە هـەم دەرس‌و پەنـدیان لێـوەردەگرین‌و، هـەم بەرچـاوڕوونیی زیـاتریش لـەبارەی ژیـان‌و تەمـەنی بەنـدەو ئـەو قۆنـاغ‌و هەلومەرجـەی ئـەو ڕۆژگارەوە، بەخوێنەرانی بەڕێز دەبەخشن.

هەڵبەتە وەك عادەتی خۆیشم هەرشتێك بەتەواویی لێی دڵنیـا نـەبم‌و، بـە ڕوونیـی لـەیادم نەمابێ نایگێڕمـەوە، بەڵام بێگومان تەنیا خوای پەنهانزان (عالم الغیب)یشـە کـە هیچـی لـێ ون‌و پەنهـان نیـە.

# كـوژرانی مامۆسـتا مەلا عومـەری تیمـار و كـۆبوونەوەی مزگـەوتی گـەورەی چـوارقورنـە

لـە شـەوی ٢٠/ ٢١ـ ٦ـ ١٩٨٤ زدا مامۆسـتا مـەلا عومـەری ئیمـامو خـەتیبی گونـدی (تیمار)ی نیزیك ناحیەی (سورداش)ی سەر بـە قـەزای (دووكـان) لەلایـەن پێشـمەرگەیەكی یەكیەتییـەوە بـەناوی (عومـەر حەمـە كاكی)یـەوە بـە ناهـەق كـوژرا "خـوا بـە شـەهیدی وەرگرتبێ، كە ئەوكاتە تەمەنی مامۆسـتا مەلا عومەر (٣٢) ساڵ بوو، چونكە لەدایك بـووی ساڵی (١٩٥٢) بوو.

شایانی باسیشە كە بابی مامۆستا مەلا عومـەریش، مامۆسـتا مـەلا مستەفا كـە بـە ئەسـڵ (پەڵكۆیی) بوو، وێڕای زیاتر لە (٢٠) كەسی دیكەی خەڵكی (سەروچاوە)و دەوروبـەری لـە نیزیك گوندی (ترشاوا) لەلایەن سوپای ڕژێمـی عێراقـەوە لـە سـاڵی (١٩٦٥)دا كـوژراوە، "خوا لێی خۆشبێ" و بە شەهیدی وەرگرتبێ.

ئنجا ئێمەی مامۆستایانو خەڵكی ئیسـلامیی هۆشیار، لە كاردانەوەی كـوژرانی مامۆسـتا مەلا عومەردا "خوا لێی خۆشبێ" هەڵساین بە سازدانی كۆبوونەوەیەكی فراوانی مامۆستایانو خـەڵكی دڵسـۆزو هۆشـیاری ئیسـلامیی لـە مزگـەوتی: گـەورەی (چـوارقورنە)دا، لـە ڕۆژی: (٢٧ی ڕەمـەزانی ١٤٠٤)ی كۆچـی، بەرانبـەر (٢٦/ ٦/ ١٩٨٤)ی زایینـیو ژمارەیەكی زۆرو بەرچاو لە مامۆستایانو دڵسۆزانی ئیسلام لەو كۆبوونەوەیەدا بەشـداربوونو كۆبوونەوەكە جۆشو خرۆشێكی تایبەتی هەبوو، چـونكە پـێش مامۆسـتا مـەلا عومـەریش چـەند مەلایەكی دیكەش بەو شێوەیە لەلایەن ناحەزانی ئیسـلامەوە ڕەشـەكوژ كرابوون!

شایانی باسیشە سەرەتا بكوژی مامۆستا نەزانرابوو، بەڵام زۆربـەی خەڵكەكـە قەناعـەتیان وابوو كە دەستی (یەكیەتی نیشتیمانیی) تێدایە، چونكە گونـدی تیمـار لـە پـاڵ سـەركردایەتی

یەکیەتی یەوە بـوو لـە سـورداش، وە ئەوکاتـەش یەکیـەتی زۆر دژایـەتی تـەوژمی ئیسـلامیی دەکرد، بەڵام دوایی بکوژ کەشف بوو، کـە ئـەوەش وردەکارییـەکی هەیـە، کـە وەك کـوڕە گەورەی مامۆسـتای شەهید (کاك عبدالقادر) هەواڵی پێدام لە دوو توێی کتێبێکـدا کە لەبارەی باییـەوە سەرگەرمی نووسین و چاپکردنیەتی، باسی دەکات.

دیارە دواتریش لەڕۆژی: (١/ ٥/ ١٩٩٥) کاك (مسـعود)ی کوڕی مامۆستای ڕەحمەتیی لە (پیرەمەگروون) بکوژەکەی بابی کوشـتەوە، بەڵام پاش تەسلیمبوونی بە گفت و بـەڵێنی ئـەوە کـە مـادام تۆڵـە بـە تۆڵەیـەو ناکوژرێتـەوە، لـە (٣/ ٥/ ١٩٩٥) واتـە: دوو ڕۆژ پـاش خۆبەدەستەوەدانی، جەنازەکەی لە چـۆڵاییەکی دەرەوەی شـاری سـلێمانی دەدۆزرێتـەوە، بەپێی زانیارییەکانی کاك عبـدالقادر کوڕە گەورەی مامۆستای شـەهید.

ئەو مامۆستایانەش کە لەو کۆبوونەوەیەدا وتاریان هەبوو "وەك لە یادم مابێ" ئەمانە بوون، بەڵام جگە لە مامۆستا (ملا عثمـان عبدالعزیز) کە یەکەمین وتـار هـی ئـەو بـوو، ڕیزبەنـدیی ئەوانی دیکەم لە یـاد نیـە:

١- مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز "خوا لێی خۆشبێ".
٢- مامۆستا مەلا محمدأمین چۆم حەیدەریی "خوا لێی خۆشبێ" بابی کاك دکتۆر جەواد.
٣- مامۆستا مەلا محمدی دەڵگەیی.
٤- مامۆستا مەلا عەلی عبدالعزیز "خوا لێی خۆشبێ".
٥- مامۆستا مەلا عبدالفتاح وەرتەیی "خوا لێی خۆشبێ" بابی کاك مەلا نعمـة الله.
٦- مامۆستا مەلا علی بیـارەیی "خوا لێی خۆشبێ".
٧- مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانەقا (ڕیش) "خوا لێی خۆشبێ".
٨- مامۆستا مەلا عبدالرحمن گەنـاویی "خوا لێی خۆشبێ".
٩- مامۆستا مەلا ئەحمەدی سکتانیی (قاضـي) "خوا لێی خۆشبێ".
١٠- عەلـی باپـیر

دیاره ئێستاکەش (٦ی شوال ١٤٣٤) بەرانبەر (١٣/ ٨/ ٢٠١٣) لەو (١١) دە کەسە کە وتاریاندا بە مامۆستا عبدالرحمن نورِسیشەوە، کە عەریف حەفل بوو، تەنیا چوارمان ماوین: مامۆستا مەلا محمدی دەلگەیی و مامۆستا عبدالرحمن نۆرِسیی و مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانەقا[1] و بەندە، .

وە ئەوانی دیکە هەموویان چوونەتە عالەمی بەرزەخ، "خوا لێیان خۆشبێ" .

کاك حاجی عبدالرحمن ناسراو بە (نورِسیی)یش عەریف حەفل بوو و، بە ئایەتەکانی قورِئان و کۆپلە شیعری گونجاو، هێندەی دیکە کۆرِەکەی گەرمتر کردبوو .

دیاره مامۆستایەکان لە وتەو وتارەکانیاندا شتی زۆر گرنگیان باسکرد، منیش لە وتارەکەمدا چەند شتێکی گرنگم باسکرد "کە بریارە کاك عبدالقادر دەقی وتارەکان یان پوختەکەیان لە کتێبەکەیدا بێنێ" کە یەکێکیان بریتی بوو لە بەرپەرچدانەوەی قسەی یەکێك لە مامۆستایەکان، کە پێمواببوو بە پاڵنەری حیزبیی و سیاسیی کردی، کە ویستی تۆمەتی کوشتنی مامۆستا بخاتە ئەستۆی کەس و لایەنێکی دیکەی غەیری کەس و لایەنی بکوژەوە!

هەروەها جەختیشم لەسەر بێ باکیی لە مردن و کوژران و ئازار دیتن لەرِێی خوادا کردەوەو، ئەم شیعرەی (أبو العتاهية)م هێناوە کە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| فليتك تحلو والحياة مَريرة | وليتك ترضى و الأنام غضابٌ |
| وليت الّذي بيني و بينك عامر | وبيني و بين العالمين خراب |
| إذا صحّ منك الودّ فالكلّ هيِّنٌ | وكل ما فوق التراب تراب |

کە دیاره لەگەڵ خوادا "عزّ وجلّ" دەدوێ و دەڵێ: خۆزگە تۆم لە دڵدا شیرین بووایەی و ژیانم تاڵ بووایە، وە خۆزگە تۆم لێ رِازی بی و با خەڵکی توورِەبن!

وە خۆزگە نێوانم لەگەڵ تۆش خۆشبێ و، با لەگەڵ جیهانییاندا نێوانم تێکچێ!

---

١) دواتر مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانەقاش لە ساڵی (٢٠١٤)دا، کۆچی دوایی کرد، خوا لێی خۆشبێ.

ئەگەر بەڕاستی تۆ خۆشت بوێم، ئەوی دیكە هەمووی ئاسـانە، وە هەرچی لەسەر گڵ بێ هەر گڵــە!

وە وتارەكەم بوو بەهۆی زیاتر بەرزبوونەوەی حەماسەت و دڵگەرمیی مامۆستایان.

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ كە كۆبوونەوەی مزگەوتی: گەورەی چوارقوڕنە لە (٢٧)ی مانگی ڕەمەزانی سـاڵی (١٤٠٤)ك بەرانبـەر (١٩٨٤ز)دا سـەداو دەنگدانەوەیـەكی گـەورەی هەبوو، وە سڵەماندنەوەیەكی باشیش بوو بۆ هەموو ئەوانەی نیازو نەخشـەو پیلانـی كوشـتنی مامۆستاو بانگخوازانی دیكەشیان هەبوو، كـە بـەپێی زانیـاریی یـەكانی ئەوكاتـە، لیسـتێكی ئامادەكراو هەبوو، وە بەندەو چەند مامۆستایەكی دیكەش ناویان لەو لیسـتەدا تۆمـاركرابوو، دیارە كوردەوارییش ڕاستیان گوتوە: مست لە درێشە دەگەڕێتەوە!

## لەدایكبوونی یەكەمیـن منـداڵ (نۆبـەرە)مان :

لە كۆتایی مانگی (١٠)ی ساڵی (١٩٨٤)دا كچێكمان بوو ناومـان لێنـا (بەسـۆز)، وە بـۆ یەكەمین جار لەگەڵ خاتوون مەلاژنی هاوسەرمدا بووینە باب‌و دایك‌و، ئەزموونێكی دیكـەی ژیانمان هاتەپێش.

هەڵبەتە بۆ هاوسەرم منداڵ بەخێوكردن ئەزموونێكی ئاسان نەبوو، بەڵام وردە پێیـەوە ڕاهـات‌و لەلای ئاسان بوو، منیش جاروبـار بـەپێی دەرفـەت‌و بۆلـوان هاوكـارییم دەكـرد، هەرچـەنـدە كەمتریش لەماڵـەوە دەبووم‌و، ئەگـەر لەماڵـەوەش بوومایــە كـەم وابـوو میـوانم لەلا نەبن.

جارێكیان بەسۆز خانمـان چـقڵی گوڵەبـەڕۆژەی لـە پێڵـووی چـاو هەڵچـەقیبوو، چـاوی ئاوسابوو، دایكـی نەیـدەزانی چییەتی، وایـدەزانی چاوئێشـەیەتی، منداڵـەش یـەك چـریكە دەیزیڕاندو بێدەنگ نەدەبوو! منیش گـوتم: خـاتوون مـەلاژن! پـێم وانیـە چاوئێشــە بـێ‌و، پێموایـە شتێك چۆتە چاویـەوە، ئنجا كە لێم وەرگرت‌و بەدەست پێڵووی چاویم لێككردەوە،

تەماشام کرد چـقڵی گوڵەبـەڕۆژەی تێچـەقیوەو بـەخوێنی داهێنـاوە، ئیـدی کـە دەرمــهێنا، منداڵەکە سرەوت و قیـژەو چریکەی نەمـا .

## دەرسی تەفسـیـر گوتنــەوە بە کۆمەڵـە مەلایەك لە گونــدی قەرەتەپــە :

هەر لەو ماوەیەدا کە لە سەرسیان بووین، چەند دەرسـێکی تەفسـیرم بـە کۆمەڵـە مەلایـەك دەگوتەوە کە لە گوندەکانی ئەو دەڤەرەدا مامۆستا بوون، لـە مزگـەوتی: گونـدی (قەرەتەپـە) کۆدەبوونەوە، کە ئەوکاتە مامۆستا مەلا طیـب لـەوێ مـەلابوو، دیـارە نـاوی ژمارەیـەك لـەو مەلایانەم لەبیرەو، ئەمە ناوی نۆ کەسیانە، کە کـاك حـاجی مـەلا سـەید ابـراهیم نۆڵچـکەیی هەندێکیانی وەبیر هێنامەوە:

١- کاك مەلا سید إبراهیم نۆڵچکەیی.

٢- کاك مەلا إسماعیل دۆڵەگۆمیی.

٣- کاك مەلا حسین صۆفیانیی.

٤- کاك مەلا عوسمان کوڕی مامۆستا مـەلا محمـد یاخیـانیی، کـە دواتـر ڕژێمـی بـەعس ئیعدامی کرد، "خوا بە شەهیدی وەرگرتبێ".

٥- کاك مەلا محمدی خانەڵێ بەئەسڵ صۆفیانیی.

٦- کاك مەلا سید عبدالله لۆتەریی، کە ئیمامو خەتیب بوو لە گوندی (مەمەنداوە).

٧- کاك مەلا موستەفا کوڕی مامۆستا عبدالقادری دیلێژەیی، کە ئیمامو خـەتیبی گونـدی (دێلیژە) بوو.

٨- کاك مەلا شێخ محی الدین کوڕی شێخ ئەمین لۆتەریی.

٩- مامۆستا عبدالرحمن شێخ محمود لۆتەریی، کە لەسەر گردی (ڕەمکان) شەهیدبوو.

شایانی باسە جوزئی (عـمّ)ەو هەندێك لە جوزئی (تبارك)یشمان خوێند، وەك کاك حاجی مـەلا سـید ابـراهیم نۆڵچـکەیی باسـی کـردو گـوتی: ئێسـتاش دەستنووسـی دەرسـەکانمان هەرماوە.

## دەرس گوتنـەوە بە چەنـد گەنجێـك لە سـەرسـیان :

هەروەها هەر لەو ماوەیەدا (١٩٨٤ و ١٩٨٥) دەرسی قورئانو تەفسیرم بە چـەند گـەنجێك دەگوت، کە ئاستو تەمەنیان جۆراوجۆر بوون، کە ئێستا ناوی هەندێکیانم لەبیرە :

١- مامۆستا عبدالرحمن شێخ محمود لۆتەریی، کە لەسـەر گـردی ڕەمکـان شـەهید بـوو لـە جەنگی قەلاتووکان لە ساڵی (١٩٨٨)دا .

٢- کاك مەلا عبداللە خدر عثمان، کە ئێستا مەلایە لە حاجیاوا .

٣- کاك حسن حسین مامە شەلە .

٤- کاك عمر حاجی مەلا (سەرکەوت) .

٥- کاك عبداللە عبدالرحمن أحمد (کوڕی مامۆستای گوند) .

## وتاردانی هەینـی لە سـەرسـیانو گوندەکانی دەڤـەری بەری مەرگـە :

هەر لەو ماوەیەدا جاروبار لە سەرسیان لەجیاتی مامۆستا مەلا سید عبدالرحمن ئیمامی گوند لەسەر داوای خۆی وتاری جومعەم دەداو، جارجارەش لەلایەن هەندێك لـە نوێژخوێنانـەوە، لەسەر هەندێك قسەوباس پرتەو بۆڵەش پەیـدادەبوو، هـەروەها لـە دێیـەکانی ئـەو دەڤـەرەش وەك : بـەردەکۆز، قەرەتەپـە، مەمەنـداوە، دێلیـژە، نۆڵچـکە، لۆتـەر، بنگـرد، مەرگـە.... جاروبار وتاری جومعەم دەدا .

## مشـتومڕم لەگەڵ مام حاجی مەحموددا لەسەر نەخوێندنی سووڕەتی فاتیحە:

ڕۆژێکیان من پێش نوێژییـم کرد، پێم وایە نوێژی ئێوارە (عصر) بـوو، دیـارە تەسـبیحاتم کرد، بەلاّم بەپێچـەوانەی عادەتی زۆربەی مەلایەکـانی ئـەو کـاتەوە، سـووڕەتی فاتیحـەم هەدیە نەکـرد!

مام حاجی مەحمود کە نوێژکەرێکی باش بوو، "خوا لێی خۆشبێ" گوتی: ماموٚستا! ئەوە بۆچی فاتیحـەت نەخوێند، ئەو خێرە گەورەیەت لە کیس دایــن؟

منیش گوتم: ئاخر مام حاجی مەحمود سوننەت نیەو، بۆیـە نەمخوێنـد چـونکە پێغەمبـەری خوا "صلى الله عليه وسلم" لەوکاتەدا فاتیحەی نەخوێندووەو، ئەو زیکرانەی دیکەی کردوون کە من کردمن: سبحان الله، الحمدلله، الله أكبر....!

ئەویش گوتی: ئاخر من بەڵگەت بۆ دێنمەوە!

گوتم: فەرموو، بەڵگەت چییە؟

گوتی: بەڵگەم ئەوەیـە کە تۆ ئەگەر (گـا) یەك سەرببڕی‌و بیکەیـە خێـر، ئەوپـەڕی بەشـی (٧٠ ـ ٨٠) ماڵ دەکات، بەڵام فاتیحـە دەتوانی بۆ هـەموو ئۆممەتی بنێری!

منیش گوتم: ئنجا مادام وایە مام حاجی مەحمود بۆچی شتێکی دیکـەش ناکـەی؟ گـوتی: چی؟

گوتم: هەرچەندە خواو پێغـەمبەر "صـلى الله عليـه وسـلم" نوێـژی بەیانیـان تـەنیا دوو ڕکات داناوەو، هی شێوان سێ ڕکاتەو، هی نیوەڕۆو ئێــوارەو خـەوتنانیش چـوار چـوار، بەڵام تۆ تاکو خێرت زیـاتر بێ، ڕکاتەکانیان زیاد بکــەو، با هی بەیانی چوار ڕکاتەو، هـی شێوان پێنجەو، ئەوانی دیکەش شـەش یان حەوت ڕکات بن!

گوتی: ئاخـر ئەوە دروست نیـە!

گوتم: بۆچی؟

گوتی: چونکە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" وای نەکردوە!

گوتم: دەجا بەهەمان شێوە پێغەمبـەری خوا "صلى الله عليه وسلم" سوورەتی فاتیحەشی لەگەڵ زیکرو تەسبیحاتی دوای نوێژە فەرزەکـان نەخوێندوە!

دیارە حاجی مەحمود بێ قســە بوو، بەڵام گوتی: بەخوا هەتا لە حەوت مـەلایان نەپرسـم قەناعەت ناکـەم!

ئەوەبوو ڕۆژێك ماڵی مامۆستا مەلا سید عبدالرحمن کە هەمیشە میوانیان زۆربوون، هەشت نۆ دەیەك لە مامۆستایانیان میوان بوون، کە یەکێکیان مامۆستا مەلا طیب بوو ئیمامی گوندی قەرەتەپە، کە ئێستاش لە حاجی ئاوا ئیمامو خەتیبە، مام حاجی مەحمودیش پرسیاری لێکردنو گوتیشی: گوتوومە لە حەوت مەلایان دەپرسم.

(مامۆستا مەلا طیب)یش گوتی: بەخوا حاجی مەحمود! لە حەفتا مەلاش بپرسی، هەر قسەی فلانکەس ڕاستە!

ئەویش گوتی: ئەدی مادام وایە، بۆچی ئێوە فاتیحە لەگەڵ زیکرو تەسبیحاتدا دەخوێنن؟! وەك بێتەوە یادم.

مامۆستاش گوتی: ئەوە شتێکە زۆربەمان عادەتمان پێوە گرتوە.

# باسێك لەبارەی گەیشتنو نەگەیشتنی خێر و پاداشتی قوڕئـان خوێنـدن بە مردووەوە

شـایانی باسیشـە زانایـان لـە گەیشـتنو نەگەیشـتنی خێـرو پاداشـتی خوێنـدنی قورئانـدا بەمردووان، بەگشتیو بەتایبەت سوورەتی فاتیحە، ڕاجیایی یان زۆرە، بـەڵام جێـی سـەرنج ئەوەیە کە بەپێی ڕای باوی مـەزەبی شـافیعیی، خێـرو پاداشـتی قورئـان خوێنـدن بـە مـردوو ناگات، کەچی خوێندنی فاتیحەش بۆ مردووان لەنێو مەلایانی کوردستاندا زۆر باوە!

(النـووي) لەوبارەوە –کە خێر و پاداشتی قورئانخوێندن بە مـردوو ناگـات ـ گوتوویـەتی: (والـمشهور في مذهبنـا – أي مذهب الشافعي ـ أنَ قراءة القرآن للميت لايَصِلُهُ ثوابها، وقـال جـماعة من أصحابنا يصـله ثوابُها و به قال أحـمد) شرح صحيح مسلم،ج٧ ، ص٩٠.

واتە: ئـەوەی بـاوە لـە مـەزەبی ئێمـەدا – یـانی مـەزەبی شـافیعیی ـ ئەوەیـە کـە پاداشـتی قورئانخوێندن بە مردوو ناگات، وە کۆمـەڵێك لـە هاوەڵانمـان گوتوویانـە دەگـات، هـەروەها ئەحمـەدیش وای گوتوە.

شایانی باسیشە ڕای زۆربـەی زانایـان ئەوەیـە کـە قورئانخوێنـدن پاداشـتەکەی بـە مـردوو دەگات، وە ئەمە ڕای: (أبوحنيفة و أحمـد و بعض أصحاب الشافعي و غيرهم)ە، بەڵام ڕای باو لە مەزەبی (مالك و شافيعى)دا ئەوەیە کە پێی ناگات، بڕوانە: الجامع في الفقه الإسـلامي، ج١١، ص١٩١، د.عبدالكريم زيـدان.

(إبن تيميـة)ش لەوبـــارەوە کە پاداشتی هەر خێـرو چاکەیـــەك کـە بـۆ مـردوو دەکـرێ ـ قورئانخوێندنو غەیری ئەوەش ـ پێی دەگات، گوتوویەتی:

(فلا نزاع بين علماء السـنّة و الجماعة فـي وصول ثـواب العبـادات الــمالية كالصـدقة و العتق، كما يصل إليـه أيضاً الدعاء و الإستغفار و الصلاة عليه صـلاة الجنـازة و الـدعاء عنـد

قبره، وتنازعوا في وصول الأعمال البدنية كالصوم و الصلاة و القراءة، والصواب أنَّ الجميع يصل إليه) مجموع الفتاوى، ج٢٤، ص٣٦٦.

واته: وه لەنێو زانایانی سوننەت‌و جەماعەتدا ناكۆكیی نیه، كه پاداشتی خواپەرستییه داراییەكان، وەك بەخشین‌و ئازادكردن، دەگاته مردوو، هەروەها دوعاو داوای لێبوردن بۆكردن‌و نوێژ لەسەركردنی جەنازەو، پاڕانەوه لەلای گۆڕەكەی پێی دەگات، بەلام لەبارەی گەیشتنی (پاداشتی) كردەوه جەستەییەكانی وەك: ڕۆژوو و نوێژو قورئان خوێندن، ناكۆكییان هەیه، بەلام ڕای ڕاست ئەوەیه كه هەمووی پێ دەگات.

دیاره منیش ڕام وایه كه هەرچی بۆ مردوو به دیاریی‌و به دڵێكی ساغ‌و ڕاستەوەو، بەبێ بەرانبەر بۆ مردوو بنێررێ، پێی دەگات، جگه له نوێژ كه پێم وانیه هیچ بەڵگەیەكی لەسەر بێت كه دروست بێ بۆ مردوو بكرێ.

## ژیان‌و گوزەرانێكی سادەو سەخت:

ئەو ماوەیەی له سەرسیان بووین ژیان‌و گوزەرانمان زۆر سادەو سەخت بوو، با لەوبارەوه دوو قوڵه نەزیله بگێڕمەوە:

١- ڕۆژێكیان وەك عادەت، چێشتی ساوارمان هەبوو، بەلام بەبێ شلەو زەلاتەو هەر شتێكی دیكەش، منیش كه هاوسەرم نانەكەی دانا لەبەرخۆمەوه گوتم: ئای بۆ تۆزه ماستاوێك لەگەڵ ئەو ساوەرەدا! دیاره مەبەستم نەبوو پەیدابكرێ، بەلام هەروا لەبەرخۆمەوه خۆزگەم پێ خواست، ئنجا هاوسەرم "بەڕەحمەت بێ"، دوو سێ دەقیقە دیار نەماو، كه هاتەوه پەرداخە ماستاوێكی پێ بوو، منیش لێم پرسی، ئەوەت له كوێ بوو؟ گوتی: چوومه ئەو ماڵه دراوسێیەو پێم عەیب بوو بڵێم: تۆزێك ماستم بدەنێ، گوتم: یەك كەوچك ماستم بدەنێ، شیری پێ هەوێن دەكەم، ئیدی كردمه ئەو پەرداخه ماستاوه!

منیش تووڕه بووم كه بۆچی وایكردوه، بەلام دوایی هەرچۆن بوو ڕازی بووم كه پێكەوه بەدەم ساوار خواردنەوه بیخۆینەوه!

٢- ڕۆژێکی دیکە دوو لە برادەرە نیزیکەکانی ئەوکاتەم کە لەسەر دەستی من گەڕابوونەوە، میوانم بوون، ئێمەش هیچی وامان نەبوو بۆیان ساز بکەین، ئەوەبوو خاتوون مەلاژن چووە دووکانەکەی نیزیك ماڵمان، دوو سێ کیلۆ برنج و دوو کیلۆ تەماتەی بە قەرز هێناو، مریشکێکیشی لە دراوسێیەك بە قەرز وەرگرت و، میوان جەژنی خانەخوێیە، بۆ نیوەڕۆ هەر چوارمان دەعوەت بووین، کەچی ئەو دوو برادەرە نەیانزانیبوو دەعوەتەکە چۆن سازکراوەو، لەلای هەندێك دۆست و برادەر گوتبوویان: کاکە ماڵی فلانکەس دەڵێی ماڵی (.....) ئاغایە هەموو دەمێ گۆشت و برنج ئامادەیە!!

ئنجا کە هاوسەرم بیستییەوە، چەند ڕۆژێك لە دڵی دەرنەچوو، دەیگوت: ئێمە چۆنین و ئەوانیش چۆن گومانمان پێ دەبەن! منیش دڵم دەدایەوەو دەمگوت: قەیناکات، با هەروا بزانن، نەوەك حەقیقەتی حاڵمان بزانن و خەفەتمان لێبخۆن!

### شوێنکەوتنی عاتیفییانەی هەندێ لە مەلایان بۆ شێخان:

شەوێکیان لە ئۆردوگای بنگرد لەگەڵ ژمارەیەك لە مامۆستایان و شێخێکیشمان لەگەڵ بوو، لە ماڵێك میوان بووین، کاتێك شەو درەنگ بوو، ویستمان بڵاوەی لێ بکەین، مەلایەکان هەرچەندە هەندێکیان ڕیش سپی و بەتەمەنیش بوون، بەلام هیچیان ئامادەنەبوون وەپێش کاکە شێخ بکەون، کە تەمەنیشی لەوان کەمتر بوو! ئیدی چەند جارێك پێمگوتن: مامۆستایان یەکێکتان پێش بکەوێ، هەروەها شێخیش هەر پێی گوتن، بەلام فایدەی نەبوو، منیش گوتم: بەڕێزان! خۆ ناکرێ هەتا بەیانی خەریکی مشتومڕی چوونە دەربین، ئەوەبوو من پێشیان کەوتم و جەنابی شێخ بەدوای من داو مامۆستایەکانیش بەدوای شێخدا هاتینە دەرێ!

هەڵبەتە شێخ ئەگەر لەبەر ڕەخنەی من نەبووایە کە: هەمیشە دەمگوت: (زانایان دەبێ لەپێشەوەبن) ئاوی لێ نەدەخواردەوەو پێشیان دەکەوت!

مەبەستیشم لە گێڕانەوەی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە پەیدابوونی شێخەکان -کە من ڕێزم بۆ شێخی ڕاستەقینە هەیەو زۆرم خۆش دەوێن واتە: کەسانی وەك شێخ عەبدولقادری گەیلانیی و

مەولانا خالیدو کاك ئەحمەدی شێخ ـ بەڵام زۆربەیان لەم ڕۆژگارەدا ئەو پەڕەکەی وەك مسوڵمانێکی عەوامی سادەن، لەڕووی دینداریيەوە، هۆکارە سەرەکیی یەکەی شوێنکەوتەیی عاتیفییانەی مەلایەکان بووە بۆیان!

خۆزگە هەر کەس نازناوی جێگرێتیو میراتگرێتی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم"ی لەسەر دەبوو، کارێکی دەکردو خۆی والێدەکرد، کە نازناوەکەی لێ خەسار نەبێو، ئاگای لە ڕێزو حورمەتو کەسایەتیی خۆی بێ.

دیارە شێخانی ڕەسەنو ڕاستەقینەش کە شارەزای قورئانو سوننەتو یاساکانی شەریعەتنو، خەڵکیان لەسەر پەروەردە دەکەن، میراتگرو جێگری پێغەمبەری خوان "صلى الله عليه وسلم"، هەرکەسە لەقەدەر خۆیو تێگەیشتوویيو پێگەیشتوویی!

## هەڕەشە لێکرانم لەلایەن کەسانێکی سەر بە یەکیەتییەوە:

هەر لەو ماوەیەدا کە لەگوندی سەرسیان بووین، نامەیەکم بەناوی یەکیەتییەوە بۆهات، کە ئاگادار نیم لە چ ئاستێکدا ئاگاداری ئەو نامەیە بوون، چونکە هیچ مۆری ڕەسمیی پێوە نەبوو، ڕەنگە هەر هەڵسوکەوتێکی شەخسییش بووبێ، لە نامەکەدا هەڕەشەم لێکرابوو، کە ئەگەر بێتو واز لە هێرشکردنە سەر مارکسیزم نەهێنم، ماڵەکەت بە ئاربیجییەك هەڵدەگێڕینەوە!

هەڵبەتە من لەسەر بەرنامەی خۆم بەردەوام بوومو، کەمو زۆر گوێم بەو هەڕەشەیە نەداو، هەر ئەو نامەیەش بوو و هیچی دیکەی بەدوا دانەهات.

## سەفەرێکی دیکەی ئێران بە نوێنەرایەتی پەیوەندیی ئیسلامیی:

لەساڵی (١٩٨٥)دا دوو سێیەك لەبرایانی پەیوەندیی، کە وەك بێتەوە یادم هەرکام لە کاك حەسەن حەمە خالدو کاك فەتاحە سوور "بەڕەحمەت بێ" و کاك کەمال دۆڵپەمۆیی بوون، لە سەرسیان سەردانیان کردمو داوایان لێکردم کە بچم بۆ (سنە) بۆ لای مامۆستا شێخ محەمەد

بەرزنجیی "بەرەحمەت بێ" ، کە ئەوکاتە ڕابەری (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) بوو ، بەڵام ئێستا لەیادم نییە چی و چییان پێدا ڕاسپاردم کە بیگەیەنمە مامۆستا .

ئیدی ئەوەبوو لەماوەی چەند ڕۆژێکدا لە ڕێی (قەندیل)ەوە چووم و ، مامۆستام بینی و چەند قسەو باسێکمان پێکەوە بوون ، دیارە هەر لەو سەفەرەمدا چەند کەسێکی دیکەشم بینی ، وەك : مامۆستا عەبدولرەحمان نەورەسیی و ، مامۆستا مەلا عەلی بیارەیی "کە بە ئەسڵ بناوەسووتەییە" ، "خوا لێی خۆشبێ" ، پاشان هەر لەڕێی خۆمەوە لە چیای سەرکەشی قەندیلەوە ، بە چیای ئاسۆسدا هاتمەوە سەرسیان ، بەڵام دوای ئەوەی شەوێك لە ماڵی مامۆستا مەلا عەلی ئاوەژەیی کە مەلای گوندی (سندۆلان) بوو ، ئیسراحەتم کردو ، خەنەشیان بۆ گرتمەوە لە پێیەکانمدا ، چونکە بەڕێی دوور ، بلۆقیان کردبوو و ئەزیەتیان بوو بوو .

### وتووێژێك لەگەڵ حاجی ئاغای سەرسیاندا لەبارەی وێنەی سەددامەوە :

ڕۆژێکیان لەگەڵ جەنابی مامۆستا مەلا سەید عبدالرحمن ئیمامی گوند ، سەردانی حاجی ئاغای سەرسیانمان کرد "بەرەحمەت بێ" کە چووین لە دیوەخانەکەیدا لە پشت خۆی ، یان لە تەنیشتییەوە ، وێنەیەکی سەددام حوسێن دانرابوو ، منیش ئاماژەم بۆ وێنەکە کردو گوتم :

مام حاجی ئاغا ! خۆ الحمدلله تۆ پیاوێکی مسوڵمانو نوێژکەری ، ئەدی ئەو بتە ، ئەو سەنەمە چییە لەلای خۆت داتناوە؟!

گوتی : کوا مامۆستا بتو سەنەم؟!

منیش ئاماژەم بۆ وێنەکەی سەددام کردو گوتم : ئەوە نییە!

ئەویش گوتی : جا کوا ئەوە بتە ، ئەوە وێنەی سەرۆکە!

منیش گوتم : هەرکەسێك وێڕای خوا ، یان لەجیاتی خوا ملکەچیی و بەندایەتیی بۆ بکرێ ، بە پەرستراو (معبود) دادەنرێ . . .

ئیدی لەوجۆرە قسانەمان لەبەیندا بوون .

شایانی باسە هەستم کرد (مامۆستا مەلا سەید عبدالرحمن)یش بەقسەو هەڵوێستەکەی مـن سەغڵەت بوو و پێی ناخۆش بوو.

هەڵبەتە منیش مەبەستم ئەوەنەبوو کە هەرکەسێك وێنەی سـەددام حوسـەین یـان یـەکێکی دیکەی وەك وی خراپ یان خراپتر، یان چاك، هەڵبواسێ، بتپەرستە، بەڵام هەرویسـتم مـام حـاجی ئاغـا ئاگاداربکەمـەوە، دیـارە ئەگـەر تێگەیشـتنی ئێستاشـم هەبووایـە، شـێوازێکی گونجاوترم بەکار دەهێناو، ئێستا کە بیر لەوجۆرە هەڵوێستانەی خۆم دەکەمەوە، خـۆم بەهەڵـە دەزانم، بەتایبەت کە حاجی ئاغای سەرسیان "وەك کاك حوسێن و کـاك حـاجی عبـاس لـەم ماوەیەی پێشوودا کە یەکدیمان بینی باسیان کرد" لە ئەنجامی زوڵم لێکراندا کە کوڕێکی بەناوی (حسـن) بەناهـەق کـوژراوە، تووشـی دوژمنایـەتیی بـووەو، بەناچـاریی چـەکی ڕژێمـی هەڵگرتوە، وە پیاوێکی خاوەن نوێژو تاعەت و دیانەتیش بـوو، نـەدەبوو وا بـەزەقیی و ڕەقیـی قسەم لەگەڵ کردبایە، بەڵام دیارە ئەوکاتە هەرئەوەندەم لێزانیوەو، منـیش دەبـێ ڕووداوەکـان وەك خۆیان بگێڕمـەوە، ئنجا چاکم کردبێ یان خراپ!

## هەرەشـە لێکـرانم لەلایـەن چـەکدارێکی ڕژێمـەوە، لـە گونـدی (بەردەکـۆز)و بەرپەرچدانەوەی:

شەوێکیان میوانی ماڵی مامۆستا مەلا خدر ئیمامی دێی (بەردەکۆز) بووم "یـادی بـەخێر کە ئێستا لە (حاجیاوا) هەر سەرگەرمی مەلایەتییە" لەمەجلیسەکەدا یەکێك لـە چـەکدارەکانی ڕژێمی لێبوو، کە بە بابایەکی پیاوکوژ ناسرابوو، ناوەکەیشـم لـەیادە، بـەڵام باسـی ناکـەم و ناشزانم داخۆ ماوە یان نا؟!

دیارە من عادەتم وابوو قسەی خێـرم دەکـردو ئامۆژگـاریی خـەڵکم دەکـردو، بـێ پـەردە هێرشم دەکردە سەر ڕژێم و جاشایەتیی و پارەی جاشایەتییشم پـێ حـەڕام بـوو، بـەڵام ئێسـتا قسەکانی ئەو کۆڕو مەجلیسەم هەموو لەیاد نین و نـازانم ئـەو کابرایـە لەسەرچـی تووڕەبـوو! ئیدی کە تووڕە بوو، زۆر بە لەخۆڕا دیتوویی، دەستی بۆ کلاشینکۆفەکەی سەرکۆشی بـردو گوتی: وەڵڵاهی شەیتان دەڵێ: یەك سـەڵیەی لێبدە!

دیارە نەیزانی کە منیش هەمیشە دەمانچەیەکی سمیسی گچکەم لەبەر پشتێندێ دایەو، دەمانچەی سمیسیش هەموو دەمێ سوارو ئامادەیە، منیش دەستم بۆ دەمانچەکەم بردو گوتم:

وەڵڵاهی هەرخۆت بجوولێنی لە لەوەڕت دەکەم! "لە لەوەڕت دەکەم، تەعبیرێکە بەمانای کوشتنو، بابای هەڕەشە لێکراو بە ئاژەڵو دڕندە دەچوێندرێ، چونکە ئاژەڵ ئەگەر مرداربوو گیاو لەوەڕی بۆ ناخورێ" دیارە کە وامگوت، کابرا ڕەنگی تلْخو زەرد بوو و مامۆستا مەلا خدریش "یادی بەخێر" قسەی خێری کردو بارودۆخەکە لەوە گرژتر نەبوو، پاشان لەیادم نیە چۆن ئەهلی مەجلیسەکەمان بلاوەیان کردو، منیش گەڕامەوە ماڵ، بەڵام پێموایە کابرای جاش، چونکە هەرگیز ئەگەری ئەوەی دانەنابوو چەکم پێ بێو، چەکەکەشم لەهی وی ئامادەتر بێ، زۆر ترساو هەر بەڕاستیش خۆی جوولاندبایە لەسەر دەستم بەهیلاك دەچوو "قسە لە قەناعەتو هەڵوێستی ئەوکاتەم دەکەم".

# ماڵ گواستنەوەمان لە (سەرسیان)ەوە بۆ (گەڵوو)

وەك پێشتر باسم كرد دوای ئەوەی لە سەرسیان ماوەی حەوانەوەم نەما، كەوتمە بە بیری پەیداكردنی شوێنێكی دیكە بۆ حەوانەوەم، چونكە جاریێ قەناعەتم نەهاتبووە سەركۆچكردنو، دەمگوت: پێویستە كاری زیاتر لەنێوەوە بكرێو خەڵك هۆشیار بكرێتەوە.

ئیدی نازانم بەپێشنیاری خاڵ ئەحمەدە ڕەشی ماخۆبزن، "بەرەحمەت بێ" بوو، یان یەكی دیكە، كە بیرۆكەی كۆچكردن بۆ گوندی (گەڵووی ماخۆبزنان)م لەلا گەلاڵە بوو.

ئنجا وەك بێتەوە یادم من لە مانگی (١٠ی ١٩٨٥)دا سەرسیانم بەجێهێشتوەو چوومەتە (گەڵوو) هەروەها كاك (عبدالكریم قادر خدرە سوور) كە برایەكی دێرین و دڵسۆزمەو بەرواری ڕۆژەكانیشی باش لەبیرەو، زۆر لەو مێژووانەم لەو وەرگرتوون، دەڵێ: من لە ڕۆژی: (٢٨/ ١٠/ ١٩٨٥)دا هاتم بۆ سەردانت لە گوندی گەڵوو، كە تازە ماڵتان دامەزراندبوو، بەڵام كاك تەهای حاجی زاهیر كاك ئەنوەر حسین بەگو ئەوان پێشتر هاتبوونو، هاتنی من بەهۆی ئەوەوە دواكەوت، كە كشتوكاڵم كردبوو، هەتا بەرهەمو حاسڵاتم هەڵگرتەوە.

دیارە بەرلەوەی ماڵو كەلو پەلەكانمان بگوازینەوە بۆ گوندی گەڵوو، لە سۆنگەی ئەوەوە كە گوندی گەڵوو و ناوچەی پشدەرە ڕەقە بەگشتی لەژێر ڕكێفی كاك عەباس بایز باڵوئاغادا بوو، كە ئەوكاتە ئامر فەوج بوو، بۆیە پێویست بوو سەرەتا لەگەڵ ئەودا قسە بكرێو گفتی لێ وەربگیرێ، شایانی باسیشە كە (پشدەرە ڕەقە) ناوە بۆ ناوچەیەك كە ئێستا ئەو حەوت گوندەی لێن:

١- گرتك كە خەڵكەكەی (بنزێریی) یان پێدەڵێن.

٢- دوو گۆمان كە خەڵكەكەی (مەندەمەرە) یان پێدەڵێن.

٣- گەڵوو كە خەڵكەكە (ماخۆبزنان)یان پێدەڵێن، واتە: خاوەن بزن.

٤- زەنگـەڵان .

٥- مەمکـان .

٦- جەلکـان .

٧- پـیرانـان .

وادیارە لەبەر وشکیی و بێ ئاوییش پێی دەگوترێ : پشـدەرە ڕەقە .

دیارەکە چووین بۆ لای کـاك عـەباس بـایز ، لەخزمـەت مامۆسـتا مـەلا سـەید سـلیمان و مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازیدا بووم ، بەڕەحمـەت بن و ، پێموایە خاڵ ئەحمـەدە ڕەشیشـم لەگـەڵ بوو ، ئەوەبوو قەزیەکەیان لێ حاڵیکرد ، کاك عەباس بـایز پیاوانـە گـوتی : مـن لەخزمەتـدام ، مادام لەسەر ئیسـلامەو لەسەر دین جێی نابێتـەوە ، ئەوە من لەخزمەتدام ، لە کوێش دادەنیشـێ من دیفاعی لێدەکەم ، منیش گوتم : کاك عەباس من زۆر سوپاست دەکەم و یەك داوام هەیـە ، گوتی : فـەرموو مامۆسـتا ! گـوتم : بـەس بۆخـۆت زەربـەم لێمـەدەو خیانـەتم لێمەکـە ، لـە حکوومەت بێ منەتم ، چونکە ئەوکاتە گەڵو جادەی نەبوو و سەیارەی بۆ نەدەچوو ، گـوتم : مەگەر کوردو خەڵکی سەر بە ڕژێم هاوکاریی بکەن ، ئەگـەر نا بۆخۆی هیچی بۆ لەگەڵ مـن ناکرێ ، گوتی : نا خەمت نەبێ ، بڕوا بکـە دیفاعیشت لێدەکـەم ، وە هـیچ کەسـیش ناتوانـێ دەست بۆ تۆ درێژ بکات ، گوتم : کاکە زۆر سوپاس .

## چوونـم بۆ گونـدی (گەڵـو)و دامەزرانـم بە مەلای گونـد :

وەك پێشتریش گوتم : لە مانگی دە (١٠)ی ساڵی (١٩٨٥)دا ڕەنگە لە سـەرەتای مانگـەوە بووبێ ، چووم بۆ گوندی گەڵوی ماخۆبزنـان ، ئێسـتا لـەیادم نیـە کـێم لەگـەڵ بـوو ، چـووم لەگەڵیان دانیشـتم " واتە : لەگەڵ ژمارەیەك لە ڕیش سـپییانیان " گوتم : خزمینـە ! من هـاتووم ببمـە مەلای ئێوە ، ئەگەر پێتـان باش بێ " مامۆستا مەلا خدر بە " ڕەحمەت بێ " ، کـە مـەلای (گەڵو) بوو تازە وەفاتی کردبوو ، بابی کاك مەلا موحەممەدو کـاك مـەلا ئەحمـەد کـە دۆسـت و نزیکی خۆمانن ، مامۆستایەکی باش بوو خەڵکەکـە زۆریـان خۆشدەویسـت " ، ئـەوانیش لـە

وەلاٌمدا گوتیان: مامۆستا ئێمە ناوبانگی تۆمان بیستووەو لە خزمەتداین‌و زۆریشمان پێخۆشە، گوتیان: خانووی مەلاشمان هەیە، چونکە پاش وەفاتی مامۆستا مەلا خدر منداڵەکانی چوونەوە (دووگۆمان) لای خزمەکانیان.

بەڵێ بەوشێوەیە وەك چۆن قاچاغیی لە رژێم ملی پێ لەبەر فەقێیەتیی نام، ئەم جارە ملی پێ لەبەر مەلایەتییش نام، دیارە من شانازیی بە مەلایەتییەکەوە دەکەم کە بتوانم هەقی خۆی پێبدەم، چونکە ئەوە میراتگریێتی‌و جێگریێتیی پێغەمبەرانە "علیهم الصلاة والسلام" وەك پێغەمبەری خاتەم موحەممەد "صلی الله علیه وسلم" فەرمویەتی: ﴿إن العلماء ورثة الأنبياء وإن الأنبياء لم يورِّثوا دينارًا ولا درهمًا، إنَّما ورَّثوا العلم، فمن أخذَه أخذ بحظّ وافر﴾ رواه الترمذي: واتا: بێگومان زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن، ئاشکرایە کە پێغەمبەران زێڕو زیویان بەمیرات بەجێنەهێشتوە، بەڵکو زانیارییان کردوەتە میرات، ئنجا هەرکەس زانیاری وەربگرێ، پشك‌و بەشێکی گەورەی وەرگرتوە.

بەلاٌم مەبەستم ئەوەیە کە پێشەکیی‌و ئەزموونم لە مەلایەتییدا نەبوو.

ئەوجار ریش سپییەکان "کە یەکیان (مام حاجی رەسووڵی مازووان) بوو کە ئێستا ماڵیان لە سەنگەسەرەو بانگبێژی گوندیش بوو" بە شەرمێکەوە گوتیان: مامۆستا! ئنجا با لەم سەرەوە دوسێ قسەی لێبکەین، گوتم: قسەی چی؟! گوتیان: بزانین چۆن چۆنی مەلایەتییمان بۆ دەکەی‌و چیت بدەینێ‌و چی‌و چیت بۆ بکەین؟ با لەسەری رێك بکەوین!

گوتم: خزمینە! من هیچ شتێکتان لێ داوا ناکەم‌و هەر ئاوا مەلایەتییتان بۆ دەکەم.

گوتیان: جا چۆن شتی وا دەبێ؟!

گوتم: با بۆتان روون بکەمەوە: ئایا ئێوە مەلاتان بۆچییە؟! گوتیان: بۆ نوێژی جومعەو جەماعەت‌و جەژنەکانو، نوێژی مردوو و، ژن مارەکردنو، سولْح‌و ئەو جۆرە شتانە..

گوتم: دەجا گوێم لێبگرن! ئەنجامدانی هەرکام لەو ئەرکانە بۆ کەسێك کە لەتوانایدا هەبێ‌و کەسێکی دیکەش نەبێ، فەرزەو مامۆستای گوندو گەرەك‌و شار، بە نەکردنو خۆ لێبواردنیان گوناهبار دەبێ، کەواتە: بۆچی لە بەرانبەردا پارەو شتی دەدەنێ؟!

ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە گوتیان: چۆن؟!!

گوتم: هەرکات بانگیدا، ئەگەر کەس هەبێ بانگ بدات، گوتم: ئەرێ کەستان هەیە بانگ بدا؟ گوتیان: بەڵێ، بەڵێ هەیە، حاجی ڕەسووڵی مازووان، کە ماشەڵڵا دەنگێکی بەقوەتی هەبوو بلندگۆی نەدەویست، کە دەیگوت: (الله أكبر) دۆڵی گوند دەنگی دەدایەوە! گوتم: هەرکات حاجی ڕەسووڵ بانگیدا، ئەگەر کەستان لە من شارەزاتر بوو بۆ پێشنوێژیی پێشکەوت، منیش لە دوای ئەووەوە نوێژ دەکەم، ئەگەر کەس نەبوو، ئەوە پێش دەکەوم، هەروەها گوتم: ڕۆژی جومعەش ئەگەر کەس هەبوو وتاریدا، ئەوە منیش گوێ دەگرم، ئەگەر کەس نەبوو، ئەوە من وتارتان بۆ دەدەم، گوتیشم: ئەگەر کێشەو گرفتێکتان هەبوو، ئەگەر کەس هەبوو سوڵحتان بکات، ئەوە زۆر باشەو منیش بەشدار دەبم، بەڵام ئەگەر کەس نەبوو، ئەوە من قسەی خێرتان بۆ دەکەمو سوڵحتان لە بەینیدا دەکەم، گوتم: ئەگەر ژن مارەکردنتان هەبوو، منیش ئەگەر دەرفەتم هەبوو دێمە مەجلیسەکەی، ئنجا ئەگەر کەس هەبوو مارەی بکات زۆر چاکە، ئەگەر نا، من مارەی دەکەم.

وە گوتم: ئەگەر یەکێکتان لێ مرد، دیارە فەرزە نوێژی لەسەر بکرێ، ئنجا ئەگەر کەس هەبوو نوێژی لەسەر بکا، ئەوە باشەو منیش ڕادەوەستم، ئەگەر نا، من نوێژی لەسەر دەکەم، هەروەها بەو شێوەیە، هەر کاروبارێکی مەلایەتیی، ئەگەر کەس هەبوو بیکا باشە، ئەگەرنا من هەر دەبێ بیکەم، کەواتە: بۆچی لە بەرنبەردا پارەم دەدەنێ؟!

هەڵبەتە ئەوان یەکەم جار بوو ئەو جۆرە مەلایەتییە ببیستن، بۆیە ناهەقیان نەبوو کە زۆریان پێ سەیربێو، بە سەرسوڕمانەوە گوتیان: مامۆستا! ئەدی بە چی دەژی؟ گوتم: خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا ...﴾ (٦) هود، واتا: هیچ زیندەوەرێك لەسەر عەرزێ نیە مەگەر رزقی لەسەر خوایە، منیش رزقم لەسەر خوایە. گوتیان: ئەوەی گوتت هەمووی چاکە، ئەدی زەکاتو سەرفترەکەمان چی لێبکەین؟ گوتم: چۆن؟ گوتیان: بیدەین بەکێ؟

گوتم: مـن پرسـیارێكتان لێدەكـەم: ئایـا چـەند كەسـتان هەیـە لـە دێـدا كـە هـەتا سـاڵێ تێوەردەسورێتەوە، بێ ئەوەی ئیشـێ بكا، هێندەی هەبێ بیخوات؟! گوتیان: بۆچی؟ گوتم: ئەو كەسە زەكاتی پێناشـێ كە نەفەقەی خۆیوماڵو منداڵیو ئەوەی نەفەقەی لەسەریەتی، تـا ساڵێك پێدەچێ، هەیبـێ، ئەگەر هیچ ئیشیش نەكا، گوتیان: بە خوا مامۆستا ئێمە یـەك دوو رۆژ نەچینە دەشتو كێو بۆ ئیشـوكار، پێمانـەوە دیـار دەبـێ، گـوتم: كەواتـە: هـەمووتان زەكاتتان پێدەشێ، هەركەس هێندەی نەبێ پێی بژی، زەكاتی پێدەشێ.

## قسـەیەكی خـۆش:

**ئنجا با لێرەدا قسـەیەكی سـەیرو خۆش بگێڕمـەوە:**

رۆژێكیان یەكێكیان كە ناوی كاك عەبدوڵڵا بوو، زانیاریم هەبوو كە زۆربەی رەمەزانەكەی نەگرتبوو، هەر هێندەم زانی بە توورەكە گەنـمێكەوە هات، گوتم: فەرموو كاك عەبدوڵڵا!

گوتی: مامۆستا! هاتووم سەرم چاك بكەیەوە.

گوتم: بۆچی سەرت شكاوە؟

گوتی: نەوەڵـڵا، بەڵام كە رۆژووت گرتن، دەبێ سەرفیترە بـدەی، ئنجـا سـەرت چـاك دەبێتـەوە.

منیش گوتم: كاك عەبدوڵا لەگەڵ رەمەزاندا چۆن بووی؟

گوتی: بڵێم چی مامۆستا! گرتوومنو نەمگرتوون،

گوتم: دەی كاك عەبدوڵڵا ئێستا هاتووی چی بكەی؟

گوتی: مامۆستا هاتووم كە هەمو ساڵێك هەر وامان كردوە، ئـەو گەنمـە مـن چـەند مستـە گەنـمێكی لـێ دەردێنمو، دەڵێم ئەوە دام بە تۆ.

گوتم: ئێ؟ ئنجا خۆ گەنـمەكەت بەشی ئەوە ناكا!

گوتی: ئنجا تۆش دوای ئەوە دەمدەیەوە،

منیش گوتم: ئنجا كاك عەبدوڵلا بۆچی ئەو درۆو دەلەسەیە پێكەوە بكەین؟ نە تۆ بەڕاست گەنمەكەم دەدەیەو، نە منیش بەدڵ دەتدەمەوە.

ئەویش پێكەنیو گوتی: ئەدی مامۆستا! سەر، چۆن چاك دەبێتەوە؟

گوتم: كاكە ئەوەی ناوێ.

جارێ لە ئەسڵدا زەكاتی فیتر بۆ كەسێكە كە ڕۆژووی ڕەمەزانی گرتبێ، بەلاّم نوقسانیی لە ڕۆژوەكانیدا هەبێو بەو سەرفترەیە پڕدەبێتەوە، بەلاّم تۆ كە ڕۆژووت نەگرتبێ، چی پڕ دەكەیەوە؟ گوتم: زەكاتی فیتر (زكاة الفطر) كە كوردەوارییی (سەرفترە)ی پێدەڵێن، وەك سواغ كردنی دیوارو پڕكردنەوەی كەلێنو درزەكانی وایە، بەلاّم تۆ هەر دیوارەكەت دانەناوە، چی سواغ دەكەی؟! گوتم: كاكی خۆم! گەنمەكەت بەرەوەو ساڵێكی دی ڕۆژووەكانت هەموو بگرە، ئنجا سەرفترەكەت بدە} .

ئاوا كە لەگەڵ ڕیش سپییانی ماخۆ بزندا قسەم كرد، زۆریان پێ عەجایەب بوو

گوتیان: مامۆستا! ئێستا تۆ ئاوا دێی؟

گوتم: بەڵێ ئاوا دێمو هیچ چاوەڕوانییەكم لێتان نیە،

گوتیان: مامۆستا! بەخوا ئێمە لە خزمەتداین هەر چۆن بێ، ئێمە گوتمان: ڕەنگ بێ تۆ زۆر داوا بكەیو ڕێك نەكەوین.

گوتم: نەخێر هیچ داوا ناكەم.

# یادکردنەوەی هاوسەری ڕەحمەتییم

لێرەدا بە پێویستی دەزانم هەڵوێستەیەکی کورت بکەم، دەربارەی خێزانم، (روخسارخان) خاتون مەلا ژن "هەزار رەحمەتی لێبێ" کە من وەك وەفایەك لە نامیلکەیەکیشدا باسم کردووەو بەشێکیشە لە کتێبی: (ئافرەتو خێزان) بەشی نۆیەم، بە ناوونیشانی: (خاتون مەلاژن ئافرەتێکی هەڵکەوتوو هاوسەرێکی ناوازە) کە تێیدا باسی سی (۳۰) لە رەوشتەکانیو هەڵوێستەکانیم کردووەو لێرەدا بوار نیە باسیان بکەم، بەڵام بە کورتی دەڵێم: هەر لەو کاتەوە کە ئێمە بووین بە حەلاڵی یەکدی، "واتە: لە مانگی (۱)ی (۱۹۸٤)ەوە" هەتا خوای پەروەردگار بردیەوە لە ٥/ ۱۱/ ۱۹۹٦ز دا "خوا لێی خۆش بێ" کە نزیکەی سێزدە ساڵ بەیەکەوە بووین، دەتوانم بڵێم لە ماوەی ئەو سێزدە ساڵەدا هەمووی بەسەریەکەوە، بۆ ماوەی چەند سەعاتێك لەیەك زویر نەبووین، هەڵبەتە زیاتریش ئازایەتیی ئەو بووە، جاری وا هەبوو من تووڕە دەبوومو هەڵدەچووم، ئەو ئاشتی دەکردمەوە!

بۆیە لە خوا دەپاڕێمەوە کە باشترین پاداشتی بداتەوە، بەڕاستیی لە ژیانی هاوسەرێتییمدا لە زۆر ڕووەوە لەو ئافرەتە بەهرەمەند بوومو سوودم لێبینی، بەڕاستیی هاوکارو دەستبارگرێکی زۆر زۆر کارامەم بوو، هەرچەندە تەمەنیشی زۆر نەبوو، چونکە لەدایکبوی (۱۹٦٦) بوو، ئەو کاتی بو بەقسمەتی من لە (۱۹۸٤) تەمەنی (۱۷ – ۱۸) بوو، بەڵام وەك ئافرەتێکی (٤٠) ساڵە بوو لە رووی تێگەشتوویی و پێگەیشتووییەوە.

ئنجا لەبەرئەوەی کە پەرستاریش بوو هەمیشە بەدەم نەخۆشانەوە بوو.

هەروەها ئافرەتانو کچو کاڵی دیٚ، کێشەو گرفتێکیان هەبووایە بەدەمیانەوە دەبوو.

هەروەها بۆ منداڵان زۆر بە ڕوحمو بەسۆز بوو، وە لە هەر شوێنێك بووبین، چ کە لە (سەرسیان) بووین، چ کە دوایی چووینە (گەڵوی ماخۆبزنان)و دواییش کە چوینە نێو ژیانی پێشمەرگایەتی لە (قەڵاتووکان)، دوایی لە شوێنەکانی دیکەی ئاوارەیی، هەرکەسێك

دراوسێمان بوویىو ئەو خێزانەمى ناسیبىێ، یادگاریى و بیرەوەریى زۆری لێدەگێڕنەوە، هیى سەخاوەتى، میهرەبانیىو بەسۆزییى و دڵسۆزیى و چاكەكاریى و بێفیزیىو...هتد، ئەو سیفەتانەى كە ئینسان پێیان جوانە، دیارە وەك گوتم: لەو نامیلكەیەدا باسى (٣٠) لە ڕەوشتو هەڵوێستەكانیم كردووە، لێرەش وەك وەفایەك بە پێویستم زانى ئاماژەیەكى پێبدەم، ئەگەر نا زۆر زەحمەتە بتوانم باسى هەموو ئەو سیفەتە باشانە بكەم، كە لەو خێزانەمم بینیون، وە كەلێن و بۆشاییەكى زۆرى لە ژیانى مندا پڕ كردبۆوە.

## ماڵو میوانى زۆرو جۆراوجۆر:

ئەو ماوەیە كە لە (گەڵووى ماخۆبزنان) بووین "ئێمە لە هەر شوێنێك دەبووین هەروابووین" میوانمان زۆر دەهاتن، بەتایبەتى لەوێ خەڵكمان زۆر بەسەر دەگەڕا، بەتایبەتى جومعان جارى وا هەبوو سى چل میوانمان دەهاتن، لە زۆر جێگاوە دەهاتن: لە ڕانیەوە، لە قەڵادزێوە، لە سلێمانییەوە، لە هەولێرەوە، لە دێهاتەوە، لە هەموو شوێنەكانەوە دەهاتن و، زۆربەى جار ماڵمان پڕ بوو لە میوان، ئنجا میوانەكان وێڕاى كورد، عەرەبو توركمانو ناسیاوو نەناسیاویشیان تێدابوون، بەڵام ئەو خێزانەم قەد نەمبینى نێوچاوان گرژ بكات، هەڵبەتە موحتاجیش دەبووین، جارى وابوو برنج نەدەبوو، ڕۆن نەدەبوو، نان نەدەبوو، بەڵام دەچوو دەیهێناو، ڕێكیدەخست، گرنگ ئەوەیە بەسەر خۆى نەدەهێناو، بەشێوەیەك لە شێوەكان لە ماڵە دراوسێیان وەریدەگرت، یان قەرزى دەكرد، هەڵبەتە خەڵكیش بەدەممانەوە بوو، زۆریش لەو برایانە كە دەهاتن بۆلامان، ئەوانیش كە دەیانزانى بارەدۆخمان چۆنە! هەیانبوو ئازووقەیان دەهێناو، شتیان دەهێناو هاوكاریيان دەكردین.

هەروەها خەڵكى دێیەكەش لە بەرانبەر مندا، كە من بە بێ مەرجو داواكارى چووبووم، خۆیان بە خاوەن هیچ شتێك نەدەزانى، هیى وا هەبوو حەیوانە كێوییى دەكوشت، نیوەى كەلەشەكەى بۆ ئێمە دەهێنا! هەیانبوو ئەگەر دوو كەوى كوشتبان، كەوێكى بۆ ئێمە دێنا، دەیگوت: مامۆستا لێى نەخوا نابێ، دیارە ژیانى لادێ سەختو زەحمەتە، بەتایبەتى لەوێ كێشەى ئاومان هەبوو، بەڵام خەڵكەكە ئاویان بە سۆندە بۆ ڕاكێشابووین، هەروەها كارى

بان گێڕانـمان هەبوو، جاروبار كوڕو كاڵی دێ بانیان بۆ دەگێـڕاین، خۆیشـم زۆرجـار بـانم دەگێڕاو، خێزانیشم جارجار بانی دەگێڕا، ئەگەر من لەماڵ نەبوومایە.

هەروەها (بەفر ماڵین)مـان هـەبوو، دار قەلاشـتن بـۆ سـۆبەو ...هتـد، بـەلاّم بەهـەرحاڵ خەڵكی دێیـەكە هەموویان وەك كـوڕو بـراو خزمـی زۆر نزیـك لەبەردەسـتمان بـوون، خـوا پاداشتیان بداتەوە، وە كە دەیانزانی مەترسییم لەسەرە، شەوانە پاسەوانییان دەگرت.

## ئەزمـوونـی چوونە هـەوارو ژیـانی نێورِەشـماڵ:

خەڵكی (گەڵوو) سـالاّنە سێ شوێنیان دەكردنو، لە سێ شوێنان نیشـەجێ دەبوون: .

١ـ گوندەكە، (گەڵووی ماخۆبزنان).

٢ـ بەهاران دەچوونە هەواری (سەر گۆڕان).

٣ـ ئنجا كە بەهار تەواودەبوو، هاوینان دەهاتنەوە (زینوو) هەتا پـاییز دەهـاتو، پـاییزان شـۆڕەبوونەوە بۆ دێیـەكە، ئنجا یەكەم شەو كـە چـووین بـۆ سـەر گـۆڕان، دەبـوو ڕەشماڵ هەڵدەین، ئیدی ڕەشماڵمان هەڵدا بۆ یەكەم جار لە ژیانمدا، چـەند كەسـێك هـاتن ڕەشماڵەكـەیان بـۆ هەڵـداین، ئنجـا گوتیـان: مامۆسـتا! بـەهارەو لەوانەیـە بەخێرهاتنێكیشـتان بكات! گوتم: بەخێرهاتنی چی؟ گوتیان: لەوانەیە ئەمشـەو باران بباریێ، ئەوە بەخێرهێنـانە.

دیارە هەر واشبوو: شەو بوو بە گرمەو گاڵەی هەورانو، هەڵیكردە باو باسریشكو بـاران دایكرد، ئنجا ڕەشماڵ كە تازە هەڵدەدرێ، پێش ئەوەی باران لێیـدا، كـونی وردی تێدانو، چونكە خاونەبۆتەوە كونەكانی بگیرێن، وردەوردە ئاو دێتە خوارێ، خێزانم "بەڕەحمەت بێ" گوتی: ئای مامۆستا ئەوە چییـە؟ ئەو ڕەشماڵە هەمووی كونە، ئاوێ ڕاناگرێ؟ خەڵكەكـەش كە لە دەورمان بـوون، پێكـەنینو گوتیـان: نـا نـا دایـك مـەلاژن! هـیچ نیـە، وردەوردە كـە ڕەشماڵەكە خوساو خاوبۆوە، كونەكانی پڕدەبنەوەو ئەو وردە بارانە نامێنێ!

دیـاره ڕەشــەبا ئـەو ڕەشماڵـەی ڕادەتەكانـد، هاوسەریشـم "بەرەحمـەت بـێ" تونـد ئەسـتوندەكەكەی گرتبـوو {ئەسـتوندەك ئـەو كۆڵەگەیـە كـە لـە نێوەڕاسـتی ڕەشماڵەكـەدا دەچەقێنرێ} دەیگـوت: دەرووخـێ!! هەرچەدە مەحكـەمیش بەسـترابۆوە، لـە هەرچـوار دەورەی بـە گـوڵمیخ و سـینگان بەسـترابۆوە، بـەڵام ئێمـەش یەكــەم ئـەزموونی ئـەو جـۆرە ژیـانەمان بوو.

## دەستكردنم بە خەتمكردنی قورئـان لە نوێژەكـانی تەراویحـدا:

ئەو ماوەیەی كە لـە (سـەر گـۆڕان) بـووین ﴿واتـە: بـەهاری سـاڵی (١٩٨٦)﴾ مـانگی ڕەمەزانمان بەسەردا هات و ڕەمەزانەكەمان لەوێ گرت، من لەو كاتەشەوە ڕەمـەزانان قورئـانم خەتم دەكرد لە نوێژەكانی تەراویحدا، واتە: هەر شەوە یەك بەش (جـزء)ی قورئانم دەخوێنـدو بە سی (٣٠) شەوەكە قورئانم تەواودەكرد.

## چوونەخـوار بـەرەو زینـوو دووپشـك پێوەدانم لە نوێـژدا:

ئنجا كە ساڵ گەرم داهات و بەهار بەسەرچوو، چووینە خـوار بـۆ زینـووی ماخۆبزنـان، زینـووش هـەمووی ڕەزو بـاغ بـوو، كـانی و سەرچـاوەی لێبـوون و كەشـی هـاوین لـەوێ دەگـوزەرا، دیـارە زینـوو مـارو دوپشـكی زۆری لێبـون، بەیانییـەك مامۆسـتا مـەلا سـەید (عبدالرحمن)ی سەرسیان، كە پێشتر باسمكرد لەگەڵ مامۆستا مەلا سەید (عبدالله)ی ئامۆزای كە ئێستا هەردووكیان ئیمام و خـەتیبن لـە حـاجی ئـاوا، نـازانم كێـی دیكـەش بـوو، چـەند میوانێكمان هەبوون، منیش كە پێشنوێژییم بۆدەكردن، نوێژی بەیانی، وە خـاتون مـەلا ژنـی ڕەحمەتی لە پشتمانەوە لەگەڵ ئێمە نوێژی جەماعەتی دەكرد، ئێستاش چـاك لەیادمـە سـوڕەتی (الطـور)م دەخوێند، ئنجا سووڕەتەكەم بـە دووبـەش خوێنـد، لـە دوو ڕكاتـدا، لـە ڕكـاتی یەكەمدا كە چوومە سەجدە، زریكەم لە پەنجەوە هـات و شـتێك پێیـەوەدام، لەگـەڵ پێوەدانـدا یەكسەر بن هەنگڵم تەزی، ئێش و ژوارەكەی زۆر عەجیب بوو وامزانی مارە، یەكسەر هەموو لەشم ئارەقەی دەركرد، وادیـارە دووپشـكەكانی ئـەوێ ژەهریـان زۆر بەقوەتــە، بـەڵام مـن

نەمزانی دووپشکە، گوتم: ڕەنگـە مار بێ، تاریك بوو هیچم نەدی، ئیدی گـوتم: هەرچـی بێ نوێژەکەم نـابڕم، ئەوەندەم زانی لەپشـتی ئێمەوە، هاوسەرم دەستی کرد بە تەپە تەپێو دیار بوو بە نەعل یان پێڵاو شتێکی کوشـت، منیش لەوکاتـەدا هەڵوێسـتی ئـەو هاوەڵـەم هێنایـەوە بیرخۆم، کە لە نوێژێدا تیری لێدراوەو نوێژەکەی نەبڕیوەو کورتیشی نەکردۆتـەوە، لەوکاتـەدا ئەوم کردە سەرمەشقو سورەتی (الطـور)م هەر تەواوکرد، بەڵام زۆر ئارەقم کـردەوە، ئنجـا کە لە نوێژەکەم بوومەوەو سەلامم دایەوە، پێش ئـەوەی مـن قسـە بکـەم، هاوسـەرم گـوتی: مامۆستا! ئەوە دووپشك بوو کوشـتم، منـیش گـوتم: کەواتـە: دیـارە ئـەو دووپشـکە بـوو بەمنیـەوە داوە، مامۆستا مەلا سەید عەبدالرحمن گوتی: دووپشـك پێوەیداوی؟ گوتم: بەڵێ، مامۆستا! هەموو قۆڵـم تەزیوە، گوتی: ڕاوەستێ، ئەوە لە حەدیسـی پێغەمبـەردا "صـلی الله علیەوسلم" هەیە کە ئەگەر دووپشـك پێیەوەدای (مُعـوِّذات)ی لەسەر بخـوێنی: {الإخـلاص، الفلق، الناس}، وە لە خوێیاوکی هەڵکێشـی! منیش گوتم: ئنجا مەگەر ئەو سـوننەتە ئێسـتاکە جێبـەجێ بکەم، چونکە قەد دووپشـك پێیەوە نەدابووم، یەکەم جارو دواین جـاریش بـوو، "هەتا ئێسـتا: ١٥/ ١٢/ ٢٠١٤"، ئیـدی ئـەوەبوو خـاتوون مـەلاژن خوێیـاوکی گرتـەوەو مامۆستا مەلا سەید عبدالرحمن هەرسێك سوورەتی نـاوبراوی لەسـەر پەنجـەم خوێنـدنو، لـە خوێیاوکیان هەڵکێشاو، تا ڕاددەیەك ژواری شکا، بەڵام دەتوانم بڵـێم هەفتەیەکیشـی پێچـوو بوو، هەرجارەی دەسـتنوێژم دەگـرت، وەك تـازە پێـوەی دابێتمـەوە، کـە ئـاوی پێدەکـەوت ژانەکـەی تازە دەبۆوە.

## پێـوەدانی دووپشــك بە بەسـۆزی کچمـان:

هەر ئەو کاتەش بەسۆزی کچم پێـڕۆچکە بـوو، لـە پـایزی ١٩٨٤ بـۆ هـاوینی ١٩٨٦، ڕەنگە سـاڵێو نیو بـەرەو دوو سـاڵ چـووبێ، گـرنگ ئەوەیـە پێڕۆچکـەبوو دەڕۆیشـت، ڕۆژێك هەر ئەوەندەمان زانی دووپشك بە پاژنـە پێیـەوەداو، دایکـی یەکسـەر دووپشـکەکەی کوشت، ئیدی تا ماوەیەك هەر بە شـەلەشەل دەڕۆیشت.

## یادێکی مامۆستا مەلا موحەممەدی کونە فلووسەیی (شەهید) :

وەك پێشتریش باسمکرد ئەو ماوەیەی کە لە (گەڵوو) بووین کە هەمووی دەکاتە دەوری ساڵێك و شەش مانگ، چونکە بەپێی زانیارییەکانی کاك (عبدالکریم قادر خدرە سور) "کە بۆ زۆر لە مێژووەکان دەگەڕێمەوە لای وی" من دەبێ لە: (١/ ١٠/ ١٩٨٥) چووبمە گوندی (گەڵوو)، وە لە: (٤/ ٤/ ١٩٨٧) لەوێ هەڵقەنابم و کەوتبینە حاڵەتی خۆحەشاردان (إختفاء)ەوە، کەواتە: بەوردی: ساڵێك و شەش مانگ و چوار رۆژ لە گوندی گەڵوو ماوینەوە.

بەڵێ ئەو ماوەیە، چ کە لە گوندەکە بووین، چ کە چووین بۆ هەواری بەهارییان (سەرگۆڕان)، چ کە داپەڕینە خوار بۆ هەواری هاوینەیان (زینووی ماخۆبزنان) میوانی زۆرو جۆراو جۆرمان دەهاتن، کە لێرەدا بەپێویستی دەزانم یادی شەهید (مامۆستا مەلا موحەممەدی کونە فلووسەیی) بکەمەوە، کە شەوێك لە (زینوو) میوانمان بوو، کە پێش ڕاپەڕینی جەماوەریی ساڵی (١٩٩١) لەگەڵ هەرکام لە (دکتۆر خالص و حاجی منوَّر)دا لەلایەن ڕژێمەوە گیران و کوژران، خوا بە شەهیدی وەرگرتبن.

هەروەها خەڵکی دیکەی زۆر لە کوردو عەرەب و تورکمان میوانمان دەبوون، بەزۆری بەمەبەستی دەربازبوون لە دەستی رژێم و ئەودیوبوون بۆ ئێران، کە ئێستاش زۆر کەس لە ئەمەریکاو بەریتانیاو ئەڵمانیاو سویدو نەرویج و... هتدەوە دێنەوە، یان تەلەفۆن دەکەن و باسی ئەو ڕۆژگارە دەکەن، کە میوانی ئێمەبوون و هاوکارییان کراوەو... هتد.

هەڵبەتە ئەرك و زەحمەتەکەش زیاتر خێزانم (خاتوون مەلاژنی ڕەحمەتی) دەیکێشا، خوا پاداشتی بداتەوەو، بۆی کردبێ بە توێشووی بەرزەخ و قیامەت.

## بەردەوامبوون لەسەر: موتاڵاو نووسین و گەڕان و سەردان :

ئەو ماوەیە زۆر خەریکی موتاڵای تەفسیر دەبووم، ئێستاش هەندێك لە تەفسیرەکان کە تەماشایان دەکەم لەسەریان نووسراوە: سەرگۆڕان، زینووی ماخۆبزنان، گەڵووی

ماخۆبزنان، كە هەتا بەرگەكەیم خوێندۆتەوەو لێم نووسیوە، ئەو كاتەیش كە لەوێ بووم، كتێبی سێیەمم لەچاپ درا: كتێبی: {یادی خوا: گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا} كە وەك (پوختەیەك . .)و (دەبەرێك ڕاچوون . .) لە چاپخانەی (النجاح) لە بەغداد چاپكرا، وە سەرەنجام كتێبە بە ڕەسمیی و ئاشكرا چاپكراوەكانم بوون بە سێ:

١- (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام).

٢- (ئیسلامو ڕێچكان) كە ئەو كاتە لە سەرسیان بووم، لەچاپ دران، واتە: لە ساڵانی: (١٩٨٤و ١٩٨٥)دا،

٣- (یادی خوا) كە لە ساڵی (١٩٨٧)دا چاپكرا.

هەروەها لەوماوەیەدا كۆمەڵێك شتی دیكەم نووسین، كە بۆم چاپ نەكران، بەڵام وەك دەستنووس بڵاوەیان پێدەكرا، وەك {زنجیرەی: با چاكتر ئیسلام بناسین!} چەند ئاڵقەیەكم لێنووسیبوو، وە هەندێ كتێبی دیكە بناغەكەم دانابوونو ئیشم لەسەر دەكردن.

هەروەها لەوماوەیەدا جەولەو سەفەری زۆرم دەكردن، چ بۆ رانیەو سەنگەسەرو تووسووڕانو بەستەسێنو ژاراوەو قەڵادزێو پشدەر بەگشتی، چ بۆ دێیەكان بەگشتی، بەتایبەت شەش حەوت گوندەكەی (پشدەرە ڕەقە) بەشەوو بەڕۆژ، بەڵام وریایانە دەگەڕام.

## بیرەوەرییەكی خۆشی كاك حاجی عبدالرحمن نۆڕسیی‌و كاك تەها حاجی زاهیرو كاك عبدالواحدی برام:

ئەوكاتەی كە ماڵمان لە (زینوو) بوو، شەوێكیان كاك حاجی عبدالرحمن نۆڕسیی‌و كاك تەها حاجی زاهیرو كاك عبدالواحدی برام، هەرسێكیان پێكەوە میوانمان بوونو بەسەرهاتەكەیان بەمشێوەیە بوو: لە ئێرانەوە پێكەوە بە چیای قەندیلدا دێنەوەو، لە ڕێگا زۆر برسییان دەبێ‌و دەگەنە خەڵكی مەڕدارو نانو كەرەیان دەدەنێ، ئنجا وەك كاك تەهاو كاك عبدالواحد گێڕایانەوە دەیانگوت: پسكیتی قەیماغدارمان پێبوو، كاك حاجی عبدالرحمن ڕۆنە كەرەكەی دەخستە نێوان پسكیتە قەیماغدارەكانو پێی دەخوارد، دیارە ئەوانیش هەر

خواردوویانە بەس ڕەنگە کاك حاجی زیاتری خواردبێ، بەهەرحاڵ دیارە ئەوان ڕێیەکیان گرتوە ئاوی لێنەبووەو، ناوچەکەش بەگشتیی ئیشكو بێ ئاوەو، بە (کەندەبووکە)شدا سەرکەوتوون کە هەورازێکی بەرزو دوورە، ئیدی وردەوردە هەر هاتوونو تووشی ئاوەدانییەك نەبوون، کاك حاجیش کە زۆر تینووی بووە، زوو زوو لە کاك عبدالواحدی پرسیوە: بە چەندی دیکە دەگەینە ئاو؟! ئەویش گوتوویەتی: زۆرمان نەماوە با بڕۆین! هەڵبەتە کاك حاجی لەوان بەتەمەنتر بووەو ئەوان گەنجتر بوون، بۆیە هەرچەندە هەرسێکیان تینوو ماندوو بوون، بەڵام کاك حاجی لەوان شپرزتر بووە.

کاك تەهاو کاك عبدالواحد دەیانگێڕایەوە: کە کاك حاجی عبدالرحمن زوو زوو دەیگوت: کاکە ڕاوەستن! دەیانگوت: ئێمەش ڕادەوەستاینو کاك حاجی هەردووك لاقی بە کەندەکە هەڵدەپەساردنو سەری بۆ خوارێ، دەمانگوت: بۆچیوا دەکەی؟ دەیگوت: کاکە خوێنی سەرم هەمووی هاتۆتە بەری پێم، با تۆزێك بگەڕێتەوە!

ئنجا کاك حاجی خۆیشی دەیگێڕایەوە دەیگوت: دەمگوت: کاکە چەندی ماوە؟ کاك عبدالواحد دەیگوت: سەعاتێکی ماوە، دەیگوت: سێ سەعات دەڕۆیشتین هیچ دیار نەبوو، دیسان دەمگوت: کاکە چەندی ماوە؟ دەیگوت: ڕەنگە بە نیو سەعاتی دیکە بگەین، کەچی سەعاتێکی دیکە دەچووین هیچ دیار نەبوو! ئنجا شەو درەنگانێك کە گەیشتنە (زینوو)، هاتنە ماڵی ئێمە، دیارە تاریك بوو، بەڵام بە دەنگی کاك عبدالواحدو کاك تەها کە بۆخۆم ناردبوومن، ناسینمەوە، بەڵام کاك حاجی عبدالرحمن، چونکە لە سەرەتاوە زمانی باش گۆی نەدەکردو هەر گلدە گلدی بوو، تاریکیش بوو سەرو سیمای دیار نەبوو، بۆیە پرسیم: ئەوە کێیە لەگەڵتان؟ یەکیان گوتی: کاك حاجی (عبدالمجید)ە ئەوانیش لە تینوێتیو ماندوێتیی ناوەکەیان لێ تێکچووبوو! پاشان دوای ئاوخواردنەوەو تۆزێك پشوودان، کاك حاجی بە هەناسە برکەو نەخۆشییو ناڵەناڵەوە ڕووی تێکردمو گوتی: کاکە ئەو برایەی تۆ تەقدیری مەسافاتی زۆر ناتەواوە، گوتم: چۆن؟ ئیدی بۆی گێڕامەوە گوتی: دوای ئەوەی گوتی: نیو سەعاتی ماوە، سێ سەعات دەڕۆیشتین، هیچ دیارنەبوو!

پاشان هاوسەرم كە شارەزاییەكی هەبوو لە چارەسەری نەخۆشییداو، هەمیشە هەندێك دەرزیو دەرمانی جۆراو جۆری لەلابوون، چەند دەرزییەكی لێدانو زۆری نەخایاند كاك حاجی تۆزێ هاتەوە سەر حالێ، بەڵام هەرماندوو شەكەت بوو، ئنجا هەر ئەو شەوەش كاك مەلاوریای خەتێ كە لە بنەماڵەی مامۆستای گەورەی (خەتێ)یەو ناوی ئەسڵیی (عبدالباسط)ەو كەسێكی دیكەشی لەگەڵدابوو، دەیانویست بچن بۆ ئێران، دیارە كاك حاجی عبدالرحمن بۆ كاری حیزب هاتبوو، بۆ ئیشی ڕێكخستنی نێوخۆ، ئنجا كاك مەلاوریا گوتی: مامۆستا عبدالرحمن! وەسیەتت چییە، ئێمە ئەوە ئەمشەو دەڕۆین؟! كاك حاجی نۆڕسیش بە ناڵەناڵەوە گوتی: كاكە وەسیەتم ئەوەیە: كەرە مەخۆن بە سەلامەتی دەگەنە جێ!

لێرەشدا بەپێویستی دەزانم وەك ئاماژەیەكی كورت بە كەسایەتیی مامۆستا عبدالرحمن مەلا مارف، ناسراو بە (حاجی نۆڕسیی) بڵێم:

ئەو برا بەڕێزە وێڕای ئەوەی كە دۆستێكی دڵسۆزی دێرینمە، یەكێكیشە لەو كەسایەتییە كەمانەی كە ڕۆڵی ڕێگاشكاندنو سەرمەشقێتییان بینی لەكارو كاروانی ئیسلامیی كوردستانداو، ماوەیەك بەرپرسی گشتیی هێزی پێشمەرگەو مەكتەبی سەربازیی لەشكری قورئان بوو، كە باڵی سەربازیی (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) بوو، پێش ئەوەش هەر خاوەنی هەڵوێستی جوامێرانەو دڵسۆزانە بووە، بۆ بەرگریی لە ئیسلامو بەرپەرچدانەوەی ناحەزانی.

پاشانیش ماوەیەك وەزیری داد بوو، لە یەكێك لەكابینەكانی حكوومەتی هەرێمو دەڤەری سلێمانیدا، لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشووەوە.

## بیرەوەرییەكی ڕەحمەتی: مامۆستا مەلا محەمەد ساڵح شارەزووریی و كاك حاجی موخلیس یونس:

لە ساڵی (١٩٨٦)دا هەركام لە مامۆستای شارەزووریی "بەرەحمەت بێ" و كاك حاجی موخلیس (خاوەنی نووسینگەی تەفسیر) كە لە ڕژێم قاچاغ بوون، ماوەیەك نازانم مانگێك یان زیاتربوو، لە ماڵی ئێمە بوون، چونكە لە ڕژێم قاچاغ بوونو لەخۆیان دەترسان.

ئیدی شەوێکیان هەواڵمان بۆهات گوتیان: جەیش و جاش هات، کۆمەڵە میوانێکمان هەبوون، مامۆستای شارەزووریی و کاك حاجی موخلیسیان لەنێودابوون، دیارە من تفەنگی خۆم پێبوو، هاوسەریشم (دوو سێ تفەنگی ئەمانەتمان لەلابوون) تفەنگێکی هێنا دایە دەست مامۆستا (مەلا موحەممەد) شارەزووریی و، تفەنگێکی دیکەشی دایە دەست مامۆستا موخلیس و گوتی: ئێوە برۆن، خەمی منتان نەبێ، خەڵکی دێ هەمووی خۆمانەیە، هەرچەندە هەواڵەکە راستیش نەبوو، بەس ئێمە وامانزانی ڕاستە، ئیدی دەرچووین بەرەو شاخ، بەرەو زینووو سەرگۆڕان چووین.

شایانی باسیشە من ناوم لە مامۆستای شارەزووریی ڕەحمەتیی نابوو: (سۆفی مەحموود) چونکە ڕیشێکی ماش و برنجی هەبوو، نازناوی سۆفیی لێدەوەشایەوە، هەرچەندە پێموایە خۆی بەو نازناوە دڵخۆش نەبوو، هەروەها ناوی کاك حاجی موخلیسیشمان نابوو (کاك خدر) گوتم: : چونکە ناوی (موخلیس) لەم دەڤەرە نامۆیە.

ئنجا کاتێك کە بەڕێوە دەڕۆیشتین، مامۆستا مەلا موحەممەد ڕوویکردە کاك موخلیس، کە ئەوکاتە سەر بە برایانی مسوڵمان (إخوان المسلمین) بوو، گوتی: کاك موخلیس چەند ساڵە سەر بە (إخوان المسلمین)ی؟

گوتی: دەوری (١٨) ساڵە.

گوتی: لە ماوەی ئەو هەژدە ساڵەدا شەوێکی ئاوات بەخۆتەوە بینیوە، کە تووشی چوونە چیا ببی، بە چەکەوە؟!

گوتی: نەخێر.

گوتی: بڕوا بکە هەژدە ساڵی دیکەش (إخوان المسلمین) بی، شتی ئاوا نابینی!

ئیدی چووینە ئەشکەوتێ و ئەو برایانەی لەگەڵماندا بوون، کوڕانی دێ، داریان هێنا و ئاگریان تێبەردا، چونکە شەوگار ساردبوو، پاسەوانیشمان دانا، نەوەك جاش و جەیش بێن و دۆخەکەمان تۆزێ بە مەحکەمی گرت، ئنجا لەکاتێکدا کە لەبەر ئاگرەکە دانیشتبووین، مامۆستا شارەزووری گوتی: ئەرێ مامۆستا؟

گوتم: بەڵێ؟

گوتی: ئایا سوورەتێك لە قورئاندا نیە باسی (کهف) دەکا، (کهف) یانی چی؟ یانی ئەشکەوت؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: بەسەرهاتێکی تێدایە لام وابێ باسی برادەرانی ئەشکەوت دەکات، ئەگەر تۆزێکمان بۆ باس بکەی، گوتم: زۆر چاکە، منیش تۆزێك لە سوورەتی (کهف)م خوێندو تۆزێ تەفسیرم کرد بۆ ئەوانەی دانیشتبوون، ئەویش نێوە نێوە قسەی تێدا دەکرد، گوێم لێبوو یەکێکیان کە کاکە مەلایەك بوو، گوتی: من تا ئێستا سۆفی وا شارەزاو ڕۆشنبیرم نەدیوە، ئەو سۆفییە زۆر شارەزایە، هەڵبەتە نەیاندەزانی کە ئەوە مامۆستا شارەزووریيە، ئیدی لەوێ بووین تا نوێژی بەیانیمان لەوێ کرد، پاشان کە بۆماندەرکەوت هەواڵەکە ڕاست نیە، گەڕاینەوە بۆ گوند.

## ئاهەنگگێڕانی جەماوەری بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە "صلی الله علیه و سلم":

یەکێکی دیکە لە بیرەوەرییەکانی ئەو کاتەم کە لەوێ بووین، بۆ یەکەم جار ئاهەنگی لەدایکبوونی پیێغەمبەرمان "علیه الصلاة والسلام" گێڕا بەشێوەیەکی جەماوەریی لە گوندی (دووگۆمان) کە ئێستاش لەوانەیە کاسێتەکەی مابێ، خەڵکێکی زۆر هاتبوون لە ڕانیەوە، لە قەڵادزێوە، لە چوارقوڕنەوە، لە دێهاتی دەوروبەرەوە، لە سەنگەسەرو حاجی ئاواو تووەسوورانەوە، مەلاو ڕیشسپیی و گەنج و زۆر لە چین و توێژەکانی خەڵك هاتبوون، هەڵبەتە من وتارمدا، ئەوکاتە کە جاروبار شیعرم دەنووسی، بەوبۆنەوە لەبارەی پێغەمبەرەوە پارچە شیعرێکم دانابوو، کاك مەلا ئەحمەدی هەنارۆکێ بە سروود خوێندیەوە، هەڵبەتە شیعرەکەم لەیاد نەماوە، بەڵام باسی پێغەمبەرم " علیه الصلاة والسلام " کردبوو وەك بڵێی کورتە ژیانێکیم خستبووەڕوو، چۆن ئیسلامی هێنا؟ بانگەوازی، کۆچکردنی، جەنگ و جیهادی، ئاوارەیی و نارەحەتیی و گرفتاریی، دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی، کە خوا بە

یەکگرتن‌و دادگەریی ئازادیی‌و ڕەوشت بەرزیی‌و برایەتیی‌و تەبایی‌و . . . هتدی بڵاوکـردەوە، بەکورتی: هـەم وتارەکـەو هـەم شـیعرەکە، وتـارو شـیعرێکی فیکریـی عەقیـدەیی سیاسـیی کۆمەڵایەتیـی بوون.

ئنجا چونکە یەکەم جار بـوو ئاهـەنگی لـەدایکبوونی پێغەمبــەری خـوا "صـلی الله علیـه وسلم" بەو شـێوەیە بکرێ، بۆیە سەدایەکی زۆری هەبوو، خەڵك زۆر دڵی پێ خۆش بـوو، ئیدی لەوە بەدوا، لەو ناوچەیەی ئێمـە بەتایبـەت کـرا بـە خـوو، کـە لـەدایکبوونی پێغەمبـەر جاروبار بەو شێوەیە دەکرایەوە.

## بیـرەوەرییـەك لەگەڵ كاك عەبـاس بایــزدا :

ڕۆژێکیان کاك عەباس بایز باڵواغاو کاك برایم کانـەبی ئاغای ئامۆزای، هاتن بۆ گونـدی گەڵوو، دیارە هەردووکیـان چەکداری ڕژێـم بـوون‌و فەوجیــان هـەبوو، هـاتن کـە داوا لـە خەڵکی گەڵووی ماخۆبزنان بکەن، چەك هەڵبگــرن، (هەڵبەتـە ئـەو مەســەلەیە تەفسـیلێکی هەیەو من بە کورتی دەیگێڕمـەوە) ئنجا بەر لەوەی کـاك عـەباس‌و کـاك بـرایم ئاغـا بـێن مـن ئامۆژگاریی خەڵکەکەم کردو گوتم: کاکە خۆتان تووشی چەکداریی ڕژێم مەکـەن، شـتێکی خراپەو دوایی دەکوژرێن‌و بە هیـلاك دەچن‌و پارەو مووچەکەتـان حەرامـە، ئـەو ڕژێمـە هـی ئەوە نیـە چەکی بۆ هەڵبگــرن‌و زۆر ئامۆژگارییم کردن.

ئیدی کە هاتن نزیکی کاتی بانگی عەسـر بـوو، بانگیـدا، گـوتم: بـا بچـینە مزگـەوت، چووینە مزگەوت، نوێژمان کردو سەلامان دایەوەو، خوا هەڵناگرێ کاك عەباس زۆر ڕێـزی منی گرت، منیش گوتم: کاك عەبـاس فەرموو، ئەگەر جەنابت قســـەیەکت هەیـە، ئیـدی کاك عەباس دەستی بە قســان کـردو گـوتی: خزمینـــە! لەبەرئـەوەی خەڵکتــان دەگـیرێ‌و تووشی گرفتاریی دەبن، پێم خۆشـە چەك هەڵبگرن، بۆئـەوەی بتـوانم بـەرگرییتان لێبکـەم‌و ناسنامەو پسوولەیەکتان پێدەبێ، کە بتوانم بڵێم سەر بە ئێمەن! ئـەوانیش هەنـدێکیان قسـەیان کرد، قسەی نەرم‌و لاوازیان کرد، یەکیان گوتی: ئێمە لە سایەی خـواو سـەری جـەنابت تـا ئێستا سەلامەت بووین، گوتم: بە خوا سوودی نیە با بۆخۆم قســە بکەم باشە، گوتم: کـاك

عەباس‌و كاك برایم ئاغا! من سوپاستان دەكەم، دیارە ئێوە ریشسپیی ئەو خەڵكەن‌و بۆیە هاتوون دڵسۆزییان بۆ دەنوێنن‌و بۆ چاكەی ئەوانتانە، بەڵام بەڕاستی ئەوە ئێوە وەزعەكەتان ئاوایە تووش بوون، دەنا من پێمخۆش بوو ئێوەش چەكتان پێنەبێ، چونكە ئەو رژێمە هی ئەوە نیە بەرگریی لێبكرێ، كاك عەباسیش گوتی: بە خوا مامۆستا وایە، هەموو كەس دەزانێ من بە ناچاریی تووش بووم، گوتم: ئنجا ئەگەر جەنابت ناچاری، ئەوان ناچار نین‌و با تووشی ئەوە نەبن، خوانەخواستە دوایی تووشی كوژران دەبن‌و بە هیلاك دەچن، ئەویش گوتی: ئنجا من لەبەر ئەوانمە، ئەگەر پێیانخۆش نەبێ، خۆیان دەزانن، ئیدی كە من قسەم كرد خەڵكەكەش دیار بوو بە قسەكەی من ئیكتیفایان كرد، ئەوەی كە چەكیشی هەڵگرتبوو هی پێشتربوو.

پاشان كاك عەباس‌و ئەوانمان بەڕێكرد، بەڵام دیار بوو دڵیان ئێشابوو، بۆیە هەندێك دۆست‌و مەلای برادەرم گوتیان: كاك عەباس ئەو رۆژە دڵی ئێشاوەو ئەگەر ئاشتی بكەیەوەو سەردانێكی بكەی باشە.

منیش گوتم: باشە دەچین، بەڵام من كێشەم ئەوەیە كە شتی ئەوان ناخۆم، ئەو كاتە خواردنی هەرچی چەكداری رژێم، یان بەهەر شێوەیەك سەر بە رژێم بووایە، نەمدەخوارد، نە ئاو نە نان نە چایی...هتد. گوتیان: قەیناكا هەر دەچین، كە چووین بۆ ماڵی كاك عەباس، سەرەتا چایان هێنا، نەمخواردەوە، گوتیان: ڕەنگە مامۆستا هەر چایی نەخواتەوە، گوتم: ئیشاڵڵا هەر چایەكەیەو كۆتایی پێدێ، كەچی دوای چایەكە، نازانم كاكاو یان نسكافە بوو هێنایان، ئەویشم نەخواردەوە، ئنجا میوەیان گێڕا، هاتە لای من سێوو پرتەقاڵ بوون، دیسان هیچیانم هەڵنەگرت، ئنجا كە وەرسووڕا بەرەو ئەولا، مامۆستایەك لە تەنیشت من بوو، دیار بوو سێوێكی گچكەی هەڵگرتبوو، گوتی: كاكە وەرەوە، گچكەكەی دانایەوەو سێوێكی گەورەتری هەڵگرت! ئنجا كە میوە گێڕەكە ئاوا تێپەڕی، دیارە منیش هیچم لەبەردەم نەبوو، كاك عەباس تەماشای كردو یەكێك لە دانیشتووانیش بە دەنگی بەرز گوتی: مامۆستا! ئەوە بۆ تۆ میوەت هەڵنەگرت؟ گوتم: وای بەباش دەزانم ئێستا نەخۆم، پێمخۆش نەبوو بڵێم: ئەوە حەرامە، گوتم: بۆچی دڵی خانەخوێ بێشێنم، هەڵبەتە دەیانزانی كە لەبەر

ئەوەیە، بەس نەمدەویست بەڕاشكاویی بیڵێم‌و گوتم: با چاودێریی شعووری خانەخوێ بكەم، چووم ئاشتی بكەمەوە، بۆچی دووبارە تووڕەی بكەمەوە! بەلاَم بابای پرسیاركەر كە ریشسپییەك بوو، هەر هەڵیكۆڵی‌و گوتی: ئەدی مامۆستا بۆچی ئێمە دەخۆین؟ گوتم: ئاخر ئێستا بە پێویستی نازانم بیخۆم، نەشمدەتوانی بڵێم ئیشتیام لێی نیە، چونكە ئیشتیام لێی بوو، بۆیە دەبوو بە درۆ، بۆیە گوتم: بە پێویستی نازانم‌و ئێستا بە چاكی نازانم، گوتی: نامامۆستا دیارە بە حەلاڵی نازانی، گوتم: بەڵێ بە حەلاڵی نازانم، ئەو كە پرسیاری كرد، ناچار بووم، ئاوا وەلاَمی بدەمەوە، ئنجا گوتی: مامۆستا ئەها ئەو مامۆستایە یەكێكی گچكەی هەڵگرتبوو پێی ڕازی نەبوو، یەكی گەورەتری هەڵگرت، ئەدی بۆچی تۆش هەر مامۆستای‌و ئەویش هەر مامۆستایە، گوتم: كاكە هەر كەس بە عەقڵی خۆی بەڕێدا دەڕوات، ئیدی بەوجۆرە بووە موناقەشە، منیش گوتم: مامۆستایان! پێویست ناكا زۆر سەری یەكدی بێشێنین، ئێستا بەهەرحاڵ من ئەو پارەیەی كە وەردەگیرێ لە بەرانبەر ئەوەدا كە خزمەت بەو ڕژێمە دەكرێ، بە حەلاڵی نازانم.

ئنجا یەكێك لە چەكدارەكان گوتی: جا خۆ ئەو مامۆستایانەش هەر مووچە لە ڕژێم وەردەگرن، گوتم: ئنجا ئەگەر مامۆستاش قسەی ناهەق بكاو، ئۆباڵی بە ناحەق بكێشێ‌و، فەتوای غەڵەت بدات، ئەویش هەروا دەبێ‌و پارەی ئەویش حەڕام دەبێ.

دوایی گوتم: بەڕێزان! ڕاستییەكەی من هیچ كێشەی شەخسیم لەگەڵ هیچ كەس نیەو، تەنیا لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا كێشەم هەیە، پێموایە ئەو پارەیەی كە لە بەرانبەر ئەو خزمەتەدا وەردەگیرێ، كە بەو ڕژێمە دەكرێ، حەلاڵ نیە.

پاشان گوتم: ئێستاش كاك عەباس! بۆیە هاتووین كە جەنابت ئاشت بكەینەوە، ئیدی سەرەنجام ئاشتبووینەوە.

هەڵبەتە ئێستا ڕەخنەم لەو وشكیی‌و سەختگیرییەی ئەو كاتەم هەیەو خۆم پێ هەڵەبووە، بەلاَم واقیعەكە وابووەو تازە ناگۆڕێ! دیارە ناشڵێم ئەو جۆرە مووچەو پارەیە حەڕام نەبووە، چونكە هەر مووچەو كرێیەك لە بەرانبەر كارێكی خراپ‌و ناشەرعیدا وەربگیرێ، ئەوساو ئێستاو لەمەودواش، هەر حەڕامە، بەلاَم بێگومان شەریعەتی خوای میهرەبانیش

سەغڵەتکاریی (إحراج)ی تێدا نیە، وەك خوا "عزّ وجل" فەرموویەتی: ﴿...وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ... ﴿٧٨﴾﴾ الحج، واتە: هەروەها (خوا) لە ئاینی خۆیدا ئێوەی تووشی سەغڵەتی نەکردوە، دیارە ئەو خەڵکەش بایی ئەوەندە ماڵی حەلاڵیان هەر هەبووە کە شتێکیان لەلا بخۆی.

## لەدایکبوونی منداڵی دووەممان (پیرۆزە):

لە رۆژی ٩/ ٢/ ١٩٨٦ خوای بەخشەر دووەمین منداڵی پێبەخشین کە ناومان نا (پیرۆزە).

ئنجا بەوبۆنەیەوە با بیرەوەرییەکی خۆشی دایکی رەحمەتیم بگێڕمەوە: رۆژێکیان پاش لەدایکبوونی (پیرۆزە)ی کچم، لە خوار گوندی (گەڵوو) بە دایکم گەیشتم کە بەبۆنەی منداڵبوونی هاوسەرمەوە هاتبووە سەردانمان، منیش لەگەڵ چەند گەنجێکی گوند بە جەولەو گەڕان دەرچووبووم، دایکم "بەرەحمەت بێ" گوتی: ڕۆڵەگیان! ئەم جارەش کچتان بوو، حەزمدەکرد کوڕتان بووایە!

منیش گوتم: دایە گیان! کوڕمان بۆچییە؟! ئەدی ئەوە نیە بۆخۆم کوڕم؟!

دایکیشم پێکەنی و هیچی نەگوت.

ئنجا دوایی دایکم دەیگوت: ڕۆڵەگیان! بە بیستنی هەواڵی لەدایکبوونی کچی دووەمتان دڵم توند بوو، بەڵام کە ئەو قسەیەت کرد، دڵم هیچی تێدا نەماو بە پێچەوانەوە دڵم خۆش بوو.

# جێ پێ لەقبوون و هەڵكەنرانمان لە گوندی (گەڵوو)و كەوتنە حاڵەتی خۆحەشاردانەوە

وەك پێشتر باسمكرد بەهۆی (كاك عەباس بایز باڵواغا)وە لە گوندی (گەڵوو) حەوابووبوومەوە، بەڵام دوایی بۆم دەركەوت كە كاك عەباس بەردەوام فشاری ڕژێمی لەسەربووە بەهۆی منەوە، هەتا سەرەنجام ئینزارێكی توندیان داوەتێ، كە نابێ فلانكەس لەوێ بمێنێ و، ڕەنگە داوای دیكەشیان لێكردبێ "بەلای كەمەوە گرتنم! [1]" ئیدی ئەوەبوو كە ئاگادار كرامەوە كە (گەڵوو) بەجێ بهێڵین بە زووترین كات! بۆیە دوا وتاری جومعەم بۆ خەڵكی گونددا و، سوپاسم كردن لەسەر دڵسۆزییان و پشتگیرییان بۆم، وەپاش داوای گەردن ئازادیی، خواحافیزیم لێكردن.

دیارە خەڵكی گوندیش بەگشتی زۆر نیگەران بوون و هەندێكیان دایانە پرمەی گریان!

پاشان هاتمەوە ماڵ و وەك گوندی (سەرسیان) بە هاوسەری ڕەحمەتییم (خاتوون مەلاژن)م گوت:

خاتوون مەلاژن! ئێرەشمان چوو، دەبێ لێرەش بڕۆین!

ئەویش بەشپرزەییەوە گوتی: بۆ كوێ؟

---

١) شەوی ٣/٤-١-٢٠١٥ كە بەبۆنەی گەڕانەوەیەوە لە چارەسەری نەخۆشیی، سەردانی كاك (حاجی عەباس بایز) مان كرد، ئاوا باسی ئەو مەسەلەیەی كردو گوتی:

لە بەغداد لە دوایان ناردم بچم، منیش دڵم خەبەری دا كە لەبارەی تۆوە قسەم لەگەڵ دەكەن، بۆیە بە برایماغا (برایمی كانەبی ئاغا ئامۆزای كاك عەبباس)م گوت: هەر كات لە بەغداوە دەربارەی فلانكەس (عەلی باپیر) تەلەفۆنم بۆكردی، ئاگاداری بكەوە، با بڕواو تووشی زیان نەبێ!.

ئنجا كە چووم: مودیری شوعبەی سێ، بەناوی (عمید ركن ولید) كە بە (أبو خالد) ناسرابوو پێی گوتم: دەبێ ئێستا تەلەفۆن بۆ برایماغا بكەی و پێی بڵێی (عەلی باپیر) بگرێ یان بكوژێ.

منیش تەلەفۆنم بۆ برایماغا كردو قسەكەم پێ گوت، بەڵام پێشتر لێم حاڵی كردبوو چی بكات!

گوتم: جاریّ نازانم، بەڵام دەبیّ جاریّ بچیە ماڵێك‌و خۆت پەنهان بکەی، هەتا خۆم لێت دەپێچمەوە.

ئنجا خۆیشم لەگەڵ کاك عەبدولکەریم قادر خدرە سوورو سیّ چوار برادەری دیکە "کە ناوەکانیانم لەیاد نیە" لە رۆژی: ٤/ ٤/ ١٩٨٧ لەگەڵووی ماخۆبزنانەوە بەرەو رانیە هاتین‌و، بە چیای (کێوەرەش)دا ئەودیو بووین‌و شەویّ هاتینە رانیە.

## نیشتەجێبوونم لە رانیە و سەرگەرمبوونم بە خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان:

ئەو ماوەیەی کە کەوتمە حاڵەتی خۆپەنهانکردنەوە کە زیاتر لە سیّ مانگ بوو، لە: (٤/ ٤/ ١٩٨٧)ەوە تاکو: (١٩/ ٧/ ١٩٨٧) هەر لە ماڵی (مامۆستا مەلا....) بووم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم) وە ئێستاش جەنابی مامۆستا ماڵیان لە رانیەیە، خوا پاداشتیان بداتەوە، خۆی‌و خێزانی، چونکە ئەو ماوەیە وێرای ئەوە کە ترسی زۆر لەئارادابوو و، ئەگەر رژێم پێیزانیبام مامۆستاش بەمنەوە گرفتار دەبوو، بۆیە بەراستیی ئەو هەڵوێستەی مامۆستا {....} جۆرێك بوو لە فیداکاریی‌و گیانبازیی‌و هەرگیز ناتوانم شتێك بڵێم‌و بکەم، کە پاداشتی ئەو هەڵوێستە برایانەو جوامێرانەیەی بیّ‌و، پاداشتیان بەس بە خوا دەدرێتەوە.

شایانی باسیشە من مانگەکانی: شەعبان‌و رەمەزان‌و شەووال، هەر لە ماڵی مامۆستا بووم، لە ژوورەکەی قاتی سەرەوەی خانووەکەیان لەگەرەکی (قولە)، وە ئەو ماوەیەش بەزۆریی هەر بەرۆژوو بوومو، سەرگەرمی موتاڵای تەفسیرەکانی قورئان‌و موراجەعەی قورئان بووم، تەفسیرەکانیش هی: (الطبري، إبن کثیر، الرازي، الزمخشري، البیضاوي، الآلوسي، سید قطب...) بوون‌و عادەتیشم وابوو هەموویانم لە بەرگەوە بۆ بەرگ موتاڵا دەکرد، ئنجا چوار بەرگ بووایەن، یان (١٢) یان (١٥).

دیارە لە برادەرەکانیشم "وەك بێتەوە یادم" تەنیا کاك عەبدولکەریم، بە شوێنەکەمی دەزانی‌و هاموشۆی دەکردمو، زۆر پەنهانکارییمان دەکرد، دووبەش لەبەر ماڵی مامۆستاو سەلامەتییان.

واتە: هەردەرچوونێکم ببووایە، بە شەو دەردەچووم لەگەڵ کاك عەبدولکەریـمداو، هـەر بە شەویش یان بە تاریکی بەرەبەیان دەگەڕامەوە شـوێنی خۆم.

## لەدایکبوونی منداڵی سێیەممان (موحەممەد) لە گوندی (بۆسـکێن):

ئەو ماوەیەی کە لە حاڵەتی خۆپەنهانکردن دابـووین، خێـزانم (ڕوخسـارخانی ڕەحمـەتیی) دوای ئەوەی کـاك عەبدولواحیـدی بـرام لـە گـەڵووەوە هێنابوویـەوە بـۆ بۆسـکێن، هـەموو ماوەکە، کە سێ (٣) مانگ زیاتر بوو، هەر لە ماڵی بابی مامۆسـتا (حەسـەن بابـەکر ئەحمـەد) بوو، واتە: ماڵی (مام حاجی خدر) کە ئێستاش ماوەو هەر لە گوندی (بۆسـکێن)ە، خـۆیو حاجی ژنە (ئامان)ی هاوسەری، دیارە بابی مامۆستا حەسەن بابەکر، نـاوی حـاجی خـدرەو بۆیە مامۆستا حەسەن ناوی بە: (حەسەن بابـەکر) ڕۆیشـتوە، چـونکە کـاتی خـۆی، سـاڵی (١٩٦٥) لە سۆنگەی ئەوەوە کە بابی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بـووەو لـە ڕژێـم قاچـاغ بووە، لە ماڵی مام بابـەکری مـامی کـە لـە ڕانیـە بـوون خوێندوویـەتیو، بـە نـاوی مامیـەوە نووسراوە: حەسـەن بابەکر! دیارە چاکەی ماڵی مام حاجی خدر بەسـەرمانەوە، هەرئەوەنـدە نیـە، خـوا پاداشـتیان بداتـەوە، بـەڵکو زۆر زۆرە، چـونکە (موحەممـەد)ی کـوڕم لـە: (٢/ ٥/ ١٩٨٧) لە ماڵی ئەوان لەدایکبووە، لە حاڵێکدا کە لە ڕژێم قاچاغ بـووینو، (حـاجی ژنە ئامان)ی هاوسەریو کچەکانی زۆر پێمـانەوە ماندوو بوون.

بەڵام چاکەی برای زێدە دڵسۆزو بەڕێزم: مامۆستا حەسەن بەسەرمەوە هەر لە زووەوەو تـا ئێستاش، لە هەموو قۆناغەکانی ژیانماندا، ئەوەندە زۆرە بەئاسانیی باس ناکرێ.

هەروەها کاك عەبدولکەریم قادریش لەو ماوەیـەدا "لـە حاڵـەتی خۆپـەنهانکردن" و پـێش ئەوکاتیو هەتا ئێسـتاش، برایەکی ساغو دڵسۆزو فیداکارم بـووە، خـوا بـە چـاکترین شـێوە پاداشتی هەموویان بداتـەوە.

# چەند بیرەوەرییەکی ئەو ساڵ و نیوەی گوندی گەڵوو

بە پێویستی دەزانم چەند شتێکی ئەو ماوەی ساڵ و نیوە کە لە گەڵووی ماخۆبزنان بووم، هەروەها لە هەوارگەی سەر گۆڕان و زینوو بووم، کە وەك پێشتر باسم کرد دەوری ساڵ و نیوێك بوو، لە سەرەتای مانگی (١٠)ی ساڵی (١٩٨٥)ەوە تاکو ٤/ ٤/ ١٩٨٧، لەم سەفەری پڕ هەورازو نشێوەی ژیانمدا ئاماژە پێبدەم.

## خەون بینین بە پێغەمبەری خواوە "صلى الله عليه وسلم" و مۆژدەی زۆرخۆش :

یەکێك لەوانە ئەوە بوو کە لە ساڵی (١٩٨٦)دا بۆ جاری دووەم لە خەوندا بە خزمەت پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" گەیشتم، جاری یەکەم ئەوەبوو کە پێشتر باسم کرد کە لە گوندی (کاژێ)ی کوردستانی ئێران خەونم بە گۆڕی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" و تەرمی موبارەکییەوە بینی، بەڵام ئەمجارەیان خەونەکەم بەم شێوەیە بوو:

﴿لە خەونمدا پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" و کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانی بەڕێزی، "خوا لێیان رازی بێ" میوانم بوون، ئنجا ئەو خانووەی کە لە گوندی (گەڵوو) تێیدا بووین چوار ژوور بوو، هەموو ژوورەکان لە هاوەڵان پڕ بووبوون، وە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" ئەو ژوورە کە کتێبخانەکەمی تێدابوو، کە ژووری میوانان بوو، تەشریفی لەوێ بوو، دیارە زۆرێك لە هاوەڵانی بەڕێزیشی لەوێ دانیشتبوون، بەڵام بێجگە لە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" کەسم لێنەدەناسین، بەس دەمزانی هەموویان هاوەڵانی بەڕێزن.

ئنجا پێغەمبەری خوام "صلی الله علیه وسلم" وا هاتە بەرچاوم وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، ئەوەندە ڕووناكو بە شەوق بوو، چاوی لەبەر هەڵنەدەهاتو ژوورەكەی پڕ كردبوو لە ڕۆشنایی.

دیارە من خەونەكەم وابینی كە ئەوان تەشریفیان هاتبوو و دانیشبوونو، منیش ڕاوەستابووم خزمەتم دەكردن، لەگەڵ هاوسەری ڕەحمەتییم (ڕوخسار خان)دا، ئەوەبوو پێمگوت: خاتوون مەلاژن! ئەو ترێیە بێنە با دایبنێین بۆ پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" و هاوەڵانی، لە خەونمدا ترێی سپیمان هەبوو، خێزانیشم گوتی: ئاخر ئەو ترێیەمان بۆ دایكت كڕیوە، چونكە دایكت بڕیارە میوانمان بێ، منیش گوتم: باشە ها ئەوە پارە "یان یازدە پەنجایی بوو یان یازدە دینار بوو" گوتم: ها ئەوە پارە دوایی كە دایكم هات ترێی بۆ بكڕە، بەڵام ئەوەیان بێنە جارێ ئێستا دایبنێ. ئەوجار خێزانم گوتی: پێموایە ئەو میوەیە شایستەی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی نیە، (واتە: پێم لەوان ناوەشێتەوەو ئەوان میوەی جوانتریان قابیلە) منیش تەماشایەكی پێغەمبەری خوام "صلی الله علیه وسلم" كردو گوتم: (ما عاب رسول الله طعاماً قط) ﴿كە دیارە ئەم دەقە لە سوننەتدا هاتووە بوخاریی بە ژمارە: ٥٤٠٩ و موسلیم بە ژمارە: ٢٠٦٤، هێناویانە" واتە: پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" هەرگیز ڕەخنەی لە هیچ خواردنێك نەگرتوە﴾ پێغەمبەریش "صلی الله علیه وسلم" سەری هەڵبڕی فەرمووی: عەیبی نیە ئەو خواردنە هەركەسێك لێی بخوات ان شاء الله جەنگو جیهاد دەكات لە ڕێی خوادا، دیارە منیش زۆر دڵم خۆش بوو و گوتم: دەبێنە بۆیان دابنێ، ئیدی میوەكەمان بۆ دانان، بەڵام وێڕای ترێ، كاڵەكیشمان سپی كردبوو، قاش قاشو وردمان كردبوو، ئەویشمان بۆدانابوون.

ئنجا دوو دوو پێكەوە میوەكەمان دەخواردو، منیش لە خزمەت پێغەمبەردا "صلی الله علیه وسلم" میوەم دەخوارد، ئەو دووەمان پێكەوە بووین، لە كاتێكدا كە میوە دەخورا، من هاتە دڵم گوتم: وا باشە بەرماوەی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" نەهێڵمەوە، (واتە: ئەوەی كە لە قاپەكەدا دەمایەوە) دوایی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" دەستی كێشایەوەو منیش ئەوەی مابۆوە هەموویم تەواو كرد، زیاتر بەهۆی ئەوەوە كە لەبەر ئەو زاتە بەرزە

ماوەتەوە، بەڵام هەرلەوکاتەشدا هەستێکی دیکەشم بەدڵدا هـات: گـوتم: پێغەمبـەری خـوا "صلی الله علیه وسلم" ئەوەیشی بە دڵدا نەیەت کە: فلاَن کەس زۆر دەخوات، کە منیش بەو پاڵنەرە دەمەوێ بیخـۆم کە لە قاپەکـەی ویدایـە! بەهـەرحاڵ تـەواوم کـرد، دوایـی پێغەمبـەر "صلی الله علیه وسلم" فەرمووی: با برۆین بۆ جەنگ بـۆ جیهـاد، منـیش لـە خەونمـدا دوو پاڵتۆم لە ژوورەکەدا هەڵواسـیبوون، پاڵتۆیەکیان عەسکەریی و پتەو بوو، یەکێکیشیان تـەنك و ناسك بوو پایزیی و بەهاریی بوو، پرسم بە هاوەڵانم کرد گوتم: لـەو دوو باڵتۆیـە ،کامـەیان لەبەر بکەم باشـە؟ ئەوانیش گوتیان: ئەو پتەوەیان لەبەر بکـە باشـە، ئیـدی پاڵتۆیەکـەم لەبـەر کردو لە کاتی چوونە دەردا، کە لە ماڵ دەچـووینە دەر بـۆ جـەنگ و جیهـاد دەچـووین، هاتـە دڵمەوە، کە ئەو جەنگە کە بۆی دەچین، سـێ ڕۆژمان پێدەچن، بەڵام مـن هەرچـی خەتـەرە بوو بەدڵمدا نەدەهات، کە پێم نـاخۆش بـێ، یـان بترسـێم، دوایـی لـەدڵی خۆمـدا گـوتم: سوپاس و ستایش بۆ خوا، دیارە گومانەکەم ڕاسـت دەرچـوو، جارجـار کـە سـیرەو ژیـانی پێغەمبـەرم "صلی الله علیه وسلم" دەخوێندەوە، بە دڵمدا دەهات دەمگوت: ئەگەر منیش لـە سەردەمی پێغەمبەردا بوومایە، وەك هاوەڵان لە خزمەتیدا جەنگ و جیهادم دەکردو نەدەترسام، ئێستاش ئەوە لە خزمەتیـدام "دیارە نەمزانی کە ئەوە خەونـە" دەچـین بـۆ جـەنگ و جیهـــادو هیچ ترسیشم لە دڵدا نیـە، وەك هاوەڵان خوایان لـێ ڕازیبێ، ئیدی لەکاتی چـوونە دەرەوەدا لە دەرگای ژوورەکەمان، خەبەرم بووەوەو خەونەکەم کۆتایی پێهات».

دیارە دوایی وا تێگەیشـتم کـە ئـەو خەونـە ئاماژەیـە بـەو قۆناغـەی دادێ، چـونکە پـاش هەڵکەنرانـمان لە گوندی گەڵووی ماخۆبزنان، چووینە بناری قەنـدیل و لـەوێ لـە گونـدی: (قەلاَتووکان) بارەگامان کردەوە، لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا تووشی چەند شەڕێك بووین، ئنجـا ئـەو خەونـەم وامانـا کـرد، کـە ئـەوە شـتێکی ڕەواو بگـرە پێویسـت بـووەو، دیفاعمـان لـە مەزڵوومیـەتی گەلەکـەمان کـردوە، لەسـەر ڕێبـازی پێغەمبــــەر "صلی الله علیـە وسـلم" و هاوەڵانی و لە ژێر بەیداغی (لااله الا الله محمد رســـول الله)دا.

## ماڵـی کـاك تەهـای حاجـی زاهیـر، مەکـۆی سـەرەکیی :

لەو ساڵانەداو پێشتریش ماڵی کاك (تەهای حاجی زاهیر) ڕانیەیی کە لە خوار سەرچـاوەی (قولە)وە بوو، شوێنی سەرەکیی کۆبوونەوەکانمان بوو.

چ بۆ دیتنی کەسانێك کە لە هەولێرو سلێمانیی و کەرکووك و بەغدادو موسـڵ و شـارەکانی دیکەوە سەردانیان دەکردم، چ بۆ حەواندنەوەو ڕێنمایکردنی کەسانێك کە لە دیوی ئێرانـەوە دەهاتنەوە لە (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) بۆ کارو چالاکیی و ڕێکخستنی نێوشارەکان، وە چ بۆ کۆکردنـەوەی خۆمـان، وەك ئـەو گـەنج و لاوانـەی کـە ڕانیـەو قـەڵادزێ و ناحیـەو گوندەکانی دەوروبەریان هاموشۆیان دەکردم.

بۆیە لێرەدا سوپاس و پێزانین خستنەڕوو و داواکردنی پاداشتی خێر بۆ کـاك حـاجی تـەهاو خێزانی، هەروەها بۆ باب و دایکی کاك حاجی تـەها: (حـاجی زاهـیر) "بەرەحمـەت بـێ و" (حـاجی ژنـە فـاتم)ی هاوسـەری، بەپێویسـت دەزانم، چـونکە چ لـەو قۆناغـەداو چ لـە قۆناغەکانی دیکەشدا، پێمانەوە ماندوو بوون و، خزمەتیان کردووین خوا پاداشتیان بداتەوە.

## بەحـەرام دانـانی پـارەی جاشـایەتیی و وتووێـژێك لەگـەڵ چـەند بەرپرسـێکی چەکـدارانی سـەر بە ڕژێـم دا :

شتێکی دیکە کە بە پێویستی دەزانم باسی بکەم، هەر هی ئەو ماوەیـەی ئـەو سـاڵ و نیـوە، (واتە: ١/ ١٠/ ١٩٨٥ تاکو ٤/ ٤/ ١٩٨٧) ئەوەیە کە مـن زۆرجـار لـە کـۆڕو مەجلیسـاندا قسەم دەکردو باسی ئـەوەم دەکـرد، کـە پـارەی جاشـێتیی حەرامـە، هـەروەها هـەموو ئـەو کەسانەی کە بەشێوەیەك لە شێوەکان سیخوڕیی بۆ ڕژێم دەکەن، پارەکەیان حەرامـە، چونکە لە بەرانبەر ئەوەدا وەریدەگرن، کە بەرگریی لەو ڕژێمە بکـەن و دژی میللەتی خۆیان بن، ئنجا ڕۆژێك کۆمەڵێك چەکدار هاتن بۆ ماڵمان، نازانم ئـامێر سـەریە بـوون، یـان ئـامێر مـەفرەزە بـوون؟ گـرنگ ئەوەیـە کۆمـەڵێك بـەرپرس بـوون، گوتیـان: مامۆسـتا! ئێمـە هـاتووین پرسیارێکمان هەیە، گـوتم: فـەرموون، یـەکێکیان گـوتی: ئێمـە بیسـتوومانە کـە جـەنابت

گوتووتە: پارەی جاشێتیی حەرامە، ئنجا ئایا ڕاستە ئەو هەواڵە وایە؟ گوتم: بەڵێ، گوتیان: بەڵام مامۆستایەكمان هەیە مامۆستایەكی دوازدە عیلمیشەو مامۆستایەكی بەتەمەنە لێمان پرسی، دوای ئەوەی كە قسەكەی تۆمان بیست، گوتمان: جەنابی مامۆستا! فلاّن كەس فەتوایەكی ئاوای داوە! ئەویش گوتی: كاكە گیان! ئەگەر واجبەكەتان باش بگرن، پارەكەتان حەلاّڵە، بەڵام ئەگەر كەمتەرخەمیی تێدا بكەن، حەرامە! منیش گوتم: یانی: ئەگەر جاشی باش بن، پارەكەتان حەلاّڵەو، ئەگەر جاشی خراپ بن، حەرامە؟ ئەوانیش پێكەنین و گوتیان: نازانین.

گوتم: برادەرینە! ئەو پارەیە مادام لە بەرانبەر ئەوەدا وەردەگیرێ كە خزمەتی ئەو ڕژێمە بكەن و، بەرگریی لەو ڕژێمە بكەن و دژی میللەتی خۆتان بن، كە خۆتان دەبینن چیمان لێدەكا! بەراستی ئەو مووچەو پارەیە حەرامە، چونكە ئەگەر پارەی جاشێتیی و سیخوڕیی حەرام نەبێ، حەرام لەم سەر زەوییە نیە، تۆ مووچەو پارە وەربگری بۆ ئەوەی خوێنی نەتەوەكەت بڕێژی، سەرەنجام خۆت بەكوشت بدەی و بكوژرێی، بۆ كێ؟ بۆ ڕژێمێكی ستەمكاری دیكتاتۆری خوانەناس، چۆن ئەو پارەیە حەرام نیە؟!

### هێنانەدەری كەسێك لە زەلكاو:

شایانی باسیشە بەهۆی ئەو فەتوایەوە خەڵكێك هەبوو چەكی دادەنا، ڕۆژێك فەقێیەك كە ئێستاش ماوەو ئەو كاتە چەكداری ڕژێم بوو، بەڵام ئێستا مەلایەو پێم وایە مەلایەكی باشیشەو خەڵكی ئەو شوێنەی ئەو مەلایە لەوێ، خۆشیاندەوێ، هات بۆلام گوتی: مامۆستا! دوێنێ شەو خەونێكم بە خۆمو بەخۆتەوە بینی، پێم خۆشە بۆت بگێڕمەوە، (ئنجا من ئەو كاتە كە سەفەرو جەولەم دەكردو، لە شاخ و داخ و بە دێهاتەكاندا دەگەڕام، هەمیشە گۆچانێكم پێبوو) گوتی: گۆچانێكت پێبوو هاتی، منیش كەوتبوومە گۆمێكەوە ئاوەكەی زۆر شین و تلخ و گۆڕاوو بۆگەن بوو، خەریكی خنكان بووم، ئنجا كە تۆم بینی گوتم: ئەوە مامۆستایە ئیشەڵلاّ دەرمدێنی و گوتم: مامۆستا! خەریكە بخنكێم دەربازم بكە، تۆیش گۆچانەكەت بۆ درێژ كردم، دەستم بە گۆچانەكەت گرت، ئنجا كە بە گۆچانەكەت

دەرتهێنـام و هێندەت بەرز كردمەوە لە سەرەوەڕا كەوتـمەوە سەرزەوی‌و قوتارم بـوو، لێـرەدا خەونەكەم تەواوبوو.

ئنجا ئایا دەبێ ئەوە مانای چی بێ؟ منیش پێكەنیم‌و گوتم: كاكە مەلا! مانای چییـە؟ ئەدی ئەوە نیە لە زەلكاوی جاشێتییدای؟! بەلاّم ئەگەر بە قسـەم بكەی لـەو زەلكـاوە دێیـە دەرێ، و خەونەكـەت دێتـەدی! ئنـجا ماوەیـەك ئامۆژگـارییم كـردو سـەرەنجام چەكـەكەی دانـاو ڕزگاری بوو.

## وتوێـژێك لەگەڵ كۆمەڵێك مامۆسـتادا، لەبارەی كەمتەرخەمیـی مەلایانەوە:

ڕۆژێك كۆمەڵێك مامۆستا هاتن بۆ لام مامۆستایانی بەتەمەن بوون، چوار یان پێنج بوون، هـەموویان لـەمن بەتەمـەنتر بـوون، موناقەشـەو وتوویـژمان بـوو دەربـارەی كەمتەرخـەمیی مامۆستایان، گوتم: مامۆستایان! بەراستی ئێمـە كەمتەرخـەمین بەرانبـەر بـەو خەڵكـەو زۆر شتیان بۆ ڕوون ناكەینەوە، ئەوەتا ئەو خەڵكە بەشێكی زۆری گیرۆدەی جاشێتیی‌و سـیخوڕیی بوون‌و، هەتا پێشمەرگەیەك هەیە، سەد سیخوڕو جاش هەن! ئاوا گفتوگۆمان كرد، یـەكێك لە مامۆستاكان گوتی: نەخێر، فلاّنكەس من پێم وایە هـیچ كەمتەرخـەمییمان نیــە، گـوتم: چۆن؟ گوتی: بە قورئانـێ لێت خوێندوە، هێنـدەی حەزرەتی نووحم جیهاد كردوە، منـیش گوتم: مامۆستا! نووح "علیه السلام" نۆسـەدو پـەنجا (٩٥٠) سـاڵ بانگـەوازی كـــردووەو حەق نەما بە خەڵكەكەی بڵێ، بەلاّم جەنابت پێم وا نیــە وابی، گـوتی: كاكـە بـە خـوا ئـەو خەڵكە هەر خراپەو مۆریان بەسەر دڵەوە نراوە. ئیـدی بـەردەوام بـووین‌و گـوتی: باشـە مـن بەڵگەیەكت بۆ دێنمـەوە، گوتم: فەرموو، گوتی: ڕۆژێـك گوتیـان: ئـەوە لـە فـلاّن شـوێن شایی‌و ڕەشبەڵەكە، بەبۆنەی بووك گواستنەوەیەكەوە، هاتن هەواڵیاندا بە من كـە بچـم لێیـان تێكبدەم، منیش چووم، سـێ چوار حاجی‌و ڕیـش سـپیش كـە هەمیشـە لەگـەڵ خـۆم نوێـژ دەكەن، لەگەڵم هـاتن، ئیـدی دوورو نزیكـی زەماوەنـدو شـاییەكە بـووم‌و لـە دوورەوە تـێم خوڕین: خەڵكینــە! ڕەشـبەڵەك مەكـەن، دەهـۆڵ مـەكوتن‌و زوڕنـا لێمـەدەن، غەزەبتـــان بەسەردا دەبارێ، لێیان تووڕەبووم، كابرای زاواش نەمزانی كە ئامیر مەفرەزەیـەو چـەكداری

ڕژێمە، هات گوتی: ئەوە چییە مەلا دەتەوێ شایی‌و زەماوەندەکەمان لێ تێکبدەی؟ نازانی کە من زاوام‌و شایی‌و زەماوەندەکە بۆ منە؟ ناهێڵم لێمان تێکبدەی.

ئیدی سەرت نەیێشێنم قسەیەك لەو قسەیەك لە من، ئەو لە من توندتر بووو یەخەو بەرۆکی گرتم‌و ڕایتەکاندم، ئنجا ئەو ڕیشسپی‌و حاجییانەش کە لەگەڵم بوون، لە جیاتی لەسەرکردنەوە، دەیانگوت: ئەها ئێستا لە مامۆستا دەدا، بەقورئان لێی نەدا باشە! منیش کە زانیم هەر بەتەنێم، بەناچاریی قسەکانم نەرم کردەوەو گوتم: کاکە من هاتووم قسەیەکی خێرتان بۆ بکەم، بە قسەم دەکەن باشە، بە قسەم ناکەن خۆ من خۆ تفەنگ‌و تەیارەم پێ‌نییە لێتان تێکبدەم‌و من دەڕۆم، ئەوەبوو وازم هێناو هاتمەوەو، هەرباش بوو بە سەلامەتی دەربازم بوو.

ئنجا گوتی: کاکە ئەو خەڵکە ئاوایە، هەرچەندە هەرچی حەقە بەو خەڵکەم گوتوە، بەڵام خەڵکەکە ئاوایە، ڕیش سپی‌و حاجییەکان کە لەپشت منەوە نوێژدەکەن، هەموو بەرگرییەکەیان ئەوەبوو کە باسم کرد، منیش گوتم: ئنجا خۆ مامۆستا! ئەو بەڵگەیە بە عەکسەوە بەسەر خۆتدا دەشکێتەوە، گوتی: چۆن؟ گوتم: مامۆستا تۆ پارچە زەوییەکت هەیە، بەس نیسکی لێدەچێنی، ئایا ئەگەر هات‌و نۆك یان گەنم‌و جۆی سەوز نەکردن، خەتای تۆیە یان خەتای زەوییەکەیە؟ گوتی: دیارە خەتای منە، چونکە تەنیا یەك شتم لێ چاندوە کە نیسکە، گوتم: مامۆستای بەڕێز! ئەو خەڵکەش جەنابت فێرت کردوون لە پشتەوەت نوێژ بکەن‌و، فێریشت کردوون ئەگەر چووی بۆ دەعوەتێك بۆ بۆنەیەك‌و بۆ سوڵحێك لەخزمەتتدا بن، وا نییە؟ گوتی: بەڵێ گوتم: دە جا ئەوەندەی فێرت کردوون، زۆر چاکیان ئیش پێکردوە، بەڵام فێرت نەکردوون ئەگەر دەستیان لەیەخە نای، ئەوانیش دەست لەیەخەی کابرا بنێن، ئەو دەرسەت پێنەگوتوون، ئیدی ئەوەندەی پێتگوتوون لەبەریان کردوەو، ئەوەندەی پێشت نەگوتوون، لەبەریان نەکردوە، بۆیە مامۆستا! بڕوابکە خەتای خۆمانە، گوتم: با من بەڵگەو وێنەت بۆ بێنمەوە: ئەم خەڵکی گوندی ماخۆ بزنانە کە هەمووی نەخوێندەوارەو بە دەگمەن خوێندەواری تێدایە[1]، بەڵام ئەو خەڵکە نەخوێندەوارە،

---

١) ئەوکاتە (١٩٨٦) وابوون، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا خوێندەواریان زۆرن.

بە پیاوو ئافرەتو پیرو گەنجەوە، گوێ بۆ من دەگرن، پیرەکان دێن دەڵێن: مامۆستا! بۆچی هەر لەگەڵ گەنجەکان قسەدەکەی، ئێمەش ئامادەین بۆ هەموو شتێك، گەنجەکان بۆخۆیان شەوێ ئێشکەم لێدەگرنو پاسەوانییم لێدەکەن، هەرچەندە نەیشم کردوون بە حیزبو ڕێکخراوو، هەر ئامۆژگارییم کردوونو قورئانو سوننەتم بۆ ڕوونکردوونەوەو بۆخۆیان هەستێکیان لەنێو دڵدا دروست بووە، کە بەرگرییم لێبکەنو پشتگیرییم بکەن! کەواتە: پێش خەڵك، یان لەجیاتی خەڵك دەبێ گلەیی لە خۆمان بکەن.

## بیرەوەرییەکی مامۆستا مەلا موحەممەدی مەلا ساڵحی شارەزووریی و کێشەی لەگەڵ (برایانی مسوڵمان)دا:

شتێکی دی کە بە پێویستی دەزانم باسی بکەم، بەسەرهاتێکی مامۆستا مەلا موحەممەدی شارەزوورییە "بەڕەحمەت بێ"، کە وەك پێشتر باسم کرد، نازانم ماوەی مانگێك کەمتر یان زیاتر لە ماڵی ئێمە بوون، خۆیو خێزانی (دایکی بەهەشت) لەگەڵ منداڵەکانی، ئنجا مامۆستای شارەزووریی کێشەیەکی هەبوو لەگەڵ ڕێکخستنی برایانی مسوڵمان (إخوان المسلمین)، ئەوان مامۆستایان تۆمەتبارکردبوو بەوەی کە گوایە ناوی خەڵکی بە ڕژێم گوتوە، یان قسەیەکی هەیە لەگەڵ ڕژێمدا، مامۆستایش بەوە زۆر قەڵس بوو، چونکە کاتی خۆی مامۆستای شارەزووریی "بەڕەحمەت بێ" لەلایەن ڕژێمەوە زۆر گیرا، گیراو تا قەراغی مردن چوو، زۆر ئەشکەنجەیان دابوو، دوایی قوتاری بوو، ئنجا کە لەلای ئێمە بوونو، دوایی لە دێیەکەی ئێمە (گەڵوو)و لە ماڵی ئێمە ڕۆیشتن، چوونە دێیەکی دیکە "وەك لە شوێنێکی دیکەش ئەوەم گێڕاوەتە" ڕوخسارخانی ڕەحمەتیی، لەهەر شتە شتێکی دەدانێ، وەك بڵێی ماڵەکەی لەگەڵدا بەشکردن، لە هەر شتە شتێك، ئنجا مامۆستای شارەزووریی کە زۆر قسەخۆش بوو، گوتی: فلانکەس! گوتم: بەڵێ؟ گوتی: دەزانی ئێستا کەییم دێتەوەبیر؟ منیش گوتم: کەی؟ گوتی: کاتی خۆی کە دایکی بەهەشتم هێناو، ماڵمان کردو ماڵم لە ماڵی باوکم جیاکردەوە، لەهەر شتەو شتێکیان دامێ، ئەو ڕۆژەم دێتەوەبیر، گوتم: مامۆستا! تۆ برا گەورەیو ماڵ ماڵی خۆتانە، واتە: ماڵی مامۆستای شارەزووریی بە

ئاشکرا دیاربوو کە نەدارو نەبوو بوون، ئنجا باشە کابرا ئەگەر سەر بە ڕژێم بێ‌و دەستێکی لە خراپەدا بێ، دەنگوبجێ ژیانی وابێ؟! بەهەرحاڵ ئەوە بوو کە مامۆستای شارەزووریی گوتی: فلانکەس پێم خۆشە تۆ قسەیەکی خێرمان لە بەیندا بکەی‌و دادوەربە لە نێواندا، ئەوە بوو ژمارەیەك لەو برایانە هاتن بۆ ماڵی ئێمە، منیش لەنێواندا بووم، هەڵبەتە هەمووشیان بۆ من وەك یەك بوون‌و برا بوون، بەس پێم ناخۆش بوو ئیسلامییەکان بە خراپە باسی یەکدی بکەن، خەڵکی مسوڵمان غەیبەتی یەکدی بکەن، بەتایبەتی مامۆستای شارەزووریی کە چەند کتێب‌و نووسراوێکی هەبوون‌و بە حەقیقەت پیاوێکی ئازا بوو، زیندانی بینیبوو، ئاوارە کۆچکردوو (مهاجر) بوو لەلای ئێمەو، لە شوێنی خۆی نەدەحەوایەوە لە ترسی ڕژێم.

دیارە کەوتمە نێوانیان‌و مامۆستای شارەزووریی قسەی خۆی کردو، ئەوانیش قسەی خۆیان کرد، سەرەنجام شتەکە بە قازانجی مامۆستای شارەزوریی شکایەوە، بەراستی زۆر بە شەهامەتیشم بینی، چونکە وەك دێتەوە یادم: پاش ڕوونبوونەوەی پاکیی‌و بێتاوانیی مامۆستا، خۆی شلوێ نەکردو گوتی: کاکە ئێستا کە دەرکەوت ئەو شتانە وانین، کە لەدوای من دەیانڵێن، من هیچ شتێکم نەکردوە لەوانەی پێیان تۆمەتبارکراوم، لەمەودوا ئەو قسانە مەکەن‌و، قسەم لەدژ مەکەن‌و، لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشام مەکەن.

دیارە منیش هەندێك قسەی خێرم کرد، پێشم وابوو بنکی گرفتەکە ئەوەبوو کە هەندێك کەس لەو برایانە، نەك زۆربەیان، کێشەیەکی کەسییان لەگەڵیدا هەبوو، بوغزێك غەرەزێك هەبوو، جاری وا هەیە قسەیەك لە کەسێکەوە دێ، دوایی دەکەوێتە زاری خەڵکی دیکەو دەتەنێتەوە.

ئیدی مامۆستای شارەزووریی دوایی زۆر دڵخۆش بوو، ئەو برایانەی دیکەش گوتیان: کاکە! ماڵت ئاوابێ، چاك بوو کەوتیە نێوانمان.

## چوونە ڕاوە کەوو کۆتر:

مەسەلەیەکی دیکە کە ڕەنگە شایستەی باسکردن بێ، ئەوەیە ئەو ماوەیەی کە من لە (گەڵوو) بووم جارجار لەگەڵ هەندێك لە خەڵکی دێ‌و، هەندێك لە(مەلا) مامۆستایەکان کە

هاوتەمەنی خۆم بوون، یان کەمتر یان هەڵکشاوتر بوون، هـی ئـەو دێیـانەی دەوروبـەرمان، ئنجا چ خوێندنی مەلایەتییـان تەواوکردبێ، یان تەواونەکردبێ، دەهاتن میوانی مـن دەبـوون و بەیەکەوە دەچووین بۆ شـاخ بۆ ڕاوەکەوو ڕاوەکۆتر، ئنجا هەرچـی ڕاوە کـۆترە بـەم شـێوەیە بوو: هێلانـە کۆتر هەیە، یان کونەکۆتـر دەبوو بە پشـتێنان یان بە گـوریس، یـەکێك دابێڵینـە خـواریێ و لەوێـدا کۆترەکـان بگـرێ و، دوایـی دەهاتـەدەرێ و، پاشـان دەچـووینەوە مـاڵێ و کۆترەکانـمان دەبرژاند، هاوسەرم "بەرەحمەت بێ"، دەیـبرژاندن.

هەرچی ڕاوەکەویش بوو، بە تفەنگ بووو هەندێك جار وەك نیشانە داکردنیشی لێدەهات، جارجار ئاوا دەچووینەدەر، ئەگەرنا من هەر خـەریکی خوێندنـەوەو نووسـین و بیرکردنـەوەو گەشت و جەولەو پێشوازییکردنی میوانان بووم، جارجاریش ئاوا هەوای بـاڵی خۆمـان دەدا، هەندێك لە هاوڕێکانی ڕانیـەم کە دەهاتن لەگەڵیان دەردەچووم، لەگەڵ ئەو مامۆستایانەدا کـە خەڵکی دەڤەرەکەبوون.

### بەحـەڵاڵ دانـانی نێچیـری ڕاوێ، مادام خوێنـی لێهاتبـێ:

شایانی باسیشـە لـەو سـەروحەدەدا مـن ڕاوبۆچـوونم وابـوو کـە نێچیـر: چ باڵنـدە وەك کۆتـرو کەو، چ ئاژەڵ وەك کەروێشك و حەیوانە کێویی، ئەگەر فیشـەکی پێوەبـێ و خـوێنی لێهاتبـێ، ئەوە خوێن لێهاتنەکـەی لەجێی سـەربڕینە، چونکە لەوێ لەو ناوچـانەی ئێمـەدا، هەروا باو بوو کە نێچـیر ئیللا دەبێ چەقۆی بگاتـێ و، ئەگـەر سـەر نـەبڕێ، بـا خوێنیشـی لێهاتبـێ، حـەڵاڵ نیـەو مردارە.

ئەڵبەتە ئەوەی کە من ئەوساکە گوتوومە، ئێسـتاش دەیلێیم و پێم ڕاستە، چونکە بـەڕوون و ڕاشکاویی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبـەردا "صلى الله عليه وسلم" هاتوە کـە هـەرکات بابـای ڕاوچی بە تیرەکەی نێچیرەکەی بریندارکردو خوێنی لێهـات، ئـەوە بریندارب‌وونەکـەی مایـەی ڕەوا (مبـاح) بوونیەتی و لە جێی سەربڕینیەتی، بۆ نـموونە:

{عن عدي بن حاتـم قال: سـألتُ النَّبـيَّ "صلى الله عليه وسلم" عـن الـمعْراض؟ فـقال: ﴿إذا أصـاب بِحَـدِّهِ فَكُـلْ، وإذا أصـاب بِعَرْضِـهِ فـلا تأكـلْ فإنــه وقيـذ﴾ البخـاري:

٢٠٥٤} ، واتە: لەبارەی نێچیرێكەوە كە بە تـیری بـێ پـەڕەمووچ دەكـوژرێ، پرسـیارم لـە پێغەمبـەر "صلى الله عليه وسلم" كرد، فەرمووی: ئەگەر بـە نووكەكـەی پێكـای بیخـۆ، بەڵام ئەگەر بە پانییەكەی پێكای مەیخۆ، چونكە بـە (مَوْقُـوذة) دادەنـرێ، (ئـەمیش بریتیـە لـە نێچیرێك كە زەبری لێـدانو بێ خوێـن لێهـاتن كوژرابـێ).

هەروەها لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هـاتوە كـە پێغەمبـەر "صـلى الله عليەوسـلم" بـە (عـدي) فەرمووە: ﴿...ءإذا رَمَيْــتَ بالـمِعْراض فخــزق فكُـلْ﴾ البخـاري: ٧٣٩٧، واتـە: ئەگـەر تیرت بە نێچیرەوە ناو تێیچـەقی (یان كونی كرد) لێی بخـۆ.

هەڵبەتە ئەو كاتەش دەمگوت: بـەڵام ئەگـەر خـوێنی لێنـەهات، بـۆ نموونـە: فیشـەكەكە گڕداربووو شوێنەكەی سووتاندو هەڵقرچاند، ئەوە لەو حاڵەتـەدا ئـەو پێكانـە، بـە سـەربڕین دانانرێ، چونكە خوێنی لێنەهـاتوە، جیاوازیی خستنە نێوان تـیرو فیشـەكەوەش، مـادام وەك یەك بریندارکـەرو خوێن لێهێـن بن، قسـەیەكی بێ بەڵگەیـە.

ئنجا خەڵكەكە هەندێكیان گومانێكیان هەبوو، بۆیە پرسـیان بـە هەنـدێك لـە مامۆسـتایان كردبـوو، گوتبوویـان: چـۆن فـلان كـەس فتوایـەكی وای داوە! هەڵبەتـە لـەوبارەوەش لـە كتێبەكاندا مشتومڕو ڕاجیایی هەیە، بـەڵام ئەوكاتـەو ئێسـتاش مـن ئـەو ڕایـەم پـێ بـەهێزترو ڕاسترو لەگـەڵ دەقـەكانی شـەریعەتو واقیـعو بەرژەوەنـدیی خەڵكیشـدا گونجـاوتر بـووەو گونجاوتـرە.

چـونكە وەك فەرموودەكانیشـمان هێنانـەوە، پێغەمبــەر "صــلى الله عليـە وسـلم" فەرموویەتی: ئەو نێچیرە كە تیری تێدەگیرێ، ئەگەر پێیكەوتبووو خوێنی لێهـاتبوو، بیخـۆ، بەڵام ئەگەر خوێنی لێنـەهاتبوو مەیخۆ، ئنجا كۆمەڵێك لـە مامۆسـتایان لەوكاتـەدا تەشـویشو هـانی هانییـەكیان دروسـتكردبوو، لەسـەر ئـەوەو لەسـەر هەنـدێك شـتی دیكـەش، دوایـی مامۆستایەكی دیوی ئێران هەبوو، مامۆستا مەلا یەحیا خوا پاداشتی بداتەوە، خەڵكی سـابلاغ بوو، ئێستا بەڕەحمەتی خوا چووە، مامۆستایەكانی بینیبووو گوتبووی: مەلاینـە! تەشقەڵە بەو

مامۆستایە مەکەنو ئەو قسانە مەکەن، چونکە لەوبارەوە ڕاجیایی هەیەو ڕایەکەی وی بەهێزو بەڵگەدارە، بەوجۆرە ئامۆژگاریی کردبوون.

ئنجا ڕۆژێك یەکێك لە خەڵکی ئاوایی، پێنج کەوی هێنابوون، هەموویان بە فیشەك یان بە تاپڕ کوژرابوونو خوێنیان لێهاتبوو، بەڵام هەموویان سەریان پێوەبوو، بە ئاقڵ گوتبووی: ئەو پێنج کەوانە بۆ مامۆستا دەبەم داخۆ دەیانخوات؟ واتە: ئایا بە مرداریان دەزانێ، یان بە مرداریان نازانێ؟

کە هێنانی منیش بە سوعبەت گوتم: ئەوە هێناوتن تاقیم بکەیەوە؟ من شتێك بەئێوە ناڵێم کە بۆخۆم قەناعەتم پێی نەبێو کاری پێنەکەم!

## سەردانی دێیەكو سەرزەنشتکردنیانو دروستکردنی مزگەوت:

سەرەتا دەڵێم: مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە ئەوەیە کە ئەو خەڵكو میللەتەی ئێمە ئەگەر بەرچاوی ڕۆشن بکرێتەوەو تێبگەیەنرێ، هەست بە بەرپرسیارێتیی دەکاو ئامادەیە بە ئەرکی خۆی هەڵسێ.

ڕۆژێك چووم بۆ دێیەك (پێویست ناکات ناوی دێیەکە بێنم) هەر لەو حەوت دێیەی دەڤەری پشدەرە ڕەقەیە، کە چووم پرسەیەکیان هەبوو لە ماڵی یەکێکیان دانیشتبوون، منیش سەرەخۆشییم لێکردنو گوتم: ئەوە مزگەوتتان نیە؟

گوتیان: نەخێر.

گوتم: ئەدی مەلاشتان هەر نیە؟

گوتیان: نەخێر، مەلاشمان نیە.

گوتم: باشە پرسیارێکم هەیە: ئایا مەڕو بزنتان هەن؟

گوتیان: بەڵێ، گوتم: چۆنیان بەخێودەکەن؟

گوتیان: شوانمان هەیە.

گوتم: ئەدی ڕەشە وڵاختان هەن، (یانی گاو مانگاو گۆلك)؟

گوتیان: بەڵێ.

گوتم: ئەدی ئەوان چۆن بەخێوەدەکەن؟

گوتیان: گاوانـمان بۆ گرتوون، گوتیان: مامۆستا مەبەستت لەو پرسیارانە چییـە؟!

گوتم: مەبەستم ئەوەیە کە خەمتان لە مەڕو بزنـان خـواردووەو، خـەمتان لـەگاو مانگایـان خواردوە، گاوانو شوانتان بۆ گرتوون، بەڵام خەمتان لە نوێژەکەتان نەخواردوە مزگەوتێکتان هەبێو، خەمتان لە دینەکەی خۆتان نەخواردوە، مەلایەکتان هەبێ، پێشنوێژیتان بۆ بکا؟!

گوتیان: مامۆستا! ئەو دەرسە بـۆ ئێمـە بەسـە، هـەتا جـارێکی دیکـە تـۆ دێیـەوە، دەبـێ مزگەوتیشـمان هـەبێو، مـەلاشمان هـەبێ، تـۆ دەرسـت دادایـنو ڕاسـت دەکـەی ئێمـە کەمتەرخەمین.

ئنجا نازانم مانگێکی پێچوو، دوو مانگی پێچوو، چەند بوو، سەردانم کردنەوە، دیاربوو هەم مزگەوتو هەم مەلاشیان هەبوو.

گوتیـان: مامۆستا! چاوت لێیـە نەسیحەتەکەی تۆمان چاك وەرگرت؟!

گوتم: بەڵێ، چاکتان وەرگرتوە، بەڕاستی من ئامۆژگاریی باشم کـردنو، ئێـوەیش زۆر باشتان وەرگرتووەو کارتان پێکردوە!

## بیـرەوەرییـەکی خۆشـی مامۆسـتا عەبدولـڕەحمـان نۆڕسـیی :

جارێکیان کـاك حـاجی عەبـدولڕەحمان نۆڕسـیی بـۆ کـاری ڕێکخسـتنو نێوشـار (هـی بزووتنەوەی پەیوەندیـی) هاتە ماڵمان، کە ئەوکاتە پایز یان زستان بووو، لەنێو گونـد بـووین (گەڵووی ماخۆبزنـان).

ئنجا دوای ئەوەی ناردمانە ماڵی کـاك تـەهای حـاجی زاهیـر لـە ڕانیـەو، ئیشـوکارەکانی تەواوکردن، بڕیاری گەڕانەوەی دا بـۆ ئێـرانو، لەوکاتەشـدا برایـەکی پێشـمەرگە هـەر هـی بزووتنـەوەی پەیوەندیی لە ماڵمان بوو، ناوی کـاك ڕەمـەزان بـوو، بـەڵام وا دیـاربوو بـەینی لەگەڵ کاك حاجی عەبدولڕەحمان تەواو نەبوو، لە سۆنگەی ئەوەوە کە کاك حـاجی کـە ئـەو

کاتە بەرپرس یان جێگری مەکتـەبی سەربازیی بوو، لەسەر شتێك سزایەکی دابوو، ئنجـا لـە سۆنگەی ئەوەوە کە کاك حاجی بەتەنیا بوو، هـەروەها کـاك رەمـەزانیش هـەر بەتـەنیا بـووو هەردووکیشیان دەگەڕانەوە ئێران، کـاك حـاجی عەبـدولڕەحمان گـوتی: کـاك ڕەمـەزان بـا پێکـەوە بچینـەوە!

ئەویش گوتی: نەخێر من حەزدەکەم بەتەنیا بچمەوە!

دیارە چەند جارێك کاك حاجی داوای لێکرد کە پێکـەوە بگەڕێنەوە، بەڵام کـاك ڕەمـەزان ملی نـەدا، کاك حاجیش گوتی: کاکە گیان! با پێکەوە بچینــەوە، ئەگەر تـۆش مـن بـە بـرا گەورە نەزانی، من تۆ هەر بە برا بچـووك دادەنێم.

دیارە منیش و ئامادەبووانی دیکەی کۆڕەکەو کاك ڕەمـەزانیش بـەو قسـەیەی کـاك حـاجی پێکەنینمـان هاتو، کاك ڕەمەزانیش لەگـەڵ کـاك حـاجی عەبـدولڕەحمان چــاك بـووەوەو پێکەوە گەڕانــەوە.

# كۆتـايـی بیـرەوەرییەكـانی پێـش قۆنـاغی پێشـمەرگایەتیـیم

دیارە ئەوانە چەند یادداشتو بیرەوەرییەك بوون هی ئەو ماوەیەی كە لـە گونـدی گـەڵووی ماخۆبزنان بووینو، دوایی ماوەی سێ مانگێـك ناچـاری خۆحەشـاردان بـووین، ئێسـتاش كۆتـایی بـەم قۆناغـە دەهێـنینو، دەچـینە قۆنـاغی كۆچـكردن بـەرەو قەنـدیلو ژیـانی پێشمەرگایەتییـەوە.

بەڵام دوای ئەوەی نـاوی بیسـتو حـەوت (٢٧) كەسـی خـەڵكی (گەڵـوو) دێـنمو وەك بەشێك لە وەفاداریی بۆیان، ڕیزیان دەكەم، كـە ئەوكاتـە بـەزۆریی گـەنجو تـازە پێگەیشـتوو بوونو هەندێكیشیان كامڵ بـوون، سـێ كەسـیش لەوانـە كـە شـەهید بـوون، دەیانخەمـە پێشـەوە:

١- فەقێ حەسـەن نەبی (فەقێ حەسـەنی گچكە)، سـاڵی (١٩٩٠) لە ڕانیـە كوژرا.

٢- فەقێ حەسـەن ئەحمەدە سوور (فەقێ حەسەنی گەورە)، ساڵی (١٩٩١) لە كەركووك كوژرا.

٣- عـەولا مەحموود، لە نەوەدەكاندا لە حاجی ئاوا كوژرا.

٤- ئەحمەد حاجی ڕەسوڵ (ئەحمەدە شـلە).

٥- حاجی ڕەسوڵ مازووان (بانگبێـژ).

٦- كوێخا وسوو كوێخا نەبی.

٧- عەبـدوڵڵا ئەحـمـەد خان.

٨- فەقێ مەحـمـوود مام موختـار.

٩- مەلا وسوو نەبی وسوو.

١٠- وسـوو عـەولا شین.

۱۱- ئەحمەد عەولا شین .

۱۲- فەقێ قادر ڕەسوول مازوو .

۱۳- عەولا نەبی وسوو (عەولا سوور) .

۱٤- وەیس ئەحمەد وسوو .

۱٥- برایم ئەحمەد وسوو .

۱٦- دێوانە حەسەن .

۱۷- عەولا نەبی (ڕووبار) .

۱۸- حەمەدەمین ئەحمەد وسوو .

۱۹- نەبی پیرۆتی فاتێ . "خوا لێی خۆشبێ" .

۲۰- ئەحمەد ڕەسول وسوو .

۲۱- نەبی فەقێ وەیس .

۲۲- نەبی پیرۆت کانەبی .

۲۳- عەولا پیرۆت عەولا .

۲٤- مینە حەسەن ئەحمەد .

۲٥- ڕەسوول عەولا شین .

۲٦- محەمەد ڕەسوول ئەحمەد .

۲۷- حاجی ژنە ئایش (ئایشە تۆپ) .

دیارە ئەو بەڕێزانە کە هەموویان ئێستاش لە ژیاندان، جگە لە سێ شەهیدەکانو مام نەبی پیرۆتی فاتێ، هەم ئەوکاتەی کە لە گەڵوو بووینو، هەم دواییش کە چووینە بناری قەندیلو گوندی قەلاتووکانو، بگرە دیوی ئێرانیش، کە بە ئێسترەکانیان ئازووقەو فیشەکو پێداویستییەکانی دیکەیان بۆ دەهێناین، هاوکارو دەستبارگرێکی زەبر دەستو دڵسۆزو

گرنگمان بوون، بۆیە بەپێویستم زانی بەتایبەت ناویان بهێنم و یادیان بكەمەوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

لێرەشدا بەپێویستی دەزانم، وەبیر حكوومەتی هەرێمی كوردستانی بهێنمەوە، كە دەڤەری پشدەرە ڕەقە بەهەر حەوت گوندەكەیەوە: گەڵوو، دووگۆمان، زەنگڵان، مەمكان، جەلكان، پیرانان، گرتك، تا ڕاددەیەكی زۆر لە زۆربەی خزمەتگوزارییەكان بێبەشن، هەرچەندە خەڵكی ئەو گوندانە باوەشێكی گەرم و پڕ سۆزی شۆڕش و پێشمەرگایەتیی بوون و، شایستەی باشترین خزمەت و پاداشتدانەوەشن! هەتا شۆڕش و پێشمەرگە ئاتاجی ئەوان بوون، ئەوان زۆر دەستكراوەو سەخیی بوون، ئێستاش كە ئەوان ئاتاجی حكوومەتن، وەفاداریی و ئەمەگ خوازیاریی ئەوەیە حكوومەتیش بەلای كەمەوە لەگەڵیان باش بێ، ئەگەر زۆریش باش نەبێ!

# زەمینەسازیی بۆ قۆناغی پێشمەرگایەتیی

دوای ئەوەی کەوتینە حاڵەتی خۆحەشاردانەوە، بەرلەوەی بە یەکجاریی شار بەجێبهێڵین و لە گوندی (قەڵاتووکان)ی بناری قەندیل بارەگای هێزی (حەمزە) دابمەزرێنین، هەڵسام بە چەند کارو چالاکییەك، وەك زەمینەسازیی بۆ قۆناغی پێشمەرگایەتیی، گرینگترینیان وەك بێتەوە یادم، ئەمانەبوون:

**یەکەم**: تۆمارکردنی یازدە (١١) کاسێتی یەك سەعاتی، واتە: یازدە سەعات، بە ناوونیشانی: (پەروەردەو جیهاد) کە دوایی بە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبوونەوەو وێنەی زۆریان لەبەرگیرانەوەو، کاریگەریی باشیان هەبوو لە هۆشیارکردنەوەو بەرچاوروونکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەوکەسانەدا، کە دوایی ئەرکی کاروچالاکیی شاخ و شاریان کەوتە ئەستۆ، لە چوارچێوەی (بزووتنەوەی ئیسلامیی)ی ئەوسادا.

شایانی باسیشە ئەویازدە دەرس و وتارە، سەرجەم باس و بابەتەکانی عەقیدەو فیکرو ئەخلاق و تەزکیەو کاری رێکخستن و پەروەردەو خەڵك و جیهادو... هتدم پێگرتبوونەوە.

**دووەم**: گەڕان و سووڕان و کۆبوونەوەی چڕوپڕ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستا (مەلا)یان و گەنجاندا، لە دەڤەری بیتوێن ـ پشدەر بەتایبەتی و ناوچەکانی دیکەدا بەگشتی، وەك: هەولێرو سلێمانی و شارەزوورو کەرکووك، کە بەزۆرییش ئەوان دەهاتن و، لە رانیە لە چەند ماڵێکدا بەتایبەت ماڵی کاك (تەهای حاجی زاهیر) لەگەڵیان دادەنیشتم.

**سێیەم**: سەفەرکردنم بۆ ئۆردوگای (سەریاس) لە نزیك شاری (پاوە) لە کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران)، بۆ بینینی مامۆستا مەلا عوسمان عبدالعزیز "بەرەحمەت بێ" و بەیعەت پێکردنی بۆکاری ئیسلامیی و جەنگکردن لە دژی رژێمی بەعس.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە لەو سەردەمەدا دوای ئەوەی جەنابی مامۆستا مەلا عوسمانو مامۆستا مەلا عومەرو مامۆستا مەلا عەلی، کوڕانی مامۆستا مەلا عەزیزی پریس "خوا لێیان خۆشبێ" کە مامۆستای ناودارو ناسراوی دەڤەری شارەزوورو هەڵەبجە بوون، هەروەها ژمارەیەکی دیکە لەمامۆستایانی نیزیکیان، وەك مامۆستا مەلا شێخ سدیق سەرگەتیی و مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود "خوا لێیان خۆشبێ" ناچارکران شوێنەکانیان بەجێبهێڵنو کۆچ بکەن، بە تەگبیری مامۆستا مەلا شێخ موحەممەد بەرزنجەیی لەمانگی حوزەیرانی (١٩٨٧)دا کۆبوونەوەیەك لە شاری (سنە)ی کوردستانی ئێران سازکرابووو مامۆستا مەلا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی "خوا لێی خۆشبێ"، کە ئەوساکە (رابەری گشتی) بوو، شوێنەکەی خۆی بۆ مامۆستا مەلاعوسمان چۆڵکردبوو، وە ناوی (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) گۆڕابوو بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامیی)، بەڵێ بە هاتنی ئەو مامۆستا بەڕێزە ڕەحمەتییانەو خەڵکێکی دەوروبەرو نیزیکیان بۆ نێو بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی، بزووتنەوەکە فراوانترو بەهێزتر بوو.

دیارە مامۆستا مەلا شێخ عەبدوللەتیف لە مانگی تەمووزی (١٩٨٦)دا کۆچی کردبوو بۆ ئێرانو لە کۆنگرەی دووەمی (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامی)دا کە لە مانگی تشرینی یەکەمی (١٩٨٦)دا بەسترا، لە شوێنی مامۆستا مەلا شێخ موحەممەد بەرزنجەییدا بە دووەمین رابەری گشتی هەڵبژێررابوو، {بڕوانە: هەورازو نشێو، لاپەرە: ٥٣ ـ ٥٥، حەسەن بابەکر}، پێشتریش باسم کردوە کە من لە ساڵی (١٩٨٣)و ساڵی (١٩٨٥)دا دووجار بە نوێنەرایەتیی (بزووتنەوەی پەیوەندیی) سەردانی ئێرانم کرد، جاری یەکەم بۆ دیتنی (حاجی شێخ قادری سۆتکە) "بە رەحمەت بێ"، جاری دووەم بۆ هەندێك قسەو باس لەگەڵ جەنابی مامۆستا مەلا شێخ موحەممەدی بەرزنجەییدا.

بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامییش لە ساڵی (١٩٨٥)دا دەستی بە جموجوڵی سیاسیی و سەربازی کردبووو هەرکام لە:

- ۞ مامۆستا مەلا شێخ موحەممەدی بەرزنجەیی "بەڕەحمەت بێ".
- ۞ مامۆستا مەلا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی "بەڕەحمەت بێ".

- مامۆستا مەلا عەلی بیارەیی، بەئەسڵ بناوەسووتەیی "بەرەحمەت بێ".
- مامۆستا مەلا لەتیف پێنجوێنی "بەرەحمەت بێ".
- حاجی عەبدولڕەحمان نۆڕسیی.
- مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی.
- مامۆستا مەلا ئەبوبەکری سددیقیی.
- مامۆستا مەلاموحەممەدی ڕازیی.
- کاك جەمال ئەحمەد مەلا فەتاح قوولەڕەشیی "بەرەحمەت بێ".
- کاك مەلا لوقمان نەزیریی.

کەسانێکی دیاری نێو ئەو بزووتنەوەیە بوون.

وە بزووتنەوەی پەیوەندیی بەر لە چوونە دەرەوەی مامۆستایانی هەڵەبجەو، چوونە نێو ڕیزەکانیەوە، هێزێکی سەربازیی هەبوو بە ناوی (لەشکری قورئان) کە لە چوار هێزی سەرەکی پێکهاتبوو:

- هێزی (صلاح الدین)، کە ماوەیەك مەلا لوقمان نەزیری بەرپرسی بوو: پاشان مامۆستا مەلا موحەممەدی رازی.
- هێزی (خالد)، کە مامۆستا مەلا لەتیف پێنجوێنیی بەرپرسی بوو، ئنجا پاش شەهیدکردنی لەلایەن رژێمەوە لە (١٩٨٦)دا مەلا موحەممەدی ڕازیی بووە بە بەرپرسی.
- هێزی (قەرەداغ)، کە کاك حاجی موحەممەدی قەرەداغیی بەرپرسی بوو، دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ (فاروق)و سەید موحەممەد عەزیز بەرپرسی بوو.
- هێزی (شافیعی) کە سەرەتا مامۆستا مەلا ئەبوبەکری سیددیقیی بەرپرسی بوو، دواتر مامۆستا مەلاعومەری سوێریی، ناسراو بە (فاروق).

دیارە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەریی مامۆستا مەلا عەلی بیارەیی بوو، کاك حاجی عەبدولڕەحمان نۆرسیی سەرلەشکر بوو، مامۆستا مەلا موحەممەدی ڕازیی جێگری بوو، وێڕای فەرماندەیی هێزی (خالد).

ئەوەشم بۆیە بە وردیی خستەڕوو، تاکو هەڵەیەکی چەندان جار دووبارەکراوەی هەندێك کەس ڕاست بکەمەوە، کە مێژووی جموجوڵی چەکداریی و جیهادیی لە کوردستاندا دەبەنەوە بۆ ساڵی (١٩٨٧)و کۆچکردن و ئاوارەبوونی مامۆستایانی هەڵەبجەو دەورووبەری، کە لەڕاستیدا وانیەو بەرلەوەی ئەوان بچنە پاڵ بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی و، ناوەکەی بگۆڕیی و، مامۆستا مەلا عوسمان ببێتە ڕابەری گشتی، ئەو بزووتنەوەیە باڵی سەربازیی هەبوو کە (لەشکری قورئان)ی ناوبوو، کە لە چوار هێز پێکهاتبوو، خاوەنی چەند شەهیدێکیش بوو.

**چوارەم**: گەڕانەوەم بۆ ڕانیەو کۆبوونەوەم لەگەڵ ژمارەیەك مامۆستا (مەلا)دا کە پێشتر گفتیان دابوو، کە ئەگەر بەندە بەیعەت بە مامۆستا مەلا عوسمان بدات، ئەوانیش لەگەڵم دەبن، کەچی کە گەڕامەوە، پاشگەزبوونەوەو، منیش لەکۆبوونەوەیەکدا کە مامۆستا حەسەن بابەکریش ئامادەی بوو، هەڵچووم و پێمگوتن: ئەو هەڵوێستەتان وەك هی (بني إسرائيل)ە کە بە مووسا "عليه السلام" یان گوت: ﴿... فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾المائدة، یەکێك لەوانیش لە وەڵامدا گوتی: ﴿... وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ ... ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، سەرەنجام هیچیان ئامادەنەبوون لەگەڵمان بێنە دەرێ.

دیارە ئەو بەڕێزانە ئێستاش هەموویان لە ژیاندان و سەرگەرمی مەلایەتیی، یان کارو کاسبیین، هەمووشیان یان زۆربەیان لەگەڵ (یەکگرتووی ئیسلامیی)دان و برایەتییشمان زۆرخۆشە.

**پێنجەم**: بەرێكردنی ڕوخسارخانی هاوسەرم بە هەر سێك منداڵەكانمانەوە: بەسۆز، پیرۆزە، موحەممەد، لەگەڵ كاك عبدالواحدی برامو فەقێ حەسەنی شەهید (فەقێ حەسەنی گچكە)دا بۆماڵی خاڵی (واتا: خاڵی هاوسەرم) (حاجی جەوهەر ئاغای غفورخانی لێوژەیی) "خوا لێی خۆشبێ" كە پیاوێكی زۆر جوامێرو سەخیو سیفەت بەرز بوو، كە ئەوكاتە ماڵی حاجی جەوهەر ئاغا لە هەواری (نازاوا)ی نێوان (شێخ ئایش)و (خانێ) لە كوردستانی ئێران بوو.

ئەویش ئەوەبوو كە بە دە دوازدە (١٠ـ ١٢) ڕۆژ پێش بەجێهێشتنی یەكجارەكیی شار، لەگەڵ ژمارەیەك لەگەڵ هاوەڵانم، خاتوون مەلاژنی هاوسەرم، كە چەند ڕۆژێك بوو ماڵی بابی مامۆستا حەسەن بابەكری لە گوندی بۆسكێن، بەجێهێشتبووو، چووبووە ماڵی برایەكانی لە چوار قورنە، واتە: ماڵی كاك حاجی سەلیم "بەرەحمەت بێ" و كاك قادرو كاك حەمەڕەش.

ئیدی وەك كاك عبدالواحد دەگێڕێتەوە: سەرەتا لە ماڵی بابمەوە لە ڕانیە بە سەیارە دەچنە گەڵووی ماخۆبزنانو، پاشان بە سواری ئێستر كاك عبدالواحدو كاك فەقێ حەسەنی شەهید، هەر ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە دەیگەیەننە (نازاوا) بۆ ماڵی خاڵی "بەرەحمەت بێ".

## قسەیەكی خۆش

ئەوكاتەی هاوسەرم "بەرەحمەت بێ" لە ماڵی برایەكی بوو لە چوارقورنە، لە سەرو حەدی كۆچكردنماندا بۆ چیا، ڕۆژێكیان ویستم قسە لەگەڵ هاوسەرمدا بكەم بە تەلەفۆنو هەوڵمدا بەدالەی ڕانیە ژمارەكەیم بۆ وەربگرێ، "ئەوكاتە ژمارەی تەلەفۆنەكانی چوارقورنە دەبووایە لە بەدالەی ڕانیەوە وەربگیرێن" ئافرەتێك لەوكاتەدا لەسەر بەدالەبوو بەناوی (ڕووپاك خان) كە لەوبوارەدا خزمەتێكی زۆری هەبوو، ئەم وتووێژەمان لەنێواندابوو كە وردەكارییەكانی زیاتر كاك عبدالكریم هێنانیەوە بیرم:

+ السلام علیكم ورحمة الله

- وعليكم السـلام، ئەوە چییـە کاکە خۆ نەهاتوویـە مەجلیسـێ سەلام دەکەی؟!

+ ئەدی بڵێـم چـی؟

- بڵـێ هەلـەو

+ ئنجـا ئایـا هەلـەو یانی چـی؟

- وەڵڵا نازانم مانای چییـە، بەڵام خەڵك هەروا تەلەفـۆن دەکەن!

+ ئەدی مادام نـازانی هەلـەو یانی چـی، چۆن دەیڵـێی، مانای وایە تۆ وشـــەیەك دەڵێـی بێ واتـایە؟!

- ئەدی (السلام علیکم) یانی چی؟!

+ خوشکم (السلام علیکم ورحـمة الله) مانایەکی گەورەو بـەرزی هەیـە، کـە بریتییـە لـە داواکردنی ئاشتیو خێرو سەلامەتیو بەزەیی خوا بۆ کەسێك کە سڵاوی لێدەکەی؟!

- دیارە جەنـابت زۆریش دەزانـی!

+ بەڵێ شتێك دەزانم.

پاشـان ژمارەکەی بۆ وەرگرتمو قسـەم لەگەڵ هاوسـەرم کرد.

**شەشەم**: سەردانیکردنی هێـزی (شـافعی) لـە گونـدی (مەلـەکان)و سـەردانیکردنی (شـێخ موستەفای زینـوێ) لەگوندی (خـەتـێ) کە تازە بەخۆیو فەوجـە خەفیفەکەیـەوە هـاتبووە دەرێ بۆ لای هێزی پیشمەرگە، وە سـەردانیکردنی مامۆسـتا مـەلا موحەممـەد مـەلا سـاڵح شـارەزووریی "بە ڕەحمـەت بێ":

کە وەك کاك عبدالکریم قـادر خـدرە سـوور دەڵـێ: لـە(١١/ ٧/ ١٩٨٧) پێکـەوە بـە گوندی (گولان)و چیای (کـارۆخ)دا چـووینە گونـدی (مەلـەکان) کـە بارەگـای هێـزی (شافعی) لـێ بوو.

دیارە لەو کاتەدا شەهید (کاك مەلا شریف حسین)یش "بەڕەحمـەت بـێ" کـە نازنـاوی (مەلا بێـدەنگ)ی پێـدرابوو، لـەوێ بوو.

پاشان لـە گونـدی مەلەکانـەوە چووینـە گونـدی (خـەتێ) بـۆ سـەردانی کـاك (شـێخ موستەفای زینوێ) کە تازە بـەخۆیو فەوجەکەیـەوە هـاتبووە دەرێو، شـەوێ لـەلای وان مایـنەوە.

دوایی هەر لەڕێـی (گولاّنو کارۆخو دۆڵی شاورێ)ەوە گەڕاینـەوە، لـە گەڕانەوەمانـدا چەند برایەکی دیکەشمان ڕەگەڵ کەوتن کە لە دیوی ئێرانـەوە وەك هاوکـارییکردنی هێـزی (شافعی) لەگەڵ بارو کاروانەکەیاندا هاتبوون، کە (کاك مەلا ئەحمـەدی هـەنارۆکیو کـاك شـەریف وەرزێرو کاك بێسـتون شـێخاودەلەیی)م لەبیرن.

بـۆ شـەوی (١٣/ ٧/ ١٩٨٧)یـش هاتینـە گونـدی (دواوە)ەو میـوانی "ڕەحمـەتیی (مامۆستا مەلا موحەممەدی شـارەزووریی) بووین.

شایانی باسیشـە مامۆسـتای شـارەزووریی پـاش بارکردنیـان لـەلای ئێمـە لـە گونـدی (گـەڵوو) سـەرەنجام لەگونـدی (دواوە) گیرسـابووەوەو، سـەرگەرمی (دەرزی لێـدان)و (دەرس گوتنـەوە) و ئامۆژگارییکردنی خـەڵك بوو.

ئنجا شـەو خـۆیو (میـنـاخان)ی هاوسـەری، زۆر خزمـەتیان کـردینو کـە زانیـی چلّکـنو دژوێـنـین، بە زۆر جلوبەرگەکانی پێـدانـاینو، بۆیان شـۆردینو خۆمان شۆرد، پاشـان گوتی: دوێنـێ باوکم لە ماڵمان بوو، شووتیی شارەزووریی هێنابوو، بەخوا دەبێ هەر لێـی بخۆن، ئیدی شەوێکی خۆشمان پێکەوە گوزەرانـد، واشـمـان بڕیـاردا هـەرکات ئێمە لە بناری قەندیل دامەزراینو من عەقڵم بڕیی کە بارودۆخ لەبارو گونجـاوە، ئاگـاداری بکەمەوەو، ئەویش ماڵەکەی بێنـێ بۆ ئەوشوێنەی کە ئێمەی لێدەبین، بەلاّم بەداخەوە چەند ڕۆژێك دوای ئێمـە (بـەپێی زانیارییـەکانی کـاك عبـدالکریم دەبـێ لـە: ٢١/ ٧/ ١٩٨٧دا بووبێ) لە ڕێی گوندی (دواوە) لـە تراکتـۆر کەوتـە خـوارێو مـرد، "خـوا بـە شـەهیدی وەرگرتبـێ".

## چۆنیـەتی ڕۆیشـتنم بۆلای (گەڵـووی ماخۆبزنـان) و پاشـان (قەندیل):

سەرەتا پاش گەڕانەوەمان لـە(دواوە) لـە مـاڵی مامۆسـتا مـەلا موحەممـەدی شـارەزووریی بەڕەحمەت بێ هاتمەوە ڕانیـەو، لەپێشـەوە بەتەنیا سواری سـەیارەی کرێ بووم و، لەبەر بازگە (سـیطرة)کەی دەربەند پێش گەیشـتنە بازگەکە دابەزیم و بەپێیـان بە دامێن بازگەکەداو بەسـەر قەراغی زێیەدا ڕۆیشتم و، پاشان لەولای بازگەکـە هەڵگەڕامـەوە سـەرجادەکەو، دەسـتم لـە سـەیارەیە ڕاگرت و یەك ڕێ چوومە (بەسـتەستێن) ماڵی مام حاجی موحەممەد بابی کاك مەلا ئەحمـەدی هەنارۆکی ـ کە دایکی من و دایکی وی خاڵـۆزا و پورزان، چـونکە دایکـی دایکـم (نەنکـــە بـــەس) لەگـــەڵ بـــابی دایکـــی وی (خـــاڵ حوســـێن) خوشـــك و بـــران و بابیـــان (ئەحمـەدەقیت) بووە، خوا لە هەموویان ببوورێ و جێگـایان بەهەشـــت بێ ـ.

ئنجا لەوێ کاك مەلا ئەحمـەدم بەدوای کاك (خـــدر عبـدالله قـەرە) بـرادەری دڵسـوّزم دا ناردو بەخۆی و سـەیارەکەیەوە ـ کـە قەمەرەیـەکی سـوور بـوو ـ هـات و، بردینیـە گونـدی (ژاراوێ) ماڵی ڕەحمەتیـی کاك (فەقـێ مینەی شـێخاوەلان) کە بەئەسڵ مامەش بوو، بەلاّم بە نازناوی (شـێخاوەلەیی) ناسرابوو.

ئنجا لـە (ژاراوێ) وە مـن و کـاك مـەلا ئەحمــەد بـە سـەیارەییەکی ستێشـن چـووین بـۆ (سندۆڵان) بۆ ماڵی (مامۆستا عەلـی ئاوەژێی)ی مەلای گوند، پاشان لە قـەراغ گونـد لـەنێو پەرێزی شـیناورد، چەند برایەکی قەلاّدزێ هاتن و بینیمن و بەیعەتم لێـوەرگرتن و، پاشـان بـە گەلاّبەیەك کە بە کاك (عبدالوهاب) کەرکووکیی بوو، گەڕاینەوە بۆ (ژاراوێ) بـۆ مـاڵی مـام حاجی محمـد بابی کاك مەلا ئەحمـەدی هەنارۆکـێ کە چێشـتی ساواری سووریان لـێنابوو، ئیـدی پـێش نوێـژی شـێوان نانمـان خـوارد و، بـەرەو لای (سەنگەسـەر)و ئۆردوگـای (تەوەسـووران) بـەڕێ کـەوتین و، لـەنێو بەسـتی ڕووبـاری (بەسـتەستێن) نوێـژی شـێوان و خەوتنانمان بە کورتکردنەوەو کۆکردنـەوە (قصـر و جمـع) کـردن و چـووینە (تەوەسـووران)و، لەوێشەوە پاش هەندێك قسـەو باس لەگەڵ چەند کاك مەلایەکی دەڤـەری پشـدەرەوە، کـە وەك بێتـەوە یادم هەرکام لــە:

مامۆستا مەلا علاء الدین و ملا عبدالفتاح و ملا ئەحمەد حاجی عبدالله، لەگەڵ بوون هەر ئەو شەوە بەرەولای گوڵووی ماخۆبزنان بەڕێ كەوتین، بەڵام نەچووینە نێو گوندو چووینە هەوارگەیەكی گوندی (زەنگـڵان) كە دەكەوێتە ڕۆژئاوای(زینووی ماخۆبزنان).

دیارە لەوێش لەگەڵ ژمارەیەك لە گەنجەكانی گوندی گەڵووی ماخۆبزنان بەڵێنگە (موعد)مان پێكەوە دانابوو، ئەوەبوو بە بیانووی داركردن و ئیشو كاری كەژوكێو بەخۆیان و ئێسترەكانیانەوە هاتبوون و، پاش هەندێك قسەكردنم بۆیان بەیعەتم لێوەرگرتن و، ئەوجار بەرەو قەندیل بەڕێ كەوتین.

هەندێك لە وردەكارییەكانی ئەم سەفەرەم لە كاك مەلا ئەحمەدی هەنارۆكێ وەرگرتوون، كە تەنیا ئەو هاوەڵی هەموو سەفەرەكەم بوو.

## وێستگە سەرەکییەکانی ژیانی پێشمەرگایەتییم،

## بەر لە ڕاپەڕینی بەهاری: ٥ / ٣ / ١٩٩١

بە باشی دەزانم بەرلەوەی بچمە نێوورەدەکارییەکانی ئەو سێ چوار ساڵەی پێشمەرگایەتییم بەر لە ڕاپەڕینی: ٥/ ٣/ ١٩٩١، ئاماژەیەك بکەم بە وێستگە سەرەکییەکانی ئەو قۆناغەی تەمەنم، کە ئەگەر لە رۆژی خۆحەشاردان (إختفاء)ەوە حیسابی بکەین "چونکە هەرلەو کاتەوە من خەریکی زەمینەسازیی بووم بۆ چوونەدەر" ئەوە لە: (٤/ ٤/ ١٩٨٧)ەوە تاکو: (٥/ ٣/ ١٩٩١) دەکاتە چوار ساڵ مانگێك کەم، بەڵام ئەگەر لە ڕۆژی بەڕێکەوتنم بەرەو چیاوە، حیسابی بکەین، واتە: (٢٠/ ٧/ ١٩٨٧)، ئەوە دەکاتە سێ ساڵو هەشت مانگو نیو، ئەویش بەمەبەستی ئەوەی نەخشەی ئەو سێ چوار ساڵە گرنگو هەستیارو دژوارەی تەمەنم، بەگشتی لەبەرچاو بێ:

١- ٢٠ / ٧/ ١٩٨٧ بەڕێکەوتنم پاش سەردانی بەستەستێنو ژاراوەو سندۆڵانو تووەسووران، لەگەڵ کاك مەلا ئەحمەدی هەنارۆکێ دا لە (ڕانیە)وە بۆ چوونەدەرو تێپەڕبوونمان بە (گەلّووی ماخۆبزنان)و کوێستانو هەوارەکانی (سیرنێ)و (مالێخ)و (خرندۆڵ)و بازاڕی (شێخ ئایش)دا.

٢- ٢٥/ ٧/ ١٩٨٨ گەیشتنمان بە هەواری (نازاوا)یە کە ماڵی حاجی جەوهەرئاغای لیۆژێ (خالّی روخسار خانی هاوسەرم)ی لێبوو، "خوا لێیان خۆش بێ" کە پێش چەند رۆژێك کاك عبدالواحدی براموو کاك فەقێ حەسەنی شەهید، هاوسەرمیان گەیاندبووە ئەوێ، بەخۆیو سێ منداڵەکەمانەوە: بەسۆز، پیرۆزە، موحەممەد.

٣- ١/ ٨/ ١٩٨٨ بەڕێکەوتنمان بۆ گوندی (کەوپەڕ) لە نزیك (خانێ) کە بارەگایەکی سەرەکیی بزووتنەوەی ئیسلامیی لێبوو.

٤- ١٩/ ٨/ ١٩٨٧ ناردنی مەفرەزەیەك كە هەركام لە: (شەهید مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی و كاك عبدالكریم قادر خدرە سوورو، كاك تەها حاجی زاهیر)ی تێدابوون بۆ (قەلا تووكان) بۆ دامەزراندنی بنكەی هێزی حەمزە.

٥- كۆتایی مانگی ٨/ ١٩٨٧ خانوو گرتن و ماڵ دانانمان لە(نەغەدە) بەهۆی كاك (مەلا سەلمان)ەوە، لەگەڵ ماڵی مامۆستا حەسەن بابەكردا پێكەوە.

٦- نیوەی یەكەمی مانگی: ٩/ ١٩٨٧ بوونم بە ئەندامی شاندی بالای بزووتنەوەی ئیسلامیی بۆ ئەنجامدانی رێككەوتننامە (إتفاقية) لەگەڵ:

أ) (یەكێتیی نیشتیمانی) لە هاوینە هەواری (گوێزێ) نزیك (دۆڵەكۆگە) لە كوردستانی ئێران.

ب) (حیزبی سۆسیالیستی كوردستان) لە گوندی (كاولان).

ج) (پارتی دیموكراتی كوردستان) لە گوندی (ڕاژان).

٧- ٢٣/ ٩/ ١٩٨٧ بەرێكەوتنم بۆ جاری یەكەم بەرەو بارەگای هێزی حەمزە لە قەلاتووكان لەگەڵ مەفرەزەیەكدا، كە هەر كام لە مامۆستا حەسەن بابەكرو شەهید مەلا شەریفم لەگەڵدا بوون.

٨- سەرەتای مانگی: ١٠/ ١٩٨٧ بەشداریكردنم لە كۆبوونەوەی شاندێكی بالای بزووتنەوەی ئیسلامیی لەگەڵ بەرپرسی قەرارگای ڕەمەزان (ئاغای ذوالقدر)داو مشتومڕكردنمان لەسەر بردن و نەبردنی پاسداران، لەگەڵ خۆماندا.

٩- سەرەتای مانگی: ١٠/ ١٩٨٧ بردنی هاوسەرم و منداڵەكان بۆ قەلاتووكان و ماڵ دامەزراندنمان لەوێ، وێڕای ماڵی چەند برایەكی دیكەش.

١٠- ١٨/ ١٠/ ١٩٨٧ دانرانم بە ئەندامی سەركردایەتی (كە ئەوكات سەركردایەتی ڕۆڵی مەكتەبی سیاسییشی دەبینی) لە كۆبوونەوەیەكدا كە لە شاری (سنە) ئەنجامدرابوو، بەڵام من لەوێ نەبووم و، پازدە (١٥) كەس دانرابوون بە ڕاوێژ لەگەڵ سی (٣٠) كەسدا، جگە لە ڕابەری گشتی جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان "خوا لێی خۆش بێ".

١١- ٤/ ١٠/ ١٩٨٧ (١٢ی ڕەبیعــی یەكــەمی ١٤٠٨ك) كۆكردنــەوەو بانگهێشــتكردنی لایەنـە سیاسییەكان بەبۆنەی یادی لەدایكبـوونی پێغـەمبەری خواوە لە قەڵاتووكان .

١٢- ٢٥/ ١١/ ١٩٨٧ـ ٢٤/ ١٢/ ١٩٨٧ ، جەولەیەكی یەك مانگی لە قەڵاتووكانەوە بـەرەو (بـەرەی مەرگـە)و ناوچـەی (جافـەتی)و (شــەدەڵە)و (ســەرگەڵوو)و (بەرگــەڵوو)و (زەرزی)و... هتد .

١٣- ١٦/ ٣/ ١٩٨٨ گوێبیســتبوونی هــەواڵی كیمیابــارانكردنی هەڵەبجـەو دەوروبـەری لـە رادیۆی دەنگی ئێــرانەوە .

١٤- ١٨/ ٣/ ١٩٨٨ دەســتپێكردنی پرۆســەی بەناو ئـەنفال و لـە ١٩/ ٣/ ١٩٨٨دا گیرانـی سەركردایەتی یەكیـەتی .

١٥- مانگی : ٤/ ١٩٨٨ كردنەوەی بنكـەی دووەمی هێزی حـەمزە لە(بەری ئەبووبـەكرە)ی بەرانبەر قەڵاتووكان لـە(كوركێ كـاوێ)و ، پاشـان گواسـتنەوەی بـۆ (بەسـتەمەلە) لـە سەرووی گوندی (ئاشـقوڵكە)ەوە لە ناوچەی ناودەشــت .

١٦- ٢٤/ ٥/ ١٩٨٨ یەكەمین هێرشی ڕژێم بە سـوپا و جاشــەوە بـۆ سـەر گـردی ڕەمكـان وشكانی .

١٧- سەرەتای مانگی : ٦/ ١٩٨٨ بەستنی كۆنگرەی چـوارەمی بزووتنـەوەی ئیسـلامیی لـە بارەگای هێـزی (خـالد) لە گونـدی (برالـە) لـە ناوچـەی (شـلێر)ی سـەر بـە قـەزای پێنجوێن ، كە من خۆم نەچووم و شـەهید مـەلا شـەریف بـە نوێنەرایـەتیی مـن و هێـزی حەمزە چوو ، وە لە هەڵبژاردنی سـەركردایەتییدا ، من زۆرتریـن دەنگم هێنـابوو .

١٨- ١٨/ ٦/ ١٩٨٨ـ ١٨/ ٧/ ١٩٨٨ گەشـتكردنم بـۆ ئێـران بـۆ شـاری ســەردەشت بـە مەبەسـتی چارەســەركردنی هاوســەرم كــە لـەوێ زانـرا كۆرپـە لـە ســكیدا مـردوە، چارەســەری بۆكراو مانگێكمـان پێچــوو .

١٩- ١٩/ ٧/ ١٩٨٨ گەڕانەوەمان (خۆم‌و هاوسـەرم کە موحەممەدیشـیمان پێبـوو)و، چەند برایەکم لەگەڵ بوون، شـەهید مامۆستا عبدالرحمن لۆتەرییـان لەنێودا بوو.

٢٠- شەوی ١٩ـ٢٠/ ٧/ ١٩٨٨ کۆبوونەوەکردنم بە ئەنـدامانی هێـز لـە بـارەی چـۆنیەتیی بەرەنگاربوونەوەی رژێمـەوە.

٢١- ٢٠/ ٧/ ١٩٨٨ دەستپێکردنی هێرشی سـوپاو جاشی رژێم‌و بۆسـەدانانمان بـۆ رژێـم‌و شکاندن‌و ڕاونانیـان‌و تۆپباران کرانـمان.

٢٢- ٢١/ ٧/ ١٩٨٨ بەردەوامبوونی شەڕو هێرشـەکانی رژێم‌و شەهیدبوونی چوار برامان.

٢٣- شەوی ٢٢ـ٢٣/ ٧/ ١٩٨٨ چۆڵکردنی گردی ڕەمکـان و بـەڕێکردنی خێزانـەکانمان‌و بریندارەکان بۆلای بەسـتەمەلە، پاشـان بریندارەکان بۆ دیـوی ئێـران.

٢٤- شـەوی ٢٣ـ٢٤/ ٧/ ١٩٨٨ چۆڵکردنی قەڵاتووکان‌و گواستنەوەی بارەگای هێـز بـۆ بەستەمەلەو گێرسانەوەی خێزانەکانیشمان لە کوێسـتانی (خواری).

٢٥- نێوە ڕاستی مانگی ٨/ ١٩٨٨ قوڵەشـەڕێك لە (کەڵەکین).

٢٦- ٢٤/ ٧/ ١٩٨٨ تـاکو ١٧/ ٩/ ١٩٨٨ مانـەوەمان لـە (کەڵـەکین)و (مـالێخ)و (گۆرگیسـوێ)و (خرِندۆڵ) پاشان بردنی بارەگاکانمان بـۆ (شـێخ ئـایش)، لـە دەوری کۆتایی مانگی (٨)یشـەوە بەرێکردنی خێزانەکانـمان بۆ نەغـەدە.

٢٧- کۆتایی مـانگی: ٩/ ١٩٨٨ گواسـتنەوەی بارەگـای هێـزی حـەمزە بـۆ (نـمێنجـە)و (بادینـاوێ) لە کوردستانی ئێران لە نیزیك شـاری (خانێ).

٢٨- ٢٧/ ٩/ ١٩٨٩ کۆبوونەوەی فراوانـی بزووتنـەوە لـە نووسـینگەی پەیوەندییـەکان لـە (سـەقز)و دانرانی بەندە بـە ئەنـدامی مەکتـەبی سـیاسی، پـاش ڕۆژێـك دواکەوتنـی بەنـدەو هەردوو هێزی حەمزەو شـافیعی، لە سۆنگەی چـەند گلەییەکـەوە کـە یـەکیان ئاگادارنەکرانەوەمان بوو لەو کۆبوونەوەیـە، کە وەك کۆنفرانسـێك وابوو.

٢٩- ١٢/ ١١/ ١٩٨٨ گواستنەوەی بارەگای هێزو ماڵەکانیشمان بۆ (سەردەشت)و دامەزراندنەوەی بارەگای هێزیشمان لە مزگەوتی: (حاجی ڕەسووڵ).

٣٠- ٣/ ٥/ ١٩٨٩ بڕیاردان بە کوشتنی (عومەر باپیر)ی برام، لە تۆڵەی شەهید عەلی ڕەسووڵ دێرەییدا، کە بە هۆی هەواڵ لێدان (إخبار)ی عومەری برامەوەو، رژێم گرتی و لەسێدارەی دا.

٣١- ٤/ ٦/ ١٩٨٩ لەدایکبوونی منداڵی چوارەمان (عبدالرحمن) لە سەردەشت.

٣٢- نیوەی یەکەمی ساڵی: ١٩٨٩ کۆبوونەوەیەك بۆ چاکسازیکردن لە بزووتنەوەی ئیسلامییداو هەڵوەشێنرانەوەی لەلایەن ئێمەمانانەوە، پاش هەوڵی بەلاڕێدابردنی لەلایەن چەند کەسێکەوە.

٣٣- چوونە ئیعتیکافێکی بیست ڕۆژەوە، لە مزگەوتی: حاجی ڕەسووڵدا.

٣٤- هاوینی: ١٩٨٩ هاتنی بابمو دایکم "خوا لێیان خۆش بێ" و براو خوشکەکانم بۆ دیوی ئێران، نیشتەجێ کرانیان لە شاری سەردەشت.

٣٥- کەشی هاوینی: ١٩٨٩ گواستنەوەی بنکەی هێزو ماڵەکانمان بۆ گوندی (خدراوێ) کە هەر خۆشمان ئاوەدانمان کردەوە.

٣٦- کەشی هاوینی: ١٩٨٩ سەردانی شاندێکی بزووتنەوەی ئیسلامیی بۆلای بەڕێز مام جەلال، بەمەبەستی پێك ئاشنابوونی زیاتر، لە گوندی (قاسمە ڕەش).

٣٧- کۆتایی کەشی هاوینی: ١٩٨٩ گرژییو نامەو نامەکاریی نێوان بەندەو مام جەلال لە (٥/ ٩/ ١٩٨٩) بەرەو دوا، پاشان چارەسەرکرانی کێشەکە بە تەجمیدکردنی بەندە لەلایەن ڕابەری گشتی (مامۆستا مەلا عوسمان)ەوە "خوا لێی خۆش بێ".

٣٨- سەرەتای ساڵی: ١٩٩٠ پێکهێنانی (کۆڕی ڕاوێژی یەکگرتوو) بە سەرپەرشتیاریی بەندە، بۆ چاکسازییو گۆڕانکاریی لەنێو بزووتنەوەدا.

٣٩- ساڵی: ١٩٩٠ نووسینو چاپکردنی کتێبی (دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی).

٤٠- ساڵەکانی ١٩٨٩ـ١٩٩٠ نووسین‌و چاپکردنی چەند کتێب‌و نامیلکەیەك:

أـ (ڕێگای صاڵح بوون‌و بەرەو خوا چوون).

بـ (ڕێبـازی پێغەمبەر کامەیـە؟).

جـ (کوردستان بۆویران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتـەوە ؟!).

٤١- ١٣/٦/١٩٩٠ بەستنی کۆنگرەی پێنجەمی بزووتنـەوەی ئیسلامیی لە گوندی (دزڵـێ) سـەر سنووری ئێران.

٤٢- ١٥/١٢/١٩٩٠ لەدایکبوونی منـداڵی پێنجـەممان (فاتیمـە) لە (خـدراویَ).

٤٣- سەرەتای ساڵی: ١٩٩١ نووسـین‌و بڵاوکردنـەوەی نامیلکـەی (حـوکمی گەڕانـەوەی ژێرنیری تاغـووت).

٤٤- ٥/٣/١٩٩١ دەسـتپێکردنی ڕاپـەڕینی جـەماوەریی کوردسـتان لـە شـاری ڕانیـە (دەروازەی ڕاپەڕیـن)ەوە.

# چەند بیرەوەرییەکی نێوان

## ١٩٨٧/٧/٢٠و کۆتایی مانگی ١٩٨٧/١٠

ئەو ماوەیە کە وێستگەکانی : (١ـ١٠)ی ژیانی پێشمەرگایەتیم پێش ڕاپەڕین دەگرێتەوە، بیرەوەریی زۆری تێدان کە بە شایستەی ئاماژەپێکردنیان دەزانم؛ ئەوانە ژمارەیەکیانن :

### ڕۆڵی جوامێرانەی گەنجانی گوندی (گەڵوو) :

پاش بەڕێکەوتنم لە ڕانیەوە لە ٢٠/ ٧/ ١٩٨٧داو پاشان لەگەڵ کاك مەلا ئەحمەدی هەنارۆکیّ لە بەستەستێنەوە چوونمان بەرەو گوندی گەڵوو، یەکسەر نەچووینە نێو گوند، لە شیوێکی ڕۆژئاوای گونددا کە پێشتر وادەمان لەگەڵ دانابوون لەگەڵ ١٥ـ ٢٠ لە گەنجەکانی گوندەکە بەخۆیان‌و ئێسترەکانیانەوە هاتبوون، یەکدیمان گرتەوەو، پاشان ژمارەیەکیان لەگەڵمان هاتن بەرەو هەوارو کوێستانەکانی قەندیل وەك: (سیرنیّ)و (مالیّخ)و (خرندۆڵ)و پاشان لە بازاڕی (شێخ ئایش)ەوە چووینە هەواری (نازاوا) کەماڵی حاجی جەوهەر ئاغای لێوژیّ خاڵی هاوسەرمی لێبوو، هاوسەریشم (روخسار خان) چەند ڕۆژێك بوو گەیشتبووە ئەویّ.

شایانی باسیشە هەڵوێستی ئەو گەنجانەی ماخۆبزنان لەوکاتەدا فیداکارییەکی گەورەبوو، چونکە ئەگەری بەهێز هەبوو کە لەسەر ئەوە بگیرێن‌و گرفتار بن، هەر لێرەوەش دەمەویّ ئەوەش بڵێم: کە هەمان هەڵوێستی جوامێرانەو فیداکاریانە لە ژمارەیەکی باش لەگەنجەکانی گوندەکانی دیکەی (پشدەرە ڕەقە)شدا هەبوو، بەتایبەت خەڵکی (دووگۆمان)و (زەنگلان)، بەڵام لەوکاتەدا تەنیا ئەوانەی (گەڵوو)مان ئاگادارکردبووەوە.

هەروەها ناکرێ لێرەدا باسی هەڵوێستی بەخشـندانەو جوامێرانەی ئەو ماڵە مەردارانەی لەو هەوارو کوێسـتانانە پێیاندا ڕەتدەبووین، نەکەم، کە وەك کوردەواریی دەڵێن: هێندە سـەخیی بوون، نانێـكو گایەکیان پێ وەك یەك بوو.

## مام مـەلای بادینـاویێو بیـرەوەرییەکی کۆمـاری مەهـابـاد:

دوای ئـەوەی لـە(نازاوا)وە بـەرەو (کەوپـەڕ) بەڕێکـەوتین کـە بارەگـای (بزووتنـەوەی ئیسـلامیی)ی لێبـوو، لە گوندی (بادیناوێ) لامان دایە ماڵی مام مەلا "خوا لێـی خۆشبێ" خەزووری مامۆستا مەلا ڕەسووڵی فەتحی ڕاد، ئیمـام جومعەی پێشووی خانێو، لـە سـیاقی چەند قسەیەکی مێژووییدا بیرەوەرییـەکی سـەردەمی کۆمـاری مـەهابادی بـۆ گێڕاینـەوە، کـە پێموایە دەرسو پەندێکی گەورەی تێدایـە، بۆیە لێرەدا دەیگێڕمـەوە:

گوتـی:

کاتی خۆی لە سەردەمی کۆماری مەهاباددا کە منیش پێشـمەرگە بوومو هێزی سـوارەمان هەبوو، ئەسـپ سـوارەکان بـە نـەزمێکی تایبـەت ئەسپەکانیان دەجوولانـدو لـەو کاتەشـدا شـیعرێکیان بە ئاوازێکی تایبەت دەگوت، ئەسپەکانیش بەهەمان ئاهەنگو ئـاوازی شـیعرەکە دەڕۆیشتن، سەرەتای شیعرەکەش ئاوابوو:

**زووکـەن هەڵـدەن ئالایـە**
**ئیسـتالیـن پێشـەوایـە**
**بۆ کـوردان وەك بـاب وایـە**

**منیش دەڵێم:**

لە هەموولایەك ڕوونو عەیانە، سـتالینو ڕووسو سـۆڤیەت چییان بەسـەر هـەرکام لـە (قازی موحەممەد)ی سەرۆك کۆماری مەهابادو (جەعفـەر پیشـەوەریی)ی سـەرۆك کۆمـاری ئازەربایجـانو کۆمـارە سـاواکانیان هێنـا، چـۆن لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدیی ناشـەرعییانەو ستەمکارەکانیاندا پردیان بە ئاوداو کـلاویان لەسـەرنان!

دەریشکەوت کە ئەوانەی ستالینیان بە باب زانیبوو، چەند ساویلکەو خۆش باوەڕبوون!

کە بەداخەوە ئێستاش لەگەڵدابێ ئەو سادەیی و خۆش باوەڕییەی سەرکردایەتیی سیاسیی کورد بە زلهێزەکان، هەر بەردەوامە، بە پێچەوانەی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" ﴿لا يُلْدَغُ المؤمن من جحر واحدٍ مرتين﴾ رواه البخاري، واتە: ئیماندار دووجاران لە کونێکەوە پێیەوەنادرێ، ئێمە چەند جار لە کونێکەوە، یان لە چەند کونێکی وەك یەکەوە، گەزراوین و پێوەدراوین!

## ڕێککەوتننامە ئیمزاکردن لەگەڵ هەرکام لە: یەکێتیی و پارتیی سۆشیالیستدا:

لە نیوەی یەکەمی مانگی ٩/ ١٩٨٧دا شاندێکی بزووتنەوە پێکهێنرا کە بەندەش تێیدا ئەندام بووم، بە مەبەستی سەردانکردن و ڕێککەوتننامە ئیمزاکردن:

**یەك**: لەگەڵ (یەکیەتی نیشتیمانیی)دا لەبارەگای مەکتەبی سیاسییان، کە لە هاوینەهەواری (گوێزێ) بوو، نیزیك (دۆڵەکۆگە).

شاندی بزووتنەوە:

١ـ مامۆستا مەلا عەلی عبدالعزیز "خوا لێی خۆش بێ".

٢ـ مامۆستا مەلا شێخ موحەممەد بەرزنجیی "خوا لێی خۆش بێ".

٣ـ کاك سەید نەجمەددین هەڵەبجەیی.

٤ـ عەلی باپیر.

شاندی یەکیەتی:

١ـ دکتۆر فوئاد مەعصوم.

٢ـ مامۆستا ناظم دباغ.

٣ـ ئاوات عبدالغفور.

دوو: لەگەڵ حیزبی سۆشیالیستدا لە گوندی (کـاولان).

شاندی بزووتنەوە هەر شاندی پێشوو، جگە لە کاك سـەید نەجمەددین.

شاندی سۆشیالیست:

١ـ کاك ڕەسوول مامەند سکرتێری حیزب، "خوا لێی خۆشبێ".

٢ـ خاڵە سەید کاکە.

٣ـ مامۆستا سەعد، "خوا لێی خۆشبێ".

سێ: لەگەڵ پـارتی دیموکراتی کوردستاندا لە گوندی (ڕاژان).

شـاندی بزووتنـەوەی ئیسـلامیی:

١ـ مامۆستا مەلا عەلـی عەبدولعـەزیز، "خوا لێی خۆش بێ".

٢ـ مامۆستا مەلا شـێخ محەممەد بەرزنجی "خوا لێی خۆش بێ".

٣ـ مامۆستا مەلا عـەلی بیـارەیی، "خوا لێی خۆشبێ".

٤ـ مامۆستا شـێخ عەبدوللەتیف واژەیـی، "خوا لێی خۆشبێ".

٥ـ عـەلی باپـیر.

شـاندی پـارتـی:

١ـ کاك مەسـعوود بـارزانی.

٢ـ کاك عـەلی عەبـدوڵڵا.

٣ـ کاك فاضل میرانی.

شایانی باسیشـە ئەو هەنگاوەی بزووتنـەوە، هـەنگاوێکی سیاســیی گـرنگ بـوو و بـووە مایــەی زیـاتر ئیعـتیراف پێکرانـی لەلایـەن سیاسـییەکانی سـەر گۆڕەپـانی کوردسـتانەوەو، ڕەوینـەوەی ترس و دڵەڕاوکەی کەسـانێك کە پێیانوابوو، بزووتنەوەش بە مەرەدی (لەشـکری ئیسـلامیی) دەبردرێ!

هەروەها بووە مایەی بەرچاوڕوونبوونەوەی لایەنە سیاسییەکان بەرانبەر بە بزووتنەوەو قیادەکەی و ئامانجەکانی و . . . هتد.

هەڵبەتە لەگەڵ هەرکام لەو سێ لایەنەشدا ڕێککەوتننامەی نووسراو ئیمزاکراو، کۆبوونەوەکان لە کەش و هەوایەکی ئیجابیی و هێمن و ئارامدا بەڕێوەچوون، ئەوەی جێی تێبینیی و گلەیی منیش بوو لە کۆبوونەوەکانماندا، ئەوەبوو کە هەندێك لە مامۆستایان نوکتەو قسەی سوعبەت و فشەقیاتیان زۆربوو، هەرچەندە منیش دژی قسەی خۆش و نوکتەو پێکەنین نیم، بەڵام گوتراوە: (إعط كلامك من المُزْح بقدر ما تعطي طعامك من الملح) واتا: با گاڵتەو قسەی خۆش لە ئاخاوتنتدا، بە ئەندازەی خوێی خواردنت بێ!

## بەشدارییکردنم لە کۆبوونەوەی شاندێکی باڵای بزووتنەوە لەگەڵ بەرپرسی قەرارگای ڕەمەزان ئاغای (ذو القدر)دا و مشتومڕمان لەسەر لەگەڵ خۆدا نەبردنی پاسداران:

لە سەرەتای مانگی (١٠)ی (١٩٨٧)دا لە شاری سنە بەشداریی کۆبوونەوەیەکی شاندێکی باڵای بزووتنەوەم کرد کە مامۆستا مەلا عوسمان رابەری گشتی، سەرۆکی بوو، لەگەڵ (ئاغای ذو القدر) بەرپرسی ئەوسای قەرارگای ڕەمەزاندا.

دیارە ئەوکاتە کۆماری ئیسلامیی ئێران بەگشتی هاوکاری ئۆپۆزیسیۆنی ڕژێمی بەعسی دەکردو، ئێمەش وەك بزووتنەوە پشکێکمان پێ دەبڕا.

ئنجا کاتێك قسە هاتە سەر ئێمە وەك هێزی حەمزە، کە تازە بارەگامان لە(قەڵاتووکان)ی بناری قەندیل کردبۆوە، (ئاغای ذو القدر) لە بەرانبەر هاوکارییکرانماندا، داوای کرد کە ژمارەیەك پاسداریان بۆ لەگەڵ خۆماندا ببەین، منیش گوتم: ناتوانین ئەوە بکەین!

گوتی: ئەدی بۆچی حیزبەکانی دیکە کە ئیسلامییش نین و لائیکن، کەچی ئەوجۆرە هاوکارییانەمان دەکەن، خۆ ئێوە لەپێشترن؟!

گوتم: ئێمە ناتوانین و هەرکەسەش بە عەقڵی خۆی بەڕێیەدا دەڕوات!

یەکێك لە مامۆستایانیش گوتی: تۆ بۆچی ئامادەی هیچ هاوکارییەك نی؟!

گوتم: مامۆستا! ناکرێ یەکەمین شتێك کە بۆ ئەو خەڵكو جەماوەرەمانی بە دیارییو خەڵات دەبەین، کە دەمانەوێ رزگاریان بکەین، پاسداری ئێران بێ، ئێمە هەتا ئێستا چالاکییەکی ئەوتۆمان نەکردووە، خەڵكو جەماوەرەکەمان لێمان بەدبین دەبن!

ئاغای ذو القدریش گوتی:

باشە مادام ئێوە ئامادەیی هاوکاریکردنمانتان نیە، ئێمەش هاوکارییتان ناکەین!

منیش گوتم: بێمنەتین هاوکارییمان مەکەن!

گوتی: ئاخر چۆن بەرێوەدەچن؟

گوتم: بەرێوەدەچین، پشتمان بە خوا قایمەو، خەڵکی خۆمان هاوکارییمان دەکەنو، ئێستاش بارەگای هێزمان دامەزراندوە!

ئەویش گوتی: باشە تەنیا دوو پاسدار لەگەڵ خۆتاندا ببەن!

منیش گوتم: (من نصف پاسدار هم با خودم نمیبرم!) واتە: من لەتکە پاسدارێکیش لەگەڵ خۆمدا نابەم.

ئەویش گوتی: (این توهین است به جمهوری اسلامی) واتە: ئەوە سووکایەتییکردنە بە کۆماری ئیسلامیی!

گوتم: نەخێر سووکایەتییکردن نیە، بەڵام وادیارە جەنابت زانستی ڕەوانبێژییو زانستی ژێربێژیی (علم البلاغةو علم المنطق)ت نەخوێندوە! کە ئەگەر کەسێك بیەوێ داکۆکیی لەسەر نەکردنی کارێك بکات، دەیبەستێتەوە بە شتێکی مەحاڵەوە، وەك: هەتا قیر سپی نەبێو زیخ گوڵ دەرنەکات، فلاّن کارە ناکەم!

منیش مەبەستم نەبردنی پاسدارەکانە، نەك سووکایەتیی، ئەگەرنا هەموو کەس دەزانێ بەشەر لەت ناکرێ!

ئیدی سەرەنجام نەگەیشتینە ئاکامو، بە دەستی خاڵی گەڕاینەوە بارەگای هێز لە قەڵاتووکان.

## بوونــم بە ئەنـدامی قیـادەی بزووتنــەوەی ئیسـلامیی :

لـە ١٨/ ١٠/ ١٩٨٧دا لـە شـاری سـنە كۆبوونەوەیـەك لـە نێـوان سـی (٣٠) كەسـدا ئەنجامدراوو، پـازدە (١٥) كـەس بـە قیـادەو سـەركردایەتیی تـازەی بزووتنـەوەی ئیسـلامیی هەڵبژێررابوون، كە دیارە من لەوێ نەبووم، بەڵام منیش یەكێك بووم لەو پـازدە كەسـە، كـە لەجێی سـەركردایەتیی و مەكتەبی سـیاسییش بوون.

ئنجا ئەوەی كە لێرەدا بە شایستەی باسكردنی دەزانم، ئەوەیە كـە چ ئـەو كۆبوونەوەیـەو چ زۆربـەی هـەرەزۆری كۆبوونـەوەو كۆنگرەكـانی ئەوسـای بزووتنـەوە، زیـاتر حاڵـەتی هەرەمەكیی و عاتیفیی و میزاجییان پێوە دیاربووو، بە نەخشەو بەرنامەیـەكی رێكوپێـك بـەرێوە نەدەچوون، هەر بۆیـەش ئامانجـەكانی خۆیانیـان نـەدەپێكاو، گـەلێك جـاران حاڵـەتی پـاش كۆبوونەوەو كۆنگرە، لە حاڵەتی پێشێ خراپتربوون و خەڵكەكە زیاتر بێـزار دەبوو.

هەڵبەتە ئەو دیـاردەیەش هۆكاری زۆر بوون، بەڵام گرنگترینیـان نەشارەزایی بوو لە كاری حیزبیـی و ئیـداریی و، هـیچ كامـان بـەوردو درشـتەوە، پاشـخانێكی ئیـداریی و سیاسـی و ئەزموونێكی حیزبییمـان نەبوو.

هەربۆیەش من هەر لە زووەوە دەمگوت: ئەم كارەی ئێمـە ئـاوا بـە ئـەنجام ناگـاتو ئێمـە كۆمـەڵ (جـماعـة) نیین، بەڵكو گردبوونـەوە (تَجَمّــع)ین!

هەرچەندە ژمارەیەك لە مامۆستایانیش ئەو قسانەی منیـان لەسـەر دڵ قـورس بـوو، بـەڵام دڵسـۆزیی خـۆمم بـۆ ئـەوانو كـارو پـرۆژە ئیسـلامییەكەشمان، لـە هەقبێـژیی و ڕاسـتو ڕاشـكاوییدا دەبینیــەوە!

# چەند بیرەوەرییەکی نێوان مانگی

## (١٠)ی (١٩٨٧) و نیوەی یەکەمی مانگی (٧)ی (١٩٨٨)

ئەو ماوەیە کە وێستگەکانی: (١١ـ١٨)ی ژیانی پێشمەرگایەتیم پێش ڕاپەڕین دەگرێتەوە، بەسەرهات و ڕووداوی زۆری تێدابوون، کە ژمارەیەکیان لێرەدا بە شایستەی تۆمارکردن دەزانم:

### کۆکردنەوەو بانگهێشتکردنی لایەنە سیاسییەکان بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەری خواوە "صلى الله عليه وسلم" لە قەڵاتووکان:

لە (١٢) ڕەبیعی یەکەمی ١٤٠٨) بەرانبەر: (٤/ ١٠/ ١٩٨٧)دا بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری خاتەمەوە "صلى الله عليه وسلم" وەك هێزی حەمزە هەڵساین بە سازکردنی ئاهەنگ و کۆبوونەوەیەك، کە پارتە سیاسییەکانی ئەو دەڤەرەشمان هەموویان بانگهێشت کرد: (پارتی، یەکێتی، سۆشیالیست، پارتی گەلی، حیزبی شیوعی) کە هەموویان هاتبوون جگە لە حیزبی شیوعی، دیارە لەو ئاهەنگ و کۆبوونەوەیەدا جگە لە وتارەکەی بەندە، چەند شیعرو سروودێکیش پێشکەشکران، هەروەها (کاك مەلا شەریف)یش وتارێکی کورتی هەبوو، کاك شەریف وەرزێریش هەڵسوڕێنەری ئاهەنگەکە بوو.

من لە وتارەکەمدا جەختم لەسەر چەند مەسەلەیەك کردەوە، وەك:

١- گەورەیی و بەرزیی کەسایەتیی پێغەمبەری خاتەم "صلى الله عليه وسلم" و پێویستبوونی شوێن پێهەڵگرتنی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، چونکە خوا بەگشتی و ڕەهایی فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ... ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا باشترین سەرمەشقتان هەیە...

٢- پێغەمبەرانی خوا بەگشتیی و بەتایبەت پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد "صلى الله عليه وسلم" رزگارکەری چەوساوانو مافخوراوان بوون، ئێمەش وەك گەلێکی ستەمدیدەو بێ قەوارەو ناوونیشان، ئەگەر بەڕاستی پابەندیی رێبازو بەرنامەکەی پێغەمبەری خاتەم بین، دەتوانین ببینە گەلێکی ئازادو سەربەستو خاوەن قەوارە.

٣- لە ئیسلامدا مرۆڤەکانو گەلو نەتەوەکان یەکسانن و، هیچ کەس پلەو ئیمتیازی بەسەر ئەوانی دیکەدا نیەو، هیچ گەلو نەتەوەیەك بۆی نیە گەلو نەتەوەیەکی دیکە بچەوسێنێتەوەو بیکاتە بندەست، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ... ﴿١٣﴾﴾ الحجرات.

٤- جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا بە مەبەستی دەربازکردنی چەوساوانو بەرپەرچدانەوەی چەوسێنەرو ستەمکاران، لەسەر مسوڵمانان فەرزەو بە کەمتەرخەمی تێداکردنی گوناهبار دەبن، وەك خوا "عزّ وجلّ" فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ ...﴿٧٥﴾﴾ النساء.

٥- پێویستیی هەبوونی کۆمەڵو رێکخراوێکی ئیسلامیی لە کوردستاندا، بۆ بەرگرییکردن لە نەتەوەی ستەمدیدەی کوردو، لەسەرشان لابردنی نیری رژێمی بەعسی دیکتاتۆرو خۆسەپێن، لەژێر بەیداغی (لا إلەالا الله)دا.

دیارە قسەکانمو بەوجۆرە باسکردنی ئیسلام، کە بەرنامەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنەی ژینە، مایەی سەرسامیی لایەنە سیاسییەکان بووو، مایەی بەرچاوڕوونبوونەوەشیان بوو.

ئنجا وەك گوتم: جگە لە وتارەکەی بەندە (شەهید مەلا شەریف)یش وتارێکی پێشکەش کردو (تیپی باوەڕ)یش شیعری (پڕ لە باوەڕە دڵمان، مسوڵمانین مسوڵمان) کە هی کاك شەریف وەرزێر بوو، وە شیعرێکی کاك مەلا هێواش کە دەیگوت:

مـن ڕۆڵـەی بـڕوا بـەتیـنـم

لێم تێکنـاچێ ڕێگای ژینـم

تەنیـا ئیسـلامـە ئاییـنم

هـەردووکیان بـە کـۆڕس پێشـکەش کـردو، جـۆش و خرۆشـێکی گـەورەیان لـە دڵـی بەشداربووواندا ڕەخسـاند.

# جەولەیەكی یەك مانگی

لە ڕۆژی: ٢٥/ ١١/ ١٩٨٧دا هەڵساین بە گەشتێكی یەك مانگیی لە قەڵاتووكانەوە بەرەو (بەری مەرگە)و (جافایەتی)و (شەدەڵەو) (بەرگەڵوو)و (سەرگەڵوو)و (زەرزی)و...هتد.

ئنجا هەرچەندە هەردووك برای بەڕێزم: (شەریف وەرزێر)و (مامۆستا موحەممەد زەرزی) كە هەردووكیشیان بەشداری جەولەكە بوون، نامیلكەیەكیان لەوبارەوە بە ناوونیشانی: (جەولەیەك بە قووڵایی خاكی نیشتیماندا) نووسیوە، كە لە ساڵی (٢٠٠٩)دا چاپكراوەو ئەو دوو برا بەڕێزو دڵسۆزە، وردەكاریی باشیان لەبارەی ئەو گەشتو گەڕانەوە خستۆتەڕوو، كە بێگومان من ناتوانم لێرەدا هەمووی باس بكەم، بەڵام بۆ مێژووەكان پشت بە نامیلكەكەی وان دەبەستم، بەڵام لەبەر گرنگیی ئەو جەولەیە لەو ئانو ساتەداو، ئەو قسەو باسانەی كە لەگەڵ كۆمەڵێك كەسایەتیی دیاری كوردستاندا كراون، بەپێویستی دەزانم چەند خاڵێك بە گوشراویی باس بكەم:

یەك: كاتی خایاندنی جەولەكە: جەولەكەمان مانگێكی ڕەبەقی خایاند، لە (٢٥/ ١١/ ١٩٨٧) تاكو: (٢٤/ ١٢/ ١٩٨٧).

دوو: بەشداربووانی جەولەكە:

١- مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی.

٢- مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا (جهاد).

٣- مامۆستا مەلا شێخ فاتح (باریێ)یی.

٤- شێخ مەحمود خەمزەیی.

ئەم چوار برایە شاندێك بوون لە سنەوە هاتبوون، لەلایەن مامۆستا مەلا عوسمان ڕابەری گشتییەوەو، بەرماڵێك و بەرگێکی تەفسیرەکەی مامۆستایان، لە مامۆستاوە بۆ مام جەلال هێنابوو.

٥- عەلی باپیر.

٦- مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی (شەهید).

٧- شەریف وەرزێر.

٨- مامۆستا موحەممەد زەرزی.

٩- عبدالواحد باپیر.

١٠- مامۆستا تۆفیق (شەدەڵەیی).

١١- جەعفەر حاجی ڕەزا (شەدەڵەیی).

١٢- مەلا سەردار.

١٣- مام ڕەسوول موحەممەد (برای مەلا ئەحمەدی هەنارۆکێ).

١٤- موحەممەد سەرسیانیی، کە لەبەر نەخۆشیی لەبەری ئاسۆسەوە گەڕایەوە.

سێ: پانتایی جوگرافیی جەولەکە:

جەولەکەمان جگە لەڕەتبوون بەلای بەستەستێن و سولْتانەدێ و سندۆڵان و کێلەسپییدا: بەری مەرگەو، دۆڵی جافایەتیی و، ناوچەی سورداش و، بەشێك لەدەشتی کۆیەی گرتەوە.

چوار: ئەو گوندانەی پێیاندا ڕەتبووین و سەردانمان کردن:

١- سندۆڵان. ٢- کەڵەکان. ٣- بناویلە. ٤- مەرگە. ٥- لۆتەر.

٦- ئاوەژێ. ٧- شارەستێن. ٨- دۆڵەبی. ٩- چالاوا. ١٠- سەرگەڵوو.

١١- بەرگەڵوو. ١٢- کانی زەرد. ١٣- بیەقووچ. ١٤- زەرزی.

١٥- شێخ زەینەڵ. ١٦- سردی گەورە. ١٧- قۆچەبلاخ. ١٨- عەودالان.

١٩ـ گـەورەدێ. ٢٠ـ كانی بی بێـژینگ بەسـەر. ٢١ـ كەڵەشـێرە. ٢٢ـ سـۆتكە.

٢٣ـ كـەلەبـاش. ٢٤ـ شـیلەخـان. ٢٥ـ سـوسـێی ئاڵەمـەڕە. ٢٦ـ چـۆخماخ.

٢٧ـ مالوومــە. ٢٨ـ گۆیـزیلـە. ٢٩ـ هـەڵــەدن. ٣٠ـ كــانــی شـینــكـە.

٣١ـ یـاخـیــان. ٣٢ـ خــورڕخـورە. ٣٣ـ كـانی تـوو. ٣٤ـ چنـارنـــێ.

٣٥ـ ئــاوەژێ. ٣٦ـ صـۆفـیـان. ٣٧ـ گــەرمـكـان. ٣٨ـ كێڵـەســـپی.

٣٩ـ كەرســۆنان. ٤٠ـ بەستەســتێن.

<u>پێنج</u>: چەند كەسـایەتییەك كە لەو جەولەیەمان دا بینیمـــانن:

١) <u>مامۆسـتا مەلا عـــەلی سـەرگەڵوویی:</u>

رۆژی: ٢٩/ ١١/ ١٩٨٧ گەیشـتینە گوندی (سـەرگەڵوو)و چووینە ماڵی (كـاك مـەلا عەلـــی) ســـەرگەڵوویی ئیمــامی گونـد، كـە هـاوەڵێكی رۆژگـاری خوێنـدنم بـوو لـە پەیـــمانگای ئیســـلامیی لـە سـلێمانیو مەلایـەكی هەقبێـژو هۆشـیار بـوو، لــە (٢٢ـ ٢٣/ ٧/ ١٩٨٩) لـە (گۆمــەداڵ)ی پشـــت (یاخیــان) لـە ناوچـەی جافـەتی لـە كــاتی دابەزینیـدا بۆ چالاكیی پارتیزانی، لەگەڵ هێزێكی نابەرانبەری رژێمدا رووبەڕوو دەبێتەوەو دەكـوژرێ، "خوا پلـەی شەهیدی پێ بەخشیبێ".

شـایانی باسە شـەویش هەرلە ماڵی مامۆستا بووینو، دواتریش لەسەری گەڕانەوەمانـدا لەو جەولەیـە داوای لێكـردم كە وتاری جومعـە بۆ خەڵكەكە بـدەم، كـە رۆژی جومعەكـە كەوتـە: (١١/ ١٢/ ١٩٨٧).

٢ و ٣) <u>مامۆستا مەلا عبدالعزیـز عـلاء الدین و كاك دكتۆر فوئاد معصوم:</u>

یەكێك دیكە لـەو كەسـایەتییانەی كـە لـەو جەولەیەمانـدا بینیمـانن "خـوا لێخۆشـبوو" مامۆستا مەلا عبدالعزیـز علاءالدین بوو، بابی دكتـۆر دلاوەر "وەزیری خوێنـدنی بـالآی پێشـووتر" و زاوای (مامۆستا مەلا مەعصوم) بابی دكتۆر فوئـاد مەعصـوم، كـە لـە سـاڵی (٢٠٠٧)دا وەفـاتی كردو خاوەنی تەفسـیرێكو ژیاننامەیەكی پێغەمبـەری مەزنیشـە "صلی

الله عليه وسلم " ، دیارە مامۆستا مەلا عبدالعزیز مەوعیدی سەردانی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانی لە (بەرگەڵوو) بۆ وەرگرتین، ئەوەبوو کە لە ڕۆژی (٣٠/ ١١/ ١٩٨٧)دا لەگەڵ کاك دکتۆر فوئاد مەعصوم دانیشتین، بەندەو مامۆستا مەلا مەحموود ئازادیی و مامۆستا مەلا جیهاد (عبدالله)، هەروەها مامۆستا مەلا عبدالعزیزیش ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو، کە نانخواردنی نیوەڕۆشی تێکەوت، دیارە لە لایەنی یەکێتییشەوە، یەك دووانێکی دیکەش بەشداربوون، بەڵام زیاتر کاك دکتۆر فوئاد مەعصوم قسەکەر بوو.

ئامانجیش لە سەردانەکە گەیاندنی سەلام و دیارییەکانی مامۆستا مەلا عوسمان و، زیاتر پێك ئاشنابوونمان بوو.

لێرەشدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بکەم بە هیممەت بەرزیی مامۆستا مەلا عبدالعزیز، کە هەرکام لە تەفسیرەکەی و ژیاننامەکەی پێغەمبەری مەزنی لە غەریبایەتییدا لە شاری لەندەن بە نەخۆشیی و تەندروستییەکی خراپەوە نووسین، لە حاڵێکدا کە گورچیلەکانی بە ئامێر ئیشیان دەکرد، بەدەست چەند نەخۆشییەکی دیکەشەوە گرفتار بوو!

٤) مامۆستا بهاء الدین نوری:

هەر ئەو ڕۆژەی کە میوانی دکتۆر فوئاد مەعصوم بووین، واتە: (٣٠/ ١١) مامۆستا بهاء الدین نوری سکرتێری پێشووتری حیزبی شیوعیمان بینی، ئەویش بەخۆی و چەند کەسێکەوە میوانی دکتۆر فوئاد بوون.

شایانی باسیشە کە لەگەڵ مامۆستا بهاء الدین نوریدا گفتوگۆیەکمان بوو، بە باشی دەزانم کە بە کورتیی ئاماژەیەکی پێ بکەم:

دوای ئەوەی دکتۆر فوئاد مەعصوم من و مامۆستا بهاء الدینی بە یەکدی ناساندو گوتی:

مامۆستا بهاء الدین! ئەمە فلان کەسە، ئەندامی سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ئیسلامیی!

مامۆستا بهاء الدین یەکسەر ڕووی تێکردمو گوتی:

حەزدەکەم ئامۆژگارییەکتان بکەم!

گوتــم : فەرموو.

گوتی : هیوادارم ئێوە خزمەتــی میللەتی خۆتان بکەن، نەك خزمــەتی خــەڵك‌و بێگانــە، مەبەستیشــم لە خەڵك‌و بێگــانە، خومەینــی‌و ئێرانــە!

پاشان گوتی : ئاگــاداریش بــن مەزهەبــەکان هــەموویان بــارودۆخی سیاســی دروســتی کردوون‌و، ئیمامەکان لە ژێرکاریگەریی حوکمڕانەکانــدا بوون!

دیارە ســەرەتا بێدەنگ بووم هەتا قســەکانی تەواوکردن، پاشان گــوتم : مامۆســتا! ئێمــە زۆر سوپاسی ئامۆژگارییــەکانت دەکــەین کــە دەڵێــی : خزمــەتی خــەڵك‌و وڵاتــی خۆتــان بکەن‌و، خزمەتی بێگــانە مەکەن! بەڵام دڵنیابــە کــە هــەرواین، چــونکە هەرنــەبێ پەنــد لــە حیزبی شــیوعی وەردەگرین، کە زۆر لە مێــژە بەوە مەشهوورە دەڵێن : ئەگــەر لــە مۆســکۆ بەفر ببــارێ، لێــرە چەتــر هەڵــدەدەن!

هەروەها حیــزبی (توودە)ی شیوعی لە ئێران کە کاتێك (دکتۆر محمد مصدق) لــە (شــا) ڕاپەری‌و هەوڵیدا نــەوت خۆماڵیــی (تــأميم) بکــرێ، (شــا) تــەنازولی کــرد بــۆ یەکێتیــی ســۆڤیەت، لە بەرانبەر پشتگیرییکردنیدا، ئیمتیــازی دەرهێنــانی نــەوتی پێــدان، لەوکاتــەدا حیزبــی تــوودە لــە ســۆنگەی ئــەوەوە کــە گرێــدراوی سیاســەتی ســۆڤیەت بــوون، نــەك بەرژەوەندیی گشــتیی خەڵکی ئێران، پشتگیریی (شا)یان کردو هەوڵەکــەی (دکتــۆر محمــد مصدق)یان لەبــاربرد! بۆیە ســەرەنجام حیزبی توودە، پاش شۆڕشی گــەلانی ئێــران، وەك بەفــر توایەوەو نەما!

ئنجا بۆ مەسەلەی مەزهەب‌و ئیمامەکانیش دەڵێم :

وادیارە جەنابت باش شارەزای مێــژووی ئیســلام نیــی، ئەگــەرنا کــام لــە ئیمــام‌و ســەر مەزهەبــەکان لەگــەڵ حوکمڕانــە خۆســەپێنەکانی ڕۆژگــاری خۆیانــدا، دانوویــان پێکــەوە کولێون‌و سازگار بوون؟!

١- (أبوحنيفــة) کــە لەســەر ئــەوەی پــاش داوای (أبــو جعفــر الــمنصــور) "دووەمــین حوکمڕانی عەبباسی ئامادە نەبوو ببێتــە (قاضــي القضــاة) زینــدانیی کــراو هەنــدێکیش دەڵــێن : هەر لە زینــداندا مــرد؟!

٢- یان (مالـك) كه لەكاتی راپەڕینـی (محمـد ذوالنفس الزكية وإبراهيـم) كوڕانی (عبدالله بن الحسـن)دا دژی (ابو جعفـر الـمنصـور) كه بە سوێندو تەلاقەوە بەیعـەتی لە خـەڵك وەرگرتبوو "كه ئەگـەر بەیعەتیـان شـكاند تـەلاقیان بكـەوێ" ئنجا كاتێـك خـەڵك پرسیاریان لە (مالـك)كرد، كه ئایا ئەگەر پشتگیریی شۆڕش بكەن، تەلاقیان دەكەوێ؟ ئەویش بۆ رێخۆشكردن بۆ خەڵك گوتی: نەخێر تەلاقتان ناكەوێو ئەو فەرموودەیـەی كردە، بەڵگـە كه دەفەرموێ: ﴿لیس علـی مُسْـتكْرَهٍ طـلاق﴾ واتە: بابای زۆرلێكـراو تەلاقی ناكەوێ، هەروەها لەسـەر ئەوە گیراو ئەشـكەنجەدراو قۆڵـی لەجێچـوو؟!

٣- یان (شـافعـي) كـە لەسـەر ملنـەدانی بـۆ سیاسـەتی عەبباسـییەكان، كـە بیرۆكـەی (مخلـوق) بوونی قورئانیـان تەبەننیـی كردبوو، ناچار بوو كۆچ بكا بـۆ میسـرو خـۆی دەربـاز بكات، بەلام ئامادە نەبوو شـتێك بڵێ قەناعەتی پێینـەبێ؟!

٤- یـان (أحـمــد) كـە لـە رۆژگـاری (مـأمون)و (معتصـم) كـوڕانی (هـارون الرشـید)دا لەبەرئەوەی ملینـەدا بۆ بیرۆكەی بە (مخلـوق) زانینـی قورئان، كە لەلایەن (معتـزلة)ەوە ورووژێنرابووو، ئەو حوكمڕانانەی تەبەننییـان كردبـوو، هـەزار (١٠٠٠) قەمچـییان لێداو ماوەیەكی زۆر لە زینداندا هێڵرایـەوە؟! هەروەها زانایانی دیكـەش كـە بەڕاسـتی میراتگـری پێغەمبەران "علیهم السـلام" بـوون بەهـەمان شـێوە، بچـۆ (تـأریخ الأُمـم والـملوك)ی طبـري (البدایـة والنهایـة)ی ابـن كثیـرو (الكامـل في التـأریخ)ی ابـن الأثیـر بخوێنـەوە، لەوبارەوە كە هەموو ئەو بەسـەر هاتانەیانو زیاتریشـیان تێدایـە!

ئنجا كە ئەم قسـانەم كردن مامۆستا بهاء الدین و دكتـۆر فوئـادو ئامـادەبووانی دیكـەش باش گوێیان گرتبـوو، مامۆسـتا بهاءالدین گـوتی: وا دیـارە شـارەزاییشت لـە مێـژوودا هەیـە! گوتم: بەڵێ شـتێك دەزانم.

شـایانی باسیشـە پاش وتووێژەكەمان بەتەنیـا لە كاك دكتۆر فوئادم پرسـی:

گفتوگۆیەكەمانت پێ چـۆن بوو؟

گوتی: دیاربوو قسەکانی تۆ بەهێزو بەڵگەدار بوون، بەڵام ئەوە جیاوازیی عەصرە، زانیارییەکانی وی کۆنو هی تۆ تازە بوون!

منیش گوتم: پێم وانیە ئەویش ئاگاداری ئێستاش نەبێ، بەڵام ئەوە جیاوازیی ڕاستو چەوت هەقو ناهەقە.

٥) کاك نەوشیروان مستەفا:

یەکی دیکە لەو کەسایەتییانەی کە لەو جەولەیەدا بینیمانن، کاك نەوشیروان مستەفا بوو، کە ئەو کاتە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو.

کە شەوی (٣٠ـ ١١/ ١ـ ١٢/ ١٩٨٧ لە (بەرگەڵوو) میوانی بووین، لەسەر دەعوەتی خۆی، ئەو شەوە دوو بەرپرسی تیپیشی میوان بوون، یەکیان (مامە غەفە)یان پێدەگوت، هەردووکیان خەڵکی هەولێر بوون.

دیارە کاك نەوشیروان زۆر تامەزرۆی قسەو باس بوو لەبارەی ئیسلامەوەو گوتی: بەخوا ئەمشەو دەبێ میوانی ئێمە بنو، نابێ بڕۆن، من هەزارو یەك پرسیارم لەبارەی ئیسلامەوە هەیە!

دیارە قسەو باسەکانمان دەوری سێ سەعاتیان خایاند، وەك بێتەوە یادم، یەکەم پرسیاری کاك نەوشیروان لەبارەی هەڵوێستی ئیسلام لەبارەی کێشەی نەتەوایەتی بە گشتیو، کێشەی کورد بەتایبەتو، تێڕوانینی ئیسلام بۆ دەوڵەتو قەوارەی سیاسییەوە بوو، منیش وەڵامی پرسیارەکانیم بۆ خستە دوو توێی تەفسیرو لێکدانەوەی ماناو چەمکی ئایەتی ژمارە (٢٥)ی (الحدید) کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوونو، کتێبو تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوارێ، هەروەها ئاسمانیشمان

ناردۆتە خواریٚ، هیٚزیٚکی زۆرو سوودگەلیٚکی بۆ خەلٚکی تیٚدایە، هەروەها بۆئەوەی خوا بزانیٚ کیٚ خۆیو پیٚغەمبەرانی بەنادیاریی (بیٚئەوەی بیانبینیٚ) سەردەخات، بەڕاستی خوا بەهیٚزی زالٚە.

دیارە لە میانەی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا چەند خالٚیٚکم خستەنەروو:

یەکەم: پیٚغەمبەرانی خوا "صلی الله علیهم وسلم" بە بەلٚگەو موعجیزەی روونو دەستەوستانکەرەوە رەوانەکراون، تاکو ئیسپاتی دەعوای پیٚغەمبەرایەتیی خۆیانی پیٚبکەن، چونکە جیاوازیی نیٚوان ڕاستو درۆ بەلٚگەیە: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾.

دووەم: پیٚغەمبەران "علیهم السلام" بە بەرنامەی ڕاستو دروستی ژیانو گوزەران ئامرازو هۆکارەکانی چەسپاندنی دادگەرییەوە نیٚرراون: ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾.

سیٚیەم: سەرجەم پیٚغەمبەران هاتوون کە دادگەریی بچەسپیٚنن: ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾، دیارە مەبەستیش لە دادگەری (القسط – العدل) دادگەرییە بە چەمكو واتایەکی گشتگیرو فراوان، کە هەموو رەهەندەکانی ژیانو گوزەران بگریٚتەوە: نەتەوەیی، سیاسی، ئابووری، کۆمەلاٚیەتی.

چوارەم: چەسپاندنی دادگەرییش بەبیٚ هیٚز نابیٚ، هەر بۆیەش خوای دادگەر یەکسەر دوای باسکردنی چەسپاندنی دادگەریی، باسی ناردنەخواری ئاسنی کردوە، کە هیٚزی زۆرو سوودو کەلٚکی جۆراوجۆری بۆ خەلٚکی تیٚدایە: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، کە دەتوانین بلٚیٚین: مەبەست لە (بَأْسٌ شَدِيدٌ) تەکنۆلۆژیای سەربازییەو، مەبەستیش لە (مَنَافِعُ لِلنَّاسِ) تەکنۆلۆژیای مەدەنییە.

ئنجا گوتم: مادام سەرجەم پیٚغەمبەرانی خوا "علیهم الصلاة والسلام" بۆ چەسپاندنی دادگەریی هەمەلایەنە هاتبن، ناگونجیٚ لە بەرنامەو ئاینی تیٚروتەواوی خوادا، چارەسەری

كێشەی نەتەوایـەتییش نەبـێ، پاشان ئاماژەم بە ئایـەتی ژمارە (١٣)ی (الحجرات)یش كرد كـە ئەمـە دەقەكەیـــەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوەمان لە نێرو مێیـەك (ئادەم و حەووا) وەدیهێنـاوەو گێڕاومـانن بەچـەند گـەلو هۆزێك تاكو پێك ئاشـنابن، بێگومان ئەوەتان لەلای خـوا ڕێزدارتـرە، كـە پارێزكـارترە، بەڕاسـتی خوا زانای شـارەزایە.

دیارە نێو نێوە پرسیارو وەڵامی دیكەش دەبوون، وە لە ئەنجامی گفتوگۆیەكەماندا، كـاك نەوشیروان گوتی: ئەگـەر ئیسـلام بـەو شـێوەیە بـێ كـە باسـتكرد، مـن بـە دەوڵـەتێكی ئیسـلامیی كوردیی ڕازییمو یەكەم كەسـیش دەبم دەچم بۆ حـەج، بـەڵام پێمنـاڵێی بۆچـی مەلایەكان هەر باسـی نوێژو ڕۆژووو زەكـاتو سەرفترە دەكەن؟!

منـیش گـوتم: كـاك نەوشـیروان! ئـەو میللەتـەی ئێمـە ئەگـەر بەڕاسـتی لـە ئیسـلام تێبگەیشـتبایە، جـەنابت یـان لـەو شـوێنەی ئێسـتات نـەدەبووی، یـان (مامۆسـتا مـەلا نەوشـیروان) دەبووی! گوتی: یانی چـی؟

گوتم: یانی خەڵكەكەمان بـە سـەركردەیەك ڕازی نـەدەبوون، كـە بـە ڕێبـازی غـەیری ئیسـلامدا پێشـیان بكەوێ.

پاشان باسی ماركسـیزممان كرد، كـە بۆچـی لەلایـەن سـەرجەم لایەنـە سیاسـییەكانەوە "جگـە لە بزووتنەوەی ئیسـلامیی" (ئەوساكە) تەبەننیـی كراوە؟

گوتی: من لـە ڕووە فەلسـەفییەكەیەوە بـڕوام بـە ماركسـیزم نیـەو، تـەنیا وەك هۆكـارو میكـانیزمی شۆڕشو خەبـات پەنامـان پێبردوە!

٦) <u>شـێخ عزالدیـن حوسـێنی:</u>

هەر لەو جەولەیەمانداو لە ڕۆژی: (١٣/ ١٢/ ١٩٨٧) لـە دۆڵـی (مالوومـە) سـەردانی (شـێخ عزالدین حوسـینی)مان كرد "خوا لێی خۆشبـێ"، كە كـاتی خـۆی وەك ڕابـەری (كۆمەڵـە)ی ئێرانو ژمارەیەكی زۆر لە كوردانی كوردسـتانی ڕۆژهەڵات ناسـرابوو، بەڵام

لەوكاتەدا كە ئێمە سەردانمان كرد، وازی لە كۆمەڵە هێنا بووو خۆی تەنیا لەوێ دانیشتبوو، دیارە نیوەڕۆش میوانی بووین و كاك (فەرەیدوون عبدالقادر)یش لەوێ بوو "میوان بوو" كە پێموایە ئەوكاتە ئەندامی سەركردایەتیی یەكێتی بوو، هەندێك قسەو باسمان لەگەڵ مامۆستادا بوون، ئاماژەیەكیان پێبكەم باشە:

شایانی باسە لەگەڵ مامۆستا (شێخ عزالدین)دا یەكدیمان نەدیبوو، ئەوە یەكەم جار بوو یەكدی ببینین، بەلاَم پێشتر بەنامە پەیوەندییمان هەبوو، هەندێك لە بەرهەمەكانی خۆیشمم بۆ ناردبوون.

سەرەتا "وەك عادەتی خۆم" بەڕوونو ڕاشكاویی پێمگوت:

مامۆستا! ئایا هەست ناكەی لە لووتكەیەكەوە دابەزیوی بۆ شیوێكی قووڵ، تۆیەك كە زۆرێك لە كوردانی كوردستانی ئێران، وەك ڕابەرێك تەماشایان دەكردی، ئێستا لێرە لەم حاڵەدای؟!

گوتم: ئایا باشتر نەبوو لەجیاتی ئەوەی خۆت بچووك بكەیەوەو ڕەگەڵ تاقمێكی كۆمۆنیست بكەوی، دەست بە ئیسلامەوە بگریو، بە ڕێبازی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) پێش گەلە چەوساوەكەت بكەویو، داوای مافەكانیان بۆ بكەی؟!

ئایا ئەوكاتە زۆر لە ئێستا گەورەتر نەدەبوویو، نەدەبوویە ئیمامی گەلەكەت، وەك چۆن خەڵكی دیكە بوو بە ئیمامی خەڵكی خۆی؟!

مامۆستاش شەرحو تەفسیلێكی وەزعی خۆی گوتو دوایی گوتی:

ئەوان فێڵیان لێكردمو من دانی پێدادێنم كە ئیشتیبام كرد (هەڵەم كرد)و هەر ئیسلامیشم پێ ڕاست بووەو پێ ڕاستە، بەلاَم گوتم: بەڵكو لەو ڕێیەوە لەگەڵ ئەو برادەرانەدا شتێك بكەین بۆ میللەتەكەمان!

منیش گوتم: ئەدی مامۆستا! بۆچی ئەوەی گوتت بە دوو وشە بلاَویناكەیەوە، تاكو ببێتە كەفارەتی هەڵوێستی ڕابوردووت؟

ئەویش بێ ئەوەی بەو شێوازە توندو كرچو كاڵەی من، قەڵس بێو خۆی شلوێ بكات، پێكەنیو گوتی: چی بنووسم ببێتە كەفارەتم؟!

گوتم: دوو شت بنووسە:

١ـ هەر ئیسلام ڕاستەو ماركسیزم هەڵەیە.

٢ـ لە ڕابوردوودا بە هەڵەداچوو بووم.

ئەویش گوتی: بە قورئانێ لێتخوێندوە، شتی وا بنووسم، دەمكوژن!

شایانی باسیشە مامۆستا (شێخ عزالدین) لەبارەی كارو چالاكیی ئێمەشەوە پرسیاری زۆری كردو، كە وەڵامدایەوە، گوتی: هەرچەندە پێم وانیە بتوانن هیچ كام لەو ئامانجانە بێننەدی، بەڵام عەزیمەتو باوەڕبەخۆبوونەكەتانم پێخۆشە!

دیارە مامۆستا (شێخ عزالدین) زۆر بە سنگفراوانییو بە حەوسەڵەوە، گوێی بۆ دەگرتین، قسەو باسی لەگەڵ دەكردین، هەرچەندە لە ڕووی تەمەنیشەوە بە مامی ئێمە دەشیا "خوا لێی خۆشبێو جێگای بەهەشت بێ".

٧) <u>كاك مەلازم كەریم جێگری سكرتێری پاسۆك:</u>

لە رۆژی (١٤/ ١٢/ ١٩٨٧) لەگوندی (گوێزیلە) سەردانی بارەگای سەرەكیی (پاسۆك)مان كرد، كە كاك مەلازم كەریم جێگری سكرتێرو چەند ئەندامو پێشمەرگەیەكی لێبوون، كاك ئازادی سكرتێریان بۆ چارەسەری نەخۆشی لە دەرەوەی وڵات بوو.

ماوەیەك لەمەوبەریش (مانگی / ١٢/ ٢٠١٣)زكە سەردانی هەفتەنامەی (ئاوێنە)م كرد ـ بەبۆنەی سەرەخۆشی لێكردنیان كە كاك كاوە گەرمیانیی پەیامنێریان لە كەلار كوژرابوو، " خوا لێی خۆشبێ" ـ كاك ( ئاسۆس هەردی) باسی كرد كە ئەو رۆژە ئەویشو كاك (ڕێبین)ی براشی لەوێ بوونو ئامادەی قسەو باسەكان بوون.

دیارە ئێمە نیوەڕۆ لەلای برادەرانی پاسۆك بووینو قسەو باسیشمان زۆركردن، ئەوەی لەیادم مابێ، ئەوەبوو كە من باسی ئەوەم كرد كە ئێمەی ئیسلامیی خۆشویستنی گەلو

نیشتیمان بە شتێكی خوا رسك (فِطْـرِي) دەزانین، وە كوردایەتییمان بە بەشێك لە مسولْمانێتیمان دەزانین، مادام برێتیبێ لە بەرگریی لێكردنی گەل و ولاّت و پاراستنیان.

یەكێك لەوانیش گوتی: ئنجا ئەگەر وابێ ئێوە وێڕای ئیسلامەتیی، كوردایەتیی و نیشتیمانپەروەرییش بۆ خۆتان دەبەنو، ئێمەش هیچمان بۆ نامێنێتەوە!

منیش گوتم: ئنجا ئێمە چی بكەین كە ئیسلام ئەگەر وەك خۆی فام بكرێت و بگیرێ، هەموو شتێكی باش لەخۆیدا كۆدەكاتەوە!

شایانی باسیشە بەپێچەوانەی لایەنە سیاسییەكانی دیكەوە، دژایەتییكردنی ئیسلامم لە پاسۆكدا بەدی نەكرد، وە هەستم نەكرد كوردایەتیی و خەباتە نەتەوایەتییەكەیان بە ئیدۆلۆژیی ماركسیزمەوە گرێدابێ!

ﷺ: چەند كەس و كەسایەتییەك كە دەعوەتیان كردین و خزمەتیان كردین:

وەك وەفاداریی بە پێویستی دەزانم، ناوی ژمارەیەكی دیكە لەو كەس و كەسایەتییە بەرێزانە بێنم، كە لەو سەفەرەماندا وێڕای ئەوانەی ناومان هێناون، خزمەتیان كردووین:

١ـ شێخ موحەممەد كاكە سوور، لە گوندی لۆتەر كە نیوەڕۆی: (٢٧/ ١١/ ١٩٨٧) میوانی بووین.

٢ـ شێخ دارا شێخ جەلال، لە گوندی (كانی زەرد) كە ئەوكاتە بەرپرسی مەڵبەندی دووی یەكێتی بوو، لە (١/ ١٢/ ١٩٨٧) میوانی بووین.

٣ـ شێخ محەمەد شێخ باوەدین، لە گوندی (زەرزی)، كە شەوی: (٣ـ ٤/ ١١/ ١٩٨٧) میوانی بووین.

٤ـ حاجی شێخ دەرویش، كە شەوی (٦ـ ٧/ ١٢/ ١٩٨٧) لە گوندی (عەودالآن) میوانی بووین.

٥ـ كوێخا نەریمان، كە نیوەڕۆ: (٨/ ١٢/ ١٩٨٧) لە گوندی (كەڵەشێرە) میوانی بووین.

٦ـ حاجی شـێخ حسین، کـە شــەوی (٨ ـ ٩/ ١٢/ ١٩٨٧) لـە گونـــدی (ســـۆتکە) میوانی بوویـن.

٧ـ مامۆسـتا مـەلا زانـا کـە شـەوی (١٢ـ ١٣/ ١٢/ ١٩٨٧) لـە گونـدی (چۆخــماخ) میـوانی بووین.

٨ـ کاك عبدالكريم خورڕخـورەیی بـابی کـاك مـەلا عبـدالله، کـە شـەوی (١٦ـ١٧/ ١٢/ ١٩٨٧) لە گونـدی (خورڕخـورە) میوانی بووین.

٩ـ شـێخ صدرالدین، کە نیوەڕۆی: (٢٠/ ١٢/ ١٩٨٧) لە گوندی (گەرمكان) میـوانی بووینو ئەوکـاتە ئەو بەرپرسـی تیپـی (٤٤)ی چەکـوچ بـوو، بارەگـای تیپەکەشــیان هــەر لەوێ بوو، مەبەست تیپـەکانی یەکیەتییـە.

١٠ـ کــاك عەلــی حــاجی صــالح، کــە هەرســێك شــەوەکانی: (٢١، ٢٢، ٢٣ی / ١٢/ ١٩٨٧) میوانیــان بــووین، لــە گونــدی (کێلــە ســپی)و، زۆرمــان پێــوە ماندووبوون.

خوا پاداشـتی هەمووانیان بداتـەوە، هی خۆیانو مــاڵو خێزانیـانو ئەوانـەی مـردوون "خـوا لێیـان خۆشـبێ" و جێگایـان بەهەشـت بـێو، ئەوانـەی ماویشـن هـەر سـەربەرزو ســەلامەت بن.

# کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو پرۆسەی ئەنفال

## گوێبیستبوونی هەواڵی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو دەوروبەری :

لە رۆژی : (١٦/ ٣/ ١٩٨٨) لە رادیۆی دەنگی ئێرانەوە، گوێبیستبووین کە رژێمی بەعسی دیکتاتۆرو دڕندە، شاری هەڵەبجەو دەوروبەری کیمیابارانکردوە، هەڵبەتە لە سەرەتاوە نە ئێمەو نە خەڵکی دیکەش بەگشتی، قەبارەی ئەو کارەساتە دڵتەزێنو هەناوهەژێنەمان نەدەزانی، هەتا وردەوردە کەناڵەکانی راگەیاندنو، پاشان خەڵکی بریندارو دەربازبووی هەڵەبجەو دەوروبەری باسیان کرد، کە دوایی کارەساتی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، بوو بە ناسنامەی ستەمدیدەیی گەلی کوردو دڕندەیی رژێمی بەعسی دیکتاتۆر.

شایانی باسیشە ژمارەیەکی زۆر لە بریندارو دەربازبووانی کیمیابارانی هەڵەبجەو دەوروبەری، بەلای بنکەو بارەگاکانی ئێمەدا رەتدەبوون، ئێمەش بە ئەندازەی توانا خزمەتمان دەکردنو هاوکارییمان دەکردن، بۆ گەیشتنیان بە ئێران، بۆ چارەسەرو حەوانەوەو گەڕان بەدوای کەسوکاری بزربوویاندا.

## گیرانی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان لە (بەرگەڵوو) لەلایەن رژێمەوەو کۆتایی پێهێنانی قۆناغی یەکەمی ( ئەنفال :

لە رۆژی (١٩/ ٣/ ١٩٨٨)دا گوێبیستبووین کە پاش شەڕێکی سەختو خوێناویی، رژێم بارەگای سەرەکیی یەکێتیی نیشتیمانیی لە(بەرگەڵوو) گرتووە، سەرجەم ئەو دەڤەرەشی خستۆتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

هەروەها دواتریش زانرا، کە ئەوە قۆناغی یەکەمی پرۆسەی قەلاچۆو ئەنفالکردنی گەلی کورد بووە لەلایەن رژێمەوە.

دیـارە وشـەی (الأنفـال)یش وێڕای ئەوەی كە نـاوی یەكێكـە لـە سـوورەتەكانی قورئـانی بەرزو بەپێـز، ناویشە بۆ ئەو دەستكەوتەی كە لـە جـەنگی دژی كافرانـدا چـنگ مسـوڵمانانو سوپای ئیسـلام دەكەوێ، بەو پێیـەش بێ، وادیارە ڕژێم گـەلی كوردی مسـوڵمانی بـە كـافر داناوە، ئەگەرنا ماڵو سـامانیانی، بگرە سـەرو ماڵیانی بە غەنیمـەت نـەدەزانی! هەڵبەتـە ئـەو هەڵوێستەی ڕژێمی گۆڕبەگـۆڕی بەعسیش لێرەدا، ئەو پەنـدە كوردییـەمان بیردەخاتـەوە كـە دەڵێ: "هەتا خـاوەن ماڵ دزی گرت، دز خـاوەن ماڵی گرت"، دیارە بـەكارهێنانی وشـەی (أنفـال)یش بۆ ئەو قەتـڵو عامكردنەی هـەزاران لـە گـەلی كـوردی ستەمدیدە، تـاكتیكێكی دیكەی ئەو ڕژێمـە بووە، بۆ دڕدۆنگ كردنو خسـتنە گومانی ئەو گەلـە مسـوڵمانە ڕەسـەنە، بەرانبەر بە ئایینـە ڕاستو پاكەكەی ئیسـلام!

شایانی باسیشـە لەبارەی پرۆسەی قـەتڵوعامكردنی كـوردەوە، گەلـێ شـت نووسـراوەو گـوتراوەو پـەردە لەسـەر زۆرێـك لـە نهێنییـەكانی ئـەو كارەسـاتە جـەرگبڕو تراژیدیایـە هەڵدراوەتەوە، كە بێگومان زۆر لە كارەساتی كیمیابارانكردنی هەڵەبجەو ناوچـەكانی دیكـەی كوردستان گەورەترو بێـبڕەزاتر بووە، بەڵام چـونكە زۆر بـە پـەنهانكاریی ئەنجامـدراوە، وەك كارەساتەكەی هەڵەبجە چـوار كـامێرای بـۆ نەڕەخسـاوە وێنـەی بگـرێ، تـا ڕاددەیـەكی زۆر بەتایبەت لەلایەن ڕای گشـتیی جیهانییـەوە، دیـزە بەدەرخۆنـەی لێكـراوە، هـەتا ئێسـتاش هەقـی خۆی پێنـەدراوە، لەڕووی باسـكرانو تیشـكخرانە سـەریەوە.

هەڵبەتە دواییش ئاشكرابوو كە ئـەو پرۆسـەی جینۆسـایدو قڕەبڕكردنـەی هـەزاران ژنو پیاوو منداڵی كوردستان، بە هەشت قۆناغ جێبەجێ كراوە، كە ئەمانـەن:

**قۆناغی یەكەم**: ناوچـەی دۆڵی جافەتی: كە لە: (٢٣/ ٢/ ١٩٨٨)دا دەسـتیپێكراوەو لـە: (١٩/ ٣/ ١٩٨٨)دا كۆتایی پێهـاتوە.

**قۆنـاغی دووەم**: ناوچـەی قـەرەداغ: كـە لـە: (٢٢/ ٣/ ١٩٨٨)دا دەسـتیپێكراوەو لـە: (٢/ ٤/ ١٩٨٨)دا تـەواوبووە.

**قۆناغـی سـێیەم** : ناوچـەی گـەرمیان : کـە لـە : (٧/ ٤/ ١٩٨٨)دا دەسـتیپێکراوەو لـە : (٢٠/ ٤/ ١٩٨٨)دا تەواوکـراوە.

**قۆناغـی چـوارەم** : ناوچەکانی کەرکووك و کۆیـە : کە لە : (٣/ ٥/ ١٩٨٨)دا دەستیپێکراوەو لە : (٧/ ٥/ ١٩٨٨)دا کۆتایی پێهێنـراوە.

**قۆناغـەکانی پێنجـەم و شەشـەم و حەوتـەم** : ناوچـەکانی پارێزگـای هـەولێر : کـە لـە : (٢٤/ ٥/ ١٩٨٨)دا دەستیانپێکراوەو لە : (٢٦/ ٨/ ١٩٨٨)دا کۆتاییـان پێهێنراوە.

**قۆناغـی هەشـتەم**: دەڤـەری بادینـان : کـە لـە : (٢٨/ ٨/ ١٩٨٨)دا دەسـتیپێکراوەو لـە (٣/ ٩/ ١٩٨٨)دا تەواوکـراوە.

بڕوانە : ئەنفـال : کوردو دەوڵـەتی عێراق/ شۆڕش حاجی ڕەسـوول : ٢٠٠٣.

ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەم پێکرد لـەبارەی پرۆسـەی ئەنفالـەوە گـەلێك شـت گـوتراوەو نووسـراوەو، بـەردەوامیش دەگـوترێ‌و دەنووسـرێ، بـەڵام مـن لێـرەدا بـە پێویسـتی دەزانم سوپاس‌و دەستخۆشیی خۆم، ئاڕاسـتەی هەر کام لەم دوو بەرێزە بکـەم:

١) دکتۆر شۆڕش حاجی ڕەسووڵ، خاوەنی کتێبـی (ئەنفـال: کوردو دەوڵـەتی عێـراق)، کە پێموایە لێکۆڵینەوەیـەکی وردی پشتبەسـتووە، بـە کۆمـەڵێك دیکۆمێنـت (وثیقــة)و سـەردانی مەیدانییـەوە.

٢) کـاك عارف قوربانیی، خـاوەنی چەند کتێبـێك لەبارەی ئەنفــالەوە.

دیـارە کتێبـەکانی کـاك عـارف قوربـانییش زیـاتر چـاوپێکەوتنن لەگـەڵ ژمارەیـەك لـە دەربازبووانی پرۆسەی ئەنفال، کە من تا ئێستا یازدە (١١) دانەیانم لەلایـەن نوسـەرەوە بـە دەستگەیشتوون‌و خوێندووشمنەوەو، زۆریش دڵ‌و دەروونیـان هەژاندووم، کە ئەمـانەن:

١/ لەبارەی گۆڕی بە کۆمەڵی منـداڵە ئەنفالکراوەکانەوە/ چ٢٠١٣.

٢/ عوزێـر: دەربـازبووی گۆڕە بەکۆمەڵەکانی ئەنفـال/ چ٢٠١٣.

٣/ فـەرەج : دەربازبووی گۆڕە بەکۆمەڵەکانی ئەنفـال/ چ٢٠١٣ .

٤/ واحیـد : دەربازبووی گۆڕە بەکۆمەڵەکانی ئەنفـال/ چ٢٠١٣ .

٥/ تەیـموور : تاکە رزگاربووی گۆڕی بەکۆمەڵی ژنو منداڵە ئەنفالکراوەکان/ چ٢٠١٣ .

٦/ گەلاوێـژ : شایەتحاڵی کیمیـاباران‌و ئەنفـالی هەڵەبجـە/ چ٢٠١٣ .

٧/ حەپسـە : شایەتحاڵی کیمیـاباران‌و ئەنفـالی هەڵەبجـە/ چ٢٠١٣ .

٨/ زارا : شایەتحاڵی کیمیـاباران‌و ئەنفـالی هەڵەبجـە/ چ٢٠١٣ .

٩/ شـەمیلـە/ چ٢٠١٣ .

١٠/ ئەو سایەق شـۆفلەی بەشێك لە ئەنفالەكانی داپۆشـی/ چ٢٠١٣ .

١١/ ڕەمـەزان : یەکەمین دەربازبووی گـۆڕە بەکۆمەڵەکانی ئەنفـال/ چ ٢٠١٤ .

جارێکی دیکەش دەستخۆشـیی‌و سـوپاس ئاڕاسـتەی ئـەو دوو بـەڕێزەو هـەر بـەڕێزێکی دیکەش دەکەم، کە لەو بـوارەدا کـاری باشـی کـردووەو دەکـات، چـونکە مـن پێموایـە ئـەو کارەسـاتی قەتڵوعامـەی کـورد، زۆری مـاوە هـەقی خـۆی بـدرێتێ، لـە باسـکران‌و تیشـکخرانەسـەر.

شـایانی باسیشـە مـن هـەتا چـاوپێکەوتنەکەی کـاك عـارف قوربـانییم لەگـەڵ کـاك (تەیـموور)دا ﴿کە ئێستا لە ئۆردوگای (صمود) نیشتەجێیـە و لـە ڕۆژی : (٦/ ٤/ ٢٠١٤)، لەگـەڵ کـاك عـارف قوربـانیی لـەماڵی خـۆی دا سـەردانیمان کـرد﴾ . نەخوێنـدبۆوە، چارەنووس‌و چۆنیـەتیـی لەبەینچـوونی ژنو منداڵە ئـەنفالکراوەکانم لـەلا (مەتـەڵ) بـوو، بەڵام بە خوێندنەوەی ئەو چاوپێکەتنـەو لەزاری کاك تەیموور، تاکە منداڵی دەربـازبووی ژنو منداڵە ئەنفالکراوەکانـەوە، ئەو مەتەڵەم بۆ حـەل بـوو، بۆیـە پێموایـە کـاك عـارف قوربـانیی لەسەر هەوڵ‌و کۆششـەکانی بۆ پەردە لەسەر لادانی کارەسـاتی ئەنفال، هەروەها کاك تەیموور وەك تاکە شـایەتحاڵی ئەو ستەمە بێـڕەزاو قەتڵوعامە کەم وێنەیەی بەسەر هەزاران ژنو منـداڵی کورددا هاتوە، شایستەی هەموو ڕێـزو تەقـدیرێکن، لەلایـەن هـەموو لایەکـەوە بەگشـتیی‌و، بەتایبـەت حکوومەت‌و بەرپرسـانی ئەم وڵاتە.

## یەکەمین هێرش‌و پەلاماری ڕژێم بە سوپاو جاشەوە بۆ سەر گردی ڕەمکان :

لە ڕۆژی : (٢٤/ ٥/ ١٩٨٨)دا، لەکاتێکدا کە من لە سەفەرێ بووم، ڕژێمی بەعسی فەوتاو بۆ یەکەمین جار بە سوپاو جاشەوە، هێرشی کردە سەر گردی ڕەمکان، کە وەك کلیلی ناوچەکە وابوو بەگشتی، بەڵام پێشمەرگەکانی هێزی حەمزە پڵنگ ئاسا لێیان هاتبوونە دەست‌و لووتیان شکاندبوون‌و ڕاویان نابوون‌و، جەنازەی ئامیر سریەیەکیشیان لێ بەجێمابوو، کە دوایی کەسوکاری هاتن بردیانەوە.

## بەستنی کۆنگرەی چوارەمی بزووتنەوەی ئیسلامیی :

لە سەرەتای مانگی (٦)ی (١٩٨٨)دا بزووتنەوەی ئیسلامیی چوارەمین کۆنگرەی خۆی گرێدا، لە بارەگای هێزی (خالد) لە گوندی (براله)ی سەر بە قەزای پێنجوێن، دیارە من لەبەر کاروباری هێز بۆم نەکرا بچم، شەهید کاك مەلا شەریفمان بە نوێنەرایەتیی خۆمان نارد.

لەو کۆنگرەیەشدا هەڵبژاردن بۆ دیارییکردنی ئەندامانی سەرکردایەتی کرابوو، بەندە زۆرترین دەنگم هێنابوو.

کە پێموایە بوونم لەنێو برا پێشمەرگەکاندا بە ماڵ‌و خێزانەوەو، چالاکی‌و جموجۆڵی فیکریی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و، بەردەوام جەولەو گەڕانمان، پاشان نوێنەرایەتییکردنی ڕێك‌وپێکی شەهید مەلا شەریف، هەموویان کاریگەرییان لەوبارەوە هەبووە.

بەڵام وەك پێشتریش ئاماژەم پێداوە: کەمتر وابوو کۆنگرەو کۆبوونەوەکانمان ببنە مایەی گۆڕانکاریی‌و بەرەوپێشبردنی کاروبارمان، چونکە هەم سروشتی بزووتنەوەکە، کە زیاتر حاڵەتی گردبوونەوە (تجمّع)ی هەبوو نەك کۆمەڵ (جماعة) بوون، هەم کەم ئەزموونیی‌و نەشارەزاییمان بەگشتی لەبواری کاری حیزبیی‌و ئیداریی‌و سیاسییدا، ئاستەنگ بوون لەبەردەم گۆڕانکارییدا، ئنجا لە داهاتووشدا هۆکارێکی دیکەی سێیەمیش زیاد بوو کە وەك دەڵێن: (زادَ الطِّينَ بِلّةً) قوڕەکەی خەستتر کرد، ئەویش پاراستنی بەرژەوەندیی تایبەتی

بوو لەلایەن هەندێك كەسەوە، كە پێیانوابوو بە گۆڕانكارییكردن، بەرژەوەندییەكانیان تێكدەچن، بۆیە هەمیشە بە ترس و هەستیارییەوە، بۆ كۆنگرەو كۆنفرانس و كۆبوونەوەكانیان دەڕوانی!!

## سەفەركردنم بۆ ئێران بەمەبەستی چارەسەری هاوسەرم :

له : (١٨/ ٦/ ١٩٨٨)دا بەمەبەستی چارەسەری هاوسەرم (روخسار خان) "بە ڕەحمەت بێ" كە دوایی زانرا كۆرپەلە لە سكیدا مردووەو كورتاژی بۆكرا، سەفەرێكی (ئێران)مان كردو چووینە هەركام لە (سەردەشت)و (نەغەدە) و دەوری مانگێكمان پێچوو، لە ڕۆژی: (١٨/ ٧/ ١٩٨٨) لە ڕێی (ئالوەتان)ەوەو بە هەورازی (كەشكی)داو بە گوندەكانی (مارەدوو)و (ڕەزگە)دا گەڕاینەوەو چەند برایەكیشم لەگەڵ بوون، كە شەهید مامۆستا عبدالرحمن لۆتەرییو، كاك عبدالكریم قادر خدرە سوورم لەبیرن، خێزانم موحەممەدی كوڕیشمانی پێبوو، كە ئەوكاتە شیرەخۆرە بوو.

لە ڕێگاش شەهید مامۆستا عبدالرحمن زوو زوو موحەممەدی كوڕمی لە هاوسەرم وەردەگرت، كە تەنیا ئەو "هاوسەرم" سواری ئێسترێك بووبوو، جاروبار موحەممەدی لە ئاوی ڕووبار هەڵدەكێشا بە جل وبەرگەوە، بۆئەوەی هەتاو نەیبات، چونكە كەش هاوین بوو، دنیا زۆر گەرم بوو.

ئنجا كە گەیشتینە گوندی (ڕەزگە) ڕژێم كە فەوجێكی لەو نزیكانە بوو، دایگرتین بە تۆپ و هاوەن، بەڵام ئێمە چووینە شیوو دۆڵە نەدیوەكان و ستایش بۆ خوا هەموومان سەلامەت بووین، وە بە دامێن گردی سەركەشی (ڕەمكان)دا گەیشتینەوە بارەگای هێزو ماڵەكانمان لە قەڵاتووكان.

# كـارو چالاكییـەكانی هێـزی حـەمزە،

## لە مــاوەی یازدە مانگــدا ١٩٨٧/٨/٢٠ – ١٩٨٨/٧/٢٤

لێرەدا بەرلەوەی بچینـە سەر وێستگەو قۆناغەكانی دیكەی ماوەی پێشـمەرگایەتیم بـەر لـە راپەڕین، بەپێویستی دەزانم هەڵوەستەیەك لـە بەرانبـەر كـارو چـالاكییەكانی هێـزی حـەمزەدا بكەین، لەماوەی ئەو یازدە مانگـەدا كە بارەگـای هێـز لـە گونـدی (قـەڵاتووكان)ی بنـاری چیای قەندیـل بوو.

ســەرەتاش دەڵـێم: پێموایـە مـاوەی ئـەو یـازدە مانگـەی قـەڵاتووكان، ماوەیـەكی زۆر بەپێـزبووو پڕبوو لە جموجـوڵ و چالاكیـی جۆراوجـۆر، كـە دەتـوانین لـەم حـەوت خاڵـەدا ئاماژەیـان پێبكــەین:

**یــەك: بواری ئیــدارەو مشوورخواردن:**

دەتوانین لەم بوارەدا ئاماژە بۆ سێ مەســەلە بكەین:

أ- كاروبـار بەراوێژ بەڕێوەبـردن، بەپێی فەرمانی خـوا جل جلاله: ﴿... وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران.

ب- دابەشكردنی كاروبارەكان، كە هەركەسـە كاری خۆی دیاربـێ.

ج- هەبوونی لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت.

شایانی باسیشـە ئەنجوومەنی شـووڕای هێـز، ئەم هەشـت برایە بوون:

١) مامۆستا حەسەن بابەكـر.

٢) كاك مەلا شەریف حوسێن/ شەهید.

٣) ماﻣۆستا عبدالرحمن لۆتـەریی/ شەهید .

٤) کاك ئەحمـەد شاسوار/ شەهید .

٥) کاك شەریف وەرزێر .

٦) ماﻣۆسـتا محەمـمەدی زەرزی .

٧) ماﻣۆستا مەلا عەلی مەمك .

٨) کاك مەلا حەمەد ئەمین ئاشووریی .

ئەو دوو برایەی دوایی ، ماوەیەك دواتر لە هێزی (نور)ەوە کە هەڵوەشایەوە ، هاتنە نێـو هێزی حەمزە ، بۆیە خستوومنە دوایی .

**دووەم : بواری پەروەردەی فیکریـی‌و رووحیـی :**

ئەمیش لەڕێـی سـێ هۆکارەوە :

أـ دەرس‌و دەوری چڕوپـڕ ، بەتایبەتی بەیانییـان دوای نوێژی بەیـانی من دەرسی تەفسیرم دەگوتـەوە .

بـ عیبادەتی جیددیی ، بـۆ وێنـە : جگـە لـە فـەرزو سـوننەتەکانی ڕەواتیـب ، بـەزۆریی شـــەونوێژیش هـــەبوو ، هـەروەها : ڕۆژووی پێـنج شـــەممەو دووشـــەممە ، قورئـان خوێنـدنی بەردەوام ، زیکرکـردن .

جـ ســەرگەرمبوون بــە تەزکیـــەی نەفســـەوەو خۆبــژارکردن لــە خـــووە بـــەدەکان‌و خۆڕازاندنەوە بە سـیفەت‌و ئاکارە بەرزو پەســـەندەکان .

**سێیەم : بواری جـوجۆڵـی پێشـــمەرگایەتی :**

لەم بوارەشدا ئاماژە بە سێ مەسەلە دەکەین :

أ ـ گـەڕان‌و پشـکنینی ناوچـەکە بـە مەبەسـتی شـارەزابوونی لـە رووی هەڵکـەوتی جوگرافییـــەوە .

ب ـ وریـایی و هۆشـیاریی بـەردەوام، کـە جـاری وا هـەبوو شـەوو ڕۆژ هـەر پێچـراوە بوویـن و، تاقم و تفەنگمان هەر پێوەبـوو، تەنانـەت لـەکاتی خەوتنیشـدا، بەتایبـەت ئەگـەر هەواڵی جمـوجۆڵـی سـوپاو جاشـی ڕژێم هـەبووایە.

ج ـ پەلهاوێشـتن و کردنەوەی بنکـەو خـاڵی سـەربازیی لە شـوێنە سـتراتیژییەکان، وەك: سـەر گردی ڕەمکان، ڕۆژ تەرازووان، شاخی جیقنـە، کوڕکی کاوێ، بەسـتەمەلە.

## چـوار: بـواری ڕاگەیـاندن:

لەم بوارەشدا گرنگیمان بەچەند کارێك دەدا:

أ ـ تۆمارکردنی وتارو دەرســەکان لەسـەر کاسـێت و ڕەوانەکردنـەوەیان بـۆ هێزەکـانی دیکـەو بۆ نێو شـارەکان و بڵاوکردنەوەیـان، بۆ نـموونە:

١) دیاردەی جاشەتیی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە (٣) کاسێت بوو.

٢) جیهاد بە زبـرە پیاوان دەکرێ، نەك بە پیرەژن پیاوان.

٣) جەنگ و جیهاد لەڕێی خواداو بڕوبیانووی ناسکە پیاوان.

٤) جەژنی قوربان و شەهیدانی گردی ڕەمکان، کە ئەمە هی ماوەیەك دواتر بوو.

ب ـ چاپکـردن و بڵاوکردنـەوەی چەند نامیلکەیـەك، وەك:

١) پێشـمەرگەی ئیسـلام کێیـەو چۆنـە؟

٢) کۆمەڵـی خـوا.

٣) با چاکتر ئیسـلام بناسـین! کە چـەند ئاڵقەیـەك بوو.

٤) جەنگـی پارتیزانیـی، کە کاك موحەممەد زەرزیی نووسـیبووی.

ج ـ گەشت و گەڕان و کۆکردنەوی خـەڵك و وتـاردان و... هتد.

شایانی باسیشە چالاکییە ئیسلامییەکانی هێزی حەمزە، جگە لە رێکخستنەکانی نێوخۆو شارەکان، کاریگەریی لەسەر هێزەکانی دیکەش هەبوو، کتێبو نامیلکەو کاسێتەکان، پەیتا پەیتا بڵاودەبوونەوەو دەستاو دەستیان دەکرد.

ئەو برایانەش کە لە بواری ڕاگەیاندندا چالاكو دەستگەرم بوون، ئەمانە بوون:

١) کاك حاجی رزگار.

٢) کاك عومەری حەمەتاڵ.

٣) کاك عەلی رەسول/ دێرەیی (شەهید).

٤) کاك عبداللە عبدالكريم/ خۆشنووس.

٥) کاك عبدالکریم سوور.

٦) کاك شەریف وەرزێر.

٧) کاك مەلا هێواش.

٨) کاك طە حاجی ظاهر/ وێنەگر.

٩) کاك کمال محمد أبوبکر/ بۆسکێنی، بەرپرسی ڕاگەیاندنی هێز بوو.

## پێنج: بواری کۆمەڵایەتی:

لەم بوارەشدا ئاماژە بەسێ مەسەلە دەکەین:

أ- میوانی زۆرو جۆراوجۆر، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بارەگاکەمان لەسەر شەقامە رێی عێراق – ئێران بوو، بارەگاکەمان وەك (گۆلی کابەکر) "کە هەموو جۆرە باڵندەیەکی لێ نیشتوە لەکاتی گەرمێنو کوێستاندا" خەڵکێکی زۆرو هەمە چەشنە رووی تێدەکردین، لە ناسیاوو نەناسیاو، کوردو عەرەبو تورکمان، ئێمەش وێڕای کەمتوانایی، بەگوێرەی توانا خزمەتمان دەکردن.

ب- ئەو برا کاروانچییانەی گوندەکانی پشدەرە ڕەقە، بەتایبەت هەر سێ گوندی: گەڵوو، دووگۆمان، زەنگلان، بەردەوام سەردانیان دەکردینو ئازووقەو

کەلوپــەل‌و فیشــەك‌و عــەتادیان بـۆ دەهێنـاین ، هــەواڵ‌و دەنــگ‌و باسیشــمان لێیـان دەپرسی‌و ، هی خۆشــمانمان پێیانـدا ڕەوانــە دەکـرد ، هــەروەها نامیلکــەو کاسـێت‌و نامــەو ... هتد .

ج- چــەند ماڵێکیشـــمان لەوێ بووین :

١) ماڵی ئێمــە .

٢) مامۆستا حەسەن بابەکـر .

٣) کاك مەلا ئەحمــەدی هەنـارۆکی .

٤) کاك محمد حاجي علـی (بــلال) .

هەروەهـا ماوەیەکیـش ماڵـی :

٥) شــەهید مەلا شەریف .

٦) کــاك عبدالصمد .

٧) کــاك سۆرکان .

دیـارە بــەهۆی ماڵەکانیشـــمانەوە ، جم‌وجـولێکی دیکـەی کۆمەڵایەتیـــی زیاترمـان خستبۆە ئەو دەڤەرەوە ، چـونکە خـزم‌و دۆسـت‌و ئاشـنا لـە ژنـان‌و پیـاوان هاموشـۆیان دەکردیـن .

**شەشەم : بواری ژیــان‌و گــوزەران :**

ژیان‌و گوزەرانــمان لە قەڵاتووکان زۆر ســادەو بگرە ســەختیش بوو ، چ هــی بارەگـاو پێشــمەرگەو چ هی ماڵەکانیشمان .

بۆوێنە : جاری وا هەبوو پاش چوار مانگ چـاومان بــە گۆشــت دەکــەوت ، هــەروەها پێداویســتییەکانی دیکەی ژیان کـــەم‌و دەگمەن بوون ، وەك : برنج‌و ڕۆن‌و شەکرو چـا .

هــەر لێرەشــەوە بــە پێویســتی دەزانم ئامــاژە بــە هەڵوێســتی شــێرەژنانەی هاوســەری ڕەحمــەتییم (ڕوخســار خان)و هاوســەری کــاك طـــە حاجــی ظـــاهر (عائیشــە خـان)

بکەم، کە هەر کامیـان بەشێك لە زێـڕو خشڵی خۆی فرۆشتبوو بـۆ کڕینـی گۆشـت بـۆ پێشـمەرگەکان، خوا پاداشـتیان بداتەوە.

## بۆنکڕووزی کراسـی سـووتاو، بە گۆشـت برژانـدن حـاڵی بوون!

بۆ دەرخسـتنی ڕاددەی تامەزرۆیی پێشـمەرگەکان بۆ گۆشت، با ئەم قوڵـە نەزیلـەیەی کاك مەلا هێـواش کـە لـە نامیلکـەی: (خـاتوون مـەلا ژن: ئافرەتێکـی هەڵکـەوتووو هاوسـەرێکی ناوازە)شـدا هێنـاومە، بگێڕمـەوە:

کاك مەلا هێواش دەڵێ:

(ڕۆژێکیان کە زۆر تامـەزرۆی گۆشـــت بـووم، بـەلای مـاڵی ئێـوەدا تێپـەڕیم بـۆن کڕووزێـك دەهـات، منـیش وامزانـی گۆشـــت دەبـرژێنن، بۆیـە سـەرم بـە دەرگـای ماڵەوەتاندا گرتو گوتم: دایك مەلا ژن! ئەوە گۆشـــت دەبرژێنن؟! ئەویش گوتـی:

نەوەڵـلا کـاك مەلا هێواش گۆشـتی چـی؟!

منیش گوتم: ئەدی ئەو بۆن کڕووزە چییـــە؟!

ئەویش ئاوڕی دایـــەوە، کـە بینـی بەسـۆز خـانی کچتـان پیڕۆچـکە بـوو، دامێنـی کراسـەکەی کەوتبـووە قوڵکـەی ئاگرەوەو بە پشـکۆکان دەسووتا! گـوتی: ئەیـەڕۆ! خۆ ئەوە کراسی بەسۆزە دەسـووتێ!

ئیـدی لـەوەوە داك مـەلا ژن بڕیاریـدا بەشـێك لـە زێڕەکـەی بفرۆشـێو گۆشـتی بـۆ پێشـمەرگەکان پێ بکڕێ).

## فـەردە ئـاردی نەوتـاویی و کرۆسك و بەڕوو خـواردن:

لە سـەرەتای بارەگا دانانیشـماندا لـە قـەلاَتووکان، تـەنیا گونیـە ئاردێکمـان هـەبوو، ئەویش نەوتی پێـداڕژابوو، ئیدی ئەو نانەی لێـــی دەکرا، بۆن نەوتی لێدەهات، منیشو چەند برایەکی دیکـەش نانەکەمان بۆ نەدەخـورا، بۆیە بەناچاریی دەبووایە بـە خـواردنی

(كرۆسك)و (بەڕوو) قەناعەتمان كردبايەو، چەند ڕۆژێك ئاوامان گوزەراند، هەتا ئاردی دیكەمان چنگ كەوت.

## نەخواردنەوەی چا وەك تاقیكردنەوە:

ئەوكاتە ئێمە لە هێزی هەمزە چامان نەدەخواردەوە، لەبەر دوو هۆكار:

**یەك:** دەمویست ئیرادەی پێشمەرگەكان تاقی بكەمەوە، وەك چۆن (طالوت) سوپایەكەی بە ئاونەخواردنەوە لە ڕووبار جگە لە مستێك، تاقی كردەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ...﴾ (٢٤٩) البقرة، واتە: ئنجا كە طالووت سەربازەكانی بردەدەر گوتی: خوا بەڕووبارێك تاقیتان دەكاتەوە، ئنجا هەركەس لە مستێك زیاتر لێی بخواتەوە، لەمن نیە (با بگەڕێتەوە)و هەركەسیش لەوە زیاتر لێی نەخواتەوە، ئەوە لەمنە (با بمێنێتەوە) ئیدی كەمێكیان نەبێ، هەموویان لێیان خواردەوە...

بەوپێیەش بێ، پێشمەرگەكانی هێزی حەمزە بەگشتی لەو ڕووەوە، لە سەربازەكانی طالووت خۆڕاگرتر بوون، چونكە مەگەر بەدەگمەن و بە پەنهانیی، ئەگەرنا نەمبیستوە هیچ كەس لەو مەسەلەیەدا سەرپێچیی كردبێ!

**دوو:** ئێمە لە ڕووی داراییەوە نەداربووین و شەكروچاش گران بوو، بۆیە بە مەبەستی كەمكردنەوەی مەسرەف، وازمان لە چایی خواردنەوە هێنابوو، بە شێوەیەكی كاتیی.

شایانی باسیشە كاك مەلا سەردار بەرپرسی ئازووقەو كەلوپەل بوو، زۆرباشیش دەستی بە شتەكانەوە دەگرت و زێدەڕۆیی پێ ناخۆشبوو، بۆیە زۆرجاران

پێشمەرگەکان ڕەخنەی ئەوەیان لێدەگرت کە ڕژدو چەنگ قووچاوە، بۆ وێنە:
ئەوکاتە (نەوت)مان کەم بوو، ئنجا وا باوبوو، کە کاك مەلا سەردار بە سەرنجێکی گەورە نەوتی دابەش کردوە بەسەر بنکەکاندا!

## میوانبوونی کاك دکتۆر مەحمود عوسمانو کاك عەدنان موفتیو کاك عادل موراد:

شەوێکیان ئەو سێ بەڕێزە میوانمان بوون، وەك بیتەوە یادم برنجی سوور یان ساواری سوورمان هەبوو، ئیدی پاش نانخواردن، چاوەڕوانی هاتنی چاییان دەکرد، نەیاندەزانی کە ئێمە چاییمان نیەو هەر کەڵو پەلی چایی خواردنەوەشمان نیە، بۆیە بەناچاریی تاکو زیاتر لە چاوەڕوانیدا نەبن "چونکە بە پێیان بەرێگایەکی دووردا هاتبوون، پێویستییان بە ئیسراحەتو خەوتن بوو" پێمگوتن:

حەزمان دەکرد چاییشمان هەبووایە، بەڵام بەداخەوە چاییمان نیە!

ئنجا ئێستاش جاروبار بە سوعبەت باس دەکەن، کە ئەو شەوە چاییمان نەداونێ!

**د: بواری تەندروستیی:**

لە بواری تەندروستییدا توانایەکی وامان نەبوو، بەڵام چەند کەسێك لەو بوارەدا ڕۆڵیان دەگێڕا:

١) کاك عبدالمجید کە بە دکتۆر عبدالمجید ناسرابوو ( معاون طبي) بوو بە پلەی یەکەم دەوری لەو بوارەدا دەبینی.

٢) کاك أحمد شاسوار – شەهید ـ ئەویش جاروبار دەوری دەبینیو (معاون طبي) بوو.

٣) ڕوخسار خان (هاوسەرم) ئەویش لەوبارەوە دەوری دەبینی، بەتایبەت بۆ منداڵو ژنەکانو، جاروباریش بۆ پێشمەرگەکانیش، ئەگەر پێویستی کردبایە.

# چەند نوکتەو قسەیەکی خۆشی رۆژگاری پێشمەرگایەتیی

بەباشی دەزانم لێرەدا ژمارەیەك قسەی خۆش‌و نوکتەی واقیعیی، کە لەو ماوەیەدا یان تۆزێك پێشتر یان تۆزێك دواتر ڕوویانداوە، بگێڕمەوە، دیارە هەر شتێکیش خۆم لە نزیکەوە ئاگاداری نەبووبم، یان لە کەسێکی تەواو متمانە پێکراوەوە نەمبیستبێ، باسی ناکەم:

- لەو جەولەیەدا کە لە مانگی (١١و ١٢)ی (١٩٨٧)دا کردمان، لەکاتێکدا مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی کە ڕیشێکی گەورەی هەبوو، دوو سێ گوللە ئاربیجیی بە بەنەخوێنێك بە شانیدا کردبوون‌و هەڵیگرتبوون "چونکە تفەنگ‌و تاقمی پێ نەبوو" بەلای دێیەکدا ڕەتبووین، ئافرەتێك گوتی: وەیش! ئەوانە پێشمەرگەن (یەزیدیی)یەکیان بە دیل گرتوە، گوللە ئاربیجییان پێ هەڵگرتوە!

منیش گوتم: مامۆستا مەلا مەحموود! بۆخۆت خەنی بووی، کردیانی بە یەزیدییش!

- هەر لە جەولەی گۆڕیندا، مامۆستا موحەممەدی زەرزی کە بیکەیسییەکەی بە زنجیرەوە هەڵگرتبووو قورس بوو، خۆیشی خڕە پیاوو بەخۆوە بوو، لە دەشتی (سندۆلان) خوار گوندی (کەرسۆنان) لەکاتێکدا بەشەو دەڕۆیشتین، تووشی جۆمەڵ‌و باتلاغێك بووین، سەرنجمدا مامۆستا موحەممەدی زەرزی لە هەندێك شوێن زۆر ڕۆدەچووە خوار، منیش بە سوعبەت گوتم: مامۆستا موحەممەد! ئەرێ هەندێك جار دەتبینم شتێکی کەمت نەبێ بەدەرەوە نامێنێ‌و لە قوڕێدا غەرق دەبی! ئەویش گوتی: مامۆستا ! ئینسان هەتا پشتێنی نەچێ بە قوڕا، پێشمەرگایەتیی ئیسلامی بۆناکرێ!

- هەروەها هەر لە جەولەکەدا، دوای ئەوەی بە شەو لە نیزیك گوندی (کانی میران) "کە گوندی مامۆستا موحەممەد زەرزییە" لە جادەی قیری سلێمانی دووکان پەڕینەوە بەرەو

گوندی زەرزی لای (چـەمی ڕەزان)، ماوەیەك ڕۆیشـتین‌و هەرنەگەییشـتین‌و مانـدووش بووبووین، مامۆستا موحـەممەدیش دەلیلمان بـوو، منـیش بـە سـوعبەت گـوتم: ئـەرێ مامۆسـتای زەرزی! ئـەوە چـی بـوو هـەر نەگەیشـتین! (زەرزی)مـان لێـوو بـە داوو دەرزی!!

❁ مامۆستا مەلا موحەممـەدی ڕازی گێڕایـەوە، کە لە جەولەیەکیـاندا بۆ ناوچەی گـەرمیان، چوونەتە دێیـەکی چـۆڵ کە کەسـی تێـدا نـەبووە، دەمێکـیش بـووە تامـەزرۆی گۆشـت بوون، چوار (قـاز)یان بینیـون، ئیـدی لـە بـەینی خۆیانـدا کەوتوونەتـە مشـتومڕەوە، سەبارەت بە ڕەوایـی‌و نـاڕەوایی خواردنیـان، هەرچـی مامۆسـتا مـەلا موحەممـەد بـووە گوتوویـەتی: دروسـتە بیـانخۆین‌و دوایـیش خاوەنەکـەیان دەدۆزینـەوەو پارەکـەی دەدەینـێ، بـەڵام شـەهید جمال أحمـد مـلا فتـاح شـارباژێڕیی "بـە ڕەحمـەت بـێ"، گوتوویـەتی: دروست نییـە بیانخۆین، ئـاوا ماوەیـەك موناقەشـەیان بـووەو، مەفرەزەکـە بوونەتە دوو ڕا، کـاك فەتاحـە سـووریش "بـە ڕەحمـەت بـێ" گوتوویـەتی: کاکـە مـن پێشـنیارێکم هەیـە:

قازەکان چوارن‌و ئێـوەش یـەکێکتان هـەر چـواریان بـە حـەڵاڵ‌و، یەکێکیشـتان هـەر چواریان بە حـەڕام دەزانێ، کەواتـە: بـا دووانیـان بـە حـەڵاڵ‌و دووانیشـیان بـە حـەڕام دابنێـین‌و بیرێتـەوە!

❁ کاك جمال أشرف قارەمـانی گێڕایـەوە گـوتی: لـە یـەکێك لەگەشـتەکانماندا بـە ناوچـەی قەرەداغدا لە سەردەمی (بزووتنـەوەی پەیوەندیی ئیسـلامیی)دا کـە بـاڵی سـەربازییمان نـاوی (لەشـکری قورئان) بوو، بە لای کۆمـەڵێکی یەکێتیـدا تێپـەڕیین، گوتیـان: ئێـوە کێن؟ منیش گوتم: لەشکری قورئـانین، یـەکێکیان گـوتی: لاپـەڕە چـەندی قورئـان؟ گوتـم: لاپەڕە شـەسـت‌و شـەش (٦٦)!

❁ جارێکیـان لە چیـای قەندیل دەچـووینە خـوار بـەرەو بـازاڕی (شـێخ ئـایش) ڕۆژێکـی یەکجار ساردی زستان بوو، بەفـر کرێوەی دەکردو بە زەحمەت بەرپێـی خۆمانمان دەدی،

هـەموو لـەشمان تەزیبـوو، دەوری بـولێڵی ئێـوارە پـاش نوێـژی شـێوان، گەیشـتینە بازاڕەکە، بەپەلـە خۆمان خزاندە بن خێوەتێکـەوە، کە شوێنی ئیسراحەت و نـان و چـایی خـواردن بـوو، چـەند برایـەکم لەگـەڵ بـوون، یـەکیان کـاك (تەهـا حـاجی زاهـیر) ئەوکاتـەش عادەتمان وابـوو چـاییمان نـەدەخواردەوە، کـاك تـەها کـە زۆری سـەرمابوو گوتی: مامۆسـتا! ئیجـازە هەیـە سـەرو چـایی بخۆینـەوە، زۆرمـان سـەرمایە، بـەڵکو هەناومان گەرم بێتـەوە؟!

منـیش بـە سـوعبەت گـوتم: لـەم سـەرماو وەیشـوومەیەدا داوای ئیجـازەی چـایی خواردنەوە دەکەن! حەز دەکـەن ئەگـەر هـەر گـەرم نابنـەوە، بـۆ گەرمبوونـەوە، سـەرو جگەرەش بکێشـن! کە دیارە هیچ کـەس لـەنێو ئێمـەدا جگـەرەی نەدەکێشـا، پێمـان حەرام بووو ئێسـتاش هەروا، بەڵام بە سـوعبەت وامگـوت و بـۆ زێـدە جەختکردنـەوە لەسەر چـایی خواردنـەوە.

۞ مەفرەزەیەکمان بە چیـای قەندیلـدا هاتبوون، بە هـەورازی (تاتی دۆ)دا کاتەکەی سەرماو زوقم بوو، کاك عبدالکریم سـوورو کـاك عومـەری حەمـەتاڵیش لەگـەڵ بـوون، پـێش وەرێکـەوتن کـاك عبدالکریـم پێیگوتبـوون: کاکـە گیـان: سـەرمایە بـەرگی گـەرم لەبەربکـەن! وادیارە کاك عومەری حەمەتـاڵ گوێی پێنـەداوە، سەرەنجام سەرمای بـووەو سـێ ڕۆژان نەخۆشبووەو بۆی کەوتـوە، ئنجـا کـاك عبـدالکریم ئـەوەی کردبـوو بـە شـیعرو دەیگـوت:

لـە هـەورازی تـاتـی دۆی
هەرکـەس نەخـوات خـەمی خـۆی
سـێ ڕۆژان دەکـەوێ بـۆی

۞ هەر لە جەولـەکەی (١٩٨٧)دا لەگوندی (کانی بـی بێـژینگ بەسـەر) دوای ئـەوەی وەك عادەتی خۆمـان بانگی شـێوانماندا، مزگەوتەکەمان گەسکدا، سۆبەی مزگەوتـمان گـەرم کرد، خەڵکی ئاوایی وردەوردە بـەرەو مزگـەوت هـاتن و ئێمـەش نوێـژی شـێوانمان بـە

كۆمەڵ بۆ كردن، داوایان لێكردین وەك عادەتی ئەوسای پێشمەرگە بە ماڵەكاندا دابەش ببین، ئێمەش گوتمان: حەزناكەین بێینە نێو ماڵو خێزانتانەوە، ئەگەر بگونجێ سەرو پارووە نانمان بۆ بێننە مزگەوت! دیارە زۆریان سەر لەو هەڵوێستەی ئێمە سوڕما، بەڵام مكوڕبوون كە هەردەبێ بچینە ماڵەكانیان، سەرەنجام دوای نانخوارد بۆ نوێژی خەوتنان هاتینەوە مزگەوتو پاش نوێژ گوتم: ئەگەر حەز بكەن دەمەوێ هەندێك قسەتان بۆ بكەم، دیارە پێیانخۆش بوو، منیش وەك عادەتی خۆم چەند ئایەتێكم بەدەنگ بۆ خوێندنو بۆم تەفسیركردن، لەمیانەی تەفسیركردنەكەشدا باسی بارودۆخی سیاسیو كۆمەڵایەتیی كوردستانم بۆ كردن.

لە كۆتایی قسەكانمدا یەكێكیان كە ڕیشسپی بوو ناوی (سید محمد) بوو گوتی: ئەرێ كاكە، مامۆستا! من سەرم لە ئێوە سوڕماوە، ئێوە چین؟!

گوتم: ئێمە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامیین، بۆچی دەپرسی؟

گوتی: بۆیە دەپرسم هەتا ئێستا پێشمەرگەم نەدیوە هەرنوێژیش بكات، كەچی ئێوە بانگتانداو پێشنوێژیشتان بۆ كردینو، ئایەتو حەدیسمان بۆ باس دەكەن!!

ئنجا گوتی: ڕەنگە زیاتر لە سەد (١٠٠) كۆبوونەوەی حیزبەكان لەم مزگەوتەی ئێمەدا بە خەڵكی گوند كرابن، بەڵام هەرگیز نەمبیستوە ناوی خوا بهێنن، جارێكیان كادیری حیزبێك كۆیكردینەوەو هەر چاوەڕێ بووین قسەمان بۆ بكاتو، بچین ئیسراحەت بكەین، چونكە ئێمە ئەهلی كەسابەتینو بە ڕۆژ ماندووین، بەڵام هەر دەستی پێ نەكرد، منیش گوتم: دەی كاكە: (بسم الله الرحمن الرحيم) با دەستپێبكەین درەنگمانە، ئەویش گوتی: ئاخر ئەوەیە ناهێڵێ ڕزگارمان بێ، منیش وامزانی لەگەڵ منیەتی، گوتم: بۆچی كاكە، چیم كردوە؟ گوتی: مەبەستم تۆ نیە، مەبەستم (بسم الله) كردنەكەتە، ئێمە دەبێ بەناوی خۆمانو بەناوی گەل كارەكانمان بكەین! منیش هەڵسامو گوتم: وەڵڵاهی بیستوومە شەیاتین (بسم الله)یان پێناخۆشە! من لە مەجلیسێكدا دانانیشم بە (بسم الله) كارەكەیان تێكبچێ!!

❁ ڕۆژێکیان مامۆستا مەلا سەلمان کە میوانمان بوو، لە هێزی شافیعییەوە هاتبوو کە سەرنجیدا ئێمە کاروبارەکانمان بە ڕێکیی بەڕێوە دەچن، چونکە هەرکەسە کاری خۆی دەکرد، لێیپرسیم:

ئەریٚ فلاٚن کەس! ئەوە چۆنە ئێوە ئیشوکارتان ئاوا ڕێك و پێکە؟!

گوتم: مەبەستت چییە؟

گوتی: دەبینم پێشمەرگەکان بۆ هەموو وردو درشتێك نایەنە لای تۆو، هەرکام لە مامۆستا حەسەن بابکرو مامۆستا شەریفو ئەوانی دیکەش هەرکەسە کاری خۆی دەکات!

گوتم: ئەدی لەلای ئێوە لە هێزی شافیعی چۆنە؟

گوتی: لەلای ئێمە بۆ هەموو شتێك دێنە لای من، بۆ وێنە: ئەگەر یەکێکیان سوژنی بویٚ، بۆ دروونەوەی کورتانی ئێستر، یان داوە بەنی بویٚ، یان چەقۆی بویٚ...هتد، بۆ هەموو شتێك دێنەوە لای من: مەلا سەلمان! کوا فلاٚن شت؟

منیش گوتم: دەزانی هۆکارەکەی چییە؟!

گوتی: نەخێر.

گوتم: هۆکارەکەی ئەوەیە جەنابت سوژنو بەنو کورتانو چەقۆو ... هتد، هەموو شتەکانت لەلای خۆت داناون، بۆیە بە ناچاریی بۆ هەموو شتێك سەری تۆ دێشێنن، شتەکان دابەشبکە بەسەر هەندێك برایاندا، تۆش هێندە سەرقالٚ ناکەن!

❁ ئێمە عادەتمان وابوو چ لە قەلاٚتووکان چ لەبەری ئەبوبەکرە، کە لەگەلٚ برادەرانی یەکێتیدا پێکەوە نهێنیی شەومان دادەنا بۆ کاتی ئێشککگرتن، چونکە مەترسیی هاتنی سوپاو جاشی ڕژێممان هەبوو.

شەوێکیان مەفرەزەیەکی یەکێتی بەسەر بۆسە (کمین)ی برایانماندا کەوتبوونو کە دەنگیان دابوون کێن؟ گوتبوویان: ئێمە یەکێتیین، گوتبوویان: نهێنیی شەو بلٚێن!

گوتبوویان: لەبیرمان نیە، برایانیشمان، گوتبوویان: یان نهێنیی شەو بڵێن، یان چەك بن، ئاوا مشتومڕێكیان بووبوو، بەڵام دوایی ئەوان نهێنیی شەویان هاتبۆوە یادو، كێشەكە چارەسەر بووبوو.

بەڵام بۆ بەیانی كاتی چێشتەنگاو بەرپرسەكەیان كە كاك (هەڵۆ)یان پێدەگوت[1]، هاتە لامانو گوتی: مامۆستا دوێنێ شەو شتێكی وابووە، منیش زانیبووم، بۆیە گوتم: ئاگادارم الحمد لله كە هیچ ڕووینەداوە، ئەویش گوتی: بەڵام من بۆیە هاتووم كە پێتان ڕابگەیەنم: جارێكی دیكە شتی وا قبوولْ ناكەین!

منیش گوتم: بۆچی؟ خۆ ئەوانەی ئێمە ناهەقیان نەبووەو ترساون كە ئێوە نەبن و دوژمن بێ، بۆیە وا توند بوون؟!

گوتی: دەزانم، بەڵام من هاتووم ئەو ڕاستییەتان پێڕابگەیەنم، كە ئێوە ئەگەر ئاوا بیربكەنەوە شەڕمان دەبێ!

منیش گوتم: ئاخر ئایا ئێوەش بان لە شوێنی ئێمە هەر واتان نەدەكرد؟

گوتی: با، بەڵام ئێمە وەك یەكێتی جیاوازین!

گوتم: چۆن؟

گوتی: یەكێتی خۆی بە كوێخای كوردستان دەزانێ!

گوتم: بە خوا كاك هەڵۆ! ئێمە هیچ كەس بە كوێخای خۆمان نازانین، وەك چۆن بە ڕەواشی نازانین كوێخای كەس بین.

پاشان گوتم: ئێمەو ئێوەو هەموو لایەنە سیاسییەكانی دیكەش، بۆیە هاتووینە ئەم چیاو چۆڵە، چونكە ڕازی نەبووین ڕژێم بەمانچەوسێنێتەوەو خۆیمان بەسەردا فەرز بكاتو، بە چاوی هاووڵاتیی پلە دووو سێ تەماشای گەلەكەمان بكات، كەواتە: چۆن ڕەوایە لێرەش بەهەمان سیاسەتو عەقڵیەتی ڕژێم پێكەوە ڕەفتار بكەین؟!

---

١) كاك هەڵۆ ئەحمەد كوردە، كە (هەڵۆی ئەحمە سمیلْ)یشیان پێدەگوت، ئێستا لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستانەو بەرپرسیارێتیشی هەیە.

گوتی: قسەکانت ڕاستو مەنتیقیین، بەڵام منیش لەگەڵتان ڕاستمو سیاسەتی یەکێتیم پێگوتن.

منیش گوتم: کەواتە: با منیش سیاسەتی خۆمانتان پێبڵێم، بە پێشمەرگەیەکم گوت: نامیلکەیەکی ﴿کۆمەڵی خوا﴾م بۆبێنە، کە هێنای ئەو لاپەڕەیەم بۆ خوێندەوە کە دەڵێ:

﴿ئێمە لەگەڵ سەرجەم لایەنە سیاسییەکانی کوردستاندا بەگشتی، هاوئامانجو هاوسەنگەرین لە بەرانبەر ڕژێمی بەعسی دیکتاتۆردا، وە دەستی هاوکاریی و تەباییمان بۆ هەموو کەس درێژ دەکەین، لەپێناو هێنانەدیی ئامانجەکانمانداو، نامانەوێ لەگەڵ هیچ کەس دا تێك بگیرێینو، هەرکەسێکیش بەناهەق یەخەمان پێ بگرێو شەڕمان پێ بفرۆشێ، خوای بەگژدا دەکەینو، با سووریش بزانێ، بە دەندووکێ پێوە دەبێ﴾.

ئەویش گوتی: قسەکانت هەموویان ڕوونن، بەڵام بێ زەحمەت مەبەستت لەوە چییە کە دەڵێی: ﴿با سووریش بزانێ، بە دەندووکێ پێوە دەبێ﴾؟!

گوتم: چۆلەکەیەك دەندووکی بگری، چی دەکات؟

گوتی: بێگومان هەر باڵەفڕە دەکاتو کلکی ڕادەوەشێنێ!

گوتم: هەر لایەنێکیش شەڕمان پێ بفرۆشێ، ئاوای لێ دێ!

❁ جارێکیان کاك تەهای حاجی زاهیرو کاك عەبدولواحیدی برام و کاك هاشم کوڕی حاجی سەید حیسامەدین، پێکەوە چوون بۆ ئێران، من کاك تەهاو کاك عەبدولواحیدم بە ئیش ناردبوون و کاك (هاشم)یشیان لەگەڵ چوو بوو.

ئنجا لە ئالۆوەتان چووبوونە بارەگای یەکێك لە حیزبەکان، بەرپرسەکەی لێی پرسیببوون بۆچی دەچن؟

کاك تەهاو کاك عەبدولواحید گوتبوویان: ئێمە بە کاری حیزبیی دەچین، کاك سەید هاشمیش گوتبووی: من لە ترسی ڕژێم ڕامکردووەو دەچم لە ئۆردوگایەك دادەنیشیمو دەبمە پەنابەر.

ئەویش گوتبووی: عەیب ناکەی دەچیتە ئۆردوگا، ڕەفیقی تۆش لە فەلەسطین خۆی دەتەقێنێتەوە؟!

ئەویش گوتبووی: تۆ چەند ساڵە پێشمەرگەی؟

گوتبووی: بیست ساڵ زیاترە.

ئەویش (سەید هاشم) گوتبووی: ئنجا تۆ بیست ساڵە خۆت نەتەقاندۆتەوە، بۆچی من یەکسەر بە شەوو ڕۆژێك خۆم بتەقێنمەوە؟!

## ڕووداوەکـــانی نێــوان:

## ١٩٨٨/٧/١٩ تاکو کۆتایی مانگـی: ١٩٨٨/٩

ئــەو ماوەیــە کــە وێســتگەکانی (٢٠ـ٢٦)ی تەمــەنی پێشــمەرگایەتیی پــێش ڕاپــەڕینم دەگرێتــەوە، چــەند بیرەوەرییــەکی گرنگــی شایســتەی تۆمــارکرانی تێــدان، کــە بــە کــورتیی ئاماژەیەکیان پێــدەدەین:

### ڕاوێژکـردن لەبـارەی بەرەنگاربوونەوەی دوژمنــەوە:

دوای ئەوەی ڕۆژی: (١٩/ ٧/ ١٩٨٨) خۆمو هاوسەرم لە سەفەری ئێران گەڕاینەوە، بـۆ شەوی دواتر، واتە: (١٩ـ٢٠/ ٧/ ١٩٨٨) کۆبوونەوەیـەکی گـەرمو گرنگمـان کـرد، وەك بەرپرس و ئەندامانی هێزی حەمـزە. ئامانجی کۆبوونەوەکەش زیاتر قسـەکردنو بەرنامـەدانان بوو بۆ چۆنیەتیـی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێم، بەتایبـەتییش کە هەندێك لە برایـان ڕایانــوابوو کە دەبێ هەرچی زووترە پەلاماری هێزەکـانی ڕژێـم بـدەینو زەبرێکیـان لێبوەشـێنین، بێئاگـا لەوەی کە ڕژێم پاش وەستاندنی جـەنگ لەگەڵ ئێرانـدا، بڕیـاری پاکسـازییکردنی سـەرجەم ناوچەکانی ژێر دەسـەڵاتی پێشـمەرگەی داوە!

منیش هەر دەمگـوت: کاکـە گیـان! پەلـە مەکـەن لـە ڕووبەڕووبوونـەوە، بـەڵام ئەگـەر تووشبووین با ئـازاو خۆڕاگربین!

لەیادمە هەر ئەوشــەوە زیکـرو دوعایـەکی زۆرمـان کـردو، لـەڕووی مەعنەوییــەوە تـەواو تێروتەسـەل بووین!

## دەستپێكردنی هێرشی گەورەی ڕژێمو بۆسەدانانمان بۆیو ڕاونانی :

لە ڕۆژی : (٢٠/ ٧/ ١٩٨٨) ڕژێم بە سوپاو جاشێكی زۆرەوە، دەستی بە هێرشكردن كرد بۆ گرتنی (گردی ڕەمكان).

دیارە ڕژێم یەكسەر بەرەو ترۆپكی گردەكە كشاو، بە پێڕەو (مَشـاة) لەسەر زەوی دەكشاو تۆپبارانیشی دەكرد.

ئێمەش "خۆمو دە كەسی دیكە" بۆ ئەوەی فشار لەسەر برایانمان لەسەر گرد نەمێنێ، چووین كە بۆسەیەك بۆ دوژمن دابنێین. بەڵام چونكە هیچ كامان ئەزموونێكی وامان نەبوو لە جەنگدا، زۆر بە سادەیی ڕۆیشتین لە دامێن گردی ڕەمكان بێ ئەوەی سەنگەر لێبدەین " كە دەرفەتی ئەوەش هەر نەبوو، چونكە بەردەوام هێزەكانی سوپاو جاش لە جموجۆڵو هاتنو چووندابوون " ، هاتین خۆمان لەقەدە درەختە چڕوپڕەكان گرتو خۆمان پەنهان كردو ماوەیەك (١٥ـ٢٠ خولەك) خۆمانمان مەڵاسداو، چاوەڕێی دەرفەتێكمان دەكرد كە دەست بە تەقە بكەینو، زەبرێكی باش لە دوژمن بدەین، كە ژمارەیەكی زۆریان پشتیان لە ئێمە بوو، هەروەها ژمارەیەكیشیان بە دەوروبەرماندا هەر لە هاتنو چووندابوون، بێ ئەوەی بمانبیننو هەستمان پێبكەن، هەر بە خەیاڵیشیاندابێ كە ئێمە موجازەفەی وا دەكەین!

دیارە بە برایانیشم گوتبوو كە هەتا خۆم پێتاننەڵێم نابێ هیچ كەس تەقە بكات، تەنانەت كاتێك (عومەر)ی براو (مام ڕەسوول)ی برای كاك مەلا ئەحمەدی هەنارۆكێ، هاتن گوتیان: ئەگەر ئیجازەمان بدەی ئەوە سێ چوار جاش پشتیان لە ئێمەیەو بەرەو گرد دانیشتوون، بە ئاسانیی دەیانكوژین، گوتم: نەخێر، جارێ هیچ مەكەن.

ئیدی سەرەنجام لەكاتێكدا ژمارەیەك جاش "پێموایە شەش حەوتێك دەبوون" لەسەر گردەكەوە بەرەو لای ئێمە هاتن، كە بێگومان ئەگەر تەقەشمان نەكردبایە ئاشكرا دەبووین، گوتم: لێیان بدەنو لێكرا دەستمان بە تەقە كردو، پێموایە ماوەی پێنج خولەك شەڕ گەرم بوو، چونكە ئەوانیش كە زانییان ئێمە لە بۆسەداین، دەستیانكردەوە، بە دژە تەقە لە زۆر لاوە،

بەڵام لە ئاکامدا شکانو هەرچی سوپاو جاش بوو لە گردەکە هاتنەخوارو ڕایان کرد، کە بە مەزەندە سەدان کەس دەبوون، چونکە بە بەرچاوی ئێمەوەو، بەلای ڕاستو چەپماندا ڕایاندەکردە خوارێ.

هەڵبەتە نازانم زیانی دوژمن چەند بوو، بەڵام دڵنیابووین کوژراوو برینداریان هەبوونو چەکێکیشیان "کە ئێمە دەستمان پێگەیشت" لێ بەجێماو ئێمەش سوپاس بۆ خوا سەلامەت بووین، هەر چەندە کارەکەمان هێندە سادەو ناشێیانەبوو، ئەگەر ڕەحمو لوتفی خوا نەبووایە هیی ئەوە نەبوو دەربازببین!

دیارە دواییش ڕژێم دەستیکرد بە تۆپبارانێکی خەستو خۆڵمانو، چەند تۆپێك لە دەوروبەرمان کەوتنو، دیار بوو نەخشەی ڕێگاکەیان لەلابوو، بۆیە بە ناچاریی ڕێگامان گۆڕیو گەڕاینەوە لای بارەگای هێز.

بەشداربووانی بۆسەکەش جگە لە خۆم:

١ـ مامۆستا حسەن بابەکر.

٢ـ مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی "شەهید".

٣ـ کاك عثمان علی وەتمان.

٤ـ محمد حسن "برایەکی عەرەبی موسڵاویی".

٥ـ مام ڕەسول حاجی محەممەد "برای کاك مەلا ئەحمەدی هەنارۆکێ".

٦ـ عومەر باپیر "بڕام".

٧ـ کاك عبدالکریم سوور.

٨ـ عەلی ڕەسول دێرەیی (شەهید).

٩ـ کاك حاجی ڕزگار.

١٠ـ کاك کمال محەممەد بۆسکێنی.

واتە: یازدە (١١) کەس بووین.

## داستانی قارەمانانەی سەر گردی ڕەمکانو شەهیدبوونی چوار برامان

ڕۆژی: (۲۱/ ۷/ ۱۹۸۸)یش هێرشو پەلامارەکانی ڕژێم بە سوپاو جاشەوەو، بە تۆپبارانکردنی خەستو خۆڵەوە بۆ سەر گردی ڕەمکان، درێژەی هەبوو.

ئێمەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەرچی هێزێك هەمانبوو لە شەڕدا بووو، گۆڕینو بەدلکردن نەبوو، لە هیچ شوێنێکیشەوە هاوکاریی (إمداد)مان بۆ نەدەهات، چونکە برایانی دیکەشمان لە بنکەکانی: (ڕۆژ تەرازووان)و ( شاخی جیقنە)و (بارەگای هێز)و (بەستەمەلە) ژمارەشیان کەم بووو دەرفەتی هاتنیشیان نەبوو، بۆیە بێخەوییو ماندوێتییو بێعەتادییو، لە کۆتاییشدا تێنوێتییو بێ ئاویی، تەواو وەڕسی کردبووین.

## سێیەمین ڕۆژی جەنگو یەکەمین شەهیدمان:

هەروەها بۆ ڕۆژی سێیەمیش "واتە: (۲۲/ ۷/ ۱۹۸۸)" شەڕ هەر بەردەوام بووو ڕژێم بەردەوام هێزەکانی لە سوپاو جاش هەر زیاد دەکردنو، تۆپبارانیشی خەستوخۆڵتر دەکردەوە، ئنجا لەو ڕۆژەدا کە دواهەمین ڕۆژمان بوو لەسەر گردی ڕەمکان بمێنینەوە، چوار شەهیدمان هەبوون:

یەکەمین شەهیدمان کاك (طاهر عبداللە)بوو کە لە سەنگەرەکەی تەنیشت مندابوو، فیشەکێك بەرسینگی کەوتو دوای ئەوەی کاك دکتۆر عبدالمجیدو برایان بردیانە خواریێ، لە دامێن گرد گیانی سپاردو هەر لەوێش بە خاك سپێررا.

## هەرچی پتر تەسکتربوونەوەی ئاڵقەی ئابلۆوقەی دوژمن:

هەتا دەهات ئاڵقەی ئابلۆوقەی هێزەکانی ڕژێم لە سوپاو جاش کە پێموایە بە سەدان بوون، بە دەورماندا تەسکتر دەبوو، بەتایبەتییش کە جگە لە ئێمە هیچ هێزێکی دیکە لە ناوچەکەدا نەمابوو، کە بەشێك لە هێزەکانی دوژمن بەخۆیەوە خەریك بکات. پاشان

برادەرانی پارتیو حیزبی شیوعییش ناوچەی رەزگەیان چۆڵکرد بووو فریاش نەکەوتبوون ئێمە ئاگادار بکەنەوە، واتە: پشتمان چۆڵ کرابوو! دیارە تۆپباران‌و هاوانبارنیش، سەرباری پەلامارە پەیتاپەیتایەکانی رژێم بوو، هەروەها ژمارەیەکی زۆر ئارپیجییان دەتەقاندو، ئێمەش فیشەك‌و عەتادمان کەم بووبوو، بۆیە زۆر دەستمان پێوەدەگرت.

ئنجا سەرەنجام دەوری عەسر لای کانییە ئاوەکەشیان لێگرتین‌و، خستیانە ژێر رکێفی خۆیانەوە.

بۆیە خۆمانمان ناچاربینی کە بەلای کەمەوە بۆ پاشەکشە (إنسحاب)کردن‌و بەجێهێشتنی سەرگردی رەمکانیش بێ، پێویستە هێرشێك بکەینە سەر هێزەکانی دوژمن‌و ئاڵقەو بازنە تەنگەکەی ئابڵووقەی دوژمن فراوان بکەین‌و، بەلای کەمەوە رێی ئاوهێنان‌و کشانەوەی سەلامەت دابین بکەین.

## هێرشێکی پڵنگ ئاسا:

پاش راوێژکردنمان پێکەوە، بریاری هێرش‌و پەلامارێکی خێراو کتوپرمان دا، بۆ سەر هێزە ئابڵووقەدەرەکەی دوژمن‌و، بەخۆمەوە حەوت کەسم دیاریی کردن:

١- مامۆستا مەلا علی مەمك.

٢- مامۆستا حەسەن بابەکر.

٣- مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی.

٤- کاك ئەحمەد شاسوار.

٥- مام رسول حاجی محمد.

٦- کاك ئومێد ئەحمەد.

٧- خۆم.

واتە: لەو دەستەی هێرشە حەوت کەسییەدا، فەرماندەی هێزو چوار ئەندام لە ئەندامە بەرجەستەکانی شووڕای هێزیش هەبوون.

دیارە هەڵبـژاردنی ئـەو دەسـتەیە لەلایـەن منـەوە بـوو، بـەڵام ئێسـتا دانـی پێـدادەنێم کـە دیارییکردنی ئەو دەستەیە بـەو پێکهاتەیـە، هەڵـەبوو، چـونکە ناگونجـیٚ زۆربـەی ئەنـدامانی بەرجەستەو مشورخۆری هێزێك، ببنە دەسـتەیەکی هێرشـبەر، کـە لـە ئـەنجامی نەمانیانـدا، هێزەکە بێسـەرپەرشت بکەوێتـە گۆڕیٚ!

ئیدی سەرەنجام هێرشمانکرد، ئـەویش بـە (الله اکـبر) گوتنـەوە، کـە ئـەوەش هەڵەیـەکی دیکـەی عاتیفییـانەمان بـوو، چـونکە (الله اکـبر) گوتنەکـە بـوو بـە مایـەی دیـارییکردنی شـوێنەکانمان، کە خۆمان لە درەختەکان گرتبوو، هەروەها ئاسانتر توانییان بـمانکەنە ئامانج.

دیارە پاش پەلامارەکەی ئێمـەو دوای چەند خولەکێك یان کەمتریش، دوژمن شکا، بەڵام ئەو شکانەی دوژمن بەنرخێکی زۆرگران بۆمان تەواوبوو، کە بریتی بـوو لـە: شـەهیدکرانی هەر کام لە مامۆستا عبـدالرحمن لۆتـەریی و، کـاك ئەحمـەد شاسـوار، هـەروەها لـە گەرمـەی پەلامارەکەشمانداو لەگەڵ بیسـتنی (الله اکبر)ەکانمان، کاك (عومەر ئەحمـــەد بۆسـکێنی)یش بیٚئـەوەی لـە دەسـتەی دیارییکراوبـیٚ، لـە سـەنگەرەکانەوە بـە (الله اکـبر) گـوتن هـاتو پەلاماریدان، بەڵام هەر بـەڕێوە سـەڵیەیەکی لێـدرابووو کـەوتبووە نێـو دەوەنێکـەوە، دوای گەڕانو پشکنین جەنازەکەیـمان دۆزیەوە.

هەروەها (مامۆستا مەلا علی مەمك)یش لە تەنیشت من برینـدار بوو، سەرەتا بە سووکیی بریندار بوو نێوچەوانی بوو، بـەڵام دوایـی لـە ڕانـی دراو پەکیکـەوت. هـەروەها پاشـانیش لە(بەسـتەمەلە) کـاك (عوسمـان علـی وەتمـان)یش بـە تـۆپ برینـدار بـوو، لـە ڕۆژی (٢٨/ ٧/ ١٩٨٨)دا.

## چۆنیەتیی شـەهیدکرانی مامۆسـتا عبدالرحمن محمـودو کاك ئەحمەد شـاسوار:

پاش هێرشکردنـمان کە وام هەسـت دەکـرد وەك ڕەهێڵـە تـەرزە گوللـەمان بـۆ دەهـاتن، "دواتر زانیم کە شوێنی چەند گوللەیەك بە شـەڕواڵو پشـتێندەکەشمەوە هەیـە"، هـەرکامان زیاتر لە قۆڵی خۆیـەوە سەرگەرمی تەقەکردنو چوونە پێش بوو، ئیدی پـاش کـەمێك گـوێم لێبوو مامۆستا عبدالرحمن بـانگی کـردمو گـوتی: مامۆسـتا! مـن پێکـرام، یـان وشـەیەکی

ئاوابوو، منیش لەبەرئەوەی سەرگەرمی هێرشبردن بووم‌و، دەمزانی ئەو بن گاشەبەردەی کە تەقەی لێوە لێمان دەکرێ، هەتا بەسەریدا بالاّ دەست نەبین، هیچمان سەلامەت نابین.

دیارە لە ماوەی ئەو چەند خولەکەدا سێ مەخزەن فیشەکم تەقاندن، ئنجا من تازە مەخزەنی سێیەمم خستبووە سەر تفەنگەکەم، کە (مام رسول حاجی محمد) بانگی کردم: مامۆستا! ئەها ئەوە جاشێکە ئاگاداربە تەقەت لێدەکات، من مەخزەنەکەم فیشەکی تێدا نەماون، گوتیشی هەرئەویش تەقەی لە مامۆستا عبدالرحمن کرد! منیش سەرنجی بن گاشە بەردەکەم دا، کە وەك ئەشکەوت‌و بن کەورگێك بوو، تەماشام کرد چەکدارێکی جەمەدانی زل‌و قەڵەو سەنگەری گرتوە، کە چاوی بەمن کەوت، هەوڵی هەلاّتنیداو خۆی خزاندە خوارێ، بەلاّم دەرفەتم نەداو سەڵیەیەکم تێسرەواند، بەلاّم چونکە ئەو دەوروبەرە هەمووی جەنگەڵ‌و چخورد بوو، نەمزانی جەنازەکەی چی لێهات‌و چۆن ڕایانکێشا، یان بە بریندارى دەربازیی بوو!

ئنجا هەر لەگەرمەی تەقەو هێرشبردندا بووم، کە دووجار گوێم لەدەنگی کاك ئەحمەد شاسوار بوو، جاری یەکەم گوتی: مامۆستا! ئەها ئەوە قوەت خاسەیەکە کوژراوەو (RBK)یەکی لەلا کەوتوە! گوتم: کاك ئەحمەد لێیگەڕێ، خۆتی پێوە خەریك مەکە!

بۆ جاری دووەم پاش خولەکێك یان کەمتر گوتی: مامۆستا! من ئەنگوام (واتە: پێکرام)، دیارە پاش هەڵکەندنی کابرای بن بەردو ڕاونرانیان، بە خێرایی گەڕامەوە سەر مامۆستا عبدالرحمن کە مام رسول بەگەرمیی‌و بەکوڵ بەدیارییەوە دەگریا، بانگم کرد: کاك عبدالرحمن! ئیدی یەك جار چاوی هەڵێناو دوا هەناسەی داو گیانی سپاردو پێموایە (بەڵێ)یەکیشی کرد، پاشان بەرەو لای کاك ئەحمەد شاسوار چووم، ئەویش لە گیانەلادابووو کە بانگم کرد سەرنجێکی دام‌و، چەند جارێك زاری پێکداداو گیانی سپارد.

مامۆستا عبدالرحمن فیشەکێك بەر نێوچەوانی کەوتبوو، کاك ئەحمەد شاسواریش فیشەکێك لە سینگی درابوو، کاك عومەر ئەحمەدیش چەند فیشەکێکی پێکەوتبوون.

## دوای شکانی دوژمن و ڕاکردنی، بەجێهێشتنی سەر گرد :

پاش ئەوەی دوژمن شکاو ڕاونرا، مەسافەیەك شوێنیان کەوتین، بەڵام زوو گەڕاینەوەو زۆر دوورنەکەوتینەوە، چونکە سەرگرد، هەمووی جەنگەڵ و چخورد بووو، ئەوانیش ژمارەیان زۆر زۆربوو.

ئنجا کەوتینە مشووری گواستنەوەی جەنازەکان، کە لەوبارەوە کاك (حسن علي محمد) کە ئێستا بە: (مامۆستا حەسەن بۆسکێنیی) ناسراوە، هیممەتێکی زۆری نواند، چونکە ژمارەیەك لە برایان (وەك دەڵێ) ئەژنۆیان شکابوو.

دوابیش گۆڕێك کە پێشتر سەنگەر بوو، هەرسێك جەنازەی:

مامۆستا عبدالرحمن و کاك ئەحمەد شاسوارو کاك عومەر ئەحمەدمان، لەوێدا بە خاك سپاردن، کاك (تاهیر عبدالله)ش پێشتر لە دامێنی گرد، بە خاك سپێررابوو.

دیارە ڕژێمیش لە کاردانەوەدا تۆپبارانی توندتر کرد، ئێمەش دەم بۆ دەمێ هیوای توانای مانەوەمان لەسەر گردی ڕەمکان کەمتر دەبوو.

ئیدی ئەوە بوو سەرەنجام پێموایە لای نیوە شەو بوو، کە بڕیاری بەجێهێشتنی سەر گردمان دا، بەڵام بە دڵێکی یەکجار تەنگ و نارەحەتەوە، لەکاتی دابەزینیشدا، ڕژێم داینیە بەر هاوەن، بەڵام (الحمد لله) هەموو لایەك سەلامەت بووین.

بەڵێ، بەو شێوەیە، شەوی: (٢٢ـ٢٣/ ٧/ ١٩٨٨) سەرگردمان چۆڵکردو گەڕاینەوە بارەگای هێز، هەروەها سێ براشم بەدوای برایانماندا، لە هەردووك بنکەی (ڕۆژتەرازووان)و (شاخی جیقنە)دا ناردون، ئەوانیش هاتنەوە بارەگای هێز.

چۆنیەتیی ئاگادارکردنەوەی برایانمان، لەو دوو بنکەیەشدا، بەم شێوەیە بوو:

پاش ئەوەی لە بارەگای هێز کۆبووینەوە، کە هەمووومان لەوپەڕی خەفەتباریی و ماندوێتیی و شەکەتیی و برسێتیی و بێخەوییدابووین، گوتم: برایان! کێتان دەچێ هەردوو بنکەی (ڕۆژ تەرازووان) و (شاخی جیقنە) ئاگاداربکاتەوە، بێنەوە ئێرە؟ چونکە ئەوان

نازانن سەرگرد چۆڵبووەو بەیانی هەموویان دەکوژرێن؟! هیچ کـەس وەڵامـی نەدامـەوە، بـۆ جاری دووەمو سـێیەمیش دووبارەم کردەوە، هیچ کەسـیان ئامادەییان دەرنەبڕی!

منیش دڵخۆشیی خۆمم بە هەڵوێسـتەکەی پێغەمبـەری خـوا "صـلى الله عليـه وسـلم" و هاوەڵە بەرێزەکانی لە جەنگی خەندەكو (الأَحزاب)دا دایەوە، کە سێ جـاران پێیفـەرموون: کێتان ئامادەیە بچێ هەواڵی دوژمنمان بۆ بێنێ؟ بەڵام هیچیان ئامادە نەبوون، پاشان بە (حذيفة بن اليمـان)ی فەرموو: بچۆ، منیش گوتم: کاك شەریف وەرزێر، مام ڕەسوول موحەممەدو، عومەری بـرام! هەڵسـن بچن ئەو برایانە ئاگادار بکەنەوە، کـە مامۆسـتا موحەممـەد زەرزیـی بەرپرسیان بووو چواردە کەس بوون، ئیدی کە ناوی ئەو سێیانەم هێنا، هەرسێکیان بەگورجی هەڵسان و چوون ئاگاداریان کردنەوە، هەرچەندە مەترسـیی زۆریش لە ڕێگایان دا هەبوو.

شایانی باسیشە دوژمن هەتا دوای نیوەڕۆی ڕۆژی: (۲۳/ ۷/ ۱۹۸۸) هەرچەندە سەرگرد کەسی لـێ نـەمابوو، بـەڵام جورئـەتی نـەکرد بچـێتە شـوێنەکانمان، وە پـاش تۆپبـارانێکی خەستو خۆڵێ ئەوجـار چوونە سـەر گرد.

لێرەشدا پێویستە ئاماژە بە مەسـەلەیەك بکەم، ئەویش ئەوەیە کە: باش شـەڕو بـەرەنگاریی بۆکرانـمان لەسـەر گـردی ڕەمکـانو سـەلامەت بوونمـان، وێـڕای ئـەو هـەموو تۆپبـارانو هاوانبـارانەی ڕژێم، پاش کەرەمو لوتفی خوا، هۆکارەکەی ئەو سـەنگەرە باشـانەی سـەر گرد بوون، کە زیاتر مامۆسـتا موحەممەد زەرزیی نەخشەی بۆ کێشابوون، بەتایبەت شـێوازی هێڵی پەیوەسـت (خط الإِتصـال)ەکەی، کە بریتیبوو لە پێکـەوە پەیوەستبوونی سەنگەرەکان.

## بەڕێکـردنـی خێزانـەکانمـانو بریـنـدارەکـان بەرەو لای بەسـتـەمەلـە:

هـەر ئـەو شـــەوە: (۲۲ـ۲۳/ ۷/ ۱۹۸۸) لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە دەوروبـەری ئـەو ئەشکەوتەش کە خێزانەکانیشمانی تێدابوونو، لەوێدا خۆیان حەشاردابوو، ڕژێـم تۆپبـارانی دەکرد، هەر ئەو شـەوە خێزانو منداڵـەکانیشو بریندارەکانیشـمان بـەرەو لای (بەسـتـەمەلە) "کـە بنکـەشمان لـەوێ هـەبوو" بـەڕێکردنو، لەوێشـەوە بریـنـدارەکانمان بـۆ دیـوی ئێـران بەڕێکـردن، بە چیـای قەندیلـدا.

# چـۆڵكردنـی قەڵاتووكـان و گواسـتنـەوەی بـارەگـای هێـز بۆ بەسـتەمـەڵەو خێـزانەكانیـش بۆ كوێستانی (خـواری)

ڕۆژی: (٢٣/ ٧/ ١٩٨٨) و شـەوی: (٢٣ـ ٢٤/ ٧/ ١٩٨٨) هەرچـی فریایكـەوتین لـە كەلوپەلی بارەگـای هێـز، بـە چـەند ئێسـترێك گواسـتمانەوە بـۆ بنكـەی بەسـتەمەلە، دیـارە ئێسترەكانیش هەر هی برا كاروانچییـە دڵسۆزو فیداكارەكانمان بوون، لـە خـەڵكی (گـەڵوو)و (دووگۆمان)، كە لەو تەنگانەیەشـدا باش بە هانامانەوە هاتن.

دیارە خێزانو منداڵەكانیشمان لە كوێستانی (خواری) گیرسانەوە، كە وەك دێتـەوە یـادم، پێنج شەش ماڵو خێزان بـوونو، لـە چـادرێكی گـەورەدا خڕبووبوونـەوەو، هـەتا بڵێـی لـە بارودۆخێكی سەختو دژواردا بوون، چ لە ڕووی گوزەرانو، چ لـە ڕووی دەروونییـەوەو، دەوری مانگێك یان زیاتر مانەوە، هەڵبەتە هەموو لایەكیشمان بە پێشمەرگەو ماڵو خێزانەوە، گیانێكمان بە هەوار نشینەكانی كوێسـتانی (خواری)یـەوە بـوو، كـە خـەڵكی (دوو گۆمـان) بوونو هاوكاریی زۆریان دەكردین.

## وتـاری: ﴿جـەژنی قوربـانو جەنگـی قەڵاتووكـان﴾ لە بەسـتـەمەلـە:

هەر ڕۆژێـك دوای گواسـتنەوەی بارەگـای هێـــزمان بـۆ بنكـــەی (بەســـتەمەلە) واتـە: (٢٤/ ٧) كە ڕێكەوتی یەكشـەممەو (١٠)ی مانگی (ذوالحجـــة)ی (١٤٠٨)ی كۆچـی كـرد، جـــەژنی قوربـــان بوو، منیش وتارێكم دا كە ئێستاش بە تۆماركراویی هەیە بە ناوونیشـــانی: ﴿جـــەژنی قوربـانو جەنگی قەڵاتووكـان﴾ كە تێیـدا باسی چوار شـەهیدەكانمانو پاداشـتی خـۆڕاگریی و ســـوننەتی خـــوا "عـزّ وجـل" لـە تاقیكردنـەوەی ئیمـــاندارانداو، باسـی حەتـمیبوونی لەنێـوچوونی ڕژێـمو، باسـی بەردەوامبوونـمان لەسـەر جـەنگو جیهـادو...

هتدم كردووە، دڵی برایـانم داوەتـەوە...قسـەكانیشم لەبـەر تیشـكی ئایەتـەكانی: (١٣٩ و ١٤٠)ی (آل عمران)دا كردن.

## گواستنەوەمان بۆ (چۆمان)، پاشان (كەڵەكین)و دواتر (خڕنـدۆڵ)و سەرەنجام (شـێخ ئایش):

لە سۆنگەی ئەوەوە كە ڕژێم بـەردەوام بـوو لەسـەر هێـرش و پـەلامارەكانی و، گرتنـەوەی سەرجەم ئـەو ناوچـە ئازادكرانـەوەی لەبـەر دەسـتی پێشـمەرگەدابوون، ئێمـەش وەك لایەنـە سیاسـییەكانی دیكـە، ناچـاربووین لـە جێگۆڕكـەی بەردەوامـدابین و، زوو زوو بنكـەو بارەگایەكانـمان بگوازینەوە، هەر بۆیـەش لـە مـاوەی دەوری دوو مانگـدا ﴿٢٥/ ٧/ ١٩٨٨ تاكو كۆتایی مانگی ٩/ ١٩٨٨﴾ ئەو شـوێنانەمان كردن: ﴿بەستەمەلە، چـۆمان، كەڵەكـین، خڕنـدۆڵ، شـێخ ئایش﴾.

**لێرەشـدا بەباشی دەزانم ئامـاژە بە چـەند شـتێك بكـەم:**

## تانـە لێدرانمـان لەلایـەن خەڵكێكی یەكێتیـی نیشتیمانییەوە، كە بۆچی سەر گـردی ڕەمكـانمان چۆڵكـردوە؟:

كەسـانێك لە یەكێتـی تانەیان لێدەداین كە بۆچی سەرگردی ڕەمكانتـان چۆڵ كـردوە؟!

ئێمەش وەڵامماندەدانەوە كە ئێمـە سێ شـەوو سـێ ڕۆژ بەتـەنیا بەرهەڵسـتی ئـەو هـەموو هێزەی دوژمنانمان كردو، هـیچ كـەس نـەهات هاوكارییـەكمان بكـات، هەرچـەندە بـە بـێ بەدەستەوەبوونی گردی ڕەمكـان كـە كلیلـی ناوچـەكە بـوو، هـیچ كـەس نەیـدەتوانی لـەو ناوچەیـەدا بـمێنێتـەوە!

پاشان یەكیەتییش كاتی خـۆی لەناوچـەی سـەرگەڵوو بەرگـەڵوو، سـەركردایەتییەكەی گـیرا! وەك گوتراوە: نابێ مرۆڤ پووشـكە لە چـاوی خەڵكـدا ببینـێ، بـەڵام چـیلكە لـە چاوی خۆیـدا نەبینـێ!

## گلەیی هەندێك لە مامۆستایانمان، کە چوار پێشمەرگەمان بەکوشتداون !

ئەمیش خەفەتێکی دیکەی سەربارە بوو، کە هەندێك لەو مامۆستایانەی هەر لە سەرەتای ئاوارەبوونیانەوە، هەتا ڕاپەڕینەکەی بەهاری (١٩٩١)، ماڵیان هەر لە شاری (سنە)بووو نەدەهاتنە نێو پێشمەرگەکانیان، کەچی کە داستانی قەڵاتووکان بە خوێنی ئەو چوار شەهیدە سەربەرزەمان و ئازارو شەونخوونیو نارەحەتیی هەموو لایەکمان تۆمارکرا، لەجیاتی دڵدانەوەو هاندان دەیانگوت: نەدەبوو ئەو چوار پێشمەرگەیە بەکوشتدرابان! ئیدی نازانم ئەوان چۆن لە چەمكو واتای جەنگو جیهادو بەرخۆدانو فیداکاریی تێگەیشتبوون!

## بەهاناوەهاتنی پۆلێك برای دڵسۆزو پێشمەرگەی فیداکاریی هێزەکان :

بەپێچەوانەی هەڵوێستی هەندێك لە مامۆستایەکانی نیشتەجێی شاری (سنە)وە، ژمارەیەك لە پێشمەرگەکانی هێزەکانی: فاروق، خالد، حسن البنا، دەستگەرمانە بە هانای برایەکانیانەوە هاتنو، هاتنی ئەو برایانە دڵخۆشییو ورەیەکی زۆری بە پێشمەرگەکانی هێزی حەمزە دا.

کە لێرەدا بەپێویستی دەزانم ناوی هەموو ئەوانەیان تۆمار بکەم کە لەیادمن:

١- کاك حاجی سەعیدی پێنجوێنی.

٢- مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی.

٣- مامۆستا مەلا ئەبوبەکری صددیقیی.

٤- کاك ئەبو هودا (عبدالجبار).

٥- کاك جەمال ئەشرەف قارەمانیی.

٦- شەهید: جەمال ئەحمەد مەلا فەتاح.

٧- کاك محەمەد عەزیز / برای مامۆستا ئازادی سلێمانی (شەهید).

٨- کاك مەروانی سلێمانی.

٩- كاك فارووق عەلـی .

١٠- كاك جەمال جافـەرانیی .

١١- كاك ئومێـد جافـەرانیی .

١٢- كاك موحسین/ ناسراو بە (عُمَیـر) .

١٣- كاك مەهدی سـوور (كەمال) .

١٤- كاك هێمن كۆرەیـی .

١٥- كاك شـۆڕش (شەهید) .

١٦- كاك سـیروان/ برای شەهید شۆڕش .

## وەســتانی جەنگـی هەشــت ســاڵەی نێــوان عێــراق‌و ئێــران :

لە رۆژی : (٨/ ٨/ ١٩٨٨) دا جەنگی نێوان عێراق‌و ئێـران كـە لـە مـانگی : (٩/ ١٩٨٠) دەستی پێكــردبوو، بە بڕیاری نەتەوە یەكگرتووەكان‌و رازیبوونی هەردوولا، وەسـتاو كۆتایی بەو خوێنرێژییـە بێمانـاو پاسـاوەی نێـوان ئـەو دوو وڵاتـە مسـوڵماننشینە هـات، سـەرەنجام (ئایەتوڵـڵا خومەیینـی) ڕێبـەری شۆڕشـی ئێـران، ئـەو قاپـە ژەهـرەی خـواردەوە، كـە بێگومان ئەگەر زووتر بووایـە باشتر بوو!

هەڵبەتـە پـاش بـە فـەرمیی ڕاگەیـەنرانی وەسـتانی ئـەو جەنگـەش، بـارودۆخی هێـزی پێشـمەرگەی كوردسـتان بەگشـتی‌و ئۆپۆزیسـیۆنی رژێمـی بـەعس بەگشـتیتر، گـۆڕانی بەسەرداهات‌و وردەوردە نائومێـدیی‌و بێورەیی بـاڵی ڕەشـی بەسـەر دڵ‌و دەروونـی زۆربـەی خەڵكیدا كێشـا، هەرچەندە ئێمەی ئیسـلامیی لە هەموویان ورە بەرزترو خۆڕاگرتر بـووین، بە حوكمی پەروەردە عەقیـدەیی‌و فیكـریی‌و ڕووحییـەكەمانەوە .

## قۆڵـە شـەڕێكی درەنگ وەخـت لە كەڵـەكیـن :

لە دەوری نیوەی مانـگی : (٨/ ١٩٨٨)دا ڕۆژێكیان بڕیارماندا مەفرەزەیەك بنێرینەخوار بۆ سەركانی‌و سـەرچاوەو مێرگێك لە خوار (كەڵەكـین)ەوە، كە ئاژەڵی خاوەندار یـان بێخـاوەن

کـەوتووی دێیــەکانی ئـەو دەڤـەرە لێـی کۆدەبوونــەوە، جاشـەکانیش دەهـاتن بـۆ گـرتن‌و سەربڕین‌و خواردنیان، بەمەبەستی پرینگانینەوەو تەمبێکردنیان، کـە چـی دیکـە مـەڕومالاَتی خەڵك بە ناهـەق نەبەن‌و نەخــۆن.

بەلاَم هـەر ئەوەنـدەمان خـۆش بـوو هەتــا مـەفرەزە خۆمەلاَسـدەرەکەمان دەسـتیکرد بـە تەقەکردن لە جاشەکان‌و ڕاکردنیان، ئیدی ڕژێم دەستیکرد بە تۆپبارانێکی خەستی هەم شوێنی مەفرەزەکە کـە (الحمـد لله) شـوێنەکەیان نێـو چـیاو مەحکـەم بـوو، هـەم ئـەو شـوێنەی کـە بارەگاکەمانی لێبـوو، دەتوانم بڵێـم: زیاتر لە یەك سـەعات تۆپبارانەکە بەردەوام بوو، بەلاَم (الحمد لله) ئێمە لەلای بارەگاکەمان سەلامەت بووین‌و، خەمی مەفرەزەکەمانمان بـوو، بـەلاَم ئەوانیش دەوروبەری نوێژی خەوتنـان‌و پاش دنیا تاریك بوون، تـاك تـاك‌و جـووت جـووت پەیدابوونــەوە، هیچ کەسمان لـێ بریندااریش نەبوو!

شایانی باسیشـە کە شـەهید: جەمال ئەحمەد مەلا فەتاح، بە بڕنۆیەکـەی ڕۆڵێکـی گرنگـی گێڕا لە تەنگ پێهەڵچنینـی دوژمن‌و دەرفەت نەدانیان کە پەلاماری مەفرەزە گیرخواردووەکەمان بدەن، چونکە ئێمـە لەگەڵ کـاك جـەمال ئەحمـەددا لـە بـەرزایی (کەڵـەکین)دا سـەنگەرمان گرتبوو، کە بەسەر شوێنی دوژمنــدا زاڵ بوو.

### بەڕێکـردنـی خێـزانەکـان بۆ شـاری نەغـەدە:

لـە کۆتـایی مـانگی (٨/ ١٩٨٨)دا خێزانـەکانمان بـۆ دیـوی ئێـران بـۆ شـاری (نەغـەدە) بەڕێکردن، چونکە کۆمەڵە ماڵێکی دیکەشمان ماوەیەك بوو لەوێ نیشتەجێ بووبوون.

ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە:

١- سـاڵ بەرەو پـایز دەچووو، بناری قەندیلیش هەر زوو باران‌و بەفـری زۆری لێدەبـارێ، هیچ نوایەکیشمان نەبوو بۆ خێزانەکـان.

٢- هێرشەکانی ڕژێم بۆسـەر بنکـەو بارەگایـەکانی هێـزی پێشـمەرگە، ڕۆژ بـۆ ڕۆژ زیـاتر پەرەیاندەستاند، بەتایبەت دوای ڕاگـرتنی جـەنگی هەشـت سـاڵەی عێـراق ـ ئێـران لـە

(٨/ ٨/ ١٩٨٨)دا، هەروەها پرۆسەی هەشت قۆناغیـــی ئـەنفالیش، هـــەموو لایـەکی زیاتر بەرەو نائومێدیـی دەبـرد.

٣- ڕژێم زیاتر بە فڕۆکـــەو تۆپی دوورهاوێژ لە پێشــمەرگەی دەدا، وە ئێمەش زیاتر چـەکی وردو کورت مەودامان پێبـوو.

بۆیە لەو بارودۆخەدا، گیانی خۆپەنـادانو خۆدەربـازکرد "بەتایبـەت بۆ مـــاڵو خێـزان" باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشـابوو!

## کاك سید مصطفی سید علـی و خۆ لـێبوونـە (مەهـدی) :

کاك سید مصــــطفی "خوا لێی خۆشبێ" کە لە سەرەتای هەشتایەکانەوە پێك ئاشنابووینو لە ســـاڵی (١٩٨٢)دا هـــاوڕێ لەگـــەڵ (کـاك نجم الـدین فـرج)دا "کـە دوایـی نازنـاوی (مامۆسـتا کرێکار)ی وەرگرت" پێکـەوە ســـەفەرێکی ئێـرانو پاشـان (تاران)مـان کـردو، چەند ڕۆژێك پێکـــەوەبووین.

بەڵـێ کاك سـید مصـطفی لـە سـالأنی (١٩٨٧ـ١٩٨٨)دا بـاری دەروونیـی تێکچـــوو و خۆی لـێ بوو بە (مـحمـد الـمهدي)، منیش کە تێکەڵیی پێشـترم لەگـەڵی هـەبوو، زوو زوو ئامۆژگارییم دەکرد کە ئەوجۆرە قســـانە نەکات، چونکە وانیـــە.

ڕۆژێکیان لە قەڵاتووکان سەردانی کردینو لـەوبارەوە قســـەمان کـردو ئـەم وتووێـژەمان پێکـــەوە بوو:

ئەو بە شێوەی پرسیارکردنو ڕاوێژپێکردن، گوتی: تۆ ئەو حاڵەی منت پێ چۆنـە؟

گوتم: پێموایە حاڵەتێکـی نائاسایی دەروونییـەو هیچ حیســـابی بۆ مەکە.

گوتی: ئاخـر هەندێك ڕستەو وشەم بۆدێنو پێشم دەگوترێ: کە تـۆ (مهـدي)، وە دەبـێ ئەو وشـانە بگەیـــەنی!

منیش گوتم: سەرنجی ڕستەو وشەکانم داوە، لە ڕووی ڕێزمانییەوە هەڵەی زۆریان تێدایە، بۆیە واپێدەچێ ئەو قسانە خوتخوتەی شەیتانێکی عەرەبی نەزان بن و، بێگومان هی خواو فریشتە نین!

{دیارە دواتر کاك سید مصطفی ئەو قسانەی بۆی هاتبوون کە بە زۆریی عەرەبی بوون، لە دووتوێی کتێبێکدا بە ناوونیشانی: (کلمات)، چاپ کردن و، قسەی زۆر تێکەڵ پێکەڵ و بێسەروبەریان تێدابوون}.

گوتی: بەڵگەی دیکەت چییە؟!

گوتم: بەڵگەیەکی دیکەم ئەوەیە کە کەوڵی جەنابت جێی (مهدي) تێدا نابێتەوە.

گوتی: چۆن؟

گوتم: تۆ هەرکەسێك بڕوات پێ نەکات، یەکسەر قەڵس دەبی و هاوسەنگییت تێکدەچێ و دەست دەکەی بە لەرزین! بەڵام (مهدي) یەك بۆ چاککردنی هەموو دنیا بێت، دەبێ زۆر سینگ فراوان و بە حەوسەڵە و دامەزراوبێ و، دڵی وەك دەریا بێ و شلوێ نەبێ.

وە گوتم: بەڵگەیەکی دیکەم ئەوەیە کە کاتی خۆی جەنابت نوێژ کورتکردنەوەو کۆکردنەوە (القصر والجمع)ی سەفەرت نەدەزانی و من فێرم کردی، لە حاڵێکدا کە مەهدی لە ڕووی زانیاریی شەرعییەوە ـ دەڵێن ـ پێویستی بە غەیری خۆی نیە، بەتایبەت مەسەلەیەکی ئاوا سادە!

ئنجا ئەو گوتی: ئاخر من بەڵگەیەکی دیکەشم هەیە، ئەویش ئەوەیە کە خەونی ڕاست دەبینم.

گوتم: خەون ـ ئەگەر گریمان ڕاستیش بێ ـ بەڕای سەرجەم زانایان بە بەڵگەی شەرعیی ناشێ، ئنجا سەربارەش خەونەکانی تۆ زۆرجار ڕاستیش دەرناچن، بۆ وێنە: بە خەڵکی قەڵادزەت گوتبوو: خەونم دیوەو قەڵادزە ڕاناگوازرێ، کەچی وانەبوو و ڕاگوێزرا!

دیاره كاك مصــطفى هەر لەسەر كاری خۆی بەردەوام بوو، هەتا بەداخەوە سەرەنجام سەری خۆی لەسەر داناو، ئەوەبوو كە لە (ڕۆژی: ١/ ١٠/ ١٩٩٢) لـە ماڵێكـدا لـە شـاری هـەولێر خۆیو چەند شوێنكەوتووێكی بێرەحـمانە كوژران، كـە دیـاره مـن ئەوسـاو ئێسـتاش زۆرم پێناخۆش بوو، وە هەمیشە دەمگوت: دروست نیە كاك سەید مصطفى لەســەر ئـەو حاڵەتـەی زیانی پێ بگەینرێ، چونكە تەكلیفی شەرعی لەسەر نیەو، باری دەروونیی تێكچـــووە.

كەچی هەندێك لـە خـزمو شـوێنكەوتووانی پـاش كـوژرانی، گومانیـان بـۆ ئێمـەومانان چووبوو، هەتا ئەوانـەی لەگـەڵ شـێخ زانـا گیرابـوون، لـە ڕێكـەوتی: (٢٠/ ٩/ ٢٠٠٦)، ئیعتیـراڤیان كرد كە ئەوان كوشـــتوویانن!

## قســەیەكی خـۆش لەبــارەی كــاك ســید مصــطفى وە:

ئەوكاتەی كە لە كوێستانی (خواری ماڵەخێ)بووین ـ وەك هێـزی حـەمزە و ژمارەیـەك لـە ماڵەكانیشــمان ـ كــاك مصــطفى ش لـەوێ بـوو، دیـاره ئـەو هـەوارەش هـەواری خـەڵكی (دووگۆمان)ە، كە ئەوكاتە مامۆستا مەلا عبداللە ئیمامیان بوو، ئنجا كاك مصــطفى نوێـژی لـە دوای (مامۆستا مەلا عبداللە) نەدەكرد، منیش لێك پرسی: كاك مصطفى بۆچی نوێـژ لە پشت (مامۆستا مەلا عبداللە)وە ناكـــەی؟

گوتی: ئاخر گومانـی هەیـــە كە من (مهـــدي)م!

گوتم: ئەدی بۆچی لەدوای منـەوە نوێژ دەكەی، خۆمن یەقینم هەیە كە تۆ (مهـدي)نی؟!

ئەویش گوتی: ئاخر تۆ دڵت بەرانبەرم خراپ نیـەو ڕقت لێم نیـــە!

شایانی باسیشە كە لە: (١/ ٦/ ١٩٨٩) لـە مزگـەوتێكی شـاری (خانـێ)ی كوردسـتانی ئێرانداو، بە ئامـادەبوونی ژمارەیـەك لـە مامۆسـتایانو خـەڵكێكی دیكـەش، كۆبوونەوەیـەك لــەبارەی كــاك ســـید مصــطفى وە ســازكراو، ئـەو هەنـدێك قسـەی كـردن بـۆ ئیسـپاتی دەعوایەكەیو، منیش لە وتارێكـدا قســـەكانیم بەرپەرچـدایەوەو هەڵوەشـاندەوەو، پێموایـە ئێستاش ئەو وتاره هەرمـاوە.

# چەند بیرەوەرییەكی نێوان

## كۆتایی مانگی ٩/١٩٨٨و هاوینی: ١٩٨٩

ئەو ماوەیە كە وێستگەكانی : (٢٧ـ ٣٤)ی تەمەنی پێشمەرگایەتیی پێش ڕاپەڕینی جەماوەریی (١٩٩١)یم پێكدێنی، ژمارەیەك پێشهاتو ڕووداوی تێدابوون، كە بەپێویستی دەزانم ئەگەر بەكورتییش بووە، تۆماریان بكەم :

### گواستنەوەی بارەگای هێزی حەمزە بۆ گوندەكانی (نمێنجە)و ( بادیناوێ)، پاشان (میراوێ) لە كوردستانی ئێران :

وەك پێشتر باسمان كرد، پاش وەستێنرانی جەنگی هەشت ساڵەی عێراق – ئێران لە : (٨/ ٨/ ١٩٨٨)و توندتربوونی هێرشو پەلامارە ئاسمانیيو زەمینییەكانی ڕژێمو، نەمانی دێهاتو، بە كۆمەڵكوژرانی بە هەزاران ژنو پیاوو منداڵی گوندەكانو هتد، هێزی پێشمەرگەی هەموو لایەنە سیاسییەكانی سەر گۆڕەپانی كوردستان، سەرەتا بەرەو چیاكانی سنوور كشان، پاشان لەوێش حەوانەوەیان نەكراو، بە ناچاریی بەرەو خاكی كوردستانی ئێران چوون، ئێمەش وەك هێزی حەمزە سەرەتا بنكەی هێزو كەلوپەلەكانیمان بردە گوندی (نمێنجە)و ( بادیناوێ)، پاشان ماوەیەك بۆ (میراوێ)، دیارە (نمێنجە)و (بادیناوێ) نیزیك شاری (خانێ)نو، (میراوێ)ش لە نێوان (سەردەشت)و (خانێ)یە .

### گەڕانو وتاردان :

شایانی باسیشە لەوماوەیەدا من وەك عادەتی خۆم، هاموشۆی مەلایەكانی ئەو گوندانەو گوندەكانی دەوروبەریانم دەكرد، ئەوانیش سەردانیان دەكردین، جاروبار لە بۆنەكانی : ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتنی هەندێك لە فەقێیەكانو، یادكردنەوەی لەدایكبوونی

پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" دا، لە مزگەوتەکاندا وتارم دەدا، لێرەدا بە باشی دەزانم ئاماژە بە سێ لەو وتارانە بدەم:

**١- وتاری (میراوێ) بە بۆنەی ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتنی چەند فەقێیەکەوە:**

ڕۆژێکیان بەبۆنەی ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتنی چەند فەقێیەکەوە لە(میراوێ) ئاهەنگێك سازکرا، کە هەر لە مزگەوتەکەدا بەڕێوەچوو، دیارە منیش دەعوەت کرابووم و وتاریشیان بۆ دانابووم، منیش لەگەڵ ژمارەیەك لە برایاندا چووم و کە چووینە ژوور، بینیمان ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایان دانیشتوون، وێڕای خەڵکێکی زۆری ڕیشسپی و هەمەجۆر، ئنجا لەبەرئەوەی مەگەر چۆن دەنا هیچکەسیان نەبوو جگەرەی بەدەمەوە نەبێ، کە تەماشات دەکرد، وات دەهاتە بەرچاو، مزگەوت هەور یان تەمومژی تێدا وەستاوە!

منیش لە نۆرەی خۆمدا کە وتارم دا، وێڕای باسی گرنگیی و پێویستیی پەیداکردنی زانستی شەرعیی و بەرزیی پلەوپایەی زانایانی ئیسلام و ئەرکی سەرشانیان و ... هتد، لە میانەی قسەکانمدا ئاماژەشم بەو دیمەنە دزێوەی مزگەوت پڕکردن لە دووکەڵی جگەرە کردو گوتم:

هیچ گومانی تێدانیە کە ماڵی خوای بەرزو مەزن، لەگەڵ ئەو هەموو دووکەڵ و خڵتەو خاڵی جگەرەو بۆن و بەرامە ناخۆشەیدا ناگونجێ، ئەویش لەلایەن کێوە؟! لەلایەن مامۆستایان و زانایانێکەوە کە خۆیان بە میراتگرو جێگری پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" دەزانن! کە بێگومان پێویستە میراتگران و جێنشینانی پێغەمبەری خاتەم "صلی الله علیه وسلم" سەرمەشق و پێشەوای خەڵك و میللەت بن بۆ هەموو شتێکی پاك و چاك و پەسەند، نەك بۆ جگەرەکێشان و مزگەوت و ماڵی خوا پڕکردن لە دووکەڵ و بۆن خڵتە!

هەروەها گوتم: بێگومان ئێمە بەمەبەستی ڕازیکردنی خواو پاداشتی بەرزی دێینە مزگەوت، بەڵام بە جگەرەکێشان و مزگەوت پیسکردن و بۆن ناخۆشکردنی، بە هەر قوم لێدانێکی جگەرە گوناهێك بۆ بابای جگەرەکێش تۆماردەکرێ...

دیارە مامۆستایەکان تەماشای یەکدییان کردو، هەندێکیان دەستبەجێ جگەرەکانیان کوژاندەوە، خەڵکەکەش پەنجەرەکانیان کردنەوەو تۆزێك دووکەڵەکە چووە دەرێ، منیش کە پێشتر تەنگەنەفەس بووبوومو، چاوم دەزووورانەوە، ئەوجار حاڵم باشتر بوو!

## حوکمی جگەرەکێشان :

شایانی باسیشە بەندە هەر لە زووەوە باسی حەرامیی جگەرەکێشانم کردوە، بە پشت بەستن بە گەلێك ئایەتو فەرموودە، بۆ نموونە:

١/ ﴿... وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ... ١٥٧﴾ الأعراف، ئنجا مادام (الطيبات) هەموو خواردن و خواردنەوەیەکی پاكو چاك وسوودبەخشن، بگرێتەوەو، (الخبائث)یش، هەموو شتێکی پیسو خراپو زیانبەخش، بگرێتەوە، ئنجا بە عەقڵو زانستو ئەزموونیش سەلمێنراوە کە جگەرەکێشان نەك هەر زیانبەخش، بگرە بکوژێکی بێڕەزایە! کەواتە: لە جوغزی (الخبائث) دایەو حەرامە.

٢/ ﴿... وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ٢٦ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا ٢٧﴾ الاسراء، دیارە (تبذیر)یش ماڵ بەفیڕۆدانە و خەرجکردنیەتی بەشێوەیەکی بێ هوودە، ماڵێکیش کە بە جگەرە دەدرێ، سووتاوەو سووتووەو لەدەست چووە!

٣/ ﴿نهی الرسول صلی الله علیه وسلم عن القیل والقال وکثرة السؤال وإضاعة المال﴾ رواه مسلم.

ئاشکراشە پارەیەك کە بە جگەرە دەدرێ، نەك هەر بەزایەدانو بەفیڕۆدانیەتی، بگرە خۆ پێ کوشتن (إنتحار)یەتی، بەشێوەیەکی پەنهان!

هەڵبەتە زیانەکانی جگەرەکێشان تەنیا لەبابای جگەرەکێشدا کورت هەڵنەهاتوون، بەڵکو زیانی گەورەشی بۆ خەڵكو خێزانو ژینگەش هەیە.

وە من پێموایـە کاتی خۆی زانایان زیانەکانی جگەرەکێشانیان بۆ دەرنەکەوتوون، ئەگـەرنا ئەوانیش وەك زانایانی سەردەم (معاصـر)، لەسەر حـەرامبوونی یەکـدەنگ دەبـوون‌و وە هـیچ زانایەکی موعتەبەریش توخنـی جگەرەکێشان نەدەکەوت!

## ٢- وتـاری (نـەلاس)ی بە بۆنـەی یـادی لەدایکبـوونی پێغـەمبـەرەوە "صـلی الله علیـه وسلم":

هەر لەو سەروحەدەدا بەبۆنەی یادکردنـەوەی لـەدایکبوونی پێغەمبـەرەوە "صـلی الله علیـه وسلم" لە مزگەوتی دێی (نەلاسێ) گردبوونەوەیەکی جەماوەریی سازکرا، منـیش دەعـوەت کرام‌و وتارێکیشـیان بۆ دانابووم.

ئنجا ئەوە بوو کە لەپێش مندا مامۆستا مەلا مەحموودی نەلاسێ وتاریـداو، زۆر بەخەسـتی باسی ڕەوایی‌و بگرە پێویسـتبوونی ئەو یادو بیرەوەرییەی کـردو، وای پێشـاندا کـە نـەك هـەر ڕەواو دروست (مباح‌و جـائز)ە، بگـرە پێویسـت (واجب)یشـە، وەك یـەکێك بـێ لـە پایـەو بنەمایەکانی ئیسـلام!! ئنجا لە گەرمەی وتارەکەی مامۆستادا، سـۆبەی مزگەوت -کە ئـەوان (کوورە)ی پێدەڵێـن- کە بە نەوت ئیشی دەکرد، تەقی‌و گرێگـرت‌و خەڵکەکـە ڕاچـڵەکین‌و هەندێکیان لە مزگەوتیش چوونـەدەرێ!

پاشان خەڵکەکە هێوربوونەوەو منیش نۆرەی وتارەکەم هات، لە وتارەکەمدا پـاش ئـەوەی باسی کەسـایەتیی پێغـەمبەری خوا (محمـد) (صلی الله علیه وسلم)و هەندێك لە هەڵوێسـت‌و ڕەوشتە بەرزو ناوازەکانیم کـرد، گوتم:

منیش یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبـەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) بەڕەوا دەزانم، بۆیەش هاتووین‌و بەشـداریيمان کـردوە، بـەلاَم بەڕاسـتی جـەنابی مامۆسـتاش زێـدەڕۆیی (مبالغـة) زۆری کردو، ڕەنگە تەقینی سـۆبەکەش، جۆرێـك بووبـێ لـە نـاڕەزایی دەربـڕینی سـۆبەی مزگەوت بەرانبـەر بەو قسـانەی مامۆسـتا!

## قسەیەك لەبارەی یادكردنەوەی لەدایكبوونی پێغەمبەرەوە (صلى الله علیه وسلم) :

یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر (مولد الرسول) (صلى الله علیه وسلم) کە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی کوردستانو بە مەلایەکانیشەوە، بەهەڵە هەر دەڵێن: (مولود)! لەمێژە مشتومڕی لەبارەوە کراوەو دەکرێ، من پێموایە لەوبارەوە هەم تێپەڕاند (إِفراط) هەیەو هەم بەزایەدان (تفریط)، تێپەڕاندنەکەش ئەوەیە کە ئەو مەسەلەیە لە حاڵەتی سروشتیی خۆی کە ڕەوایی (إِباحة)یە، ببرێتە دەرو، بکرێتە شتێکی فەرز یان سوننەت، واتە: جۆرێك لە عیبادەت!

بەزایەدانەکەش ئەوەیە کە حوکمی قەدەغەبوونو ناڕەوایی بەسەردا بدرێ، یان بەداهێنراو (بدعة) دابنرێ!.

شایانی باسیشە من لە کتێبی: (جەژنو یادو بۆنەکانو هەڵسەنگاندنێك)دا بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەم کردوە، وە ئێستا دەرفەت نیە ئەوەی لەوێ گوتوومە، لێرە باسی بکەم، بەڵام هەر بەکورتی دەڵێم:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە بابەتی جەژنو یادو بۆنەکان، بە هەموو جۆرەکانیانەوە: ئایینیی، نیشتیمانیی، نەتەوەیی، پیشەیی، جیهانیی، لە جۆری نەریتو هەڵسوکەوتەکان (العادات ء المعاملات)ن، بناغەش لە هەڵسوکەوتو عادەتەکاندا ڕەوایی و ڕێپێدران (الإِباحة والعفو)ە، بەپێچەوانەی خواپەرستییەکان (العبادات)ەوە کە بناغە تێیاندا ڕێ لێگیرانو قەدەغەبوون (المنع و الحَظْر)ە، وەك (ابن تیمیة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (إن الأصل في العبادات التوقيف، فلا يشرع منها إلا ما شرعه الله ... والعادات الأصل فيها العفو فلا يحظر منها إلا ما حرم) القواعد النورانية الفقهية ص١١٢.

واته: بناغه له خوا پەرستییەکاندا وەستێنرانەو، جگە لەوەی خوا دایناوە ڕەوانییە، بەڵام عادەتەکان، بناغە تێیاندا ڕێپێدرانەو، مەگەر ئەوەی خوا قەدەغەی کردبێ، ئەگەرنا قەدەغە نییە.

ئنجا ئاشکراشە کە جەژنو یادو بۆنەکان، هیچ پەیوەندییان بە بواری عیبادەتەوە نیە، تاکو – وەك هەندێك کەس دەڵێن – هەرشتێکی تازەو نوێیان لێ پەیداکراو داهێنرا، بچێتە بازنەی داهێنراو (بدعـة)ەوە، چونکە یادو بۆنو جەژنەکان، بریتین لە هەڵسوکەوتەکانی خەڵك لەنێو خۆیاندا، کە بەپێی پێویستی ژیانو گوزەرانی خۆیان پەیدایان دەکەن، وەك (ابـن تيميـة) گوتوویەتی: (وأما العـادات فهـي ما اعتـاده النـاس في دنيـاهم ممـا يحتـاجون إليـه) هەمان سەرچاوە، ص ١١٢.

بۆیە تەنیا کاتێك ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، یان شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء و المعراج) یان جەنگی بەدرو ... هتد، بە بیدعەت لە قەڵەم دەدرێ، کە وەك خواپەرستییەك تەماشا بکرێ، چونکە بێگومان لە بواری خواپەرستیی (عبادة)دا ـ کە ئیمانو عەقیدەو دروشمەکانی خواپەرستیی (شعائرالتعّبـد) دەگرێتەوە ـ هەر شتێك دابهێنرێ، ڕەتکراوەیەو بە بیدعەت دادەنرێ، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد﴾ البخاري: ٢٦٩٧، ومسلم: ١٧١٨، واته: هەرکەس لەم ئایینەماندا شتێك دابێنێ کە لەو نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە.

کە دیارە مەبەست لە (أمرنا هذا) بواری ئیمانو عیبادەتە، کە نوختەی تێدا خراوەتە سەر پێت، نەك بواری هەڵسوکەوتو عادەتەکان، کە دەقی کەمی لەبارەوە هاتوونو، بۆشایی (فراغ) زۆری تێدا جێهێڵراوە، کە عەقڵ بە ئیجتیهاد پڕیبکاتەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە، ئەوەیە کە جۆروچۆنیەتیی یادکردنەوەکە ڕاستو دروست بێو، قسەو باسو هەڵسوکەوتی ناشەرعییو هەڵەی تێنەکەوێ، وەك ئەو قسانەی کە لە کتێبی (مولودنامە)دا هاتوون، کە هەرلەزووەوە من ناوم لێنابوو: (کتێبی پلاوان)!

شایانی باسیشه سـەرجەم زاناو پێشەوایان لەسەر ئەوە یەکدەنگـن، کە بیدعـەت تەنیـا لە بواری ئیمانو عەقیـدەو عیبادەتدایـە، هەرکام لە ( الشـاطبـي) لە (الـموافقات)داو ( ابـن بـاز) لە فەتوایەکانیداو (ابن عثيمين) لە (شرح الأربعين النووية)و (شرح ريـاض الصـالحين)داو زانایانی دیکـەش وایانگوتوه، وەك لە کتێبـی: ﴿جـەژنو یـادو بۆنـەکان...﴾دا قسـەکانیانم هێناون.

### وتـاری گونـدی (شـوێ) بەبۆنـەی ئیجـازە وەرگرتنـی مەلایەکـەوە :

هەر لەو سەروحەدەدا بۆنەیەکی ئیجـازە وەرگـرتن لەگونـدی (شـوێ)ی نزیـك شـاری (بانـە) سازکرا کە ئەو کاتە مامۆسـتا مەلا ئەحمـەدی شـافیعیی مەلای گونـد بـوو، وە وێـڕای مامۆسـتایانی ڕەحمەتی:

١ـ مامۆستا مەلا عثمـان عبدالعزيـز.

٢ـ مامۆستا مەلا شێخ عبداللطيف واژەیی.

بەندەش دەعوەت کرابووموو، وتەیەکیشیان بۆ دانابووم.

ئنجا یەکێـك لە مامۆسـتایانی ئامـادەبوو کـە خـەڵکی لای بانـە بـوو، پـێش مـن هەڵسـا وتارێکی داو، لە وتارەکەیدا باسـی ئەوەی کرد کە:

کەسانێك پەیدابوونە دەڵێن: دەبـێ بەدوای قورئانو سـوننەت بکەوین! بەڵام ئاگـاداربن، ئـەوە فیکـرەیەکی زۆر خەتـەرەو دژی ئیسـلامەتییەو، دەبـێ لێیـان وریـا بـینو ... هتـد، لەوبارەوە زۆر قسـەی کردنو سەرەنجام گوتـی: مـن دەڵـێم: نـان نـانی گـەنم، دیـن دینـی موحەممەد، مەزەب مەزەبی شـافیعی، هیچی دیکـە ناناسین!

دیارە منیش قسەکانیم زۆر پێ ناهەق بوون، بۆیە لە دووتوێی وتارەکەمدا، وێڕای هەندێك قسـەوباس لەبارەی گرنگی زانسـتی شـەرعیيو... هتدەوە.

لە وەڵامی قسەکانی ئەو مامۆسـتایەدا گوتم: وێڕای ڕێزو حورمەتم بۆ مامۆسـتا، نـە نـان تەنیـا نانی گەنـمەو، نە دین تەنیـا دینی موحەممـەدە، نە مەزهەبیش تەنیـا مەزهەبی شـافیعییە!

بەڵكو ویڕای گەنم دانەوێڵـەی دیكەش زۆرن، كە وەك نان یان لە جیاتی نان دەخورێن، ڕەنگە لە هەندێك وڵاتان گەنم هەرنەچێنرێ، بۆ وێنـە: تەنیا برنج یان هەرزن یان گەنمەشـامی، یـان پاقلـە... بخۆن.

هەروەها (دیـن)یش – كە هیی خوایە نەك هی موحەممەد "صلى الله عليه وسلم"، بـەڵكو ڕێبـازو پەیڕەوییكردن لە ئیسلام كە سوننەت (سنة)ی پێدەڵێن، هی موحەممەدە "صلى الله عليه وسلم" بەڵام ویڕای ئایینـی هەقو ڕاستو ساغو دەسـتكاریی نـەكراویی ئیسـلام، گـەلێك جـۆرە ئاییـنی دیكـەی ناڕاسـت، یـان گـۆڕراویش هـەن، وەك: ئایینـەكانی جوولەكـەو نەسرانیی، كۆمۆنیـزمو كاپیتـالیزمو سـیكۆلاریزم..

هـەروەها وێـڕای مەزهـەبی شـافیعییش، چـەند مەزهـەبێكی دیكـەش هـەن، وەك: حەنەفیـی، مـالیكیی، حەنبـەلیی، جەعفـەریی، زەیـدیی، ئیبـازیی (إباضـي)، زاهیریـی (ظـاهري)، پاشـان گوتم:

زانـاو پێشـەوایانیش هـەموویان مەزهەبـەكانی خۆیـان هـەر لـە قورئـانو سـوننەت هەڵهێنجاون، جگە لە قورئانو سوننەتیش، قسەو بۆچوونو مەزهەبی هیچ كەس بـە خـودی ئیسلام دانانرێ. بەڵكو هەمووی تێگەیشـتنی ئەوانە لەبارەی دینـەوە، نەك خودی دین!

هەڵبەتە هەستیشم كرد كە ئامادەبووان بەگشتی قسـەو ڕوونكردنـەوەكانی منیـان پێخـۆش بوون.

### كۆبوونـەوەی فراوانـی بزووتنـەوەی ئیسـلامیی لە شـاری سـەقز:

لە ڕۆژی: (٢٧/ ٩/ ١٩٨٨)دا، ئەو مامۆستایانەی كە ماڵەكانیان لە(سنه) بـوون، بـە بـێ ئاگـاداریی و ڕاوێـژكردن بـە ئێمـە ـ وەك هـەردووك هێـزی حـەمزەو شـافیعیی ـ بڕیـاری كۆبوونەوەیەكی فراوانو گرنگیان دابوو، كە وەك كۆنفرانسێك یـان كۆنگرەیـەك وابـوو، لـە نووسینگەی پەیوەندییـەكاندا، لە شاری (سـەقز).

ئێمەش كە هەر لە بنـەڕەتدا لێیـان نیگەران بووین، لە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە زۆر داوامـان لێیان دەكرد، جارێك بێن سـەردانمان بكەن، بەڵام هیچ كامیان نەهاتن، جگە لە مامۆستا شێخ

عبداللطيف واژەيی "بەرەحمەت بێ" ، ـ كە چەند رۆژێك لە قەڵاتووكان لەلامان مايەوە ـ هەروەها سەربارەش ئاگاداريان نەكردبووينەوەو راوێژيان پێنەكردبووين، كە ئەو كۆبوونەوەيە چييەو بۆچييەو... هتد؟! بۆيە ئێمەش رۆژێك دواكەوتين‌و نەچووين، هەتا دوايی مامۆستا شێخ موحەممەد بەرزنجيی، نامەيەكی بۆ ناردين‌و لەسەر داواو داكۆكيی ئەو چووين.

ديارە هەندێك لە مامۆستايەكانيش بەر لە چوونی ئێمەومانان، ويستبوويان كۆبوونەوەكە بەبێ بەشداريی ئێمە بكەن‌و، هەندێك قسەی ناخۆشيان كردبوون، بەڵام كاك حاجی عبدالرحمن مەلا معروف، ناسراو بە (نۆرسيی) لێيان وەدەنگ هاتبووو، بەرگرييەكی باشی لێكردبووين، بەتايبەت لە بەندە، وە رێگرييان لە ئەنجامدانی كۆبوونەوەكە كردبوو، بەبێ ئێمە.

ئنجا سەرەنجاميش كە كۆبوونەوەكە كرا ـ كە دوو رۆژی خاياندن ـ لە سۆنگەی ئەوەوە كە رابەری گشتی مامۆستا مەلا عوسمان "بەرەحمەت بێ" ، لە وتارەكەيدا هيچ بەلای گيروگرفت‌و كەموكوورييەكان دانەچووو، زياتر باسی ئەوەی كرد كە الحمد لله حاڵ‌و وەزعمان زۆرباشە، خەڵكێكی زۆر لە دەرەوەی ولاتيش نامەيان ناردووەو دڵيان پێمانخۆشەو ... هتد، بۆيە من خۆمم ناچار بينی، وەك تەعبيركردن لە خەڵكێكی زۆری نارازی‌و، پەنجەدانان لەسەر هەندێك لە گيروگرفت‌و نەخۆشييەكانی بزووتنەوەی ئيسلاميی، وتارێكم داو وێنەيەكيشم بۆ پێناسەی وەزعی خۆمان هێنايەوەو گوتم:

ئێمە وەك ئەو كەسەمان لێهاتوە كە گرفتی چاوی هەبووە، چاوی نەبينيوەو چووە بۆلای پزيشك، ئنجا كە گەڕاوەتەوە، لێيان پرسيوە: ئێستا چۆنی؟

ئەويش گوتوويەتی: بەخوا بۆخۆم هيچ نابينم، بەڵام دكتۆر دەيگوت: زەرداييەك دەكەی (واتە: شتێك دەبينی)!! مەبەستم ئەوەبوو كە ئێمە خۆمان دەزانين چەند گيروگرفت‌و كەموكوورييمان هەن، نابێ بە قسەو نامەی خەڵكێكی دوور كە ئاگايان لێمان نيە، دڵخۆش بين!

لە ئاكامی كۆبوونەوەكەشدا هەندێك بڕياردران‌و مەكتەبی سياسی هەڵبژێررا ـ كە پێشتر لەگەڵ سەركردايەتی تێكەڵ‌و ئاوێتە بوو – بەندەش بوومە ئەندامی مەكتەبی سياسی.

## یادێکی حاجـی جوهـر ئاغـای غفـورخـانی لێـوژەیـی :

شایانی باسیشە ئەو ماوەیەی کە بارەگامان لە(نـمێنجە)و (بادینـاوێ)بوو ، هـەروەها پـێش ئەوەو دوای ئەوەش ، (حاجی جوهر ئاغای لێـوژێ) بەڕەحمەت بـێ ، کـە ماڵیـان لـە گونـدی نـمێنجە بوو ، وە خاڵی هاوسـەری ڕەحمەتییم (ڕوخسار خان) بوو ، هاوکارو دەسـتبارگرێکی باشـمان بوو لە زۆر ڕووەوە ، خوا پاداشـتی بداتـەوە ، چـونکە پیـاوێکی بەئـەزموون بـووو ، تێکەڵاویی کۆمەڵایەتییشـی زۆربوو ، وە زۆرجاران لە ئامۆژگاریی و پێشنیارەکانی بەهرەمەنـد دەبووین ، ویڕای هـەوڵ و هیممـەتی مـاددیی و مەعنـەویی ، بەتایبـەت لەگـەڵ مـاڵی ئێمـەدا بەحوكمی نیزیکیـی و خزمایەتیـیمان .

## گواسـتنەوەی ماڵەکـانمانو بنکـەی هێـزی حەمـزەش بۆ شـاری سـەردەشـت :

لـە (١٢/ ١١/ ١٩٨٨)دا بنكـەی هێـزی حـەمزەو ماڵەکانیشـمان گواسـتەوە بـۆ شـاری سەردەشت ، چونکە لەڕووی جوگرافییـەوە ، لە دەڤەری پشـدەر ـ بیتوێن– نزیکتر بوو .

بارەگای هێزمان لە مزگەوتی (حاجی ڕەسوولڵ)دا دانا ، کە مامۆستایەك بەناوی (کاك مەلا سعید) ئیمامی بوو ، کە کوڕی (مامۆستا مەلا ڕەحمانی کـاژێ)بوو ، کـاك مـەلا سـەعید زۆر دراوسێو هاوکارێکی باشـمان بوو ، لە هەموو ڕوویەکەوە ، خوا پاداشتی بداتەوە ، هـەروەها هەرکام لە (مامۆستا مـەلا سـید ڕەزا)و (مامۆسـتا مـەلا عبدالسـلام) کـە یەکـەمیان هـەر لـە سەردەشتو دووەمیشیان لە گوندی (شیوەبرایم)ی نیزیك سەردەشت مەلا بـوون ، هـەروەها کاك (نادری کریـمیان) کە ئێستا (دکتـۆر نادر)ەو لە تارانە ، کـەمو زۆر بەدەمانـەوە بـوونو ، تێکەڵاویی خێزانیشـمان لەگەڵیان هەبوو ، یادی هەموو لایەکیـان بەخێـربێ .

هەروەها چەند گەنجێکـی سەردەشتیش زۆر خەمو مشووریان بۆ دەخواردین ، بەتایبەت لە سـەرەتای دامەزرانـدنی بنکـەی هێـزەوە ، کـە کـاك (محمـودي ابراهیمـي)و کـاك (سـلیماني عظیمي) ، برای ڕەحمەتیی مامۆستا (مەلا محمـدی عظیمـي) لەنێوانیانـدا زۆر دیـاربوون ، خـوا پاداشتیان بداتەوەو یادیـان بەخێـربێ .

# ناردنی کاك عەلی دێرەیی بۆ ڕانیە
# بە کاری حیزبیی و گیرانیی و لەسێدارەدانی لەلایەن ڕژێمەوە،
# کوشتنی عومەری برام لە تۆڵەیدا، کە هەواڵی لێدابوو

ئێمە عادەتمان وابوو بەین بەین برایەك یان زیاترمان دەناردەوە ژووریٚ (داخل) بەمەبەستی گەیاندنی هەواڵ و دەنگوباسی خۆمان و، وەرگرتنی هەواڵی ناوەوەش.

ئیدی ئەوەبوو جارێکیان کاك (علي رسول) کە خەڵکی گوندی (دێریٚ)ی دەڤەری پشدەر بووو، پێشمەرگەیەکی زۆر گورج و گۆڵ و دڵسۆز بوو، چووەوە لەوێش چووبووە ماڵی بابم لە ڕانیە، عومەری برام هەواڵی لێدابوو گیرابووو لەسێدارە درابوو، "خوا لێی خۆشبیٚ" و بە شەهیدی وەرگریٚ. ئێمەش کە هەواڵی لەسێدارەدرانی کاك عەلی دێرەییمان بیست و، دوای ئەوەی پاش لێکۆڵینەوە بۆمان ساغ بۆوەو ئیسپات بوو کە عومەری برام بەگرتی داوە، لە (٣/ ٥/ ١٩٨٩)دا وەك شووڕای هێز، بڕیاری تۆڵەستاندن (قصاص)مان لە عومەری برام داو، مەفرەزەیەکمان ناردو کارەکەی جێبەجیٚ کرد، دایك و باب و کەسوکاری کاك عەلییش تارادەیەك دڵیان فەرامۆشیی بۆهات و برینیان سارێژ بوو. شایانی باسیشە ئەوساکەو ئێستاش هەندێك کەس یەکێك لەوشتانەی کە لە بەندەیان بە ڕەخنە دەگرت، ئەو مەسەلەیەی تۆڵە وەرگرتنەوە بوو: ئینسان چۆن دەبیٚ برای خۆی بکوژیٚ؟!

**منیش لە وەڵامدا دەڵێم:**

**یەکەم:** بێگومان بڕیاردان بۆ کوشتنی برای خۆت، شتێکی یەکجار قورسە، بەتایبەت کە عومەری براشم ئەوکاتە تازە دەگەیشتیٚ، چونکە لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٨) بوو، واتە: ئەوکاتە تەمەنی بیست ساڵ بوو! بەڵام بێگومان کاك (علي رسول)یش براو پێشمەرگەمان بوو، بە کاری حیزبییش ناردبوومانەوە، ئەوکاتە ئێمە وەك قیادەو

شـووڕای هێزی حـەمزەش کەسـوکارو خـوێن ئەسـتێنی بـووین، بۆیـە نـەدەگونجا لـەو مەسـەلەیە بێـدەنگ بین.

**دووەم**: ئێمە بڕیارەکەمان وەك ئەنجوومەنی ڕاوێژی هێـزی حەمزە دابوو، بەڵـێ ئەگـەر خـۆم قەناعەتم پێنـەبووایە، ڕەنگە بڕیارەکـە نەدرابایـە، بـەڵام خۆیشـم قەناعـەتم وابـوو کـە ئایـەتی: ﴿... ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ... ﴿٤٥﴾﴾ الـمائدة، واتـە: نـەفس بـە نـەفس و، ئایـەتی: ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَـٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ... ﴿١٧٩﴾﴾، واتە: هەروەها لە تۆڵەسـەندنەوەدا ژیانتـان هەیـە...جێبـەجـێ بکەین.

**سێیەم**: پێم وایە ئەگەر سەروسـینە ساغ بن، ئەو هەڵوێسـتەی بەنـدە هـی ئەوەنیـە بکرێتـە مایـەی عەیبو ڕەخنە، چ بە پێودانگی موسڵمانەتیی و پابەنـدیی بـە شـەریعەتەوە، چ بـە پێـودانگی کوردایەتیـی و نیشـتیمانپەروەریی!

بۆیە ڕەخنە لێـگیرانم بـەو هۆیــەوە، ئـەو دێـڕە شـیعرە عەرەبییــە وەبیردێنێتــەوە، کـە شاعیرێك مەدحی هۆزەکـەی خۆی دەکـاتو دەڵـێ:

لاعيب فيـهم غيـر أَنَّ سـيوفهم بِهِــنَّ فلـول من قِـراع الكتـائب

واتە: هۆزەکەم هیچ عەیبیـان نیــە ئەوەنـدە نـەبێ، کـە شمشـێرەکانیان بـەهۆی جـەنگو شـمشـێر وەشاندنی زۆرەوە، پاچـــاونەوە!

دیارە کەسێك شمشـێرەکەی هێنـدە وەشاندبێو شـەڕی پێکــردبێ، پاچـابێتەوە، مانـای وایە جەنگـاوەری باشو ئازایـە.

بەکورتی: شاعیرەکە ویسـتوویەتی بڵێ: گەلو هۆزەکـەی من، عەیبیــان هەر ئەوەیە کـە جەنگاوەری باشــنو ئــازان.

لە خوای بە بەزەیی داواکارم کـاك (علــي رســول) دێرەیـی بـە شـەهید وەرگرتبــێو لـە (عومـەر باپـیر)ی براشم خۆش بووبـێو، ئـەو ســزادانو تۆڵـە لێوەرگرتنـەوەی، بووبێتــە مایەی سـڕانەوە (کفـارة)ی تاوانەکەی، چونکـە پێغەمبـەری خوا "صـلى الله عليـه وسـلم"

فەرموویەتی: {تبايعوني على أن لا تشركوا بالله شيئاً، ولا تسرقوا ولا تزنوا ولا تقتلوا أولادكم – قرأ الآية التي أخذت على النساء: ﴿...إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ ... ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة – فَمَنْ وفَّى منكم، فأجره على الله، ومن أصاب من ذلك شيئاً، فعوقب به، فهو كفّارة له، ومن أصاب من ذلك شيئاً فستره الله عليه، فهو إلى الله، إن شاء غفر له، وإن شاء عذبه} متفق عليه.

واته: ﴿پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" وەك (عبادة بن الصامت) دەگێڕێتەوە لەکاتی وەرگرتنی پەیمانی یەکەمی لە هاوەڵانی لەلای عەقەبەدا، فەرمووی: پەیمانم پێدەدەن کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خوا، وە دزیی نەکەن، وە زینا نەکەن، وە منداڵەکانتان نەکوژن – ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت: ﴿هەرکات ئافرەتانی بڕوادارن هاتنە لات... ﴾ کە ئایەتی ژمارە (١٢)یە لە سوورەتی (الممتحنة)﴾، ئنجا هەرکامتان پەیمانەکەی جێبەجێ کرد، پاداشتی لەسەر خوایەو هەرکامێکتان گوناهێکی لەوانەکرد، ئەگەر – لە دنیادا – پێی سزادرا، ئەوە مایەی پاکبوونەوەو سڕانەوەی گوناهەکەیەتی، وە هەرکەسێك گوناهێکی لەوانە کردو خوا – لە دنیادا – بۆی پۆشی، ئەوە لە قیامەت عایدی خوایە، ئەگەر ویستی لێیدەبووریّو، ئەگەر ویستیشی سزای دەدات.

### کۆبوونەوەیەك بۆ چاکسازییکردن لە نێو بزووتنەوەداو، هەوڵدان بۆ بە لاڕێدا بردنی:

لە نیوەی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩)دا ئێمە ئەوانەی کە رەخنەو گلەییمان هەبوو لە حاڵ و وەزعی بزووتنەوەو، شێوەی بەڕێوەبرانی کاروبارەکانی، چەند کۆبوونەوەیەکمان بەمەبەستی دۆزینەوەی چارەسەر کردن، ئنجا لەوانە: کۆبوونەوەیەکمان لە سەردەشت کرد، ئەوانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربوون، وەك بێتەوە یادم جگە لە خۆم، ئەوانە بوون:

١- مامۆستا حسن بابکر

٢- کاك مەلا شەریف (شەهید).

٣- مامۆستا عبدالقادری برایەتیی.

٤- كاك مەلا سـەلـمان.

٥- كاك جەمال ئەحمەد شارباژێڕیی (شەهید).

٦- مامۆستا مەلا محەمـەدی رازیی.

٧- كاك جەمال ئەشرەف قارەمانیـی.

٨- كاك مەلا ئەمین/ جهـاز.

٩- كاك مەلا عەلی سەرگەڵوویی (شەهید).

١٠- مامۆستا عبدالرحیم فرج.

١١- مامۆستا كرێكار (نجم الدین فرج).

كە ئەمیان ئەو ساڵە مـاڵی لە(پاكسـتان) بـوو، جاروبـار بـە سـەفەر دەهاتـەوەو سـەردانی ئۆردوگایـەكانی دەكـرد، كـە هێزەكـانی بزووتنـەوەیان تێـدا كۆبووبوونـەوە، بەتایبـەت ئۆردوگاكانی: دزلـی، باراماوا، كامیـاران، دێڵـزە.

شـایانی باسیشـە مـن چ لـەو كۆبوونەوەیـەدا، چ لـە كۆبوونـەوەكانی دیكـەدا، هـەردەم پێداگرییم لەسەر چاكسازیی و نەهێشـتنی كەموكوورِییەكان دەكـرد، بـەڵام لەگـەڵ هـەبوونی پێشنیارو داواكاریی ژمارەیەك لە برایاندا، هەرگیز لەگـەڵ لـێكترازانو مـاڵ جیـایی نـەبووم، كەچی لەو كۆبوونەوەیـەدا بـە زەقیـی بینیمـان كـە مامۆسـتا كرێكـار ـ خـوا دەرووی خێـری لێبكاتەوە، كە ئێستا لە نەرویج گیراوە – دەیەوێ وەزعەكە بە باری لێكترازاندا بەرێ، خۆیشی دانابوو بە بەرپرس، بە حوكمی ئەوەی كە دەتوانـێ لە پاكستانەوە پارەو هاوكـاریی بێنێتـەوە، خەڵكەكـەشمان بەگشـتی هـەتا بلێـی ئاتـاج بـوون! دیـارە منـیشو زۆربـەی هـەرەزۆری بەشداربووانی كۆبوونەوەكەش، بگرە هەموویان جگـە لـە مامۆسـتا عبـدالرحیم فـرج، كـە یەكێك بوو لە كەسە زۆر نیزیكو تایبەتەكانی مامۆسـتا كرێكار! ڕامان لەگەڵ ئـەوەدا نـەبوو، بۆیە بەپێویسـتمان زانی، ڕێ لەو پرۆژە نامۆیـە بگرینو ئەو ڕیسـە بكەینەوە بە خوری!

دیارە مامۆستا كرێكاریش لەو هەڵوێستەی ئێمە نیگەران بوو، لە پاكستانەوە نامەیەكی بە ئەندازەی نامیلكەیەكی لەزەمو زەمكاریی بەندەدا ناردبوو، كە مامۆستا عبدالرحیمو ژمارەیەك لە لایەنگرانی دیكەی مامۆستا كرێكار لە هێزی (حسـن البنّـا)دا دەستاودەستیان پێدەكرد، بەلاّم خەڵكەكە بەهێندیان نەگرت، منیش وەلاّمێكم دایەوە، هیچی دیكەی بەدوا دانەهات!

شایانی باسیشە لەو هەوڵەی چاكسازییەدا، جگە لەوانەی ناوم هێنان، هەركام لەم بەڕێزانەش هاوڕاو پشتگیرمان بوون، بەلاّم خۆیان لە كۆبوونەوەكان دەپاراست:

١- مامۆستا مەلا شێخ محەممەد بەرزنجیی بەرەحمەت بێ
٢- مامۆستا مەلا شێخ صدیق سەرگەتیی، ڕەحمەتیی.
٣- مامۆستا مەلا شێخ عبداللطیف واژەیی، ڕەحمەتیی.
٤- مامۆستا عبدالرحمن نۆڕسی.
٥- مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی.
٦- مامۆستا مەلا ئەبوبكری صدیقی.

## چوونە ئیعتیكافێكی بیست ڕۆژەوە:

هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە كردبووم بە عادەت ـ ئێستاش هەروا – كە ناوە ناوە بچمە (إعتكاف)ەوە، كە بە كوردی (خەڵوەكێشان)ی پێدەڵێن، كە (راغب الأصفهاني) لە پێناسەیدا گوتوویەتی: ﴿العكوف: الإقبال على الشيء وملازمته على سبيل التعظيم له، والإعتكاف في الشرع: هو الإحتباس في المسجد علي سبيل القربة﴾ مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٧٩.

واتە: (عكوف) یانی: ڕووكردنە شتێكو هۆگربوونی بەشێوەی بەمەزنگرتنی، وە ئیعتیكاف لە شەرعدا بریتییە لە مانەوە لە مزگەوتدا، بەمەبەستی لە خوا نزیكبوونەوە.

دیارە لەو سەرو حەدەشدا هەستمان بە فشـارێکی دەروونیـی زۆر دەکـرد، بۆیـە بڕیارمـدا بچـمە ئیعتیکـافێکی بیسـت ڕۆژەوە، لـە ژوورێکـی پەیوەسـت بـە مزگـەوتی (حـاجی ڕەسـوول)ەوەدا، کـە بنکـەی هێزیشـمانی تێـدابوو، هـەروەهاماڵیشـمان هـەر لـە نزیـك مزگەوتەکەوە بوو.

دیارە لە ماوەی ئیعتیکافەکەشمدا، بەس بۆ نوێژە فـەرزەکان کـە بـە کۆمـەڵ دەمـانکردن، دەردەچووم، وە بۆخۆم هەر سـەرگەرمی زیکرو پـاڕانەوەو قورئـان خوێنـدنو بیرکردنـەوەو ڕامـان بووم، ڕۆژانەش تەنیـا چەند دەنکە خورمایـەکم دەخوارد.

ئنجـا وەك مامۆسـتا حەسـەن بابـەکریش لـە (هەورازونشـێو)ەکەیدا باسـیکردوە ـ لاپـەڕە (١٩١، ١٩٢) – ئەوکاتە بەگشتی دەرفەتێکی باشمان بۆ ڕەخسـابوو، بـۆ بەخۆداچـوونەوەو تەزکیـەی نەفسو موتـالاو . . . هتد.

## بیـرەوەرییـەکی خۆشـی مامۆسـتا مەلا عـەلی ئاوەژێیـی :

ئەوکاتەی کە لە ئیعتیکافـدا بـووم، ڕۆژێکیـان کـە دەوری سـەعاتێکی مـابوو بـۆ نوێـژی نیوەڕۆ، گوتیان: ئەوە مامۆستا مەلا عەلی سندۆلاّن ـ کە بە ئەسڵ خەڵکی گوندی ئاوەژێیـە – هاتووەو دەیەوێ بتبینـێ!

منـیش گـوتم: چـونکە لـە ئیعتیکافـدام، بـا سـەعاتێك ئـارام بگـرێ، کـە بـۆ نوێـژێ هاتـمەدەرێ، دەیبینم، بەڵام کە پێیانگوتبوو، (کاك عبدالکریم قادر خدرەسـوور دەڵێ: مـن پێمگوت، ئەویش لە وەڵامەکە قەڵـس بوو گوتی: ئەوە دەرۆمو جارێکی دیکەش چـاوتان بـە چاوم ناکەوێتـەوە!)و لێمـان زویربوو.

منیش پـاش تـەواوبوونی ئیعتیکافەکـەم، لەگـەڵ چـەند برایەکـدا چـووین بـۆ سـەردانی مامۆستا، کە ماڵیان لە نزیك گوندێکی سەردەشت بوو، بە ناوی (باغ)ەوە، ئنجا کە چووین پێمگـوت:

مامۆستا! هاتووین ئاشتت بکەینــەوە، هەرچــەندە نــەدەبوو تــوورِەش بووبــای، ئەگــەر گریــمان گوتباشم: ئێستا بگەڕێوەو دەرفەتم نیـە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿...وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ...﴿٢٨﴾﴾ النــور، واتە: هەروەها ئەگەر پێتان گــوترا: بگەڕێنــەوە! بگەڕێنــەوە، ئەوە زیــاتر مایەی پاکیــیو چاکییتــانە!

بەڵام من تەنیا گوتبــووم: لەبــەر ئیعتیکافەکــەم، ئێســتا نــاتوانمو پــاش ســەعاتێکی دیکــە دەیبینم؟!

ئەویش گوتی: دەزانمو ئایەتەکەشم ئاگا لێیــە، بەڵام بە خوا نــەهاتبان، لەگــەڵتان ئاشــت نەدەبوومــەوە!

## لەدایکبوونی منداڵی چوارەممان (عبدالرحمن):

لە ڕۆژی: (٤/ ٦/ ١٩٨٩)دا خوای بەخشەر منداڵی چوارەمی پێــداین کە (عبدالرحمن)ی کوڕمەو، شایانی باسیشــە نازانم دایکی ڕەحمــەتیی (ڕوخسار خان) سکی چەند مــانگ بــوو، شــەوێکیان لــە خەوندا کوڕمان بووبــوو، ناویشــم لێنــابوو (عبــدالرحمن) دیــارە دوایــیش هــەروابوو، هــەر ئــەوناوەشمان لێنــاو بــەناو (مامۆســتا عبــدالرحمن لۆتــەریی)ی شــەهیدمان کــردەوە، کــە لەســــەر گــردی ڕەمکــان لــە تەنیشــت منــەوە کــوژرا، "خــوا بــە شــەهیدی وەرگرتبــێ".

## هاتنــی بابــمو دایکــم (خــوا لێیــان خۆشــبێ)و خوشــكو برایەکــانم بــۆ ســەردەشــت:

لە کەشی هــاوینی: (١٩٨٩)دا "وەك كاك عبدالواحــدی بــرام دەڵــێ" دوو ســێ مــانگ پاش کوژرانی عومــەری برام: بابمو دایکــمو خوشــكو برایــەکانم، بێجگــە لــە (ئایشــە)ی خوشکم کە لە ڕانیە لە ماڵی مێــردی بــوو، هــەموویان هــاتن بــۆ سەردەشــت، واتــە: بــەپێی ڕیزبەنــدیی تەمەنیــان: مەریــەم، عبدالواحــد، أبوبکــر، إبــراهیم، قــدم خــیر، ئیــدی لــە

سەردەشت لە نزیك خۆمانەوە خانوویکمان بۆ گرتن، دوایش کە ژنمان بۆ کاك عبدالواحدی برام هێنا، لەگەڵ ماڵی بابم هەر پێکەوە بوون.

## مام ڕەحیمە شەل، برادەرو ڕەفیقی دێرینی بابم‌و، ڕۆڵی مەردانەی کاك سیروان (محمد) سلێمانەیی لە خزمەتکردنیدا:

ئەوکاتەی کە لە سەردەشت بووین، لە یەکێك لە ژوورەکانی مزگەوتی حاجی ڕەسووڵدا، پیرەمێردێکی نەخۆش‌و کەنەفت دەژیا، سەرەتا نەمانزانی کێیە؟ بەڵام ڕۆژێك هەر لەخۆوە هاتە دڵم: تۆ بڵێی ئەو پیاوە پیرو شەل‌و کەنەفتە بێکەس‌وکارە، ئەو (مام ڕەحیمە شەل)ە نەبێ کە بابم زۆری باس دەکات؟ کە لە تەمەنی لاویێتیدا ڕەفیق‌و دۆستێکی نزیکی بووە، خەڵکی کوردستانی ئێران بووە، بەڵام کە بابم پەڕیوەتە دەڤەری بیتوێن‌و بەردەربەند بووە، لەیەك دابڕاون؟!

ئیدی ئەوەبوو ڕۆژێك بە وردیی لەگەڵی دانیشتم‌و، سەرگوزشتەی ژیانی خۆیم پێگێڕایەوە، سەرەنجام بۆم دەرکەوت، کە ئەو پیرەمێردە بێکەسە کەنەفتە، هەر هەمان (ڕەحیمە شەل)ەکەی برادەرو ڕەفیقی چل پەنجا ساڵ لەمەوبەری بابمە! بۆیەش پێشینان گوتوویانە: کێو بەکێو ناکەوێ، بەڵام ئادەمی بە ئادەمی دەکەوێ!

دیارە پاشان بە بابمم ناساندەوەو هەتا مام ڕەحیم کۆچی دوایی کرد، چەند جارێك لەگەڵ بابم دانیشتن‌و بیرەوەرییەکانی ڕۆژگاری لاویێتیی خۆیان دەگێڕانەوە، چونکە تەمەنێکی زۆریان پێکەوە بەڕێکردبوو.

ئنجا ئەوەی لێرەدا مەبەستی سەرەکیی (بیت القصید)ی باسکردنی مام ڕەحیمە شەل بوو، بریتییە لە باسکردنی ڕۆڵی جوامێرانەو بۆ خوا سوڵحاوانەی، یەکێك لە پێشمەرگەکانی هێزی حەمزە بەناوی: کاك (سیروان) کە ناوی خۆی کاك (محمد)ەو خەڵکی شاری سلێمانی بووو ئێستاش لەژیاندایە، کە بەڕاستی ئەو کاك سیروانە لە

مەسەلەی خزمەتكردنی مام ڕەحیمدا، ژمارەی پێوانەیی (الرقم القیاسي) لە خاكێتیی و بێنەفسیی و دڵسۆزیی و ماندوونەبوون و كول نەبووندا، شكاندبوو، چونكە:

**یەكەم:** مام ڕەحیم وا دیاربوو هیچ كەس و خزمێكی نەبوو، یان ئێمە نەمانبینین، واتە: كاك سیروان هیچ چاوەڕوانییەكی ـ جگە لە خوای بە بەزەیی ـ لە هیچ كەس نەبوو، لە بەرانبەر خزمەتكردنەكەیدا!

**دووەم:** كاك سیروان هەموو جۆرە خزمەتێكی مام ڕەحیمی دەكرد، چونكە ماوەیەكی زۆر زەلیلی سەرجێگا بوو، دەبووایە پاكیش كرابایەوە، وێڕای خواردن و خواردنەوە پێدان، شۆردن، جل و بەرگ بۆ شۆرین و گۆڕین!

**سێیەم:** هەرگیز لە كاك سیروانم نەدەبیست كە پرتە و بۆڵە و نارەزاییەك دەربڕێ، یان تەنانەت باسی كار و خزمەتەكەی خۆشی بكات!

خوا لە مام ڕەحیمە شەل خۆشبێ و جێگای بەهەشت بێت، وە بە باشترین شێوەش پاداشتی شایستەی كاك سیروان سلێمانەیی بداتەوە.

بێگومانیشم كە كۆمەڵگا بە كەسانی دڵسۆز و خزمەتگوزار و بێنەفس و هەوای وەك كاك سیروان بەرەكەتدار و بەختەوەر دەبێ، وە شایستەی بەزەیی و بەخششی خوای بەخشندەی میهرەبان دەبێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿مَن لا يرحَمُ لا يُرحَمُ﴾ البخاري: ٥٩٩٧ و مسلم: ٢٣١٨، واتە: هەر كەسێك بەزەیی نەبێ، بەرانبەر بە خەڵك، بەزەیی بەرانبەر نانوێنرێ، لەلایەن خواوە. كەواتە: بە هەبوونی كەسانی بەڕەحم و خاوەن پەرۆش لە كۆمەڵگادا، كۆمەڵگا شایستەی بەزەیی خوا دەبێ.

## ڕووداوێکی سەیر لە مزگەوتی حاجی ڕەسووڵدا :

ئەو ڕووداوە کە مامۆستا حەسەن بابەکریش لە (هەورازو نشێو)ەکەی – لاپەڕە (١٩٧ – ١٩٨) دا ـ باسی کردوە، ئاوابوو :

ڕۆژێکیان فەقێیەکانی مامۆستا مەلا سەعید سۆبەی حوجرەکەیان کە دەرگای بەسەر مزگەوتەوە بوو، پڕکردبوو لە دار قەلاشکەریی و سۆبە سوورسوور بووبۆوە، هاتبوون بۆ نوێژێ، کە نوێژی شێوان بوو، منیش هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە عادەتم وابووە، کە مەگەر لە حاڵەتێکی نائاساییدا بین، ئەگەرنا نوێژەکانم بەپێی توانا بەڕێو جێو بەتەواویی دەکەمو قورئانی زۆریان تێدا دەخوێنم، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : ﴿ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ) رواه الترمذي: ٤١٣، وقال: حديثٌ حسن.

واتە : یەکەمین شت کە بەندە لە کردەوەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەری لەگەڵدا دەکرێ : نوێژەکەیەتی ، ئنجا ئەگەر نوێژەکەی باش بوو، سەرفرازو سەرکەوتوەو ئەگەریش خراپ بوو، پەشێمانو زیانبارە.

ئیدی ئەوەبوو، لە نوێژەکەمدا، سوورەتی (البروج)م دەخوێندو، پێموایە هەر لە ڕکاتی یەکەمەوە کە گەیشتمە : ﴿ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ۝٥ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ۝٦ ﴾، واتە : ئاگری خاوەن بڵێسە، لەکاتێکدا کە ئەوان لەسەر قەراغەکەی دانیشتبوون. (واتە : کافرە ستەمکارەکان لەسەر لێوارو کەناری چاڵە ئاگرەکان دانیشتبوونو، تەماشای ئیماندارە ستەمدیدەکانیان دەکرد، کە دەسووتێنران) بەڵێ کە گەیشتمە ئەوێ، سۆبەکە لەکڵپەی داو گڕو دووکەڵێکی زۆری لێهاتەدەر، دیارە برایانو فەقێیەکانیش چاوەڕێیان دەکرد نوێژەکەم ببڕم، یان لانیکەم کورتی بکەمەوەو لەو چڕە دووکەڵە دەربازیان ببێ، کە مزگەوتەکەی پڕکردبوو، بەلام من نوێژەکەم بە تێرو تەواویی کرد، سوورەتەکەشم بە هەردووك ڕکاتەکان خوێند، دیارە لە هەموو لایەکیشەوە بووبوو بە کۆخەکۆخ! ئیدی هەرکە سەلامم دایەوە، هەر بابابوو بەپەلە پرووزە ڕایدەکردە دەرێ!

هەڵبەتـە کە ئێسـتا شارەزاییم لە شەریعەتدا زیاتر بووە، ئەو هەڵوێسـتەی ئەوکاتـەمم لـەلا هەڵەیە، دەبووایە نوێژەکەم کورت کردبایەوە، بگرە ئەگەر پێویسـت بکات، دروستەو جاری وایە فەرزیـش دەبێ، کە نوێژەکـــە ببڕێ!

بەڵام ئەوکاتە ئەوەندەم لێزانیـوەو قەناعـەتم چـۆن بـووە وام ڕەفتـار کـردوە، هەمیشـەش تێگەیشـتن‌و وێنـاکردن، بناغـەی کـردارو هەڵسـوکەوتە (الفهـم والتصـور أسـاس العمـل التصرف).

# چەند بیرەوەرییەكی نێوان هاوینی

## ١٩٨٩و ١٩٩١/٣/٥

ئەو قۆناغە كە وێستگەكانی: (٣٥ – ٤٤)ی تەمەنی پێشمەرگایەتیی پێش ڕاپەڕینی جەماوەریی ساڵی (١٩٩١)یم پێكدێنێ، كە دوا قۆناغی ئاوارەیی و كۆچ و كۆچباری هێزی پێشمەرگەی كوردستان بوو بەگشتی، بەپێویستی دەزانم هەڵوەستە لە ئاست هەندێك لە ڕووداوو پێشهاتەكانیدا بكەم:

### لە كەشی هاوینی: (١٩٨٩)دا دەستنیشانكردنی دۆڵی (خدراوێ)ی نزیك میراوێ و، دواتر گواستنەوەی بنكەی هێزی حەمزەو ماڵەكانمان بۆ ئەوێ:

ئێمە كە هەر لە سەرەتاوە قەناعەتمان بە دانیشتن لە خاكی ئێراندا نەبوو، بەڵام بارودۆخی سیاسیی ئێمەشی وەك سەرجەم لایەنە سیاسییەكانی دیكە، ناچاركردبوو وا بكەین، هەمیشە لەبیری ئەوەدابووین بنكەیەك لە سنووری خاكی عێراقدا دابنێین، بۆیە هەر لە مانگی: (٥/ ١٩٨٩)دا بنكەیەكمان لە (قووڵە هەرمێ)ی نزیك گوندی (شێنێ) دامەزراند، كە دەكەوتە نێو سنووری خاكی عێراقەوە، دیارە پێشتر ـ پاش بوونی بەندە بە ئەندامی مەكتەبی سیاسیی – لەبەر سەرقاڵیی زۆری بەندە بە جەولەو گەڕان بەسەر هێزەكانی دیكەو ئۆردوگاكانداو پێشوازیی لە میوانان و كۆبوونەوەو وتوویژ... هتد، كە نەم دەپەرژایە سەر كاروباری هێزو وردەكارییەكانی بنكەو پێشمەرگە، داوام لە برایان كرد، كە لەنێو خۆیاندا یەكێكی دیكە بكەنە بەرپرسی هێز، منیش وەك سەرپەرشتیارو مشوورخۆر هەر لەخزمەتیاندا بم، ئیدی ئەوەبوو لەمزگەوتی حاجی ڕەسووڵدا كۆبوونەوەیەكی گشتیی هێز كرا، كاك مەلا شریف حسین (شەهید) بەفەرماندەی هێز هەڵبژێررا، بەڵام دواتر پێش

كردنەوەی بنكەی (قووڵـە هەرمێ) كۆبوونەوەیەكی دیكەمـان كرد، مامۆستا حەسەن بابەكر، كرایە فەرمانـدەی هێـز، ڕاستەوخۆش سـەرپەرشـتیی بنكەكەی (قووڵە هەرمێ)ی دەكـرد.

شایانی باسیشـە ئـەو بنكەیـەی (قووڵـە هـەرمێ)مان پـاش ئـەوە دامەزرانـد، كـە خـۆم‌و شـاندێك ڕاستەوخۆ سـەردانی هـەركام لـە ( یەكێتیـی نیشـتیمانیی)و (حیزبـی شـیوعی)و (حیزبـی سۆشیالیسـت)مان كردو، لە نزیكـەوە لێمـان حـاڵی كـردن، كـە ئێمـەش وەك هێزێكـی كوردسـتانیی تـەباو هاوكـار، دێینـە ئـەو دەڤـەرە، بۆیـەش ئێسـتا ئـەم ڕاسـتییە دەخەمـەڕوو، چونكە بەهۆی ئەو بنكەیـەو جـموجوڵ‌و چالاكییەكانـمانەوە، لەو ناوچەیەدا، دواتر لەگەڵ یەكێتیـدا كێشـەمان بۆ دروست بوو، هەتا گەیشـتە خودی مام جەلال‌و مامۆستا مەلا عوسمانیش " خوا لێی خۆشبـێ "، وەك دواتر باسی دەكەین.

ئنجا پێویسـتە ئەوەش بگوترێ، كە گواستنەوەی بنكەی هێـزی حـەمزەو، پاشـان هێـزی ئازادیی‌و ماڵەكانیشمان بۆ (خـدراوێ)و نیشتەجێبوونـمان لـەوێ، هـەروەها دروسـتكردنی مزگـەوت‌و ... هتد، هەرچـەندە لە هاویندا دەستی پێكـرد، بـەڵام هـەتا پـاییزێكی درەنگـی خایـاند.

دیـارە بەر لە چوونی ئێمـە بۆ دۆڵـی (خدراوێ) ئاوەدانیی لێنـەبووو، گوندی (خدراوێ) ئێمـە بنیاتـمان نا، كە دوایی خـدراوێ قەڵـەباڵغ بـوو، دەوری سـەد (١٠٠) مـاڵی خۆمـانی لێبـوو.

# سەردانكردنمان بۆ لای بەڕێز مام جەلال‌و یەكەمین دیدارمان پێكەوە

لە كەشی هاوینی: (١٩٨٩)دا بەبۆنەی گەڕانەوەی لە هەندەران‌و بەمەبەستی یەكدی ناسین‌و پێك ئاشنابوون، وەك شاندێكی بزووتنەوە، سەردانی مام جەلالمان كرد لە قاسمەڕەش، كە ئەوكاتە سەركردایەتییان لەوێبوو.

**شاندەكەی ئێمە جگە لە خۆم، ئەم بەڕێزانە بوون:**

١ـ مامۆستا مەلا مەحموودی ئازادیی.

٢ـ كاك مەلا سەلمان.

٣ـ مامۆستا حەسەن بابەكر.

٤ـ مامۆستا مەلا ڕەسولی زەنگڵ.

هەڵبەتە ئێمە بە مەوعیدی پێشوەخت چووبووین، سەرەتا فەرموویان لێكردین بۆ ژوورێكی تۆزێك فراوان‌و لاكێشەیی، كە پێدەچێ شوێنی پێشوازیی میوانان بووبێ، ئنجا كە چووینە ژوور، بینیمان ژمارەیەك (مەلا)ش دانیشتوون، كە بە مەزەندە "وەك كاك مەلا سەلمانیش دەڵێ" بیست (٢٠) ئەگەر زیاتر نەبووبن كەمتر نەبوون، كە لە نێوانیاندا هەركام لەوانە هەبوون:

١ـ مامۆستا مەلا ئەحمەدی وەرتی، كە ئەوكاتە بەوە ناسرابوو ماركسییە!

٢ـ كاك مەلا نەجم.

٣ـ مامۆستا مەلا حوسێن شارەستێنی.

٤ـ مامۆستا مەلا قادری كوڕی مامۆستا مەلا ڕەسووڵی شارەستێنیی ڕەحمەتیی.

### گێچەڵکردنی مەلا ئەحمەدی وەرتێ، بە بەندەو دروستبوونی مشتومڕ :

پاش ئەوەی دانیشتین و بەخێرهێنان و چاك و چۆنی كرا، مامۆستا مەلا ئەحمەد ـ كە من حەزم بە چارەی نەدەكرد، چونكە ناوی بە بێدین (ملحد) ڕۆیشتبوو وە توانج و تەشەریشی لە ئیسلام دەدان ـ یەكسەر ڕووی كردە من و، دەستی بە گلەیی كرد، كە بۆچی دیار نین و سەردانی ناكەین؟!

منیش خواخوام بوو لەگەڵی تێكنەگیرێم، چونكە ئامانجەكەمان سەردان و بینینی مام جەلال بوو، نەك شەڕە قسە لەگەڵ مەلا ئەحمەددا، كە پێشتر بینیبووم و دەمناسی، ئەوكاتە ئەو مامۆستایانەی لەگەڵ یەكێتی بوون، لەنێو خەڵكدا بەگشتی نیشانەی پرسیاریان لەسەر بوو، بەتایبەت لەنێو ئێمەشدا، واباوبوو كە یەكی مانگانە حەفتاو پێنج (٧٥) دینار وەردەگرن، هەربۆیەش كەسانێك پێیاندەگوتن: مەلای حەفتاو پێنجیی!

بۆیە بەكورتی و بە نابەدڵییەوە پێمگوت: مامۆستا! دیارە دەرفەتم نەبووەو كاری پێویستترم هەبووە!

ئەویش هەر لەسەری چووو گوتی: ئاخر دەبێ خەڵك لە ئێمەی مەلاوە، فێری برایەتیی و نیزیكیی و هاموشۆی یەكدی ببن.

منیش گوتم: ئەوە ڕاستە، ئەگەر مامۆستایان ڕاست و ساغ بن و لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەرو ئیسلامدا ڕاست بكەن، دەبێ وابن، بەڵام ئێمەش كەموكووڕیمان زۆرەو لە ئاستی پێویستدا نین!

ئەویش گوتی: نەخێر وانیەو هەرگیز (مەلا) خراپ نابێ، مەلا هەموویان چاكن!

منیش گوتم: ئاخر چۆن وایە! خۆ مەلا مەلائیكەت نین، بەڵكو ئەوانیش چاك و خراپیان هەیە، ئەدی ئەوە نیە خوا لە قورئاندا وێڕای زانایانی باش و ساغ، كە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿... يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ...﴾ ﴿١١﴾

المجادلة، واتە: خـوا ئەوانـەتان كـە ئیمانیـان هێنــاوە بەرزدەكاتـەوە، ئەوانـەی زانیارییـان پێـدراوە، بە چـەندان پلــە – بـەرزیان دەكاتـەوە ـ، بەهـەمان شـێوەش لەبــارەی زانایـــانی خراپو دەغەڵـەوە، فەرموویـەتی: ﴿...فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ ...﴿١٧٦﴾﴾ الأعراف، واتە: وێنـەی وەك وێنـەی ســەگ وایــە! وە فەرموویــەتی: ﴿... كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ ...﴿٥﴾﴾ الجمعة، واتە: وەك كەر وایە، كە بـارە كتێبـی هەڵگرتـوە؟!

ئەویش بە تووڕەییەكەوە دیسـان دووبارەی كردەوەو گوتـی: نەخێـر هیچ مەلایەك خـراپ نیـە، ئەوەی خـراپ بێ مەلا نیــە!

منیش گوتم: ئاخر بێقەزابی! چـۆن مـەلای خـراپ نیـە، ئـەدی نابینـــی كـە (سـەددام) كۆبوونەوە بە مەلایان دەكـاتو فـەتوای هەڵـەیان پێـدەدات، چـۆن هـۆڵی كۆبوونەوەكـە لـە مەندیـلان (مێـزەران) سـپی دەچێ، دەڵێـی بێسـتانی پەمۆیـە؟!

گوتی: ئاخـر ئەوانە مـەلا نین!

گوتم: واللە لە تۆ زیاتر خۆیان بە مەلا دەزانن، بەڵام بەڵـێ مەلاو زانای ڕاستو ساغ نین، چونكە مەلاو پێشـەوای ڕەسـەن، هەرگیز ئامادە نیـە، ببێتە پاشـكۆی ڕژێمێك یان حیزبێكـی بێدینو سـتەمكار، چـونكە كەسـێك بەڕاسـتی میراتگـرو جێگـری پێغـەمبەران (علیـهم الصـلاة والسلام) بـێ، وەك پێغـەمبەرمـان فەرموویەتی: ﴿...وإن العلمـاء ورثة الأنبياء وإن الأنبيـاء، لـم يُوَرِّثـوا دينارًا ولا درهمًا، وإنّما وَرّثـوا العلـم، فمـن أخـذه أخـذ بحـظ وافـر﴾ أبـوداود: ٣٦٤١،و التــرمذي: ٢٦٨٢، واتـە: هـەروەها بێگومـان زانایـان میراتگرانـی پێغـەمبەرانن، پێغەمبـەرانیش دینارو درەم (زێـڕ وزیو)یـان، بـەمیرات جێنەهێشـتوە، بـەڵكو زانیارییـان كردۆتە میرات، ئنجا هەركەسـێك وەریبگرێ، بەشێكی گەورەی پێبڕاوە.

بەڵێ كەسی ئاوا، بەرنامەو ڕێبازەكەی، عیزەتـی پێدەبەخشـێو پاشـكۆیەتیی لـە خـۆی ناوەشـێنتـەوە!

ئەویش بە هەڵچوونێكی زۆرەوە بە دەنگی بەرز گـوتی: ئەوە تۆ مەبەستت ئێمەیە، ئێمە بـە پاشـكۆو كلك دەزانـی!

منیش گوتم: من بەگشـتی قسـەم كردووەو ناوی كەسـم نەهێناوە، بـەڵام وادیـارە تـۆ ئـەو پەندەت بەسـەردا چەسـپیوە كە دەڵـێ: (مل بەقوڕ بۆخۆی لـەخۆی دەگـات) وادیـارە وای، بۆیە قسـەكانم دەبەیە سـەرخۆت!

ئەویش ئەوجارە ویستی بە مەلایەكانی دیكـە گەلەكۆمەكێ لە دژم دروست بكـات، بۆیـە ڕوویكردە مەلایەكـانو گوتی: مەلاینـە! ئەو هەمووتان بە پاشـكۆ دەزانێ!

منیش گوتم: ڕەفیقان بۆخۆت زۆر مەكە! مـن باسـی كەسـم نـەكردووەو بەگشـتی قسـەم كـردوە!

ئیدی لەوكاتە مامۆسـتا مەلا حوسێن شـارستێنیی هەڵسـاو گوتی:

ئەشـهەدوبیللا مەلا ئەحمـەد! تۆ شـەڕ بە مامۆستا عـەلی دەفرۆشی، ئەگەرنا ئـەو بەگشـتی قسەی كردووەو دەڵێ: مەلاش وەك هەر خەڵكێكی دیكـە، چـاكو خراپیـان هەیـەو ڕاسـتیش دەكـات.

ئنجـا مەلایەكی دیكەش كە بەتەمەن بوو، ڕیشێكی سـپیی هەبوو، هەڵساو گوتی: ئـەرێ ئەوە چییـە! مەجلیسەكەتان كردۆتە هی خۆتـان!! ئاماژەی بۆ هـەردووكمان كـردو گـوتی: من نە لەگـەڵ تۆم، نە لەگـەڵ تۆشم!

منیش گوتم: بۆچی لەگـەڵ هـیچ كامـمان نـی؟ كـێ هـەق دەڵـێ لەگـەڵی بـە، ئەگـەرنا فـەرموودەی خـوات بەسـەردا دەچەسـپێ: ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ...﴿١٤٣﴾ ﴾ النسـاء، واتە: لەو نێوانەدا لەرەلەریـانە، نـە لەگـەڵ ئەوانـەنو نـە لەگـەڵ ئەوانەشـن....

ئنجا مەلا ئەحمـەد زیاتر هەڵچووو گوتـی: هەركەس بـە مـن بڵـێ پاشـكۆ، دەیخەمـە ژێـر پێمـەوە!

منیش بەشـێنەیی گوتم: قسـەی ناشیرین بە هـەموو کەس دەکرێ...

کاك مەلا سـەلـمانیش هەر هەڵسـایە سەر پێو گوتی: ئەوە دیارە جـوون دەرێ! {واتـە: جنێـو دەڵـێ}.

ئیـدی ڕوویکـردە مـنو – وەك مۆڵـەت وەرگـرتن ـ گـوتی: هەڵسـم بـە مەنـدیل (مێـزەر)ەکەی ڕایکێشـمە دەرێ؟!

گوتم: نا نا کاك مەلا سـەلـمان، شتی وا نەکەی، خۆ ئێمـە بۆ شـەڕ نەهاتووین!

ئیدی لە مەجلیسەکەدا بوو بە غەڵبـەغەڵب، وادیاربوو هەواڵیان بە مـام جـەلال دابـوو کـە مشـتومڕێکی وابووە، بۆیە پاش کەمێـك جەنابی مام جەلال وەژوورکەوت، یەکسەر سـەرەتا لەگـەڵ منــدا تۆقــەو بـەخێرهێنانێکی گـەرمی کـرد، پاشـان لەگـەڵ ئەنـدامانی دیکـەی شـاندەکەمانو مەلایەکانو، دوای ئەوەش ئیـدی لاپەڕەی گێچەڵپێکردنەکـەی مەلا ئەحمـەدی وەرتـێ، هەڵدرایەوەو کۆتـایی پێهـات.

## دەسـتپێکردنـی قسـەو باس لەگـەڵ جەنـابی مـام جەلالـدا:

پاش ئەوەی مـام جەلال هاتــە ژوورو بـەخێرهاتنی گـەرمی هەموولایـەکی کـرد، ڕووی کردە مـنو گوتی: ئەرێ نانخواردن پێش قسـان بخەین، یان قسـان پێش بخەیـن؟!

منیش گوتم: زۆرکەس کە تێربوو خەوی دێ، بە سکی بەتاڵ باشتر قسە دەکرێن، تـۆش چۆنت پێ باشــە با وابێ!

ئەویش گوتی: قسەی تۆ ڕاسـتە، بەڵام برسـیەتییش خراپـە، قازییش ئەگەر برسـیی بێ، دروسـت نیە دادوەریی و قـەزاوەت بکات، کاکە با نانەکەمان بخۆیـن!

ئیـدی سفرە ڕاخراو دەست بە نان خواردن کرا، مام جەلال وەك عادەتی خۆی لەسەر نان خـواردنیش جاروبـار دەیــدواندینو قسـەیەکی خۆشـی دەکـرد، ڕووی کـردە یـەکێك لـە مەلایەکانو گوتی: ئەوە بۆ مەندیلت لەسـەر نییـەو، هەر جـەمەدانەت لەسـەر نـاوە، مــەلا نابێ نیشـانەی خۆی پێـوەبـێ؟

هەروەها ڕووی لە یەكێكی دیكەیان كردو گوتی: ئەو مەندیلە گچكە چییە لەسەرت ناوە! مەندیلێكی گەورە لەسەر بنێ!

هەروەها مام جەلال مەجلیسی گەرم كرد، بە باسكردنی هەندێك زانیاری لەبارەی هەندێك بنەماڵەی شێخو مەلای دیارو بەناوبانگی كوردستانەوە، دیاربوو زانیاریو شارەزایی باشی لەوبارەوە هەبوو.

## كۆبوونەوەی فەرمیی لەگەڵ جەنابی مام جەلالدا:

پاش نانخواردنو چایی خواردنەوە، مام جەلال مۆڵەتی لە مەلایەكان وەرگرتو ڕووی كردە ئێمەو گوتی: بابچین كۆبوونەوەكەمان بكەین!

دیارە مام جەلال پیاوێكی كراوەو ئاوەدانو ڕێزگرو گەشو قسەخۆشە، بۆیە هەركە چووینە ئەو ژوورە تایبەتەوە، كە بۆ كۆبوونەوەكەمان دانرابوو، ئەو تەنیا خۆیو كاك (د. فوئاد مەعصوم) بوون، ئێمەش شاندەكەمان هەموومان بووین، مام جەلال سەرینێكی لێ بوو، لەسەر كۆشی خۆیدانا و خۆی خستە سەریو، یەكسەر پاش دووبارە بەخێرهێنانو خۆشحاڵیی دەربڕین بە دیتنمان، دەستی بە قسان كردو باسی زۆر شتی كرد، ئەوانەی لەبیرم ماونو ئەوكاتە سەرنجیان ڕاكێشام، دواتر منیش لە نۆرەی خۆمدا ـ كە سەرۆكی شاندەكەمان بووم – قسەم لەسەركردن، ئەمانە بوون:

١- ئێمە وەك یەكێتیی نیشتیمانیی هەردەم ویستوومانە بیروڕا ئازادبێ، هەموو لایەك پێكەوە تەبابین.

٢- ئێمە بوونی ئێوەش وەك ﴿جوولانەوەی موسڵمانان﴾ لە خەباتی ڕزگاریخوازیماندا بەپێویست دەزانین.

٣- هەموو لایەك ئامانجمان یەكەو لە خەباتی نەتەوایەتیماندا یەكدەگرینەوەو پێویستە پێكەوە هاوكار بین.

دوای ئەوەی مام جەلال قسەکانی تەواوکردن ـ کە تەنیا ئەویش قسەی کردنو نایەتەوە یادم کاك د. فوئاد قسەی کردبێ، هەروەك لەلایەن ئێمەشەوە جگە لە قسەی ئاسایی، بەس من قسەم کردن ـ، منیش دەستم بە قسەکردو گوتم:

١- ئێمەش هەر بەو مەبەستە هاتووین کە پەیوەندییەکانمان وەك بزووتنەوەو یەکێتی بەهێزتربنو باشتر پێك ئاشنا بین.

٢- هەروەها ئێمەش خزمەتکردن بە گەلو نیشتیمانی خۆمانو بەرگریی لێکردنیان، بە ئەرکێکی شەرعیی پێویست دەزانین.

٣- بەڵام جەنابی مام جەلال! وادیارە ناوی ئێمەت باش ڕەوان نەکردوە، ئێمە ناومان (جوولانەوەی مسولّمانان) نیەو ناومان (بزووتنەوەی ئیسلامیی)یەو ئەگەر (جوولانەوە)ش بین (جوولانەوە)ین نەك (جوولانەوە) ـ واتە بە لامی قەڵەو ـ ئنجا بۆیەش دەڵێم: ئێمە (جوولانەوەی مسولّمانان) نین، چونکە ئەو ناوە بۆ ئێوەومانان خراپە، لە بەرانبەر (جوولانەوەی موسڵمانان)دا (جوولانەوەی کافران) هەیە!

دیارە مام جەلال بەم قسانەم نارەحەت بووو کەوتە هەڵچوون ـ کە ئێستا ڕەخنەم لە خۆم هەیە، لەوبارەوەو قسەکانم زەقو ڕەق بوون – بەڵام جاریێ هەرخۆی مەرزەم کردبوو، هەتا هاتمە سەر باسی مەسەلەی نەتەوایەتییو گوتم:

٤- ئێمە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، مەسەلەی نەتەوایەتییش بە دوو شێوە دەبینین:

**یەك:** ئەگەر وەك هەستو نەستێکی خوارسك (فطري) بەرانبەر بە گەلو نیشتیمان، تەماشای بکەینو، وەك ئەوە کە ولاّتو گەلی خۆمان خۆشبوێتو، هەوڵبدەین ئازادو سەربەست بن، ئەوە شتێکی ڕەوایە.

**دوو:** بەڵام ئەگەر بکرێ بە ئیدۆلۆژییو وەك ئاینو بەرنامەی ژیان سەیربکرێ...

ئیدی لێرەدا مام جەلال قسەکەی پێبڕیمو بە هەڵچوونێکەوە گوتی:

نەخێر وانیە، بیری نەتەوایەتی پێچەوانەی ئیسلام نیەو ئێوە بەهەڵەداچوون... هتد، ماوەیەك لەو قسانەی کردن!

منیش لێیگەڕام هەتا قسەکانی تەواوکردن و دوایی بە شێنەیی گوتم: مام جەلال! جەنابت سەبرت نەگرت تاکو قسەکانم تەواو دەکەم، ئەگەرنا ئەو قسانەت هەموو لە کۆڵ دەبوونەوەو، پێویستی نەدەکرد بیانکەی!

منیش دەڵێم: دەبێ خزمەتی خەڵك و وڵاتی خۆمان بکەین و خۆشمانبوێن و بیانپارێزین، ئەوە ئەرکێکی ئیسلامییە، بەڵام من دەڵێم: ناگونجێ کوردایەتیی بکرێتە ئیدۆلۆژیی و بەرنامەی ژیان، چونکە (کوردبوون)ی من هیچم فێرناکات، ئەگەرنا ئەوانەی ئێستا جاشی ڕژێم و خزمەتی ڕژێمی بەعس دەکەن، ئەوانیش وەك من و تۆ پۆشاکی کوردییان لەبەرەو بە کوردییش قسە دەکەن، ئنجا ئەگەر (کوردبوون) فیکرەو بەرنامە بووایە، نەدەبوو هیچ کوردێك چەکی ڕژێمی پێ بێ دژی گەل و نیشتیمانەکەی.

دواییش باسی کتێبی (سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم)م بۆ کردو، گوتم: بەکورتی کوردایەتیی بۆخۆی بەرێدا ناڕوات و ئیدۆلۆژیی و بەرنامەو ڕێباز نیە، هەر دەبێ بخرێتە سەر سکەو ڕەوڕەوەیەك، ئنجا ئێمە کە گەلێکی مسوڵمانین، دەبێ خەباتی ڕزگاریخوازیی و نەتەوایەتییمان بخەینە سەر ڕەوڕەوەی ئیسلام، نەك فیکرەو بەرنامەیەکی دیکەی نامۆ... .

ئیدی کە ئەو قسانەم کردن، مام جەلال کە پێشتر هەڵچووبوو، چاویلکەکەی بەتووڕەیی دانابوو، ئەوجار تۆزێك ئارام بووەو گوتی: ڕاستە منیش دەڵێم خەباتی نەتەوایەتییمان پێویستی بە بەرنامەو ئیدۆلۆژییەك دەکات و ... هتد، سەرەنجام قسەکانمان لەیەك نزیك کەوتنەوە، پاش کاتژمێرێك لەو قسەو باسانە کۆبوونەوەکەمان لە کەش و هەوایەکی ئیجابییدا کۆتایی پێهێنا. هەر لەو یەکەم دیدارەشماندا نوسخەیەك لە کتێبی (کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟)م دا بە مام جەلال.

لە کاتی وێنەگرتنیشندا ـ کاك (طە حاجی ظاهر) کامێرایەکی پێبوو ـ سەرەتا مام جەلال و کاك دکتۆر فوئاد لەولاولامان و ئێمە لەنێوە ڕاستدا، وەستاین و مام جەلالیش گوتی: دکتۆر فوئاد! وەرە با بیانخەینە نێوان خۆمانەوەو، ئەمسەرو ئەوسەریان لێبگرین!

ئنجا بۆ جاری دووەم وێنەکـەمان بە شێوەیەکی دیکــە گرت، ئێمـــە کەوتینـە ئـەملاولاو کاك (طــە حاجـی ظـاهر)یش گوتی: مام جەلال! ئەم جارە مامۆستایان ئێوەیان لەنێوخـــۆوە گـرت! کـە دیـارە ئەوانـە هەموویـــان قســەی خـۆش‌و ســوعبەت بـوون، بــەلاّم مـەغزای سـیاسـییشـیان هەبوو!

پاشان وەك چۆن بە گەرمیـی پێشوازیی کرابووین، بە گەرم‌و گوڕییش بەڕێیـان کـردین‌و، گەڕاینـەوە بۆ شاری سەردەشت، کە جاریَ خانووی بارەگای هێـزو ماڵـەکان لە(خـدراویَ) تەواو نەبووبوون‌و نەمانگواسـتبۆوەو هەر هاموشـــۆمان دەکرد.

## گواســتنــەوەی هـێـزو پاشــان ماڵەکــانمــان بۆ خــدراویَ:

وەك بێتـەوە یادم ئێمـە ســەرەتا لە (خدراویَ) مزگەوتـمان دروست کرد، پاشان بارەگای هێـــزو دواتریش خانووی ماڵەکانــمان.

ئنجا کە خـانوو بەرەکانـــمان تـەواوکردن، وردە وردە دەسـتمان کـرد بـە گواسـتنەوەی کەلوپەلـی هێزو پێـــشمەرگەکان‌و کەلوپەلیـــان، پاشان ماڵەکانـمان، پێموایە لـە نێوەڕاسـتی کەشـی هاوین‌و مانگــی (٨/ ١٩٨٩)دا بەتەواویی لە خدراویَ نیشـــتەجێبووین.

شایانی باسیشە ئێمە هـەمووومان وەك یـەك لـە دروسـتکردنی مزگـەوت‌و بارەگـای هێـزو خانووی ماڵەکـاندا کارمان دەکرد، بە کوردیی هەمووومان وەسـتاو کرێکاری خۆمان بووین، ئنجـا لێـــرەدا قســـەیەکی خۆش هەیە بۆگێـڕانەوە دەشـــیَ:

## بەهـەڵـــەداچوونی بەرپرســـێکی ئێرانیـــی لـــە ناســـینی بەنـــدەدا بەهـــۆی قورکـارییـــەوە:

ڕۆژێکیان کە هەمووومان سەرگەرمی ئیشـو کـاربووین‌و قوڕکارییمـان دەکـرد، خـەریکی دروستکـردنی خانووەکان بـووین، بەپەلـە هـەواڵیان هێنـا گوتیـان: بەرپرسـی ئـەو گـوردان (فـوج)ەی لای ئالۆوتـان‌و کۆمـەڵێك بەرپرسـی دیکــەی لەگــەڵن‌و هـــاتوە بـۆ سـەردان، ئێمەش تۆزێك دەسـت‌و دەموچاوی خۆمان بە پەلـە شـۆردەوەو چووین، کە چـووین ئـەوان

لە ژووری بارەگاکەماندا دانیشتبوون، یەکەم جاریش بوو یەکدی ببینین، من دوو سێ جار بە گەرمیی بەخێرهێنانم کردنو ڕێزمان لێگرتن، بەڵام چونکە جلوبەرگم هەمووی قوڕقاڵ بوو، هەروەها کاك مەلا شەریف "بەرەحمەت بێ" جلوبەرگەکەی ـ لەوکاتەدا ـ پۆشتەترو خاوێنتر بوو، ئەو برادەرە هەر زیاتر ڕووی لەلای وی دەکردو نەمزانی کە منی نەناسیوە، ئیدی پاش چایی خواردنەوە، دیاربوو تەماشای سەعاتەکەی کردو، گوتی: ئێمە کاتمان زۆرنیەو هەڵدەستین، ئنجا لەکاتی سواربوونی سەیارەکەیاندا، جارێکی دیکە ڕوویکردە کاك مەلا شریفو گوتی: ئێمە زۆر حەزمان دەکرد ئاغای شێخ ببینینو تامەزرۆی دیداری بووین، بەڵام وادیارە بۆی نەکراو سەلامو ڕێزمانی پێڕابگەیەنن!

کاك مەلا شەریف گوتی: مەبەستتان کێیە؟

گوتی: مەبەستم شێخ عەلی باپیرە.

ئەویش ئاماژەی بۆ من کردو گوتی: ئەوەتا!

منیش بە پێکەنینەوە گوتم: ئەوە لە خزمەتداین!

ئەویش بە تەریقییەکەوە گوتی: جەنابت شێخ عەلی باپیری؟!

گوتم: بەڵێ، فەرموون دابنیشنەوە، با دووبارە تێهەڵبچینەوە!

ئەویش گوتی: من شەرمەزارت بووم نەمزانی تۆ هەوی، ئێستاش ئەوەندە شەرم دەکەم ناتوانم دابنیشمەوە، من وامزانی تۆش وەك ڕووحانییەکانی ئێمە پۆشاکی مەلایەتییت لەبەردایەو، نەمزانی لەگەڵ پێشمەرگەکاندا قوڕکاریی دەکەی!

ئیدی بەپەلە خوا حافیزییان کردو ڕۆیشتن!

## دانرانی هەر کام لە مامۆستا مەلا شێخ صدیق سەرگەتیی ـ بە ڕەحمەت بێ- و بەندە، بە سکرتێری ڕابەر:

لە درێژەی ئەو کۆبوونەوانەدا کە وەك پینەو پەڕۆکردنو چارەسەری کاتیی (مُسَكِّن) بوون بۆ کێشەو گرفتەکانی بزووتنەوە دەکران، لە (٢٧/ ٨/ ١٩٨٩)دا لە بارەگای هێزی

شافیعی لە گوندی (گەسك گەسك)ی تەنیشت شاری (خانێ) کۆبوونەوەیەکی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتیی، بە سەرپەرشتیی جەنابی ڕابەری گشتی ماموستا مەلا عوسمان "خوا لێی خۆشبێ" ، کراو چەند بڕیارێکی تێدا دران، کە یەکیان بریتی بوو لە دانرانی :

١- ماموستا مەلا شێخ صدیق سەرگەتی "بە ڕەحمەت بێ" .

٢- عەلی باپیر .

بە سکرتێری ڕابەری گشتی، کە منو ماموستا شێخ صدیق ئەوساو دوایش حاڵی نەبووین، ئیشو کارو سنووری صەلاحیەتمانو چۆنیەتیی کارکردنمان لەگەڵ جەنابی ماموستا مەلا عوسمان چییەو چۆنە؟!

( ماموستا حەسەن بابەکر)یش لە(هەورازو نشێو)ەکەیدا لەوبارەوە نووسیویەتی :

﴿دانانی ئەو دوو سکرتێرە بۆ ڕابەر لەجێی خۆی نەبوو، چونکە سکرتێرەکان هەر یەکەیان ماڵی لە شوێنێك بوو، لە یەکتر دوورو لە ڕابەریش دوور، جگە لەوە: لە پەیڕەوی ناوخۆی حیزبدا ئەو پۆستو بەرپرسیارێتییە هەر نەبوو، دوای دانانیشیان هیچ ئەركو مافیان بۆ دیاری نەکراو لائیحەیەکی کارکردنیان بۆدانەنراو...هتد.﴾ لاپەڕە (٢٠٥).

# گرژیی و نامەو نامەکاریی لەنێوان ئێمەو یەکێتیدا

وەك پێشتر باسم کرد، کاتی خۆی وێڕای ڕێککەوتننامەی (گوێزێ)ی ساڵی (١٩٨٧) لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی یەکێتیدا، ماوەیەك لەوەپێش – واتە: پێش گرژییەکەی سەرەتای مانگی: (٩/ ١٩٨٩) – سەردانی جەنابی مام جەلالمان کردبوو، بۆ بەخێرهاتنەوەی لە سەفەری دەرەوەی وڵات، بەڵام وادیار بوو یەکێتی بوونی ئێمەی لەو دەڤەرە لەسەر دڵ قورس بوو، چونکە هەمیشە لە جەولەو گەڕاندا بووین‌و، خەڵکمان دەبینی‌و هاموشۆی زۆریان دەکردین.

هۆکاری ڕاستەقینەو قەڵسبوونی یەکێتی لە بوونی ئێمە لەو دەڤەرەدا هەر ئەوە بوو، ئەوەی دیکە هەرچی دەگوترا بیانووگرتن بوو.

ئێستاش با سەرنجی قۆناغەکانی ئەو بارگرژییەی ئەوساکەی بزووتنەوەو یەکێتی بدەین، بەپێی مێژووی ڕووداوەکان ڕیزیان بکەین:

١– لە ڕۆژی: (٤/ ٩/ ١٩٨٩)دا کاك حەسەن کوێستانی ئەندامی سەرکردایەتی‌و سەرپەرشتیاری تیپەکانی ئەو سنوورەی یەکێتی، نامەیەکی بۆ مامۆستا حەسەن بابەکر فەرماندەی هێزی حەمزە ناردبوو، لە ڕۆژی: (٥/ ٩/ ١٩٨٩)دا پێشمەرگەیەکی خۆمان لە بنکەی خۆمان لە (قووڵە هەرمێ)ـەوە هێنابووی، کە نێوەڕۆکەی ئەوەبوو: نابێ بزووتنەوە لەو دەڤەرەدا بنکە دروست بکات.

٢– منیش پاش ڕاوێژکردن بە مامۆستا حەسەن بابەکرو کاك مەلا شەریف‌و ئەندامانی هێز، بە ڕای هەمووان وا بەباش زانرا، کە من وەك سکرتێری ڕابەری گشتی نامەیەك بۆ مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بنووسم کە لە (قاسمەڕەش)بوو، نامەکەشم دایە دەست مامۆستا حەسەن بابەکر، واتە: من هەر هەمان ڕۆژ: (٥/ ٩/ ١٩٨٩) نامەکەم

نووسـی و مامۆستا حەسـەن بـۆ ڕۆژی دواتـر واتـە: (٦/ ٩/ ١٩٨٩)، ـ كـە ڕۆژی (٦/ صفر/ ١٤١٠)ی كۆچیشی دەكرد ـ لەگـەڵ دوو پێشـمەرگەی هێـزدا نامەكـەی گەیاندبووە دەستی پرسگەی مەكتـەبی سـیاسیی یەكێتـی، تێشـیگەیاندبوو، كـە ئـەوە نامەی مەكتەبی سـیاسـیی بزووتنـەوەیە بۆ مەكتەبی سـیاسـیی یەكێتـی.

٣- بەڵام هەر هەمان ڕۆژ واتـە: (٦/ ٩/ ١٩٨٩)، بگـرە وەك مامۆسـتا حەسـەن بابـەكر لـە (هـەورازو نشـێو)ەكەیدا گوتوویـەتی: ـ لاپـەڕە: ٢٠٧ـ هـەر دوای گەیشـتنەوەی مامۆسـتا حەسەن بـە بنكـەی قووڵـە هـەرمێ، یەكسـەر دوو پێشـمەرگەی یـەكێتی، وەڵامی نامەكەی ئێمـەیان گەیاندبۆوە دەسـتی مامۆستا حەسەن بابەكرو گوتبوویان: ئەوە وەڵامی نامەكەتـانە!

ئنجا دوو پێشـمەرگەكە كە نامەكەیان هێنـابوو، بـە زارەكیـی (شـفهي)یـش بـە مامۆسـتا حەسەن بابەكریان گوتبـوو: مام جەلال گوتوویەتی: دەبـێ هەتا (٤٨) كاتژمێری دیكـە ئێـرە چۆڵ بكـەن، ئەگـەرنا لێتـان دەدەین!

ئنجا ئەوەی سـەیرو جێی سەرنجی ئێمە بوو ئەوەبوو، كە جـەنابی مـام جـەلال بـە خـەتی خـۆیو هـەر لەسـەر خـودی نامەكـەی ئێمـە وەڵامەكـەی نووسـیبۆوە، كـە بێگومـان هەڵچوونێكـی زۆرو زبرییـەكی بەرچاوی پێـوە دیـاربوو!

ئەمەش دەقی نامەكـەی ئێمـە، بە ژمارە: (٥١) ڕێكەوتی: ( ٦ی صەفەری ١٤١٠) ك، بۆ مام جەلالو وەڵامەكەی ئەویش كـە وەك گـوتم، هـەر لەسـەر خـودی نامەكـەی خۆمـان نووسیبوویـەوە:

## دەقی نامەکانی بزووتنەوە بۆ مام جەلال و،

## هی مام جەلال بۆ بزووتنەوە

بسم الله الرحمن الرحیم

بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراقدا

نووسینگەی سکرتاریەت

ومالكم لاتقاتلون فـي سبيل الله والمستضعفين

بۆ نووسینگەی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

دوای هەواڵپرسین‌و هیوای سەرکەوتن‌و خۆڕاگریی‌و پشوودرێژیی پتر .

ئاگادارتان دەکەینەوە کە برادەرێکتان بە ناوی کاك (حەسەن کوێستانی) لە ڕۆژی (٤/ ٩/ ١٩٨٩)ز نامەیەکی بۆ فەرماندەی هێزی حەمزە کاك (حەسەن بابەکر) ناردووەو تێیدا داوای لە ناوبراو کردوە، کە ئەگەر بگونجێ لە ناوچەی (قووڵە هەرمێ) بنکە دروست نەکەن، لەبەر پێداویستیی خۆیان!!

هەڵبەتە ئێمە ئەو هەڵوێستەمان لەلا سەیرە، چونکە کاتی خۆی کە ئەو هێزانە بنکەیان لەو ناوچانە بنیاتناوە، بە ئاگاداریی‌و پێخۆشحاڵیی ئێوەو هێزە سیاسییەکانی دیکەش بووە!

ئێمە بە پێویستی دەزانین لەو ناوچانە هەبین، چوار پێنج مانگیشە لەوێ نیشتەجێین‌و تازە نەچووین .

ئیدی بە هیوای پتەوکردنی ڕیزی برایەتیی‌و پتر پاراستنی گفت‌و بەڵێن . .

والسلام على من اتبع الهدى .

ل . سکرتاریەت

ئیمزا . عەلی باپیر

ئەمەش وەڵامەکەی مام جەلال بوو کە لەسەر هەمان نامە نوسیبووی:

چونکە زۆر ناشیرین نووسراوە باوەڕناکەین

١) ئەمە نامەی بزووتنەوەی ئیسلامی بێ، چونکە ئەمە لە ئەدەبی ئەوان بەدوور دەزانین، بۆیە ڕەتمکردەوە بۆ ئەو نوسەرەکە.

٢) بێ ڕەزامەندیی ئێمەش ناتوانن لەو ناوچەیە بن.

والسلام على من اتبع الهدى.

ئیمزا. جەلال تالەبانی

پاشان من لە ڕۆژانی: (٨/ ٩/ ١٩٨٩) (٨ صفری ١٤١٠) و (٩/ ٩/ ١٩٨٩) (٩ ی صفری ١٤١٠)دا دوو نامەم بە ژمارە (١)و (٢) بۆ جەنابی مامۆستا مەلا عثمان ناردن، بەمەبەستی بەرچاو ڕوونکردنەوەیو چەواشەنەکرانی بەهۆی نامەکانی مام جەلالەوە، نامەی دووەمیانم بە (کاك کەمال محمد أبوبکر)دا نارد کە بەرپرسی ڕاگەیاندنی هێزی حەمزە بوو، بەهیوای ئەوەی کە وێڕای نامەکان، بە زارەکیی (شفهي)یش بارودۆخەکە زیاتر بۆ جەنابی ڕابەری گشتی "خوا لێی خۆشبێ" ڕوون بکاتەوە.

نامەی ژمارە (١)

بسم الله الرحمن الرحيم

حسبنا الله ونعم الوكيل

بەڕێزو خۆشەویست جەنابی (مامۆستا مەلا عوسمان)

السلام عليكم ورحمه الله

دوای سەلامو ڕێزو هەواڵپرسین

ئەم هەواڵەتان پێڕادەگەیەنین و چاوەڕێی وەڵامو هەڵوێستی خێراتانین:

لە ڕۆژی (٤/ ٩/ ١٩٨٩) حەسەن کوێستانیی نامەیەکی بۆ کاك حەسەن بابەکر (فەرماندەی هێزی حەمزە) ناردوە، نێوەڕۆکەی ئەوەیە کە نابێ بزووتنەوەی ئیسلامیی

بنكەیان لە (قوولـە هەرمێ)و (پشـكاوێ)و (تووژەڵە) هـەبێ‌و دەبێ واز لە دروستكردنی ئـەو خانووانە بێنـن، كە بە نیـازن بیانكـەنە بنكـە.

ئێمەش لـە رۆژی (٦/ صـفر/ ١٤١٠)ك نامەیـەكمان بـەناوی نووسـینگەی سـكرتاریەتی بزووتنـەوەی ئیسـلامییەوە، ڕەوانەكرد بۆ مەكتەبی سیاسـیی یـەكێتی، كـە دەقـی نامەكـەمان لەگەڵ ئەم نامەیـەدا بۆ ناردوون، لە وەڵامـی ئـەو نامەیـەدا (جـەلال تاڵـەبانی) بـە شەخسـی خۆی‌و بە خـەتی خـۆی لەسـەر عـەینی كاغـەزی نـاوبراوی ئێمـە، وەڵامێكـی عاتیفییـانەو سـەركێڵانەی نووسـیوەتەوە، كـە ئـەمیش دیسـان وێنــەیەكی فۆتۆكـۆپی كـراوەو بـۆ ئێـوە نێرراوە.

جا هیـوادارین تۆزێك بە زوویی وەڵامێمان بدەنەوە، چونكە ئەو دوو (پ.م)یەی كە نامەی (جـەلال تالەبانی)یان هێنابوو گوتبوویان: مامە بـەدەم گوتوویـەتی: پێیـان بڵـێن، ئەگـەر لـە ماوەی (٤٨) كاتژمێـری دیكـەدا بنكەكەیان لانەبەن، لێیان دەدەین.

والسلام عليكم ورحـمة الله

ئیمـزا

براتان: عەلـی باپیر

(٨ صفر ١٤١٠) / خدراوا

تێبینـی:

كاك (مەلا حەسەن بابەكر) لە نامەكەیدا كە بۆ منی نووسـیوەو گوتوویـەتی، كـە (جـەلال تاڵەبانی) لەسەر نووسینی ئەو ئایەتە تووڕەبـووە كە لەكۆتایی نامەی نووسینگەی سكرتاریەتدا نووسـراوە، واتە: (والسـلام علـى من اتبـع الـهدى)!!

بەڵام خراپ حاڵی بووە، چـونكە نووسـینی ئایـەتی نـاوبراو هـیچ مـەفهوومێكی خـراپ ناگەیەنێ، بەڵگەشـم ئەوەیە كە جەنابی (مامۆستا مەلا عوسمان) لە نامەیەكیـدا كـە لـە رۆژی (٢٩/ ٥/ ٦٨)دا سـەبارەت بــە بلاوكردنــەوەی بڕیارەكــانی كۆبوونــەوەی پیرانشـــەهر نووسیویەتی، لەكۆتاییـدا نووسیویەتی: (والسـلام علـى من اتبـع الـهدى).

نامەی ژمارە (٢)

بسم الله الرحمن الرحيم

بەرێـزو خۆشـەویست

مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیـز وفقه الله لـما يحبــه ويرضاه

السلام عليكم ورحمة الله

دوای سلاو رێـزو هەوالپرسین.

مامۆستای بەرێز!

لە نامەی دوێنێ ژمارە (١)دا ئەسـڵ‌و چـۆنیەتیی ئـەو گیروگرفتـەی نێـوان ئێمـەو جـەلال تاڵەبانیـم بۆ ڕوونكردبوونەوە، كـە ئێستا بـە پێویسـتی نـازانم دووبـارەی بكەمـەوە، بـەلام سەبارەت بە هەڵوێستی بەرێـزت كە بڕیارتداوە، ئێمە لێرە لیژنەیـەك پێكهێـنین‌و چارەسـەری بكەین، پاشان بڕیارت گۆڕیـوەو فەرمووتـە: (مەلا عەلـی)ی برام دەنێـرم بۆ چارەسەری!!

بەڕای من ئەو گیـــروگرفتە بـە هـیچ كـام لـەو دوو شـێوازانە چارەسـەر نـاكرێ، بـەڵكو چارەسـەری ڕاسـتەقینە ئەوەیـە، كـە بـەرێزت نامەیـەك بـە نـاوی لێپرسـراوی بزووتنـەوەی ئیسـلامییەوە بۆ لێپرسـراوانی یەكێتـی یـان شـەخســی (جــەلال تاڵـەبانی) بنووسـیو تێیـدا ڕوونی بكەیتـەوە، كە ئەو نامەیـەی كە بەناوی سـكرتاریەتی بزووتنـەوەی ئیســـلامییەوە بـۆ ئێوە نێـرراوە، هەڵوێستێكی شەخسـیی نیـەو هەڵوێسـتی هـەموو بزووتنەوەیـە، چـونكە مـام جەلال بەو هەڵوێسـتەی ویستوویەتی دەماری ئێمـە بگـرێ، داخۆ لەنێوان خۆمانـدا چۆنین؟ ئایا یەكڕیـزین‌و لەسـەر یەك دەكەینـەوە یان نا؟!

دیســان ئەو نامەیـەی ســكرتاریەتیش جگـە لـە هـەق‌و ڕاسـتیی‌و پاراسـتنی عیـــززەتی ئیسـلام، هیچ بێشەرعیی‌و ناشیرینییەكی تێـدا نییـە، بـەلام وادیـارە لـە فەرهـەنگی (جـەلال تاڵەبـانی)دا قبووڵنەكردنی كوێخـایەتیی (یەكێتـی)و ملكەچ نەبوون بۆ ئـەمرو فـەرمانیان، بـە ناشـیرین‌و هەڵە لەقەڵـــەم دەدرێ!!

جا مامۆستای بەڕێـز!

تكایە با بەزوویی و دەستوبرد بەدەم ئەم كارەوە بچین و، با لە دوادوای تەمەنی ماركسیزم لە كوردستاندا، نەهێڵین سەری ئیسلام نەوی ببێ، هەڵبەتە ئەو هەڵوێستو بڕیارانەی ئێستاشمان لەسەر ئیسلام دەنووسرێن و لە مێژوودا تۆمار دەكرێن.

دڵنیابە كە جەلال جگە لە ڕق و قین و بوغز و غەرەز، هیچ شتێكی دیكە نەبووەتە هاندەری، سوپاس بۆ خوا ئێمەش ڕێگەی هیچ بەهانەیەكمان لەسەر خۆمان تۆمارنەكردوە!

كەواتە ئەگەر گریمان لەلای ئەوانیشەوە، مەسەلەكەت بە جۆرێكی تر لێ حاڵیكرابوو، ئەوە سوور بزانە كە واقیع و هەق ئەوەیە كە ئێمە بۆمان خستوویتەڕوو.

والسلام علینا وعلى عباد الله الصالحين

ئیمزا

براتان: عەلی باپیر

٩/ صفر/ ١٤١٠

تێبینی:

هەڵگری نامە ئاگاداری هەموو لایەنەكانی ئەو مەسەلەیەیەو، دەتوانی پرسیاری لێبكەی، هەڵبەتە ناوبراو (كاك كەمال) لێپرسراوی بەشی ڕاگەیاندنی هێزی (حەمزە)یەو جێی هەموو متمانەیەكمانە.

دوایی وا پێدەچێ لە ڕۆژانی: (٧ـ ١٠)دا جەنابی مام جەلال ئەم نامەیەی بۆ جەنابی ڕابەری گشتی نووسیبێ ـ چونكە نامەكەی مێژووی لەسەر نیە – هەڵبەتە نامەكەی مام جەلال قسەی زبر و ناخۆشی زۆری بەرانبەر بە بەندە تێدان، وادیارە بە هەڵچوونێكی زۆرەوە نووسیبووی!

ئەمـەش دەقی نامەکـەیەتی :

بەناوی خوای گـەورەو توانـا

برای خۆشـەویسـتمان مامۆستا شێخ عثمـــانی بەڕێـز!

سلاوێکی گەرم

شـادیو سـەرکەوتنتانم هیوایـەو ئێمەش باشین .

لای جەنابتـــان شـــاراوە نیـــە کـــە (ی . ن . ك)و بەنـــدە لـــەو ڕۆژەوە پێکـــەوە بەیاننامـــەمان مۆرکردوە، لەگەڵ (ب . ئی کوردستان) درێغیی نەکردوە لە هاوکارییتانو ڕێگەدان بە بوونو چالاکیی برایـــان لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێـر دەسـەڵاتی (ی . ن . ك)دا .

بەڵام عەلـی باپیر کە پیاوێکی داخ لـەدڵو، قـین لـە دڵـەو زۆریـش ناحـەزی (ی . ن . ك)و شۆڕشـــەکەمانە، چ کـــە لـــە شــــار بـــوو، چ کـــە هاتووەتـــە دەر، هـــەر خـــەریکی تێکـــدانی نێوانـمانە : بۆ نـموونە :

١) کە دێتە ناوچەکانی ئێمە نـەك بـەپێی ڕێککەوتننـامانەی مـۆرکراوی نێـوان هـەردوولا، بەڵکو دەیـەوێ بە کەڵەگایی‌و بە خۆسـەپاندن، بە بێبـاکیی لـە (ی . ن . ك)و گاڵتـەکردن بە دەسـەڵاتە شـۆڕشـگێڕییەکەی ڕەفتار بکات، کە ئەمـەش بە هـیچ جۆرێـك قابیلـی قبـــوڵ نیە .

٢) نامـەو وتـەی زۆر قسـە ترنانـەو توندوتیـژو ناحەزانەیـە بـە جۆریـك کـە ئاوێنـەی دڵـە داخدارەکەی خۆیەتی لە (ی . ن . ك)و شۆڕشەکەمان، نامەی دوایی کـە بـۆ مـنی نـاردوە زۆر بێئەدەبانەشــە، دوا جوملەشـی (والسـلام علـی من اتبع الـهـدی)یە!! کە خۆتـان دەزانن بۆ کێ‌و کـەی‌و چـۆن وتـراوە؟!

جا بەڕاستی (ی . ن . ك .) چـیی دیکـە لـە توانایـدا نـەماوە قبـوڵی بکـات، لـەو ناوچـەی سـەرکردایەتیی خۆی، بۆیە تکامان وایە هەرچی زووترە بیکێشـــنەوە، ئەگینـــا مـن نـاتوانم چیـی تر (هـ . پ . ك) زەبـت بکـەمو ئۆبـاڵی خـۆی‌و وتـەو ڕەفتـاری دوژمنانـەی خـۆی لـە ئەسـتۆی خۆی دەبێـت . وقد أعـذر من أنــذر .

بەتایبەتی چونکە عەلی باپیر لە فیتنەو هەرانانەوە دەگەڕێ، زۆریش ئاشکرایە کە وتەو رەوشتی ناحەزانەی بەرانبەر (ی. ن. ك) هەر خزمەتی بەعسی فاشی دەکاتو بەس.

ئیتر هیوادارم یەکێك بنێرن بۆ ناوچەکەمان کە باوەڕی بە دۆستایەتیو هاوپەیمانی هەبێو هەرچی زووە ئەو بەڵایە لەکۆڵ خۆمانو خۆتان بکەنەوە.

دووبارە ڕێزی بێپایان بۆ جەنابتان

هەربژی بۆ برای دڵسۆزتان: مام جەلال

ئیمزا

سەرەنجام جەنابی ڕابەری گشتی لە ڕۆژی: (١١/ ٩/ ١٩٨٩) (١١صفر ١٤١٠)دا نامەیەکی بۆ مام جەلال بە (کاك شێخ مصطفی زینوی)دا دەنێرێو لە نامەکەیدا جۆرە گفتێك بە مام جەلال دەدات کە شتێکی وا بکات ڕازیبێو گلەیی نەمێنێ!

ئەمەش دەقی نامەکەی جەنابی رابەری گشتییە، بە ژمارە: ف ـ ق، ڕێکەوتی: (١١/ ٩/ ١٩٨٩).

بسم الله الرحمن الرحيم

الله اكبر

نوسینگەی رابەری گشتی

بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق

بەرزو بەڕێز جەنابی مام جەلال وفقة الله تعالی

لەپاش ڕێزو سلاو لە وەڵامی نامەیەکدا کە بەدەستمان گەیشت

بەهۆی بەڕێز شێخ مصطفی نەقشبەندییەوە

بەڕێزتان ئاگادار ئەکەین کە بێگومان بن ئێمە بە فەرمانی ئیسلام پارێزگاری ئەو ئیتفاقیە ئەکەین کە پێکهات لە نێوان (ی. ك. ن)و (ب. س. ك) کەواتە سەبارەت بەو رووداوانەی کە هۆی دڵگرانیتانە سەبارەت بەوە کاریکی وا ئەکەین، کە جێگەی

ڕەزامەندی هەردوولا بێ، کەواتە ئێوەش هەروەکو جاران بن و برایەتی ڕاگیرکەن تا کردەوەمان دەرئەکەوێ، ئیتر داوای پارێزگاری و موفقیەتتان ئەکەین...

والسلام عليكم

برای دڵسۆزتان عثمان عبدالعزيز

ئیمزا

لەکۆتاییدا من نامەیەکی تێرو تەسەلم لە (١١/ ٩/ ١٩٨٩) (١١صفر ١٤١٠)دا بۆ مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نووسیبوو کە وەڵامێکی باشی نامەکەی مام جەلال و ڕەخنەکانی و هەڕەشە زارەکییەکەیشی تێدابوو، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

## نامەیەکی بەندە (عەلی باپیر) بۆ (م . س)ی یەکێتی

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ی. ن. ك بەڕێزەوە!

١١/ ٩/ ١٩٨٩

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

دوای سڵاوو ڕێزمان بۆ هەموو بەڕێزان، چەند تێبینییەکمان دەربارەی ئەو گیروگرفتە هەیە، کە لەم بەینەدا، ڕوویدا، بە پەسندمان زانی ئاگادارتان بکەینەوە:

١) زۆر سەرمان سوڕما کە لە وەڵامی نامەی ژمارە (٥١)ی نووسینگەی سکرتاریەتماندا کە بە شێوەیەکی ڕەسمیی نووسرا بوو (مام جەلال) چەند دێڕێکی عاتیفیی و دڵگەرمانەی لەسەر عەینی نامەکەی ئێمە نووسی بوون، کە چ لە ڕووی نێوەڕۆك و چ لە ڕووی تەعبیرەوە ناقۆڵا بوون!!

٢) لەو چەند دێڕانەدا سێ مەبەستی هەڵە نووسرابوون، کە پێمانوابوو لە ئێوە ناوەشێنەوە:

أ/ کە نامەکەی ئێمـە بە (زۆر ناشیرین) لەقەڵـەم درابوو! بەڵام هەموو عـاقڵێکی خـاوەن ویـژدان دەزانێ کە ئێمـە هیچ وشـــەو تـەعبیرێکی ناجوانــمان بـەکار نەهێنـــابوو، چونکە لە خۆمـانو بەرنامـەکانی ناوەشـێنینەوە، جـا مەگـەر وەدەنـگ هـاتن لەسـەر ناحـەقو، کوێخـایەتی قبـوولْ نەکردن، بە شـتی ناشیرین لەقەڵــەم بدرێ!

ب/ کە نـامەی ناوبراومان بـە ئـی (بزووتنـــەوەی ئیســـلامیی) حسـێب نـەکرابووو لـە ئەدەبـی بزووتنـەوە بەدوور زانرا بوو! بەڵام دڵنیـابن کـە نامـەی نـاوبراوو هـەرجۆرە هەڵوێستو بڕیارێکی دیکەی ئەوتۆش، هـەڵقوڵاوی نێـو جەرگـەی بزووتنەوەیـەو، ئەدەبو ڕەوشـتی بەرزیش لەلای یەك یەکی وردو درشتانی بزووتنـەوە، کاکڵەکـەی بریتیـــە لـە پاراســتنی عیــززەتو ئـابڕووی ئیســلامو ناحــەقیی قبــوولْ نـەکردن، هەرکەسێکیش بەپێچـەوانەی ئەوەوە لـە بزووتنـەوەی ئیســـلامیی حـاڵی بووبـێ، بـا بەزوویی چـاو بە بیروبۆچـوونی خۆیدا بگێڕێتـــەوە.

ج/ کە لەکۆتـایی ئەو چـەند دێــڕەدا نووسرابوو (بەبێ ڕەزامەنــدیی ئێمــەش ناتوانـــن لە ناوچـەی ئێمــە بن)!! جا ئێمــە ئەو قســـەیەمان لە دوو سـەرەوە پێ هەڵـەیە:

**یەکەم:** بزووتنەوەی ئیسـلامیی هەر لـە یەکـەم ڕۆژی دروسـت بوونیـــەوە چـــاوەڕێی پرسو ڕازیبـوونی هیچ کەسێك نەبووە، جگـە لـە ئـی خـواو پێغـــەمبەر "سـەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بێ"، کاتی خۆشـی ئێمـە لەگـەلْ (ی.ن.ك)و هێـزە سیاسـییە کوردسـتانییەکانی دیکەشـــدا، پەیـمانو ڕێکەوتننامەمان مـۆر کـردوە، کـە جگـە لـە ڕێزی دووسـەرە (الإحتـرام الـمتبـادل)و هاوکـاریی، هـیچ مـەرجێکی دیکـەی تێـدا نیـە، جا ئێمـە بە حوکمـی فەرمانی خـوا کە دەفـــەرموێ: ﴿... وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ٣٤﴾ الإســراء، هەر لەسـەر ئەو بەڵێــنو پەیــمانەینو هیچـی لـێ کەمو زیـاد ناکــەین، هەتـا بەرانبەرەکـەمان گۆڕانی بەسـەردا نەیەت!

دیسان کاتی خۆشی کە ئەو بنکانەمان لەو ناوچانە بنیات نان ـ کە ئێـوە بـەس بـە ئـی خۆتانیـان دادەنێن ـ، هاتین لەسەر ئاستی سەرکردایەتیمانو سـەرکردایەتیتان لەگـەڵتان

دانیشتینو ئەوكاتیش چەند جارێك لێمان تەئكید كردنەوە، كە وشەی (پرس پێكردن)و (ئیزن وەرگرتن) بەكارمەینن، چونكە ئێمە بە پرسو ئیزنی كەس بەڕێوە ناچین، جگە لە ئی خواو پێغەمبەرمان "سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بێ" .

دووەم: ئێمە هیچ پارچەیەكی كوردستانی بەرین ـ كە بە نەخشەو پیلانی هێزە زلە جیهانخۆرە ڕۆژهەلاّتیو ڕۆژ ئاوایی یەكان لەتوپەت كراوە ـ بە ملكی تایبەتیو شەخسیی هیچ كەسو پێڕو دەستەیەكی نازانین، بەلكو دەلێین: كوردستان بەس مولكی كوردە! دیارە كە ئیسلام بە كوێخایەتی ئیمپریالیزمی ڕۆژهەلاّتو ڕۆژئاواش ڕازی نەبێ لە كوردستاندا، حەوجار بە كوێخایەتی پێڕو دەستەیەك قایل نابێت، هەلبەتە ئەو كەسەش كە كەلكەلەی ملكداریەتیو كوێخایەتیی كوردستان یان بەشێكی كوردستانی لە كەللە دایە، نە دەتوانێ ناوی شۆڕشگێڕ لەخۆی بنێ، نەدەتوانێ بەلگەیەكیش بەدەستەوە بگرێ بۆ ڕەتكردنەوەی دەعوای ملكداریەتیو كوێخایەتیی ئیمپریالیزمی جیهانخۆرو، ڕژێمە ناوچەییە داگیركەرەكانیش! .

٣) ئەو دوو (پ.م.ی) كە نامەكەی (مام جەلال)یان هێنابۆوە، گوتبوویان: ﴿مامە گوتوویەتی ئەگەر بە (٤٨) سەعاتی دیكە بنكەكانیان لەو ناوچەیە لانەبەن، لێیان دەدەین!﴾ .

جا لە ئاقار ئەم قسەیەدا، ئێمە ئەوە هەلۆێستی بێ پێچو پەنامانە :

یەكەم: ئەم قسەیە لە دوو حالّان بەولاوە نیە، یان (پ.م)ەكان ڕاست دەكەن، ناوبراو قسەی گۆڕینی كردوە، یان دەست هەلبەستی خۆیانە، ئەگەر دەست هەلبەستی خۆیان بێ، ئەوە دەلالەت لەسەر بێ سەروبەرەییو بێ یاسایی (ی.ن.ك) دەكات!

وە ئەگەر ناوبراویش خاوەنی قسەكە بێ، ئەوە لەم خالّی دووەمو سێیەمەدا بۆ وەلاّمەكەی بگەڕێن.

دووەم : وادیارە نووسەری دێڕەكە، بەرهەمو دەستكەوتی چاكی دەستگیربوون، لە ئەنجامی شەڕی نێوخۆییو كورد كوژییدا، بۆیە هێندە لە بەهانەیە بۆ ئەو جۆرە شەڕانە!!

سێیەم : ئێمە وەك ئیسلامیی نەك (ئیستیسلامیی!!) هەر لە سەرەتای مسوڵمانەتی مانەوە، سەرو ماڵمان بە خوا فرۆشتوەو، لە بەرانبەر پاراستنی عیززەتو ئابڕووی ئیسلامدا، خۆمان بە خاوەنی هیچ شتێكمان نازانینو، وەك كڕیاریش بەدوای شەهیدیی و مردنی شەرافەتمەندانەدا دەگەڕێینو، خەڵك چەندە ژیانی خۆشدەوێ، ئێمە هێندە عەوداڵی مردنین، لە پێناوی خواو ئیسلامو خەڵكی چەوساوەو بێ شوانماندا.

وە ئێمە بەپێی فەرمانی خوا ﴿...فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ...﴿١٩٤﴾﴾ البقرة، بە عەزمێكی پۆلاینو دڵێكی پڕ بڕواو یەقینەوە، بەرپەرچی هەر جۆرە دەست درێژیی و خۆسەپاندنێك دەدەینەوە و پێمان وایە ستەمو زوڵمو خراپە هەر ستەمو زوڵمو خراپەیە، چ بابایەكی ئەمریكیی و ڕووسیی و بەعسیی بیكات، چ بابایەكی كورد!!

هەڵبەتە ئێمە ئامادەیی خۆشمان وەرگرتبووو چاوەڕێی واقیعیەت پەیداكردنی هەڕەشەكە بووین، بەڵام وادیار بوو قسەكە بەرهەمی بیر لێكردنەوە نەبووو، هەستو نەستو دەروون گەرم بوونێكی كاتیی بوو!! جا نازانین داهاتووش چی لە هەگبەدایە!

٤) بیستوومانە كە (مام جەلال) گوایە زۆربەی تووڕەیی یەكەی، بەهۆی ئەو ڕستە قورئانییەوە بووە، كە لە كۆتایی نامەكەماندا نووسرابوو، واتە: (والسلام على من اتبع الهدى)، بەڵام بێگومان هەڵچوونو تووڕەبوونەكەی، ئەگەر هاندەرو ڕەگو ڕیشەی دیكەی نەبووبن، لەجێی خۆیدا نەبووە، چونكە ڕستەی ناوبراو هیچ ماناو مەبەستێكی خراپ ناگەیەنێ ـ هەرچەندە قسەی مووسایە (علیه السلام) بۆ فیرعەون ـ بەڵگەشم بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەم زۆرن، بەڵام بەس یەكیان دەخەمە ڕوو، ئەویش

ئەوەیە : كە بەڕێز مامۆستا مەلا عثمان ـ ڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامیی – لە نامەیەكیدا كە بۆ ئەندامانی كۆڕی ڕاوێژی بزووتنەوەی نووسیوە، لە ڕۆژی (٢٩/ ٥/ ١٣٦٨)ی (ئێرانیی)دا لەكۆتایی نامەكەیدا نووسیویەتی : (والسلام على من اتبع الهدى) .

دیارە ئەگەر ڕستەی گۆڕین هیچ مەفهوومێكی نەگونجاوی گەیاندبایە، مامۆستای بەڕێز بەكاری نەدەهێنا .

٥) لە كۆتاییدا :

هیوادارین هەموو لایەكمان ئەم بارودۆخ و قۆناغە دژوارەمان لەبەرچاو بێ، كە گەلە چەوساوەو بێكەسەكەمانی پێدا تێدەپەڕێ، وە ئاگامان لە خۆمان بێ، شەیتان و نەفس و سیفەتە بەدەكانمان دووچاری هەڵوێست و ڕەفتارێكمان نەكەن، كە بێجگە لە زیانی خۆمان و پێخۆشحاڵیی دوژمن و نارەحەتیی دۆستان و، زیاتر وێرانبوونی كوردستان، هیچ سوودو بەرهەمێكی نیە .

وە دووپاتیشی دەكەینەوە كە ئێمە وەك (ئیسلامیی)و شوێنكەوتووانی خەت و ڕێبازی پێغەمبەر "سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ" بۆ برایەتیی و دۆستایەتی و تەبایی، لەسەر بنچینەی حەق و دادگەریی و ڕێزی دووسەرە، دەستمان لەئی هەموو كەس درێژترەو خوا پشتیوان بێ، هیچ بەڵگەیەك لەسەر خۆمان پەیدا ناكەین، بەڵام بە پێچەوانەوە كەسێك چاوی لە كوێخایەتیی و سنوور بەزاندن و لاق لە بەری تێپەڕاندن بێ و، بە هەق و دادگەریی و برایەتیی ڕازی نەبێ، ئەوە ئیمامی عەلی گوتەنی : (( ومن ضاق بِهِ العدلُ فالجورُ عليه أضيق)).

ئیدی بە هیوای پتەوكردنی ڕیزی دۆستایەتیی و، زیاتر جۆشدانی كوورەی خەباتی ڕەوامان دژی ستەم و چەوسانەوەو بێدادیی . .

والسلام علينا وعلى عباد الله الصالحين

عەلی باپیر ١٠/ صفر ١٤١٠ ك

ئیمزا

دیـاره مامۆسـتا (مـەلا عثمـان) رازی نـەبوو نامەکـەیان راسـتەوخۆ بـۆ بنێـرین، بـەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ پێمانگەیانـدن، ئەگـەر گریـمان پێشـیان نەگەیشـتبێ ـ کـە پێموایـە پێشـیان گەیشتبـێ ـ لەبەرئـەوەی هـەر لەوکاتـەوەی نامەکـە لـە ڕێکخسـتنەکانماندا و لـە هێزەکانیشماندا دەستاودەستی پێکـراوەو بڵاوبووەتەوە، بەپێویسـتم زانی لێرە لـە دووتوێـی ئەم یادداشـتانەمدا تۆماری بکەم، تـاکو بزانـرێ شـێوەی بیرکردنـەوەو هەڵوێسـت نوانـدنی ئەوسـامان چۆن بووە، لە بەرانبـەر ئەو جۆرە بیرکردنەوەو سیاسەتەی جـەنابی مـام جـەلال و یەکێتیی نیشـتیمانیدا، شـایانی باسیشـە کـە دەقـی هـەموو ئـەو نامانـەی ئێمـەو ئـەوان بـە دیکۆمێنت لەلامان پارێزراون و لەکاتی بڵاوکردنەوەی ئەم یادداشتانەدا بەشێوەی کتێب لەلایەن گۆڤـاری (لڤـین)ەوە، تۆماردەکرێن و لە کتێبـی (هەورازو نشـێو)یشـدا هێنـراون.

## کۆتـایی کێشـەکـە

سەرەنجام لە دوو قۆڵەوە کۆتـایی بە کێشەکە هێنـرا:

**یەکەم**: وەك مامۆستا حەسـەن بابەکر لە (هەورازو نشـێو)ەکەیدا ـ لاپەڕە: (٢٣٨، ٢٣٧) باسی کردوە: ڕۆژێکیان برادەرێکـی ڕۆژگـاری خوێنـدنی بـە نـاوی (عبـدالرحمن بـاپیر ئاوەژێیـی) کـە ئەوکاتـە جێگـری بەرپرسـی تیپـی (٩٣)ی کۆیـە بـووە، سـەردانی مامۆستا حەسـەنی کردووەو داوای لێکـردوە پێکـەوە سـەردانی (حەسـەن کوێسـتانی) بکەن، بۆ لێکتێگەیشتن و چارەسەری کێشـەکە، سـەرەنجام پێکەوە چوونە لای ناوبراو و هەندێك قسـەو باسی باشـیان پێکەوە کردووەو بارگرژیـی و ئاڵۆزییـەکە خاوبۆتـەوە.

**دووەم**: هەر لەو سـەرو بـەندەدا ڕۆژێکیـان مامۆسـتا مـەلا عثمـان، بـە دوای کـاك مـەلا شـەریفیدا ناردبوو بچـێ بۆ خانێ "نووسینگەمان لەوێ هەبوو" ئنجا کـە ئێـوارێ کـاك مەلا شـەریف هاتـەوە، دیاربوو زۆر زۆر ناڕەحەت بوو، گوتم: ئـەوە چییە بۆچـی وا ناڕەحـەتی؟!

ئەویش دیاربوو نەیدەویست پێم بڵێ، بەڵام زۆر جەختم لێكردەوە كە هەرچی بووە دەبێ پێم بڵێی، هەڵبەتە لەلا بەلای نامەكەی مامۆستا (مەلا عثمان)یشدا كە بۆ مام جەلالی ناردبووو تێیدا هاتبوو "سەبارەت بەو ڕووداوانە كە هۆی دڵگرانیتانە، كارێكی وا ئەكەین كە جێگای ڕەزامەندیی هەردوو لابێ." ئەوەم خوێندبۆوە كە مامۆستا مەلا عثمان بۆ ڕازیكردنی مام جەلال شتێكی لەبارەی منەوە بەدەستەوەیە، ئیدی ئەوەبوو كاك مەلا شەریف گوتیی: "بەكورتی مامۆستا (مەلا عثمان) دەیەوێ بۆ ماوەی شەش مانگ تۆ تەجمید بكات، هەرچەندە زۆریش هەوڵمان لەگەڵدا، بەڵام لەسەر قسەی خۆی سووربووو گوتی "وا نەبێ مام جەلال ڕازی نابێ!"

ئیدی ئەوەبوو من بۆماوەی شەش مانگ بڕیاری تەجمیدكردنم درا، بەڵام بە كردەوەو لە واقیعدا هیچ گۆڕانكارییەك ڕووینەدا، چونكە ئێمە هەر لەنێو پێشمەرگەو بارەگاكانمان بووین، جەنابی ڕابەرو ئەوانیش مەگەر بە سەفەر هاتبان، ئەگەرنا هەر لە(سنە) بوون!

مامۆستا حەسەن‌و برایانی بنكەی قووڵەهەرمێش دوای ئەوەی سەرمای پاییز تەنگی پێهەڵچنین‌و، بەهۆی هەڵوێستەكەی قیادەشەوە كە شتێكی دیكەیان لێ چاوەڕوان دەكرد! ئەو بنكەیەی كە بەتەمابووین دروستی بكەین، دروست نەكراو، هاتنەوە بۆ خدراوێ!

# ساڵو نیوێك تەمەن لە (خدراویّ) و چالاكیو جموجوڵی جۆراوجۆر

ماوەی ئەو ساڵو نیوەی كە لە (خدراویّ) بووین ـ لە مانگی (٩/ ١٩٨٩) تاكو (٥/ ٣/ ١٩٩١)ـ چ وەك خۆم، چ وەك هێزی حەمزەو پاشان شافیعی، كۆمەڵێك چالاكییو جموجوڵی جۆراوجۆرمان هەبوون، كە بە پێویستی دەزانم لە حەوت خاڵاندا سەرو ئاماژەیان پێبكەم:

## ١- ژیان و گوزەرانی سەخت و سادە :

ئێمە هەموولایەكمان بە پێشمەرگەو بەرپرس و ماڵەكانمانەوە لە (خدراویّ) ژیانو گوزەرانێكی زۆر سەختو دژوارمان هەبوو، لە هەموو رووێكەوە، بەڵام چونكە بە عەزمو ئیرادەیەكی پۆڵایینەوە دەستمان دابوویە، پێمان ئاسان بوو، كە لێرەدا واباشە ئاماژە بە چەند شتێك بكەم:

أـ ئەو ماڵانەی لە خدراویّ بووین ـ كە لە سەرەتاوە سی (٣٠) ماڵێك دەبووین ـ بە بارەگای هێزیشەوە، بە هەموومان یەك موەللیدەی گچكەی كارەبامان هەبوو، هەر ماڵە گلۆپێكی گچكەی پێدرابوو، كاك دكتۆر ئەحمەدی هەولێریی سەرپەرشتیی كارەباو موەللیدەكەی دەكرد!

بـ هیچ ماڵێكو بارەگای هێزیش تەلەفزیۆنمان نەبووو لە رێی رادیۆوە ئاگاداری هەواڵو دەنگو باس دەبووین!

جـ كارتی سپییمان هەبوو خواردەمەنی هەرزانمان بە (كۆپین) وەردەگرتو، كاك مەلا سەردار سلێمانەیی سەرپەرشتیی ئەو كارەی دەكرد.

د- هەندێك ماڵە دۆستی خۆمان خەڵكی دەڤــەری پشدەر كە دەوڵەمەند بـوون، جاروبـار ئاژەڵێكیاــن دەهێنـاو لـە خـدراوێ ســەریاندەبڕیو، گۆشـــتەكەمان بەسـەر مقـەڕو ماڵـەكاندا دابەش دەكـرد.

## سێ بیرەوەریی خاتوون مەلا ژنی هاوسەرم لە خدراوێ:

**یەك:** (گوڵشـــاد خان) هاوسەری كاك خالد (أبو هـاجر) گێـڕایەوە، كـە ڕۆژێكیـان لـە خدراوێ میوانی ماڵی ئێمـــە بووەو لە كاتێكـدا كـە منداڵەكانـــمان: بەسـۆز، پـیرۆزە، محمـــد، عبدالرحمن، نوستوون، ڕۆژێكی ساردی زستان بووەو باران بەلێزمـە بـاریوە، هەر ئەوەندەیان زانیوە سەربانی خانووەكە – كـە خانوویـەكی گـڵ بـوو- بـە هـۆی ئـەو گۆماوەوە كە لەسـەری دا وەسـتاوە، كـون بـووەو قـوڕو ئـاوێكی زۆر هەڵڕژاوەتـە نێـو ژوورەكەوە! گوتی: منیش وامزانی ئێستا مامۆستا ژن نارەزایی دەردەبـڕێو ناشـكوریی دەكـات! بەڵام هیچ خۆی تێكنـــەداو خێـرا منداڵـەكانی گواســـتەوە بـن دیوارەكـانو گوتی: ماشـــەڵڵا خوایە لەو هـەموو بەرەكەتو ڕەحمەتـەی ئەمســـاڵ!

شایانی باسە ئەم بیرەوەرییەم لە نامیلكەی: ﴿خاتوون مەلا ژن ئافرەتێكی هەڵكەوتووو هاوســەرێكی ناوازە﴾دا كە بەشێكیشە لەكتێبـی: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شـەریعەتدا) لە زاری بەسۆزخانی كچمەوە هێنـاوە، بەڵام ئەوكاتـە وایزانیبـــوو لە(سـازگار خـان)ی هاوسەری كـاك جەمال ئەحمـەد قووڵەڕەشیی شـەهیدی بیسـتوە، كەچی كە گوڵشاد خان سـەردانی كـردین، گـوتی: ئـەوە مـن بـووم ئـەو دیـــمەنەم بینیـــوەو بـۆ بەسـۆز خـانم گێڕاوەتـەوە.

**دوو:** لـە خـدراوێ هەنـدێك پێشـــمەرگەی زگورتییمـان هـەبوون، یـەك دووانێكیـــان هـەر دەرداژۆو نـەخۆش بـوون، هەشـــیانبوو نـەخۆش دەكـەوتو جـلو بـەرگی چڵكنـــی خۆیانیان بۆ نەدەشـۆررا، خاتوون مەلاژنیش بەبێ ئاگـاداریی مـن دەینـارد- سـەرەڕای سـەرقاڵییو منداڵـەبەریی خۆی- پۆشاكە چڵكنەكانی ئەو پێشـمەرگانەی دەهێنـاو بـۆی

دەشـــۆردن‌و بـــۆی دەناردنـــەوەو دەیگـــوت: گونـــاهن نەخۆشـــن‌و دایـــك‌و خوشـــك‌و هاوسـەریشیان لەلا نیــە، جلەکانیـان بۆ بشـۆن.

دیارە بۆیەش بەبێ ئاگاداریی من ئەوەی دەکـرد، چـونکە دەیزانـی پـێم خـۆش نیـە، دەمگوت با پێشمـەرگەکان فێری تەنبـەڵیی نەبن، خۆیان پاك‌و خاوێنـیی خۆیان بکەن.

ﷺ: سـەخاوەت‌و پەرۆشیی هاوسەری ڕەحمـەتییم: ئـەمڕۆ (١٠/ ٩/ ٢٠١٤ز بەرانبـەر: ١٥ ذي الـقعـدة ١٤٣٥ك) لە سەردانێکدا بۆلای دایکی کاك (طـه حـاجی ظـاهر) حاجی فاطمـە خـــان، عائیشـــە خـانی هاوســـەری کـــاك طـه، ئـەم بیرەوەرییـەی هاوسـەرم (ڕوخسار خان)ی گێڕایەوە، هی ئەو کاتەی کە پێکەوە لە (خـدراویێ) بـووین، سـالانی (١٩٨٩ـ ١٩٩١)، گوتی: دایـك مـەلا ژن (ڕوخســار خـان) کـە چێشتی لـێ دەنـا، هەرکەس لە پێشـمەرگەکان بەو نیزیکـانەدا ڕەتبـووایەو، بۆنی چێشـتەکەی بۆچووبایە، بانگی دەکردو داوای لێـدەکرد کـە هـەر دەبـێ لێـی بخـــوات، هـەتا جـاری واهـەبوو چێشتەکە تەواو دەبوو و هیچی بۆخۆیان نەدەمایەوە!

ئێمەش دەمانگوت: چۆن وادەبـێ بۆخۆتان هیچ نەمـایەوە؟!

ئەویش دەیگوت: بەخوا مـادام بۆنیـــان کـردوە، نـاتوانم لێـی بخـۆم هـەتا ئـەوانیش نەیخـۆن، باجاریێ ئەوان بیخـۆن، دوایـی بۆخۆمـان هـی دیکـە ســـازدەکەمەوە، ئەوانـە دایك‌و خوشکیان لێرە نیـە نازیان بکێشـێ!

## دەرۆیش شـووشـەو مووس‌و ئاگـر دەخوات‌و شـێخیش سـێوو پرتەقاڵ‌و مـۆز:

هەر لەو سەروحـــەدەدا سـالانی: (١٩٨٩ـ١٩٩٠) لەگـەڵ هەنـدێك لـە برایـان کـە لـە ـ خدراویێ)بووین، لە یەکێك لە گەشتەکانـمان دا سەردانی شێخێکمان لە بنەماڵـەی (شـێخانی زەنبیـــل) لە مەهاباد (سـابلاغ) کرد.

ئنجـا جەنـابی شێخ کە خوێندەواریـی مەلایەتیشـی هـەبوو، پیـاوێکی قسـەخۆش بـوو، بۆی گێڕاینـەوە کـە ڕۆژێکیـان پزیشـکێك هـاتوە بـۆلای بـۆ لێکۆڵینـەوە لـەبارەی ئـەو شـتە

سەرسوڕهێنەرو یاسادڕ ( خارق العادة)انەوە کە دەروێشەکان دەیانکەن؛ لە خواردنی شووشەو مووس و ئاگرو، شیشەی ئاسن بەگووپ و کەلەکەی خۆداکردنو ... هتد.

گوتی: ئنجا دوای ئەوەی پزیشکەکە ماوەیەکی باش سەرنجی ئەو کارانەیدا کە دەروێشەکان دەیانکردنو، دەفتەرو قەڵەمێکی پێ بوو هەر شتی دەنووسیی و دەنووسی دوایی بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

عەقڵ و عیلمی من لێرە وەستاو نازانم چی بنووسم:

زمان بە سۆپەی گەرم و سووربووەوە دابێنیی و، نەسووتێ!

شووشەو مووس بخۆیو، زمانت نەبڕێ!

زەرگ لە گووپ و کەلەکەو زمانت بدەیو، خوێنی لێ نەیێ!

شێخ گوتی: ئنجا پزیشکەکە ڕووی تێکردم و گوتی: جەنابی شێخ! دەروێشەکانت ئەو شتانە دەکەن و شووشەو مووس و ئاگر دەخۆن، ئەدی جەنابت دەتوانی چی بکەیو چی بخۆی؟!

گوتی: منیش گوتم: کاک دکتۆر منیش دەتوانم سێو بخۆم، دەتوانم پرتەقاڵ بخۆم، دەتوانم مۆز بخۆم!

## ٢- گرنگییدانمان بە فێرکردن و پەروەردەی وردو درشت:

ئێمە لە خدراویێ گرنگییەکی باشمان بە فێرکردنو پەروەردەکردنی هەمەلایەنە دەدا:

أـ جاریێ هەفتانە وتاری هەینیمان هەبوو، کە هەر خۆم وتارم بۆ دەدان و، ئەگەر لە سەفەریش بوومایە، بە زۆری (مامۆستا مەلا ئەحمەدی سینەمۆکیی)م "خوا لێی خۆشبێ" ڕادەسپارد جومعەیان بۆ بکات.

ب- هەروەها مەگەر چۆن دەنا ڕۆژانە دەرسم هەبوو، چ بۆ پیاوان چ بۆ ئافرەتان.

ج- هەروەها منداڵەکانیشمان کە بە زۆری وردیلە بوون، لە ژوورەکەی کاك (عبدالكريم قادر خدرەسوور)دا هەردووك برای پێشمەرگە: (کاك کاروان هاشم)و (کاك لقمان ژاراوەیی) خۆیان تەرخان کردبوو، بۆ دەرس پێگوتن‌و پەروەردەکردنیان، تاکو نەخوێندەوارو بێئاگا دەرنەچن.

## ٣- کاروباری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی:

### أ- سەردان‌وگەڕانی جۆراوجۆرمان:

بە سروشت گەڕان بەسەر خەڵکەوەو سەردانکردنیان، لە نزیکەوە پێ ئاشنابوون‌و لێ ئاگاداربوونیانم پێ خۆشە، دەزانم ئەگەر بە دڵێکی ساغ‌و نیەتێکی باشەوە بکرێ، بەرەکەتی زۆرەو پاداشتی قیامەتیشی گەورەیە، چونکە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: ﴿قَال الله تعالى: وَجَبَتْ مَحَبَّتي للمتحابِّين فيَّ، والمتَجالسين فيَّ، والمتزاورين فيَّ، والمتباذلين فيَّ﴾ رواهُ مالك في الموطأ: (٨١٨، ٨١٩) وصحَّحهُ النووي في رياض الصالحين، ص ١٧٠.

واتە: خوای بەرز فەرموویەتی: خۆشویستنم پێویست بووە بۆ کەسانێك کە: لەبەر من یەکدییان خۆشدەوێ، لەبەر من پێکەوە دادەنیشن، هەروەها لەبەر من سەردانی یەکدی دەکەن‌و، لەبەر من چاوپۆشیی لە یەکدی دەکەن.

ئەو ماوەیەش کە لە خدراوێ بووین سەردان‌و گەشتی دوورو نزیکی زۆرم دەکردن، بە زۆرییش مامۆستا حەسەن‌و کاك مەلا شەریف، یان یەکێکیان وێڕای چەند برایەکی دیکە هەر لەگەڵ دەبوون، وە بە زۆرییش کاك تەهای حاجی زاهیر شوفێر دەبوو.

**سەردانەکانمان بۆ لای ئەم لایەن‌و شوێنانە بوون:**

أ- هێزەکانی بزووتنەوە: وەك: هێزی ئازادیی، هێزی حسن البنا، هێزی نەصر، هێزی صلاح الدين، هێزی خالد، هێزی فاروق...

ب- ئۆردوگاکان کە خەڵکی خۆمانیان لێ نیشتەجێ بوون: وەك: ئۆردوگای دیڵزە، ئۆردوگای دزڵی، ئۆردوگای باراماوە، ئۆردوگای کامیاران.

ج- خەڵکی خۆمانو خەڵکی ئێرانیی لە شارەکانی ئێران: وەك: سەردەشتو بانەو خانێو نەغەدەو مەهابادو سەقزو بۆکانو شنۆو سنەو مەریوانو کامیارانو... هتد.

د- لایەنە سیاسییەکان:

یەك: پارتی: کە ئەو ماوەیە دووجاران سەردانی کاك مەسعود بارزانیمان کرد لە (راژان)، جارێکیان لەگەڵ کاك جوهر ئاغای لێوژێو کاك حاجی برایم شێرخۆر، جارێکیشیان خۆمو مامۆستا حەسەن بابەکر، ئەوانیش (کاك مسعودو کاك عەلی عبداللە)ی جێگری بوون.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە لە یەکێك لەو دوو کۆبوونەوەیەدا، من هەندێك تێبینیی و پێشنیارم ئاراستەی کاك مەسعود بارزانی کردن، دوایی کاك عەلی عبداللە لە دەرفەتێکدا "کە پێموایە کاك مەسعود چووبووە دەرێ بۆ دەست شۆردن" گوتی: مامۆستا! زۆر سوپاست دەکەم کە ئەو پێشنیارو تێبینیانەت عەرزی کاك مەسعود کردن، لەمێژبوو ئەو شتانەم لەدڵدابوون عەرزی بکەم! هەڵبەتە منیش زۆرم پێ سەیربوو، جێگری سەرۆك لەمێژبێ هەندێ پێشنیارو تێبینیی لە دڵدا هەبێ، بۆی نەگونجابێ پێیبڵێ!!

دوو: حیزبی سۆشیالیست: ئەمانیش بەلای کەمەوە دووجار سەردانمان کردن، جارێکیان لە(کاولان)و جارێك یان دووانیش لەلای "نێوزەنگ"و هەردووك جاریش کاك (رەسول مامەند) سکرتێری حیزبو، خاڵە سەید کاکە ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون.

سێ: حیزبی شیوعی: کە ئەوانیش ئەوکاتە بارەگایەکیان لەلای قاسمەڕەشو دۆڵی نێوزەنگ بووو (کاك مەلا حەسەن) بەرپرسی بارەگاکەیان بوو.

**چوار: پاســۆك :** ئەوانیش بارەگایەك لەو ناوچەیــەی پێشــوو بــوو ، بەرپرســەكەیان لــەوێ ناوی (مــلازم شوان) بوو .

**پێنج: یەكێتــی :** كە پێشتر باسمان كردو ، دوای ئەوەش كەمو زۆر كۆبوونەوەو دیـدارمان پێكــەوە دەبوون ، بەتایبــەت پێش دەستپێكردنی راپەڕینی جەماوەریی ســاڵی ١٩٩١ .

**ب – پێــشوازییكردنـمان لە میوانـانی جۆراوجۆر :**

ئێمــە لە خــدراوێ زۆر جۆرە میوانــمان دەهــاتن :

**یــەك:** ئەندامانو پێشمەرگەكانی هێزەكان ، كە بە مەبەســتی ڕاوێژكردنو پرسو ڕا لەبارەی چۆنیەتیــی چاكسازیی كردن لە بزووتنەوەدا دەهــاتن .

**دوو:** خەڵكــی عەشــایەرو خزمو دۆست ، چ لەنێو ئێــرانداو چ لە عێـــراقەوە .

**ســــێ:** برایــانی بــانگخوازو مامۆســـتایانی ئێرانیــی ، بەتایبــەت لــە شــارو دێیــەكانی دەوروبەرەوە ، بۆ وێنــە : برایانی مەكتــەب قوڕئان ، وەك : كــاك حەســـەنی ئـەمینیو ، كاك فاروقی فەرســاد ، خوا لێی خۆشــبێ... كە زیاتر لە جارێك لە سنەوە هاتن .

**چوار:** كەســایەتییو لایەنە ســیاسییەكان .

## ٤- كاروباری ڕاگەیانـدن :

زەقترین چالاكییمان لــە بــواری ڕاگەیاندنــدا ، لــەو مــاوەی ســاڵو نیــوەی مانــەوەمان لــە خدراوێ ، بریتیبوو لە نووسینو چاپو بڵاوكردنەوەی چەند كتێــبو نامیلكــەیەك ، وەك :

١ـ ســۆزی نەتەوایەتیــی .

٢ـ ڕێبــازی پێغــەمبــەر " صلى الله عليه وسلم " كــامەیــە؟

٣ـ كوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟ !

٤ـ ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون .

٥ـ پێناســەی حیزبی بەعسو چارەســەری مەســەلەی كورد .

٦ـ دەردو دەرمـانی بزووتنـەوەی ئیســلامیی.

٧ـ حوکمی گەڕانـەوە ژێـر نیری طــاغووت.

دیارە هـەرکام لـەو حــەوت کتێـبو نامیلکەیـە بەســەرهاتی تایبەتــی خـۆی هەیــەو هەرکامیـان بارودۆخـێكو هەلومەرجێـك بووەتە هـاندەری نووسرانی:

١ـ هـەرچی (سۆزی نەتەوایەتیی)یە ویســتم وەلاّمی پرســیارگەلێکی زۆری پێبــدەمەوە، کە لەبارەی بابـەتی نەتەوایـەتیی و نیشــتیمانپەروەریی و کوردایەتییـەوە دەورووژێنـران، خەڵکێك دەیویست بزانـێ: کە ئایـا ئێمە وەك ئیسـلامیی چیمان لە هەگبــەدا هەیــە، بۆ چارەســەری کێشــەی لەمێژینـەی بێقـەوارەیی کــوردو، ســڕانەوەی بــوونی لەسـەر نەخشەی سیاســیی دنیـا لەلایەن زلهێـزەکـانەوە؟!

٢ـ (ڕێبـازی پێغـەمبـەر "صلى الله عليه وسلم" کامەیە؟!)یش، ویســتم ببێتـە پێناســەیەك بۆ ئەو جۆرە تێگەیشــتنەی کە ئێمە هەمانە لەبارەی ئیســلامو مســوڵمانەتییەوە.

٣ـ (کوردســتان بۆ ویران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتــەوە؟!)یش، ویســتم تێیــدا وەلاّمــی ئەو دوو پرســیارە گــەورەو گرنگــە بدەمــەوە، کــە ئەوکــاتە لــە زەینــی زۆربــەی خەڵکیـدا هەبوون.

٤ـ (ڕێگای صـاڵح بـوونو بـەرەو خـوا چـوون)یش کـە هـەتا ئێســتا پێـنج جـار چـاپ کراوەتەوەو وەرگێـڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیو فارسیش، وەك دواتـر باسـی دەکـەم، هەوڵێکی بەندەبوو، بـۆ چـۆنیەتیی شـکاندنی تێنوێتیــی ڕووحیــیو، زیـاتر بـۆ خـوا ســوڵحانو بەرەو تەقـواو ئیحسـان هەنگـاونان.

٥ـ (پێناســەی حیزبی بـەعسو چارەســەری مەســەلەی کــورد)یش، کــە هــەر بەشــێکی ســۆزی نەتەوایەتییــە، هەلــومەرجی ئەوســاکە پێویســتی کــرد، کــە لــە شــێوەی نامیلکـەیەکی سەربەخۆدا چاپو بلاّوبکرێتـەوە.

٦ـ (دەردو دەرمـانی بزووتنـەوەی ئیســلامیی)یش هـەوڵێکی بەنـدەبوو بـۆ پەنجەخســتنە ســــەر نەخۆشــــیی و دەردەکــــانی بزووتنــــەوە، وە شــــێوازو چۆنیەتیــــی

چارەسـەركردنیشیان، دیارە كەسانێكیش لە قیادەی بزووتنەوە پێـی قەڵـس‌و لالـووت بـوون‌و لـەوبارەوە ڕەخنـەیان لـێم هـەبوو، بـەلاّم پێموابـووو ئێسـتاش پێموایـە كـە بەهەڵەداچوو بوون، چونكـە عەیب‌و كەموكووڕیی هیـچ كەس‌و لایەنێـك، بـە خـۆ لـێ بێـدەنگ كردن لانـاچێ.

٧ـ (حوكمـی گەڕانـەوە ژێـر نیـری طـاغووت)یش، كـە دوای عەسـرێك لەسـەر بـانی بارەگای هێـزی حـەمزە لـە كۆتـایی سـاڵی (١٩٩٠)دا نووسـیم، پاڵنـەری سـەرەكیی نووسرانی بریتیبوو، لە بەرچاو ڕوونكردنەوەی كەسـانێك كـە دووچـاری نائومێـدیی بووبوون‌و، بیریان لە گەڕانەوە بۆ ژێر چەپۆكی ڕژێـم دەكـردەوە، تەنانـەت ژنێـك لـە مێردەكەی یاخی بووبووو گوتبـووی: "یان عیراق یان تەلاّق"، ئیدی لەو نامیلكـەیەدا ڕوونم كـردەوە، كە دروسـت نیە كەس بگەڕێتـەوە ژێـر سـایەی شـوومی ڕژێـم‌و بـن (نیرو ئـاموور)ەكەی!

شایانی باسیشە سەرجەم ئـەو كتێـب‌و نامیلكانـە، لەلایـەن ڕاگەیانـدنی هێـزی حـەمزەوە چاپدەكران، كە پێشتر باسی ئەو برایانەمان كرد كە لەو بوارەدا ڕۆڵیـان دەگێـڕا.

هـەروەها سـەرجەم ئـەو بەرهەمانـەش هـەم لـە نێوخـۆی ئەنـدام‌و پێشـمەرگەكانی بزووتنـەوەدا، هەم لەنێو لایەنە سـیاسـییەكانی دیكەشـدا، بڵاّودەكرانەوە.

## ٥- كـاروبـاری حـیـزبیـی:

دەتوانم بڵێـم گرنگترین‌و بەرچـاوترین كـاری حیزبیـی‌و هەوڵـدان بـۆ چاكسـازیی لـەنێو بزووتنەوەدا، كـە مـن لەوماوەیـەدا پێـی هەڵسـام، بریتیبـوو لـە پێكهێنـانی (كـۆڕی ڕاوێـژی یەكگرتـــوو)، كە دیـارە بناغـــەی (شـــوورای یـەكگرتوو) هـەردووك هێـزی: (حـەمزە)و (شـافیعی) بوون، بەلاّم دوایی هێزەكانی: (خالـد)و (صـلاح الـدین)و (فـاروق)و چـەندان كەسایەتیی دیارو بەرجەسـتەی ئەوسای نێو بزووتنـەوەش، كـە هـی هـەموو، یـان زۆربـەی شارو ناوچەكانی كوردسـتان بوون، هاتنـە نێوی‌و تێیـدا بوونە ئەنـدام.

دیارە ئامانجیش لە پێكهێنانی ئەو شووڕای یەكگرتووە، چاكسازییكردنی هێمن‌و تەباییانە بوو، لەنێو بزووتنەوەدا، دوور لە پەنابردنەبەر شێوازی توندو زبر.

شایانی باسیشە هێڵە گشتییەكانی ئەو چاكسازیی‌و گۆڕانكارییەم لە كتێبی (دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی)دا خستبوونەڕوو، كە دەتوانم بڵێم: گرنگترین ئەو بنەمایانەی خستبوومنە ڕوو، بۆ چاكسازیی تێداكردنی بزووتنەوە، ئەمانە بوون:

١- پابەندیی بە بەرنامەو پەیڕەوێكی ڕاست‌و دروست‌و واقیعییەوە.

٢- كاروبار بەڕێوەبردن بە ڕاوێژ.

٣- بە دامەزراوەكردنی ئیشوكارەكان‌و دوورخستنەوەیان لە میزاجییەت.

٤- كاروبار بە ئەندامان سپاردن لەسەر بناغەی شایستەیی‌و توانا.

٥- دادگەریی‌و دەستپاكیی لە پارەو ساماندا.

٦- بە یەكسانیی‌و بە یەك چاو تەماشاكردنی ئەندامان‌و دوور لە خزمایەتیی‌و ناوچەگەریی.

٧- ڕەچاوكردنی حیكمەت‌و عیزەت لە مامەڵەكردن لەگەڵ لایەنە سیاسییەكاندا.

پێویستە ئەوەش بڵێم كە من لەو ماوەیەدا كاتێكی باشم تەرخان كردبوو بۆ چارەسەری كێشەو گیروگرفتەكانی هێزەكان، هەمیشە هەوڵی پەرەپێدانی برایەتیی‌و تەبایی‌و هاوكاریی نێوانیانم دەدا، چ لەسەر ئاستی ئەندام‌و پێشمەرگەكانی هەر هێزێك، چ لەسەر ئاستی هێزێك و هێزێكی دیكە، بە پێچەوانەی هەندێك كەس لە ئاستی قیادەدا، كە زیاتر كاریان لەسەر وردكردنی هێزەكان‌و لە یەك ترازاندنیان دەكرد!

## قسەیەكی خۆش

جارێكیان هەندێك برای هێزێك لەنێو خۆیاندا كێشەیان بووبوو، بەشێكیان پارەكەی (بیت المال)یان بردبوو، چووبوونە سنە بۆ لای ڕابەری گشتی، ئەو برایانەی دیكەش بەدوای پارەكەدا چووبوون‌و چووبوونە لای ڕابەرو گوتبوویان:

ئەو برایانە پارەکەی هێزیان زەوت کردوە!

جەنابی ڕابەریش گوتبووی: مەڵێن: زەوتیان کردوە!

گوتبوویان: باشە مامۆستا ئەوان پارەکەیان بردوە!

ئەویش گوتبووی: مەڵێن: پارەکەیان بردوە!

گوتبوویان: باشە پارەکەیان ڕفاندوە!

گوتبووی: ئەوەش مەڵێن!

ئنجا یەکێکیان گوتبووی: مامۆستا! پارەکە شوێنیان کەوتوەو بەدوایاندا هاتۆتە ئێرە!

## ٦- جموجوڵو چالاکیی پێشمەرگایەتیی:

### أ- چوونەوە نێوەوەی چەند مەفرەزەیەكو لێکەوتنەوەی ژمارەیەك شەهیدو بریندار:

**یەك:** لە ڕۆژی: ١٠/ ٩/ ١٩٨٩ برایەکمان بەناوی (حسن حسین) کە پێشمەرگەی هێزی حەمزە بوو، لەکاتی گەڕانەوەیدا لەنێو شارەوە، لە(گوێزێ) لوغمێك لەژێر پێیدا تەقیەوەو کوژرا، خوا بە شەهیدی وەرگرتبێ.

**دوو:** لەکۆتایی مانگی: (٩/ ١٩٨٩)دا لە کاتێك کە مەفرەزەیەکی هێزی حەمزە کە (شەریف وەرزێرو عبدالباقی رەسولو باوەڕ حسین)ی تێدابوون، لە (خدراوێ)ەوە چووبۆوە رانیەو چەند ڕۆژێك مابوونەوە، لە گەڕانەوەیاندا (فەقێ حەسەن نەبی) کە بە (فەقێ حەسەنی گچکە) ناسرابوو، دەلیلی چەند برایەك دەبێ، کە بیانگەیەنێتە مەفرەزەکە، بە مەبەستی هاتنە دەریان بۆ پێشمەرگایەتیی، بەسەر بۆسەیەکی جاشاندا دەکەوێ، دەستڕێژی لێدەکەنو دەکوژرێ، خوا بە شەهیدی وەرگرتبێ.

**سێ:** لە بەهاری سالّی: (١٩٨٩)دا هەواڵی گوللەبارانکرانی هەرکام لە: (نەوزاد، جیهاد، ئاری)مان لەلایەن رژێمەوە پێگەیشت لە هەولێر، خوا بە شەهیدی وەرگرتبن، کە سەر بە هێزی شافیعی بوون.

**چوار:** لە سەرەتای مانگی: (٦/ ١٩٩٠)دا مەفرەزەیەکی هێزی (حسن البنّا) کە ژمارەیان نۆ (٩) کەس بوو بە فەرماندەیی کاك (صلاح الدین) ـ کە دواتر لە ساڵی: (١٩٩١) دا لە تاسلُوجە کوژرا، لەکاتی بەرپەرچدانەوەی دژەهێرشی رژێمدا، خوا بە شەهیدی وەرگرتبێ ـ، پاش گرتنی رەبیەیەك لە (گەورە دێ) دەبنە دوو بەش، بەشێکیان دەچنە گوندی (مەلا داود)و بەشێکیشیان دەچنە گوندی (فەیاڵێ) لە (دۆڵەڕووت)و پاشان گوندی (هەنارانی خواروو)و لەوێ ئاشکرا دەبن، لەگەڵ هێزێکی زۆری رژێمدا لە سوپاو جاش رووبەڕوودەبنەوە، پاش زیانێکی زۆری دوژمن، هەر پێنجیان دەکوژرێن، خوا بە شەهیدی وەرگرتبن.

ئەوانەی دەکوژرێن: (سەلمان، هیدایەت، باوەڕ، ئازاد، نصرالدین).

ئەوانەی دیکەش لەکاتی گەڕانەوەیان لەسەر ڕووباری (هەرزنێ) جارێکی دیکە رووبەڕووی دوژمن دەبنەوە، بەڵام سەلامەت دەبن، بەڵام لەکاتی پەڕینەوەیاندا لە ڕووباری (هەرزنێ) ( کاك مەلا حامد) دەخنکێ، خوا بە شەهیدی وەرگرتبێ.

شایانی باسیشە کاك مەلا حامد لە جەولە یەك مانگییەکەی (١٩٨٧)دا بووبوو پێشمەرگەو من کلاشینکۆفێکم دایە.

**پێنج:** لە: (١٣/ ١٢/ ١٩٩٠)دا مەفرەزەیەکی هاوبەشی هەردووك هێزی حەمزەو شافیعی بە بەرپرسیارێتیی (کاك عبدالستار مجید)و ئەندامێتیی (١٠) پێشمەرگەی دیکە، کە ئەوانە بوون:

١ـ کاك بێستوون شێخاودەلەیی.

٢ـ کاك محمدأمین أحمد ژاراوەیی.

٣ـ کاك مصلح حمزە نووری.

٤ـ کاك ابراهیم أحمدە سوور شێخ ئاودەلانیی.

٥ـ کاك خالد پشت ئاشانی.

٦ـ کاك عبدالله پشت ئاشانی.

٧ـ کاك مەلا یوسف کەرکووکیی (شەهید).

٨ـ کاك خالد چەکۆیی/ دەلیل.

٩ـ د. عبدالمجید سلێمانی.

١٠ـ خالێ هەڵمەت.

بەمەبەستی لێدانی ڕەبیەی ئەو (فوج)ەی کە لە(کورتەك) بوو، بەرێدەکەون، بەڵام کاتژمێر (١٢)ی شەو لەلای کوێستانەکانی (تاتی دۆی)بەسەر کێڵگەی لوغمدا دەکەون، سەرەنجام کاك (محمدأمین أحمد) بریندار دەبێ‌و دەست‌و لاقی دەشکێن‌و، پاش زەحمەتی زۆر دەیهێننەوەو دەگەڕێنەوە بۆ خدراوێ.

ﷺ: لە: (٢٦/ ١٢/ ١٩٩٠)دا هەر کام لە ( مامۆستا مەلا محمد کونەفلووسەیی‌و، حاجی منەووەرو، دکتۆر خالص‌و، عبدالصمد مجروم) هەر چواریان کە پێشتر لە: (١٥/ ٢/ ١٩٩٠) گیرابوون‌و کادیرو مشوورخۆرو موجاهیدی جەربەزە بوون، لەلایەن رژێمەوە لە سێدارەدران‌و، تەرمەکانیان تەسلیمی کەسوکاریان کرانەوە، خوای بەرزو مەزن پلەی بەرزی شەهیدیی پێبەخشێن.

**کەواتە:**

تەنانەت ئەو بارودۆخە دژوارو نائومێدکەرەش، کە بەر لە ڕاپەڕین باڵی ڕەشی بەسەر شۆڕش‌و پێشمەرگایەتییدا کێشابوو، نەیتوانیبوو هیممەت‌و وورەی بەرزو پێشمەرگەی ئیسلامییەکان دابەزێنێ، وەك زۆرکەسی دیکە لە پەل‌وپۆیان بخات!

## ب ـ کردنەوەی چەند بنکەیەکی تازە لەسەر سنوورو لە خاکی عێراقدا:

لە هاوینی (١٩٩٠)دا هێزی (حەمزە) هەروەها هێزی (ئازادیی)یش چەند بنکەیەکیان لە (گوێزێ) دانان، پاشان هێزی حەمزە، زستانێ بنکەکەی گواستەوە بۆ (نێوزەنگ) کە بنکەیەکی گەورە بوو، جێی (٢٠ ـ ٣٠) کەسی تێدا دەبۆوە.

هـەروەها هێـزەكانی: (شـافیعیو حسـن البنـا)یش لـە گونـدەكانی (تووژەڵـێ)و (پشـكاوێ)و (گۆڕەشـێر)و پشـت (سـونێ) چـەند بنكەیەكیـان دانـابوون، هـەروەها هێزەكانی دیكـەشمان هـەركامیان لەسـەر سـنووری نزیـك بـە ناوچـەكانی خۆیـان بنكـەیان كردبوونەوە، چونكە پاش هێرشـی رژێم بۆ (كوێت) لە: (٢/ ٨/ ١٩٩٠)داو داگیركـردنی، هەموو لایەك هەستمان بـەوە دەكـرد، كـە گۆڕانكارییـەكی گـەورە لـە عێـراقو ناوچـەكەدا بەڕێوەیـە!

## قسـەیەكی خـۆش:

ڕۆژێكیان لە كاتێكـدا لەگـەڵ پۆلـە پێشـمەرگەیەك لـە جەولـەو گـەڕان بەسـەر بنكـەكانی هێزەكـانی خۆمـان لـە دەڤـەری: نێـوزەنگو سـونێدا، بـووم، لـە ڕێگـا تووشـی چـەند پێشمەرگەیەكی هێزی شـافیعی بووم، پـاش سـەلامو چـاكو چـۆنی، یـەكێكیان گـوتی: مامۆسـتا! پرسـیارێكم هەیـە: گوتم: فەرموو:

گـوتی: ئایـا كـە لـە ڕێگـا دەگەینـە پێشـمەرگەكانی پـارتیو یەكێتـیو شـیوعیو سۆشیالیستو پاسـۆك، ئەگەر سـڵاویان كرد، دروستە وەڵامیان بدەینـەوە؟

منیش گوتم: كاكە گیـان! تۆ نـاوت چییـە؟

گوتـی: هـەوراز.

گوتم: كاك هـەوراز! هێنـدە هـەوراز نەڕۆی باشـە!

گوتی: یـانی چی؟

گوتـم: نـەك هـەر دروسـتە وەڵامیـان بدەیـەوە، بـەڵكو پێویستیشـە، چـونكە خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾ النسـاء، واتە: هەركات سڵاوتان لێكـرا بە سڵاولێكردنێك، ئێوەش بە باشـتر لە خۆی یان وەك خۆی سڵاو بكەنەوە، بێگومـان خـوا بەسـەر هـەموو شـتێكەوە چاودێـرو لێپرسـەرەوەیـە.

پاشان پێگموت: نەك هەر ئەوە، بگرە باشتر وایە کە ئێمەی ئیسلامیی دەستپێشخەری سڵاوکردنو رێز لە خەڵك گرتن بین، پاشان ئەو خەڵكو میللەتەی ئێمە بەگشتی مسوڵمانەو، پێویستە وەك مسوڵمان مامەڵەی باش لەگەڵ تاك تاکیاندا بکەین، وە خۆمان بپارێزین لەوەی حوکمی نامسوڵمانیی بەسەر ئەمو ئەودا بدەین، مەگەر کەسێك کوفری روونو بێ پێچو پەنای لێ ببیسین یان ببینین، ئنجا لە حاڵەتی بەکافردانراني کەسێکیشدا، دیسان پێویستە هەر بە رەوشتو ئاکاری بەرزی ئیسلامەوە مامەڵەی لەگەڵ بکەین، چونکە ئیسلام، جگە لە چاکیی و پاکیی و رەوشت بەرزیی هیچی دیکەی لێناوەشێتەوە.

## هێرشی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بۆ سەر رژێمیی پەددامی دیکتاتۆر:

ئنجا سەرەنجام کە لە: (١٥/ ١/ ١٩٩١)دا هێرشی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی کە سی (٣٠) دەوڵەت بوون، بۆ سەر رژێم دەستی پێکرد، ئەو هەستە قووڵتر بۆوە، کە عێراق بەرەو گۆرانەو پێویستە ئێمەش خۆمان سازو تەییار بکەین، بۆ ئەو قۆناغە هەستیارەی بەرێوەیە!

## ٧- چالاکیی رووحیی:

وەك پێشتریش باسم کرد، هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە، عادەتم وابووە کە بەین بەین بچمە ئیعتیکافەوە، یان لانی کەم بۆ ماوەیەك کەنار بگرمو سەرگەرمی هەندێك عیبادەتی تایبەتیی خۆم بم، وەك نوێژو دوعاو بیرکردنەوەو رامانو رۆژووگرتنو قورئان خوێندنو...هتد، کە دیارە ئەوەش هاندەرێکی دەروونییە، وەك چۆن بابایەکی تینوو بەدوای ئاوێکی ساردو سازگاردا وێڵو عەوداڵ دەبێ، هەتا پێینەگاتو لێی تێراو نەبێ، دڵی دانامرکێو هەر هەست بە تینوێتیی دەکات، منیش لەرووی مەعنەویی و تامەزرۆیی لە خوا نیزیکبوونەوەی زیاترو باشتر، بەهەمان شێوە.

ئنجا ئەو ماوەی یەك ساڵو نیوە كە لە (خدراویێ)و بنكەو بارەگایەكانی دیكەی كە لەوێوە بۆیان دەچووین بووین، دەرفەتێكی باش بوو بۆ من كە لەو ڕووەوە هەوڵی زیاتر بدەم و، گەلێك جاران هەر لە خدراویێ برایانی پێشمەرگەم ئاگاداردەكردەوە، كە ئەوە من ماوەی چەند سەعاتێك دەچمە فلان بن بەردە، یان فلان پەنایەو لێمگەڕێنو بەلامدا مەیەن، بۆخۆم هەندێك نوێژو دوعا دەكەمو ... هتد.

هەروەها لەو سەروحەدەدا ماوەیەك نەخۆش بووم "پێموایە گرانەتام بوو" بۆیە چوومە بنكەكەی (قووڵەهەرمێ)و وێڕای ئیسراحەت كردنو پشوودان، كتێبی: (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خواچوون)یشم نووسی.

شایانی باسیشە هەستم دەكرد ئەو ئیعتیكافو پەناگرتنو كەنارگیرییەم، هەموو جارێ بۆم دەبوو بە هۆكاری تازەبوونەی ئیمانو گەشەكردنی طاعەت، وە بۆم دەبوو بە سەرچاوەیەكی وزەبەخشی لەبن نەهاتوو، لە بەرانبەر گرفتو كێشەو تەنگو چەڵەمەی جۆراوجۆری نێوخۆیی ـ وەك حیزب ـ و دەرەكییدا.

دیارە لەمیانەی ئەوەشدا، زیاترو باشتر لەو ئایەتە موبارەكانە تێگەیشتم كە خوای كاربەجێ تێیاندا پێغەمبەری خاتەم "صلی الله علیه وسلم" دەدوێنێو دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾﴾ المزمل.

واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئەی پۆشاك لە خۆوە پێچەر! شەوگار هەڵسە بۆ نوێژو مەخەوە مەگەر كەمێكی. نیوەی یان بڕێكیشی لێ كەم بكەوە، یان لێی زیاد

بکەو، بەڕێك‌و پێکیی قورئان بخوێنە. چونکە ئێمە لەمەودوا فەرمایشتێکی قورست دەنێرینەسەر. بێگومان ئەو عیبادەتەی کە لە شەودا دەکرێ کاریگەریی تونـدترو دەربڕینیشی ڕێکترە (چونکە دنیا کشوماتو بێ ژاوەژاوە). بەدڵنیاییەوە تۆش دەرفەتی گەڕان‌و سووڕانێکی درێژت لە ڕۆژێدا هەیە. هەروەها یادی ناوی پەروەردگارت بکەو بەتەواویی خۆتی بەرەولا یەکلایی بکەوە. پەروەردگاری ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوایە، جگە لەو هیچ پەرستراونین، دەجا هەر ئەو بکە بە وەکیل (کارپێ سپێرراوو مشوورخۆر)و لەسەر ئەوە کە (نەیارەکانت) دەیڵێن، خۆڕاگربەو بەشێوەیەکی جوان لێیان دووربکەوەوە...

بەڵێ، بێگومان هەرکەس بیەوێ بە ڕاستەڕێی خوادا بڕوات‌و ڕێبازی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" بگرێ‌و، بەملاولادا لانەدات‌و لاڕێ نەبێ، وە کولیش نەبێ‌و نەبەزێ، بەبێ توێشووی باشی پارێزکاریی‌و بۆ خوا سوڵحان‌و، دنیا بەکەمگرتن‌و دوارۆژ بەسەر دنیادا هەڵبژاردن‌و، پشت بە خوابەستن‌و ... هتد ئەوەی بۆ مەیسەر نابێ.

هۆکاری سەرەکیی بەزین‌و کولبوون‌وکۆڵدان، یان بەلاڕێدا ڕۆیشتن‌و خلیسکانی هەندێك کەسیش، کە پێگەو پلەی بەرپرسیارێتییشیان هەیە، هەر ئەوەیە!

### دیدارێك لەگەڵ کاك مەلا بەختیار سکرتێری ئاڵای شۆڕش دا!

هەر لەو ماوەیەدا کە لە (خدراوێ) بووین (١٩٨٩ – ١٩٩٠) ڕۆژێکیان سەردانی کاك مەلا بەختیارم کرد کە ئەو کاتە لە شاری (ورمێ) دادەنیشت.

دیارە من چەند کەسێکم لەگەڵدا بوون‌و ئەویش بە هەمان شێوە، وە کاتێك گەیشتین گوتی: ئەگەر پێت ناخۆش نەبێ برادەرێکم هەیە بە ناوی (دکتۆر نەوزاد) ئەویش بەشداری کۆبوونەوەکەمان بێ!

گوتم: باشە با بێ.

ئنجا كاتێك دكتۆر نەوزاد وەژوور كەوت، سەلامی كردو، سەرنجم دا یەكسەر ناسیمەوەو گوتم: بەخێر بێی كاك دكتۆر نەوزاد، جەنابت: (نەوزاد محمد صالح)ی سـلێمانەیی كـە لـە پۆلـی چـواری سـەرەتایی لـە قوتابخانـەی ڕانیـە پێكـەوە دەمانخوێنـد ـ دەوری بیسـت سـاڵ لەمەوپێـش ـ !

دیارە من لەو ماوە درێژەدا كاك نەوزادم نەدیبۆوەو هیچ هەواڵیشـم نـەدەزانی، بۆیـە كـاك مەلا بەختیارو كاك نەوزادیش پێیان سەیر بوو كە وا بە زوویی ناسـیمەوە.

هەڵبەتە لەگەڵ كاك مـەلا بـەختیاردا قسـەو باسـی زۆرمـان بـوون، لـە ڕووی فیكریـی و عەقیدەیی‌و سیاسـیی‌و نەتەوەیی یەو، ئەوەی جێی سـەرنج بـوو، ئـەوەبوو كـە ئـەو بـاوەڕو متمانەی بە هیچ كام لە سەركردەكانی ئەوسای كورد نـەبوو: مـام جـەلال، كـاك مەسـعود، ڕەسووڵ مامەند، كاك سامی عبدالرحمن، كاك نەوشیروان.

منیش لێم پرسی: كاك مەلا بەختیار! ئایا پێت وانیە ئەگەر جەنابیشـت لە شوێنی وان بی، هەروەك وان دەبی؟

گوتی: نەخێر، من وانابم!

گوتم: ئاخر بەڵگەت چییە كە وانابی، وە چی وات لـێ‌دەكات وانەبی؟

گوتی: ویـژدان و ئینسانییەت وام لـێ‌دەكات وانەبم.

گوتم: ئەدی نـەتگوت: هەرچـی بـە پێـنج هەسـتەكانم: (دیـتن، بیسـتن، تـامكردن، بۆنكردن، دەسـتلێكوتان) هەسـتی پێ‌نەكەم نیە؟

گوتی: با.

گوتم: ئەدی كوا، ئەو ویژدانو ئینسـانییەتە: ڕەنگی، دەنگی، تامی، بۆنی...؟!

گوتی: بێ‌قەزابی، تۆش مەسەلەكە هێنـدە قووڵ مەكەوە!

گوتم: كاك مەلا بەختیـار مـن مەسـەلەكە قـووڵ ناكەمـەوەو هـەر خـۆی قووڵـە، بـەڵام جەنابت سـەركێڵ تێیگەیشـتووی.

ئنجا گوتم: کەواتە تۆ بە پێی جیهانبینی خۆت کە جیهانبینی یەکی ماددییە، ناتوانی بوونی ویـژدانو ئینسـانییەت بسـەلـمێنی، چـونکە بـە هـیچ کـام لـە پێـنج هەسـتەکان هەسـتی پێناکرێ؟

گوتی: ئەدی تۆ دەڵێی چی لە بارەی ئاینـدەی منـەوە؟!

گوتم: من دەڵێم: هەرچـەندە لەگـەڵت هـاوڕانیم لـەبارەی هەڵسـەنگاندنتەوە، بـۆ ئـەو سـەرکردانەی ناومان هێنان (چونکە هەڵسـەنگاندنەکەی کـاك مـەلا بەختیـار بۆیـان، زۆر خراپ بوو!)، بەڵام دەڵێـم: تۆ هیچ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نیە کە لـەوان باشـتـر دەبـی، چونکە ئەو ویژدانو ئینسانییەتەی گوتت: دەبێتـە پاڵنـەرم بۆ چـاکتربوونم، نـەتتوانی بـوونی بیسـەلـمێنی.

شایانی باسیشە قسـەو باسو وتوێژەکەمان هەمووی لە کەش و هەوایەکی هێمنو ئـارام دا بەڕێوەچوو، بەڵام پێم وایە ڕەشـبینی یەکەی کاك مەلا بەختیار بەرانبەر بە سەرکردەکانی کورد لەو کاتەدا، هۆکارەکەی بارودۆخی سـیاسـییو نەفسـیی نالەباری خۆی بوو.

هەرچەندە منیش ئێسـتاشی لەگەڵـیـ ناڵێـم: دنیـای سـەرکردەکان شـامی شـەریف بووەو شـامی شـەریفە، بەڵام ڕەواش نیـە ڕاسـتو چـەپ (X) بەسـەر هـەموو شـتێکی خەڵك دا بێنیـن.

## سـەرکردایـەتیـی سـەفـەریی لە خـدراوێ!

پاش دامەزرانی ئێمـە لە خدراوێ، چـەند خانوویـك بـە نـاوی سەرکردایەتییـەوە لـەوێ دروستکران، کە جاروبـار جەنابی ڕابـەری گشتیو هەندێك لە مامۆسـتایانی دیکـەش، کـە ماڵەکانیـان هەر لە (سـنە) بوون! بە سەفەرو بۆ ماوەی چـەند ڕۆژێـك دەهـاتن بـۆ ئـەوێ، دوایی دەگـەڕانـەوە بۆ سـنە، پێشم شك نایـەت هیـچ دیدارو چالاکییـەکی ئەوتـۆ لەوێ ـ وەك سـەرکردایەتی ـ ئەنجـام درابێ.

دیارە ژمارەیەك پێشـــمەرگەی هێزی (نصـــر) کـە بـەزۆریی یـان هـەموویان خـەڵکی هەڵەبجـــەو دەوروبـــەری بـــوون، کـــاری پاســـەوانیی (حرســـیات)ی ئـــەو خانووانـــەی سەرکردایەتیـیان پێ سـپێررابوو، بە چـەند وەجبـەیەك دەهـاتن و دەوامیان دەکرد.

## لـەدایکبـوونی منـداڵی پێنجـەممـان (فاطمـة) :

لە: (١٥/ ١٢/ ١٩٩٠)، لە (خدراوێ) خوا منداڵی پێنجەمیشـی پێ بەخشـین، کـە کـچ بـوو وناومـان نـا (فاطمـــة)و سـەرەنجام پـاش حـــەوت سـاڵ لـە هاوسـەرگیریمان مـن و ڕوخسـارخان بووینـە باب و دایکی سـێ کچ و دوو کوڕ، بە پێـی ڕیزبەندیی تەمەنیـان:

١ـ بەسـۆز/ ١٩٨٤. ٢ ـ پـیرۆزە/ ١٩٨٦. ٣ ـ محەمـەد/ ١٩٨٧.

٤ ـ عبدالرحمن/ ١٩٨٩. ٥ ـ فاطمـــة/ ١٩٩٠.

خوا بە لوطـف و بەخششی بـێ سـنووری خـۆی منداڵـەکانی ئێمـەو هەموولایـەك سـاغ و سەلامەت و سەرفراز بکات و، لە گوناهباریی و عەیبداریی بیانپارێزێ و چەپاڵەیان بدات.

## کۆنگـرەی پێنجـەمی بزووتنـەوەی ئیسـلامیی لە (دزڵـی) :

پەیوەندی نێوان (کۆڕی ڕاوێژی یەکگرتـوو)و بەشێك لە قیادەی بزووتنـەوە کـە زیـاتر لـە سـنە نیشـتەجێ بوون، تا دەهات خراپتر دەبووو، زیاتر لەیەك دووردەکەوتینـەوە، دیـارە مـن فشاری زۆری هەندێك لە مامۆستایان و برایـانی دڵسـۆزو نیگـەران لـە بـارودۆخی نالـەباری بزووتنەوەم لەسەر بوو، کە دەیانگوت: دەبـێ جیـا ببینـەوەو حیزبێکـی دیکـە ڕابگەیـەنین، یەکێك لەوانە مامۆسـتا حەسـەن بابـەکر بـوو، وەك خۆیشـی لـە (هـەورازو نشـێو)ەکەیدا – لاپـەڕە: ٢٥١ –، باسـی کـردوە، بـەڵام مـن ڕازینـەبووم، دیـاربوو بـەبێ منـیش کارەکـە نەدەکـرا، بۆیە هـەروا ماینـەوە.

ئنجـا بـۆ نەهێشـتن یـان لانـی کـەم کەمکردنـەوەی بـارگرژیی نێوانـمان، بـەباش زانـرا کۆنگرەی پێنجـەم ببەسترێ و، ئـەوەبوو لـە: (١٣/ ٦/ ١٩٩٠)دا لـە گونـدی (دزڵـی) سـەر

سنووری ئێران – عێراق دەستی بە کارەکانی کردو، دەوری (١٤٠) کەس ئەندامی کۆنگرەبوون.

هەڵبەتە ئەو کۆنگرەیەش وەك سەرجەم کۆنگرەو کۆبوونەوەکانی دیکەی بزووتنەوە، جگە لە هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرکردایەتی – کە ڕابەریش هەلاوێرابووو لەنێو هەڵبژاردندا نەبوو – هیچ پرۆسەیەکی دیکەی ئەوتۆی تێدانەبوو.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو کە کاك کامیل حاجی عەلی کە برایەکی دێرین و دڵسۆزە، زۆرترین دەنگی کۆنگرەی هێنا، کە بە جەمسەرو پایەیەکی نێو بزووتنەوە دانەدەنراو، زیاتر قەناعەتی بە وەك خۆی هێشتنەوەی بارودۆخەکە هەبوو!

دیارە هۆکارەکەیشی ئەوەبوو، کە ئەو دوولایەنەی کێبەرکێ (منافسة)یان لەنێواندا هەبوو، هیچ لایەك دەنگی بەلایەکەی دیکە نەدا، کاك کامیلیش چونکە مەیلەو بێلایەن بوو، دەنگی لە هەردووك لاوە بۆچووبوو، هەرچەندە دەنگەکانی ویش نەگەیشتبوونە نیوەی ژمارەی ئەندامانی کۆنگرە!

دیارە کۆنگرە هیچ گۆڕانکارییەکی لە بزووتنەوەدا نەکرد، جگە لەوە کە یەکە سەربازییەکانی لە(هێز)ەوە گۆڕی بۆ (تیپ)، لەڕووی ئیداریی و ڕێکخستنیشەوە، سەرجەم ناوچەکانی کوردستان بۆ سێ (مەڵبەند) دابەشکران:

١ـ مەڵبەندی یەك: کە سنوورەکەی هەڵەبجەو دەوروبەری بوو، کاك مەلا ابراهیم خالۆ رحیم، بەرپەرسی بوو، "خوا لێی خۆشبێ".

٢ـ مەڵبەندی دوو: کە سنوورەکەی سلێمانی و هەورامان بوو، کاك مەلا طالب بەرپرسی بوو.

٣ـ مەڵبەندی سێ: کە سنوورەکەی پشدەرو بیتوێن و هەولێر بوو، کاك جەمال ئەحمەد مەلا فتاح شارباژێری (شەهید) بەرپرسی بوو، "خوا لێی خۆشبێ".

پێویستە ئەوەش بڵێین کە بەر لە راپەڕینی جەماوەریی بەهاری (١٩٩١) ئێمە وەك بزووتنەوەی ئیسلامیی، لەگەڵ لایەنەكانی نێو بەرەی كوردستانییدا، بەتایبەت یەكێتیو پارتی، چەندان كۆبوونەوەی هاوبەشمان پێكەوە كردن، بەمەبەستی خۆ سازو تەییاركردن بۆ ئەو قۆناغەی كە هەموو لایەك چاوەڕێمان دەكرد، بەڵام نەمانەزانی كەیو چۆن دێتە دی؟!

هەتا ئەوەبوو كە لە: (٥/ ٣/ ١٩٩١) لە شاری ڕانیەوە كە دواتر نازناوی (دەروازەی ڕاپەڕین)ی پێدرا، ڕاپەڕینی جەماوەری چەخماخەیدا، سەرەنجام هەموو شارو شارۆچكەكانی كوردستانی ڕووناك كردەوە، بە كەركوكیشەوە.

لێرەش كۆتایی بە بەشی یەكەمی بیرەوەرییەكانم دێنم، خوا یاربێ دەستپێكی بەشی دووەمی بیرەوەرییەكانم، باسی ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییە شكۆدارە دەبێ.

# ١- نامەکـــان

٣

ژمارە: ٥١

بەروار: ٦/٢٥/١٩٩٠ز

[illegible]
[illegible]
[illegible]

بسم الله الرحمن الرحیم

وما لکم لا تقاتلون فی سبیل الله والمستضعفین

بۆ نووسینگەی سیاسی یەکیەتی نیشتمانی
سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

دوای هەواڵپرسین و هیوای سەرکەوتن و خۆڕاگری و پشوودرێژی پتر .

ئاگادارتان دەکەینەوە کە برادەرێکتان بەناوی کاک ( حسن کوێستانی ) لە ڕۆژی ١٩٨٩/٩/٤ ز نامەیەکی بۆ فەرماندەی هێزی هەمزە کاک ( حسن بابکر ) ناردوەو تێیدا داوای لە ناوبــــراو کردوە کە ئەگەر بگونجێ لە ناوچەی ( قووڵە هەرمێ ) بنکە دروست نەکەن ، لەبەر پێداویستـــی خۆبان !!

هەڵبەتە ئێمە ئەو هەڵوێستەمان لاسەیرە ، چونکە کاتی خۆی کە ئەو هێزانە بنکەیان لـــەو ناوچانە بنیاتناوە بە ئاگاداری و پێخۆشحاڵی ئێوەو هێزە سیاسیەکانی دیکەش بووە !
وە ئێمەش بەپێویستی دەزانین لەو ناوچانە هەبین و ، چوار پێنج مانگیشە لەوێ نیشتەجێینو تازە نەچووین .

ئیدی بەهیوای پتەوکردنی ڕیزی برایەتیو پتر پاراستنی گفتو بەڵێن .

والسلام علی من اتبع الهدی

ل . سکرتاریەت

علی باپیر

چونکە زۆر ناشیرینە
نوسراوە، باوەڕناکرێت
١) ئەمە نامەیا بزووتنەوەیا ئیسلامیتی، چونکە
ئێمە لە ئەدەبی ئەوان بە دووری دەزانین
بۆیە وا ڕەتم کردووە بۆئەوەی نوسراوەکە
٢) بێ ڕەزامەندیی ئێمەش جەلال تالەبانی
ناتوانن لە ناوچەی
ئێمەبن . والسلام علی من اتبع الهدی

١

٦ بەناوی خوای گەورە و توانا

برای خۆشەویستمان مامۆستا شێخ عوسمانی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و سەرکەوتنتانم داوایە وئێمەش باشین.

لای جەنابتان شاراوە نییە کە ی.ن.ک و بەتایبەت لەم ڕۆژانەوە پێکەوە بەیاننامەیان جووتکردووە لەگەڵ ب.ئ. کوردستان دریغی نەکردووە لە هاوکاری تان. وە ڕێگەدان بە بوون و چالاکی بۆیان لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی ی.ن.ک دا.

بەڵام عەلی باپیر کە پیاوێکی داخ لە دڵ و قینی لە دڵە و زۆر ڕیشی ناحەزی ی.ن.ک و شۆڕشەکەمانە ئەوەی کە لە شارباژێڕ کە هاتووەتە دەر، هەر خەریکی تێکدانی نێوانمانە: بۆ نموونە.

① کە دێتە ناوچەکانی ئێمە نەک بە تەنیا ڕێککەوتننامەی جووتکراوی نێوانمان لەبەر ناگرێ، بەڵکو دەیەوێ بە کەڵەگایی (بە خۆسەپاندن) بە تایبەتی لە ی.ن.ک و گاڵتە کردن بە دەسەڵاتی شۆڕشگێڕیەک ڕەفتار بکات کە ئەمەش بە هیچ جۆرێک قابیلی قبووڵ نییە.

② نامەوگوتەی زۆر قسەی تیژانە و توندوتیژ و ناحەزانەیە بە جۆرێک کە شایەنی دڵە داخدارەکەی خۆیەتی لە ی.ن.ک و شۆڕشەکەمان. نامەی دوایی کە بۆ منی ناردووە زۆر بێ ئەدەبانە نووسیوە: دوا جوملەشی (والسلام على من اتبع الهدى) یە!! کە خۆتان دەزانن بۆ کێ دەکەی؟ وچۆن گوتراوە؟!

جا بەڕاستی ی.ن.ک چیکە ئەتوانای نەماوە قبووڵی بکات لە هەموو ناوچەی سەرکردایەتی خۆی، بۆیە

تکامان وایە هەرچی زووتر بیکێشنەوە
ئەگینا من ناتوانم چیتر هـ. پ. ك
زەبت بکەم و ئۆبالی خوێن و گوشت و ڕەفتاری
دوژمنانەی خۆی لە ئەستۆی خۆی دەبێت.
وقد اعذر من أنذر.
بەتایبەتی چونکە عەلی باپیر لە فیتنە و هەرانانەوە
دەگەڕێت و زۆریش ئاشکرایە کە گوتە و ڕەوشتی
ناعەزانەی بەرامبەر ی.ن.ك هەر خزمەتی بەعسی فاشی
دەکات و بەس.
ئیتر هیوادارم یەکێك بنێرن بۆ ناوچەکەمان
کە پابەندی بە دۆستایەتی و هاوپەیمانی هەبێت
و هەرچی زووە ئەو مەرەزیە لە کۆڵ خۆمان و خۆتان بکەنەوە.
دووبارە ڕێزمانی پایان بۆ جەنابتان

و هەر بژی بۆ
ئازادی کوردستان
مام جەلال

بگەڕێنە :

دووەم : وا دیارە نووسەری دێڕەکان بەرهەم و دەستکەوتی چاکی دەستگیر بووبێ لە بەغای شەڕی ناوخۆیی و کوردی کوژرادا . بۆیە هێناویە لەم هاتنە بێت جۆرە شەڕانە !!

سێیەم : ئێمە وەک ئیسلامی ترەنەک پێستیسلامی !! ] هەر لە سەرەتای مسوڵمانێتیمانەوە سەروماڵمان بە خوا فرۆشتووە و ، لە بەرانبەر پاراستنی عیززەت و ئابرووی ئیسلامدا خۆمان بە خاوەنی هیچ شتێکمان نازانین و ، وەک کڕیارێش بە دوای شەهیدبوون و مردنی شەرافەتمەندانەدا دەگەڕێین ، وە خەڵک چەندە ژیانی خۆشی دەوێت ، ئێمە هێندە عەودالی مردنین لە پێناوی خوا و ئیسلام و خەڵکی چەوساوە و بێ شوانمان دا .

وە ئێمە بە پێی فەرمانی خوا ( فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم .. ) بە عەزمێکی پێداگیرانە و دڵێکی پڕ باوەڕ و یەقینەوە . بە پیریە هەر جۆرە دەستدرێژی و خۆسەپاندنێک دەچینەوە ، دەبینیان وا بە ستەم و زوڵم و خراپە هەر ستەم و زوڵم و خراپە بوو چ باباییەکی ئەمریکی و ڕووسی و بەعسی بیکات چ بابایەکی کورد !!

دواتریش ئێمە ئامادەی ئەوەشمان دەگرتووە و چاوەڕێی واقیعیەت پەیدا کردنی فەرمایشتەکە بووین ، بەڵام وادیار بوو قسەکە بەرهەڵبەرکێکردنەوە نەبوو و هەر هەڕەشە و زۆرداری دەرووی گەرم بوونێکی کاتی بوو !! خوا نازانین داهاتووش چ دەگەڕێتێ !

٤) بیستوومانە کە (مام جلال) گوایە زۆر بە توندوتیژی قسەی کردووە بەرامبەر ئەو پەیامە تووڕەیانەی بووە . پێوە کە لە کۆتایی نامەکەماندا نووسیبوومان وە (والسلام على من اتبع الهدى ) . بەڵام بیستوومانە هێنانە و تووڕە بوونەکەی ئەگەر هانەدەرو ڕەوگەی بێپەنای دەستی نەبێت . لە جێی خۆیدا نەبووە . چونکە پەیامێک ناردراو هیچ مانایەکی ستەمکاری خراپ ناگەیەنێ ـ هەروەک قسەی حەزرەتی موسا علیه السلام بۆ فیرعەون ـ بەڵگەشمان بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەمان زۆرن ، بەڵام بە هیوای ئەوەین دەخەینە بەرچاو ئەوەش ئەوەیە کە بەرێز مامۆستا ملا عوسمان ـ ڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی ـ لە نامەیەکیدا کە بۆ ئەندامانی کۆنگرەی ڕاپەڕین . زۆرتر نەوەی نووسیوە لە بەرواری ٢٩/٥/١٣٦٨ دا لە کۆتایی

# ٢- وێنەکان




**لە ڕاستەوە ڕاوەستاوەکان:** مامۆستا غازی یوسف، ستار ڕەسول، عەلی باپیر، بەختیار عبدالرحمن، حەویز قادر ، ئەکرەم کوێخا عەلی، سەعید قادر، مامۆستا ووسو حەمەد.

**ریزی ناوەڕاست:** صلاح عومەر نەجار، ئازاد محەممەد وەستا قادر، غازی حەمەعەزیز، پێشرەو زاهیر، بەکر.

**دانیشتوکان:** فەرەیدون حەسەن غەریب، سیروان تۆفیق حەلاق، سالار یوسف دیان، ئازاد تۆفیق، سەلام کەمال



**خوالێخۆشبوو**

مامۆستا مەلا ئەحمەدی سکتانی

ناسراوی بە (قاضي)

یەکەمین مامۆستا کە دەرسی عەرەبیی و زانستە شەرعییەکانی پێگوتووم لە ساڵی (١٩٧٤) لە پەیمانگای ئیسلامیی لە ڕانیە.



(١٩/ ٢/ ١٩٧٦) سلێمانی – پەیمانگای ئیسلامیی چەند قوتابییەکی پۆلی دووی نێوەندی

**راوەستاوەکان لە لای ڕاستەوە:** مصطفى الله کرم، دڵشاد محەممەد کەریم، عەلی مەلا حوسێن.

**دانیشتوەکان:** جەزا قەرەداغی، تەیب مەلا عەبدوڵڵا، بایەزید عەبدوڵڵا، کاوە مەلا راجی، ئیدریس، عەلی باپیر، محەممەد حیسامەدین.



(١٣/ ٥/ ١٩٧٦) سلێمانی – پەیمانگای ئیسلامیی – دووەمی نێوەندی بەشی ناوخۆ

١. عومەر ئەحمەد حەمەد ٢. عەلی باپیر.



**سالّی (١٩٧٦)ز**

ئەبووبەكری برام بە باوەش هەلّگرتووە، تەمەنی یەك سالّ بووە



**(١٩٧٧)**

ئەبووبەكرو ئیبراهیمی برام بە باوەشەوەنو سەرو دەستە نێرگزیان پێیە، رۆژی جەژن بوو.



سـاڵی (١٩٧٧)ز

خۆم و هەر چـوار برایەکەم

لەلای ڕاسـتەوە لە پێشـەوە:

١- عبدالواحد

٢- عمـر

لە لای ڕاسـتەوە لە پێشـەوە:

٣- أبـوبكـر.

٤- إبراهيـم.



(١/ ١١ / ١٩٧٦)ز

پەیـمانگای ئیسلامیی – پۆلـی دووەم

١- خالیـد وەلـی.

٢- عەلـی باپیـر



(١٩٧٦)ز سلێمانی
پەیمانگای ئیسلامیی – پۆلی دووەم

١ حەسەن بابەکر.
٢ عەلی باپیر.
٣ محمد عبدالرحمن.



(١٩٧٦)ز سلێمانی/پەیمانگای ئیسلامیی – پۆلی دووەم

ئەمین حەمە شەریف، حەسەن بابەکر، عەلی باپیر، محەممەد ئەحمەد، محمد عبدالرحمن، حەسەن غەفور شەریف



سالآنی حەفتایەکان

لەلای ڕاستەوە

١ ئامینە ئیبراهیم رەسول.

٢ ئەحمەد ئیبراهیم رەسول.

٣ ئایشە عەولآ گۆران ( هاوسەری ئەحمەد).

لەلای ڕاستەوە بە دانیشتنەوە

١ نەنکم (بەس) دایکی دایکم.

٢ پورر ئەستی (براژنی نەنکم).



(١٩٧٧)

سەربانی پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی کە ئەو کاتە پۆلی سێی نێوەندی بووم

لەلای ڕاستەوە

١ عەلی باپیر.

٢ حەسەن بابەکر.

٣ خالید وەلی.



**قۆناغی ئامادەیی پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی**

عەلـی باپیـر



**(١٩٧٦ ١٩٨٠)**

مامۆستا شێخ ئەمین مستەفا کە لە پۆلی دووی نێوەندی تا شەشی ئامادەیی لە پەیمانگای ئیسلامیی دەرسی پێگوتووم



(١٩٧٦ – ١٩٨٠)

ژمارەیەك لە مامۆستایانی پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی دەرسیان پێ‌گوتووم، ئەوانەی کە دەیانناسم

**لەلای ڕاستەوە لە پشتەوە:** ١ مامۆستا غەفور مەجید . ٢ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا خاڵ

**لەلای ڕاستەوە لە پێشەوە :** ١ مامۆستا مەلا خالید . ٢ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا خەیاڵ



(١٩٧٦ – ١٩٨٠)

هەندێك لەو مامۆستایانی پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی دەرسیان پێ‌گوتووم، ئەوانەی کە دەیانناسم

**لەلای ڕاستەوە بە پێوە :** ١ مامۆستا مەلا خالید . ٢ مامۆستا عبدالرحمن قەرەداغی

**بە دانیشتنەوە :** ١ مامۆستا مەلا عومەر مەلا حەمەدەمین مام قاسمە .



(١٩٨١) نەجەف – بەشی نێوخۆیی
قۆنـاغی یەکـەمی زانکـۆ



(١٩٨١) نەجـەف



(١٩٨٢) تاران مەیدانی ئازادی



(١٩٨٢) تاران
١ مامۆستا ئەحمەد مەحمود . ٢ عەلی باپیر



(٢٥/ ٧/ ١٩٨٢) شاری قـه‌زویـن

له‌لای ڕاستـه‌وه‌:

١ فه‌قێ عه‌زیـز بایه‌وانیـی.

٢ ؟؟؟

٣ مامۆسـتا ئه‌حمـه‌د مه‌حمـود.

٤ عه‌لـی باپیـر



(٥/ ١٩٨٣) سـلێمانـی

له‌لای ڕاسـتـه‌وه‌: ١ ره‌سـول (ناسـراوه‌ به‌ سـه‌عد). ٢ عه‌لـی . ٣ محه‌مه‌د .
٤ عه‌بدولكه‌ریم قادر خدر سوور . ٥ عه‌لـی باپیـر . ٦ محه‌مه‌د حه‌مه‌ صالح / محه‌مه‌د كاره‌با



**(١/ ١٩٨٤) قەلادزێ – مالی حاجی خدر قەرە**

**لەلای ڕاستەوە:** ١ خدر عەبدوڵلا قەرە. ٢ خالید . ٣ عەلی باپیر . ٤ حەسەن جەلیل



**(١/ ١٩٨٤) رانیە**

یەکەمین وێنەم لەگەڵ ڕوخسار خان دا پاش هاوسەرگیریی



خوالێخۆشبوو :

حوسێن مام ئاغا ڕەسول

مامی هاوسەری ڕەحمەتییم روخسار

ئیبراهیم مام ئاغا ڕەسول ڕیش سپی

عەشیرەتی میرزا ڕۆستەمیان .

له ٩ / ٦ / ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردوە

لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٢ ە .



بەهاری (١٩٨٤) سەیداوە – دێراو هەڵدانەوە

لەلای ڕاستەوە: ١ مەلا عەلی بەردەکۆزیی . ٢ کاك خالید وەلی . ٣ عەلی باپیر . ٤ ؟؟؟؟



خوالێخۆشبوان:
خاڵ ئەحمەد ڕەشی ماخۆ بزنو زەینەب خانی هاوسەری.
دۆست و دڵسۆزی خۆم و ڕوخسار خانی هاوسەرم بوون.
خاڵ ئەحمەد لە (١٩/ ١/ ٢٠٠٥) وەفاتی کردوە.
لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٣ بوو.



**(١٩٨٤) گوندی گردجان**

بۆ وتاردانی هەینی چووبووم و ئەوکاتە مامۆستا عوسمان صۆفی عەبدوڵڵا لەوێ مەلا بوو

**دوو کەسەکەی لای چەپم:** ١- مەلا عوسمان صۆفی عەبدوڵڵا. ٢- مام زەینەدین.

**دوو کەسەکەی لای ڕاستم:** ١- سەلام حاجی برایم. ٢- ئەحمەد شاسوار (شەهید).



(١٩٨٦) گەڵووی ماخۆبزنان 
بەندەو چەند كاكە مەلایەكی دەڤەری پشدەرە ڕەقە




(١٩٨٦) ژووری كتێبخانەكەم لە (گەڵووی ماخۆبزنان) 
١ عەلی باپیر . ٢ مامۆستا عبدالرحمن نوورسی . ٣ مامۆستا مەلا ئەبووبەكری صدیقی 



**(١ / ١ / ١٩٨٦) (گەڵووی ماخۆبزنان)**

١ فەقی حەسەن ئەحمەد سوور (شەهید) . ٢ عەلی باپیر . ٣ فەقێ حەسەن نەبی حەسەن (شەهید)




**(٢٨ / ٨ / ١٩٨٧)**

**یەكێك لە بنكەكانی بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشوو**

مامۆستا مەلا عەلی بیارەیی (شەهید) و چەند پێشمەرگەیەك



( ٩ / ١٩٨٦) كوێستانی (گوێزێ) بارەگای یەكیەتی نیشتمانیی شاندی بزووتنەوەو یەكیەتی پاش ئیمزاكردنی ڕێككەوتننامە. شاندی بزووتنەوەی ئیسلامیی:

١ مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز. ٢ مامۆستا شێخ محەممەد ٣ عەلی باپیر. ٤ شێخ نەجمەدین

شاندی یەكیەتی: ١ دكتۆر فوئاد مەعصوم. ٢ مامۆستا ناظم دباغ. ٣ ئاوات عبدالغفور.



(٢١ / ٩ / ١٩٨٧) ڕێگای قەندیل / قەڵاتووكان

لەگەڵ طە حاجی ظاهردا



(٢٣ / ٩ / ١٩٨٧) چیای قەندیل
کـاروانی رۆیشـتنمان بەرەو (قەڵاتووکان)



(٢٣ / ٨ / ١٩٨٧) ڕێگای قەندیل
پۆلێـك پێشـمەرگەو كاروانچـیی بەرەو (قەڵاتووکان)



(٢٣ / ٩ / ١٩٨٧) كوێستانی مێرگژان

١ مەلا شەریف حوسێن ( شەهید ) . ٢ عەلی باپیر



(١٩٨٧) قەڵاتووكان – بارەگای هێزی حەمزە

ڕاوەستاوەكان لە لای ڕاستەوە: ١ مەحمود ڕێباز . ٢ عەلی باپیر ٣ مامۆستا مەلا عەلی مەمك ٤ مامۆستا حەسەن بابەكر . ٥ مەلا شەریف ( شەهید) . ٦ حەسەن عەلی .

دانیشتووەكان : ١ هێرش مەحمود . ٢ حاجی رزگار



**(١٩٨٧) كاروانچییەكانو بارهێنانیان بۆ هێـزی حـەمـزە**

كـاك ئەحـمـەدە شـەلی ماخۆبـزنـان



**(١٩٨٧) قەڵاتـووكان**

**لـە لای ڕاسـتەوە:** ١ كـاك جـەلال (برایەكـی بادینـی) پیـرۆزەی كچـمی لەباوەشـەوەیە.
٢ عەلـی باپیـر ٣ مامۆسـتا مەلا عبدالرحـمن لۆتـەری (شـەهید). ٤ بەسـۆزی كچـم.



(١٩٨٧) قەڵاتـووکان– بناری قەندیل

١. عەلـی باپـیر . ٢. كاك فەقی محمود حەمە جكۆل (مام موختار)



زسـتانی (١٩٨٧) قەڵاتـووکان

پێش بەرێکەوتنی مەفرەزەکەمان بۆ جەولە یەك مانگییەکە




**( ٢٩/ ١١/ ١٩٨٧) دۆڵەبی**

لە سەردانی (حاجی فەقی سمایلی یاخیان) دا




**( ٢٦/ ١١/ ١٩٨٧) چیای پیرەمەگرون**

١- عەلی باپیر . ٢- عبدالواحد باپیر

www.alibapir.net



( ٢٦/ ١١/ ١٩٨٧)
لەسەر چیای پیرەمەگرون



( ٢٦/ ١١/ ١٩٨٧) لەسەر چیای پیرەمەگرون
زۆربەی مەفرەزەکە



( ٨/ ١٢/ ١٩٨٧) گوندی کەڵەشێرە

لە سەردانی (کوێخا نەریمان) دا



(١٢/ ١٩٨٧) ئەشکەوتی قسقاپان – گوندی زەرزی / نزیك چەمی ڕێزان



**(١٢/ ١٩٨٧) ئەشکەوتی قسقاپان – گوندی زەرزی**

**لە لای ڕاستەوە:** ١- مامۆستا مەحمودی ئازادی . ٢- شێخ مەحمود . ٣- عبدالواحد باپیر .
٤- م . عبدالرحمن لۆتەری (شەهید) . ٥- مام رەسول حاجی محەممەد . ٦- م . تۆفیق شەدەڵەیی .
٧- م . شێخ فاتح باری . ٨- م . محەممەد زەرزی . ٩- عەلی باپیر .



**(٣/ ١٩٨٨) هەڵەبجە – پاش کیمیا باران**

١- کاك سەر بەست . ٢- کاك حاجی سەعید .
کە لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی دیکەدا بۆ هاوکاری خەڵکەکە چووبوون



(مانگی نیسانی/ ١٩٨٨)
قەڵاتووکان – وتاردان
بەبۆنەی گەڕانەوەی بەشێك لە هێزەکانمان لە قەرەداغەوە



(١٩٨٨) بناری قەندیل
گوندی قەڵاتووکان
١- مامۆستا حەسەن بابەکر.
٢- عەلی باپیر.



**(٢٠/٨/١٩٨٨) قەنـدیـل – کوێـستانی مالـێخ**

**پیاوەکان لە سـەرەوەڕا :** ١ـ م. سەید عبداللە مەمەنداوەیی. ٢ـ کاك بیـلال (محەمـەد بۆسـکێنی. ٣ـ عەلـی باپـیر

**ئـافرەتەکان لە لای ڕاسـتەوە :** ١ـ هاوسەری ڕەحمەتیـم (روخسـار خـان). ٢ـ فاتیمـه خـان (هاوسـەری مـەلا ئەحمـەدی هەنارۆکێ). ٣و ٤ـ دوو ئافرەتی ڕەوەند. ٥ـ پیـروز خان (خێـزانی کـاك بیـلال). ٦ـ ئایشـه خـان (هاوسـەری، م. سەید عبداللە). ٧ – شـلێر خـان (هاوسـەری کاك مەلا شـەریف).



**(١٩٨٨) قەڵاتووکان**

**دوو برای بادینان:** ١ـ کـاك جـەلال. ٢ـ ؟؟؟؟.



**(٢٠/٨/١٩٨٨) قەندیل – کوێستانی مالێخ**

**له لای ڕاستەوه :** ١- پیروز خان (خێزانی کاك بیلال) . ٢- فاتیمه خان (هاوسەری مەلا ئەحمەدی هەنارۆکێ) ٣- هاوسەری ڕەحمەتیم (روخسار خان) .



**(٢٠/٨/١٩٨٨) قەندیل – کوێستانی مالێخ**

**هاوسەرم سێ منداڵەکانمانی پێیه :** ١- بەسۆز / کە تفەنگەکەی پێه . ٢- پیرۆزه / له دەستی ڕاستی بەسۆز وەستاوه . ٣- محەمەد / له باوەشی دایکی دایه .



(١٩٨٨) قەڵاتووکان

لەگەڵ مام حاجی ظاهردا کە سەردانی کردبووین



(٣٠ / ٨/ ١٩٨٨) قەندیل

کاك موصلح حەمزە نوری کە وەك حیمایە وەستاوە



(٥/ ٢/ ١٩٨٩) گوندی بەردەڕەش

لەگەڵ مامۆستا مەلا محەممەدی عەزیزی ئیمامی گوندو ژمارەیەك لە خەڵکی گوندو فەقێیان




(٥/ ٢/ ١٩٨٩) گوندی بەردەڕەش

لەلای ڕاستەوە : ١ مامۆستا مەلا محەممەدی بەردەڕەشی . ٢ عەلی باپیر . ٣ مەلا شەریف (شەهید



(٣١/ ٣/ ١٩٨٩) شاری سەردەشت

سەردانی مامۆستا شێخ عبداللطیف واژەیی بۆ بارەگای هێزی حەمزە لە مزگەوتی (حاجی ڕەسول)دا



(١٩٨٩) ڕێگای نێوان میراوێ سەردەشت

سەردانی مامۆستا شێخ صدیق سەرگەتی و مامۆستا شێخ عبداللطیف واژەیی بۆ بارەگای هێزی حەمزە لە (خدراوێ)




(١٩٨٩) دزلــی 

ســەردانی ئێــمە بۆ لای مامۆســتا مەلا ئەحــمەد کاکە مەحــمود و هێـزی (صـلاح الدین)



(١٩٨٩) ئۆردوگــای دزلــی 

ســەردانێکی بۆ ماڵی مامۆســتا شــێخ صـدیق ســەرگەتی لە ئۆردوگــای دزڵـی

**لەلای ڕاستەوە ڕاوەستاوەکان :** ١ مامۆستا شێخ صدیق . ٢ لوقمان شـێخ جەعفەر . ٣ نەجمەدین شـێخ صـدیق . ٤ عومەری حەمـەتاڵ . ٥ تەهای حاجی زاهیـر . ٦ مەلا صـوهەیب بالیکـەدەر . ٧ کەمال مەلا محـەمـەد

**دانیشتووەکان :** ١ جمال احمد مەلا فتاح (شەهید) . ٢ مەلا شەریف (شەهید) . ٣ م . مەحــمودی ئـازادیی . ٤ م . شـێخ صـدیق . ٥ عەلــی باپـیر . ٦ شـێخ سـەعید سـازانی (شـەهید) . 



**(١٩٨٩) خـدراوێ**

پۆلێـك منداڵـی ماڵەکانی خدراوێ کە (بەسۆز) و (پیـرۆزە)ی کچم لەنێوانیان دان




**(١٧/ ٣/ ١٩٨٩) بـۆکان**

سـەردانکردنـمان بۆ لای مامۆسـتا مەلا هـادی ئەفخـەم زادە




(٢٦/ ٣/ ١٩٨٩) سەردەشت

لە کاتی سەردانکردنی جەنابی مامۆستا مەلا عثمان دا بۆ لامان




(٢٦/ ٣/ ١٩٨٩) سەردەشت

لەلای ڕاستەوە : ١ـ مامۆستا مەلا مەغدید (شەهید) . ٢ـ عەلی باپیر . ٣ـ مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز . ٤ـ مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز . ٥ـ کاك مەلا شەریف (شەهید) .



زستانی (١٩٨٩) سەردەشت

لەلای ڕاستەوە :

١ـ کـاك جـەمال ئەحـمـەد مـەلا فەتـاح (شـەهید).

٢ـ عـەلی باپیـر .

٣ـ کاك کـاروان هاشم.



(١٩٨٩) سەردەشت

پێشـانگایەکی وێنـەیی کاك طـە حـاجی ظـاهر کردبوویەوە



**(١٩٨٩) خـدراوێ**

**پۆلێـك لە پێشـمەرگەی هێـزەكانی :** ١ حـەمـزە . ٢ شـافـیـعیی . ٣ ئـازادی . جەنابـی بابیشـــم لە نێـوانیان دا دیـــارە



**(١٩٨٩) خـدراوێ**

**لەلای ڕاسـتـەوە :** ١ خالید پشـتئاشـانیی . ٢ مـەلا عومـەر مسـتەفا (شـەهیـد) . ٣ عبدالســتار مەجیـد . ٤ عـەلـی باپیـر . ٥ طـــە حـاجی ظاهـر . ٦ عبدالواحـد باپیـر . ٧ صـوهەیـب مسـتەفـا .



(١٩٨٩) خدراوێ
پۆلێك لە پێشمەرگەكانی هێزی (نەصر).



(١٩٨٩) سەردەشت و دەوروبەری
كۆبوونەوەو قسەكردن بۆ كۆمەڵێك مەلای كوردستانی ئێران




(١٥/ ٥/ ١٩٨٩) بـادیـناوێ

چـایـی خواردنـەوەیەك لەلای (مام مـەلا)ی بادینـاوێ




(١ / ٦/ ١٩٨٩) خـانێ – مزگەوت

قسەكردن لەبارەی كاك سید مصطفى سید علي كە داوای (مهدي) بوونی دەكردو بەرپەرچدانەوەی لەلای ڕاستەوە : ١ كاك مەلا شەریف (شەهید) . ٢ مامۆستا مەلا رەسولی زەنگل . ٣ مامۆستا مەلا ئەحـــمەدی سینەمۆكی (شەهید) . ٤ كاك عەباس بایز بالوغا . ٥ مامۆستا مەلا محەممەدی ڕازی . ٦ مامۆستا مەغدید (شەهید)




(٢٤ / ٧/ ١٩٨٩) سـەردەشت

لەلای ڕاسـتەوە : ١ـ محەمـمەد عەزیـز . ٢ـ کاك مەلا شەریف (شەهید) . ٣ـ عـەلی باپیـر .




(٢٤ / ٧/ ١٩٨٩) سـەردەشت

لەلای ڕاسـتەوە : ١ـ ئەبووبەکر باپیر . ٢ـ عـەلی باپیر . ٣ـ ابراهیـم باپیر . ٤ـ باپیـر وەتـمان ماماغا .



**(١٩٨٩) سـەردەشت – مزگـەوتـی حاجی ڕەسول**

چەند ئەندامێکـی هێـزی حەمـزەو چەنـد مەلایەکـی کوردسـتانی ئێـران



**(١٩٨٩) مـەریـوان**

**لەلای ڕاستەوە :** ١- مەلا صـوهەیب . ٢- حاجی سەعید . ٣- مامۆستا مەلا محەمـەدی ڕازی . ٤- أبو هـدی .
٥- عـەلـی باپـیـر . ٦- شـێخ سـەعید سـازانی (شـەهید) . ٧- شـەریف وەرزێـری شاعیـر .
٨- طـە حاجی ظـاهر . ٩- جـەمال ئەحـمەد قوولەڕەشیی (شەهید) . ١٠- کەمال محـەمـەد بۆسکێنی




(١٩٨٩) سەردەشت وتاردان لە مزگەوتی



(١٩٨٩) قاسمەڕەش

سەردانکردنمان بۆ لای مام جەلال



(١٩٨٩) قاسمەڕەش – سەردانکردنمان بۆ لای مام جەلال

لەلای ڕاستەوە : ١ مامۆستا حەسەن بابەکر . ٢ دکتۆر فوئاد مەعصوم . ٣ عەلی باپیر . ٤ مام جەلال . ٥ مامۆستا مەحمودی ئازادی . ٦ کاك مەلا سەلمان . ٧ مامۆستا ڕەسولی زەنگڵ .



(١٩٨٩) ڕاژان

سەردانکردنمان بۆ لای مەسعود بارزانی



**(١٩٨٩) کاولان**

سەردانکردنمان بۆ لای رەسول مامەند / سکرتێری حیزبی سۆشیالیست



**(١٩٨٩) سەردەشت و دەوروبەری**

سەردانیکردنم بۆ لای حوجرەیەکی فەقێیان



**لە پێشەوە:**

١- مامۆستا مەغدید ( شەهید ).

٢- عەلی باپیر.

**لە دەورەوە:**

١- مامۆستا محمد امین ئاشووریی.

٢- کاک مەلا شەریف (شەهید).

٣- کاک بیلال (محەمەد بۆسکێنی).

٤- مام رەسوڵ بەستەستێی.

٥- شوان عبدالرحمن.



**(١٩٨٩) خدراوێ**

**شەهیدان :** ١- عبدالباسط . ٢- جمال احمد



(١٩٨٩) گوندی نمێنجە ماڵی حاجی جەوهر ئاغا

لەلای ڕاستەوە : ١ طه حاجی ظاهر . ٢ حاجی جەوهر ئاغا (خاڵی ڕوخسار خانی هاوسەرم .
٣ عەلی باپیر . ٤ مەلا ڕەسول (مەلای گوند) . ٥ جەمال جەلال (برازای جەوهەر ئاغا) .



(١٩٨٩) خدراوێ

پۆلێك لە پێشمەرگەی هێزەكانی : ١ حەمزە . ٢ شافیعیی . ٣ ئازادی .



**پۆلێك لە پێشمەرگەی هێزی شافیعیی**

کە ١ مەلا سەلمان . ٢ مەلا عبدالقادری برایەتی . ٣ مەلا عومەر (شەهید) . لە نێوانیان دا دیارن



**(١٩٨٩) خدراوێ**

قوڕکاریی کردن بۆ دروستکردنی مزگەوت و بارەگای هێز .



(١٩٨٩) خـدراوێ

سـەردانکردنی مامۆسـتا شـێخ صـدیق سـەرگەتی و مامۆسـتا شـێخ عبداللطیـف واژەیـی بـۆ لامـان.



(١٩٨٩) خـدراوێ

**لە لای ڕاسـتەوە :** ١ مامۆسـتا حەسەن بابەکر. ٢ کاک شـێخ صلاح شێخ مصـطفی. ٣ عەلـی باپـیر. ٤ مامۆسـتا شـێخ عەلـی عبدالعـزیـز. ٥ کاک شـێخ مصـطفی زێنـوێ



(١٩٨٩) خـدراویٚ / سـەردانکردن و چاوپێکـەوتن کردنی هەر کـام لە :

١ د. عثـمان علـی ( ئـازاد گەرمیـانی ). ٢ کاك سـەرتیـپ لەگەڵ مان دا.



(١٩٨٩) خـدراویٚ

سـەردانیکردنی شـاندێکی پارتـی دیموکراتی کوردستان بۆ لامان

ڕاسـتەوەکان لە پێشـەوە : ١ سـیامەند . ٢ عـەلـی باپـیـر . ٣ صـالح بـارزانـی . ٤ ؟؟؟؟

٥ ئەحـمەدە سـوری شـێخئـاودەلان . ٦ مەلا سـەلـمان . ٧ مەلا عبـدالقادری برایـەتی



**شاری نەغەدە**

دایك و بابی ڕەحمەتیم خوا لێیان خۆشبێ



**شاری نەغەدە**

دایکی ڕەحمەتیم خوا لێی خۆشبێ



(١٩٨٩) ڕێگای نێوان سەردەشت / خدراوێ

هاوسەری ڕەحمەتییم (روخسار خان) و چوار منداڵەکانی ئەو کاتمان:

١- بەسۆز . ٢- پیرۆزە . ٣- محەممەد . ٤- عبدالرحمن



(١٩٨٩) ڕێگای نێوان سەردەشت / خدراوێ

لەلای ڕاستەوە: ١- عائیشە خان (هاوسەری کاك طە). ٢- روخسار خان (هاوسەرم) . ٣- پەروین خان (هاوسەری مامۆستا حەسن بابەکر).

منداڵەکان: ١- دیاریی . ٢- محەممەد . ٣- زانا . ٤- کۆچەر (سازان).



شاری ڕانیـە

١- حاجـی ظـاهـر ( بابـی کـاك طـه) . ٢- حاجـی ژنـە فاطـمة ( دایکـی کـاك طـه)-




(٢/٣/١٩٩٠) خـدراوێ

لەلای ڕاستـەوە: ١- ملا عومـەر مصـطفی (شەهید). ٢- عـەلـی باپـیـر . ٣- صـوهەیب مصـطفی.-



**(١٣ / ٦ / ١٩٩٠) كوردستانی ئێران گوندی دزڵی**

ژمارەیەك لە مامۆستایان و كادیرانی بەشداربووی كۆنگرەی پێنجەمی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (١٣ ٦ ١٩٩٠)



**(٢/ ٣/ ١٩٩٠) خدراوێ**

خۆمو ڕوخسار خانی هاوسەرم و (عبدالرحمن)ی كوڕم.



زستانی (١٩٩٠) خـدراوێ 

لەگەڵ کاک عبدالکریـم قادر خـدرەسـوور .

# نێوەڕۆك